محمد بن جریر طبری

# میژووی تەبەری

بەرگی پێنجەم

وەرگێڕانی: زانـەرمحمد

## بەناوی خوای جوانکاری بونەوەر

***پێناسی کتێب***


ناوی کتێب : مێژووی تەبەری

بابەت :مێژوویی

بەرگی: پێنجەم

**نوسینی: محمد بن جرير طبری**

**وەرگێرانی: زانەر محمد**

نەخشەسازی: چوارچرا

نۆبەتی چاپ :چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠١١

چاپخانە : چوارچرا

دیزاینی بەرگ: هەرێم عوسمان

تیراژ :١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن (٢٤٥٨) ساڵی (٢٠٠٩) پێدراوە

# پێڕست

## بەردەوامی ڕووداوەکانی ساڵی١٤ی کۆچی

عەمرۆ دەڵێت: خەڵکی سواد سکاڵایان بۆ لای یەزدگێرد بەرز کردەوە وکەسیان ڕەوانە کرد و ئاگاداریان کردەوە کەعەرەبەکان لەقادسیە کۆبوونەتەوە و مەبەستی شەڕیان لەسەردایە و لەو کاتەوەی هاتوونەتە قادسیە ئەوەی لەنێوان ئەوان و فوراتدا بووە، وێران و خاپووریان کردووە، خەڵکان لەقەڵاکاندا ماونەتەوە و ئاژەڵ و چوارپێ و خواردەمەنییەکان لەدەست چوون، زۆری نەماوە خەڵکان لەقەڵاکانیش بێننەدەر، ئەگەر هاوکاریمان نەکرێت ناچارین خۆمانیان تەسلیم بکەین.

ئەو پاشایانەی لەتف، مڵکیان هەبوو، نامەیەکی لەم شێوەیان بۆ یەزدێگرد نووسی و وتەی خەڵکانیان پشتڕاستکردەوە. پاشایان هاندا تا ڕۆستەم ڕەوانە بکات. کاتێك یەزدگێرد بڕیاری ڕەوانە کردنی ڕۆستەمیدا، کەسی نارد و ڕۆستەمی بانگ کرد، کاتێك هات، پێی وت: دەمەوێت تۆ بۆ سواد بنێرم، بۆ هەر کارێك یا پێشهاتێك پێویستە بەشێوەیەکی شیاو خۆئامادە بکەین، ئێستا تۆ کەڵەپیاوی فارسەکانیت و دەبینیت ئەم بەلاّ و زیانانە بەرۆکی وڵاتەکەمانی گرتووە کە لەسەرەتای پاشایەتی ئەردەشێرەوە وێنەی نەبینراوە.

ڕۆستەم واینیشاندا بەبۆچوونەکەی پاشا ڕازی بووە، سوپاسی کرد، پاشا وتی: دەمەوێت بۆچوونی تۆیش بزانم ولە ئەندێشەی تۆ ئاگادار ببمەوە، عەرەبەکان و کردەوەکانی ئەوان لەو کاتەوەی لەقادسیە دابەزیون، بۆ من باس بکە و لەزیانی عەجەمەکان بدوێ.

ڕۆستەم وتی: عەرەبەکان هاوشێوەی گورگن کە لەبێ ئاگای شوان دەرفەتیان دەسکەوتووە و سەرقاڵی لەناوبردن و بەفیڕۆدانن.

پاشا وتی: بەوشێوە نییە، دەمەوێت وەسفی ئەوان بەئاشکرا بکەیت بۆ ئەوەی هێزی پێویستت بخەمەبەردەست، بەلاّم ڕاستیت نەوت. هەنووکە گوێ لەوتەکانی من بگرە: نموونە عەرەب و فارسەکان هاوشێوەی هەڵۆیەکە و لەسەر کێوێك دابەزیوە کەباڵندەکان شەوانە دەڕۆنە ئەوێ و لەداوێنی کێوەکە و لەناو هێلانەکەی خۆی ئارام

دەگرن و کاتێك بەیانی دادێت، هەڵۆ دەبینن بۆسەی داناوە، ئەگەر باڵندەیەك بەجێ بمێنێت، هەڵۆکە دەیگرێت و کاتێ باڵندەکان ئەمە دەبینن، لەترسا، ناتوانن بەرگری بکەن و هەر باڵندەیەك جیا ببێتەوە، لەدەستی هەڵۆدا ئەسیر دەبێت. ئەگەر باڵندەکان پێکەوە هێرش بەرن، پاشەکشێ بەهەڵۆکە دەکەن و هەموویان رزگاریان دەبێت، بەڵام ئەگەر بڵاوەی لێبکەن، ئەوانەی بەرگری دەکەن، لەناو دەچن. نموونەی عەرەب و فارسەکان بەمشێوەیە، تۆیش بەمشێوەیە کارەکانت رێکبخە.

رۆستەم وتی: ئەی پاشا، من لێرە بهێڵەرەوە چوونکە عەرەبەکان تا ئەو کاتەی من بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان ناچار نەکەیت، لەعەجەمەکان دەترسن، ئەگەر من رەوانە نەکەیت، خواوەند بەلای ئەوانمان لێ دوور دەخاتەوە و بەمشێوەیە ئێمە فێڵ و فریو بەکار دەبەین چوونکە فریو و دوورئەندێشی لەجەنگ لەسەرکەوتن سوودمەنترە.

بەڵام پاشا رازی نەبوو و وتی: چیتر؟

رۆستەم وتی: لەجەنگ، پەلە کردن دوورئەندێشی نییە و هەنووکە باشترە چاوەڕوان بین چوونکە شەڕی سوپایەك دوای سوپایەکی دیکە لەتێکشکانی یەکجارەکەی باشترە و بۆ دوژمن دژوارترە.

شا پێداگری کرد و رازی نەبوو. رۆستەم بەرێکەوت و لەسابات ئوردووی لێدا. بەردەوام کەسی بۆ لای پاشا دەنارد تا ئەو لەم کارە دوور بخاتەوە و کەسێکی دیکە رەوانە بکات.

لەم کاتەدا خەڵکان لەدەروی رۆستەم کۆدەبوونەوە و سیخوڕەکان لەحیرەو منالەکانی سەلوبا سەعدیان لەهەواڵەکان ئاگادار کردەوە و ئەو پێشهاتەکانی بۆ عومەر نووسی.

کاتێك سکالای خەڵکانی سواد بەهۆی ئازازمەرد کوڕی ئازازبە چەندین جار لای یەزدگێرد دووبارە کرایەوە، شا بڕیاریدا رۆستەم بۆ شەڕ رەوانە بکات و بیری لەدوور ئەندێشی و رێگەچارەیەکی عەقڵانی نەکردەوە چوونکە پیاوێکی کورتبین و پێداگر بوو. بەردەوام جەختی لە رەوانە کردنی رۆستەم دەکردەوە. رۆستەم بەردەوام وتەکانی دووبارە دەکردەوە و دەیوت: ئەی پاشا! پێچەوانەی دوورئەندێشی، ناچارم

دەکات سنووری خۆم ببەزێنم و لێپرسراویەتییەکان لەسەر شانی خۆم هەڵبگرم، ئەگەر چارەم دەبوو، ئەم قسانەم نەدەهێنایە سەرزمان، سوێندت دەدەم بەخوا لەبەر خۆت و کەسەکانت و پاشایەتیت، ڕێگە بدەی لەئوردووگا بمێنمەوە و جالینوس بنێرم، ئەگەر سەرکەوتنی بەدەستهێنا چ باشتر و گەرنە ئامادەم کەسێکی دیکە بنێرم تا ئەوکاتەی هیچ ڕێگە چارەیەك نەمێنێتەوە، ئەوسا کاتێك ڕووبەڕوویان دەبینەوە کەبێزار و شەکەتن و ئێمە ئاسوودە و بەهێز.

بەڵام یەزدگێرد ڕازی نەبوو و ئەوی بۆ ڕۆشتن ناچار کرد.

کوڕی روفەیل لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك ڕۆستەم لەسابات ئوردووی لێدا و کەل و پەلەکانی شەڕی کۆکردەوە، جالینوسی لەگەڵ چل هەزار شەڕکەر بۆ پێشەوە نارد و وتی: هێرش بکە بەڵام خۆت گرفتاری عەرەبەکان مەکە تا ئەو کاتەی فەرمانت پێدەدەم. هورموزانی وەك فەرمانەدەی باڵی ڕاستی سوپاکەی و مێهران کوڕی بەهرامی ڕازی وەك فەرماندەی باڵی چەپ دەستنیشان کرد. پیرزان فەرماندەیی دواوەی سوپاکەی گرتەئەستۆ.

ڕۆستەم بۆ هاندانی سوپاکەی وتی: ئەگەر خوا بەسەر ئەم خەڵکە سەرکەوتنی پێبەخشین، دەڕۆینە سەرزەمینی ئەوان و لەوێ زاری شەڕ هەڵدەدەین تا ئەو کاتەی بەئاشتی تەسلیم و بەباروودۆخی پێشوویان ڕازی دەبن.

کاتێك نێردراوانی سەعد ڕۆشتنە لای پاشا و گەڕانەوە، ڕۆستەم خەوێکی ناخۆشی بینی و هەستی بەمەترسی کرد، لەجموجۆڵ و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ عەرەبەکان دەترسا و دوودڵ و پەرێشان بوو، داوای لەپاشا کرد جالینوس بڕوات و خۆی بمێنێتەوە، وتی: سەرکەوتنی جالینوس سەرکەوتنی منە، هەرچەندە ناوی من لای ئەوان ناودار و بڕواپێکراوە، ئەگەر سەکەوتنی بەدەست هێنا، بەمەبەستی خۆمان گەیشتوین، ئەگەر پێچەوانەکەی ڕوویدا، کەسێکی دیکە دەنێرم و تا کاتێکی دیاریکراو بەمشێوەیە ڕێگە لەپێشڕەوی ئەم خەڵکە دەگرین چوونکە فارسەکان تا ئەو کاتەی من شکستم نەخواردووە، دەست لەهەوڵەکانیان هەڵناگرن و بەمشێوەیە عەرەبەکان بەردەوام لەئێمە دەترسن. تا ئەو کاتەی من ڕووبەڕووی ئەوان نەبمەوە، بوێری هێرش کردنیان نابێت، بەڵام ئەگەر خۆم بڕۆمە گۆڕەپانی شەڕ، وورە و هێزی ئەوان زیاد دەکات و فارسەکان بەتەواوی تێکدەشێن.

ڕۆستەم پێشەنگی سوپاکەی کەپێکهاتبوو لەچل هەزار شەڕکەر، ڕەوانەی کرد و خۆی لەگەڵ شەست هەزار کەس بەرێکەوت. کۆتایی سوپاکەی بیست هەزار شەڕکەری لەخۆ دەگرت.

عەمرۆ دەڵێت: ڕۆستەم لەگەڵ سەد و بیست هەزار کەس بەرێکەوت کەهەموویان ئێرانی و لەگەڵ شوێنکەوتەکان دەگەیشتنە دووسەد هەزارکەس، لەمەداینەوە لەگەڵ شەست هەزار کەس بەرێکەوت.

ڕۆستەم بەسوپایەکی شەست هەزار کەس هێرشی کردە سەر سەعد لەقادسییە.

عەمرۆ دەڵێت: کاتێك پاشا فەرمانی بەرێکەوتنی بەرۆستەمدا، ئەو بۆ براکەی و سەرکردەکانی فارس بەمشێوەی نووسی: لەرۆستەم بۆ بەندوانی سنووردار و تیری فارسەکان کە ڕووبەڕووی هەر پێشهاتێك دەبوویەوە و خواوەند هەر سوپایەکی گەورەی لەسەر دەستی ئەو شکستدەدا و هەر قەڵایەکی بەهێز و تۆکمەی دەگرت و بۆ کەسانی هاوشێوەی ئەو، قەڵاکانی خۆتان بەهێز و ئامادە بن، کەرەستەی پێویست کۆبکەنەوە چوونکە لەنزیکترین کات عەرەبەکان دێنە سەرزەمینی ئێوە و دەبنە ئەرك بۆ خۆتان و خەڵکەکەتان. بۆچوونی من ئەوە بوو لەشەڕ کردن لەگەڵ ئەوان پەلە نەکەین تا ئەو کاتەی ئەستێرەی بەختی ئەوان بەرەو کوژرانەوە دەڕوات بەڵام پاشا ڕازی نەبوو.

سەڵت کوڕی بەهرام دەڵێت: کاتێك یەزدگێرد فەرمانی بەرۆستەمدا لەساباتەوە بەرێکەوێت، ڕۆستەم نامەیەکی هاوشێوەی بۆ براکەی خۆی نووسی و زیادی کرد: ماسی ئاوی قوڕاوی کردووە و وشترمر جوان بووە و تەرازوو هاوسەنگ وەستاوە و بەهرام لەناوچوو، دڵنیام ئەم خەڵکە بەسەر ئێمەدا زاڵ دەبن و بەسەر وڵاتی دراوسێی ئێمەیشدا زاڵ دەبن. ناخۆشترین وشەی بیستم ئەوە بوو پاشا وتی: یا تۆ ڕووبەڕووی ئەوان دەبیتەوە یا خۆم.

کوڕی روفەیل لەباوکی دەگێڕێتەوە: ئەو کەسەی یەزدگێردی بۆ ڕەوانە کردنی ڕۆستەم ناچار کرد، غولام جاپان، ئەستێرەناسەکەی کەسرا بوو، ئەو، لەخەڵکانی فوراتی بادەقلییە. یەزدگێرد کەسی بەدوای ئەودا نارد و وتی: بۆچوونی خۆت سەبارەت بەڕەوانە بوونی ڕۆستەم و شەڕ لەگەڵ عەرەبەکان باس بکە؟

ئەو، نەیوێرا ڕاستییەکان بێنێتە سەرزمان و لەبەر ئەمە درۆی کرد.

ڕۆستەمیش هاوشێوەی ئەو شارەزای زانستی ئەستێرەناسی و بەهۆی زانستەکەی خۆیەوە، حەزی بەڕۆشتن نەدەکرد، بەڵام پاشا بۆ ڕۆشتنی ئەو پێداگری دەکرد چوونکە غولام جاپان فریویدا. پاشا پێی وت: دەمەوێت لەزانستەکەی خۆی سەبارەت بەم کارە ئاگادارم بکەیتەوە تا دڵنیا ببوو.

غولام بەزەڕنای هیندی وت: ئاگاداری بکەرەوە.

وتی: لەمن بپرسە.

کاتێك پرسی، وتی: ئەی پاشا، مەلێك دێت و دەکەوێتە سەر هەیوانی تۆ، شتێکی بەدەمەوەیە و دەکەوێتە ئێرە. بازنەیەکی کێشا. کۆیلە وتی: ڕاست دەکات، مەلەکە قەلەڕەشە و دەرەمێکی بەدەم هەڵگرتووە.

کاتێك جاپان ئاگادار بوویەوە، پاشا داوای ئەوی کردووە، ڕۆشت و پاشا سەبارەت بەوتەی غولام پرسیاری لێکرد، بەراوەردی کرد و وتی: ڕاستی وت، بەڵام هەڵەی کرد، مەلەکە قەلەڕەشێکی زەنگییە و دەرەمێکی بەدەمەوەیە و لێرەدا دەیخاتە خوار. زەربابە بەدرۆ وتی دەرەمەکە دەپەڕێت و دەکەوێتە ئێرە، بازنەیەکی کێشا. لەشوێنی خۆیان هەڵنەستابوون قەلەڕەشێك هات و دەرەمێکی لێکەوتە خوار، هەڵفڕی و لەشوێنێکی دیکە نیشتەوە. هندی دژایەتی جاپانی کرد. دواتر مانگایەکییان هێنا کەئاوس بوو. هیندی وتی: گوێرەکەکەی ڕەشە و ناوچاوی سپی.

جاپان وتی: درۆ دەکەیت ڕەشە و کلکی سپییە.

مانگاکەیان کوشت و گوێرەکەکەیان دەرهێنا و کلکی بەناوچاویەوە لکا بوو.

جاپان وتی: هەڵەی زەرنا لێرەدا بوو. دڵنەوایی پاشایان کرد تا ڕۆستەم ڕەوانە بکات و ئەو، ڕۆستەمی ڕەوانە کرد.

جاپان بۆ جەشنسماە نووسی فارسەکان لەناودەچن و دوژمن بەسەریاندا زاڵ دەبێت. پاشایەتی زەردەشتییەکان کۆتایی پێهات و پاشایەتی عەرەبەکان دەستی پێکرد، پەیمانیان لەگەڵ ببەستەو فریوی بارودۆخ مەخۆ، پەلە بکە، پەلە بکە، پێش ئەوەی بکەویتە دەستی ئەوان..

کاتێك نامەکەی بەدەستی جەشنسماە گەیشت، بەرەو لای عەرەبەکان بەرێکەوت و ڕۆشتە لای مەعنی کە لەگەڵ سوپاکەی خۆی لەعەتیق بوو. مەعنی ئەوی بۆ لای

سەعد نارد و جەشنسماە لەسەعد بۆ خۆی و بنەماڵەکەی و شوێنکەوتەکانی ئەمانی وەرگرت و بوو بەسیخوڕی ئەوان. فالودەیەکی پێشکەش بەمەعنی کرد. مەعنی لەژنەکەی خۆی پرسی: ئەمە چییە؟

وتی: پێم وابێت ویستوویەتی شتێکی دیکە دروست بکات و نەیتوانیوە.

مەعنی وتی: داماوی هەژار.

عەمرۆ دەڵێت: کاتێك رۆستەم لەساباتەوە بەرێکەوت، جاپان لەسەر پردەکە ئەوی بینی، گلەیی کرد و وتی: مەگەر لەگەڵ بۆچوونەکەی مندا نیت؟

رۆستەم وتی: جڵەوی کاروبارەکان لەدەستی کەسێکی دیکەدایە و بەناچاری دەبێت فەرمانەکانی ئەو ئەنجام بدەم.

رۆستەم جالینوسی لەپێشەوە نارد و تا حیرە پێشڕەوی کرد و لەنەجەف ئوردووی لێدا. رۆستەم لەکوسی دابەزی و نامەی بۆ جالینوس و ئازازمەرد نووسی تا کەسێك لەعەرەبەکانی سوپاکەی سەعد بگرن و ڕەوانەی بکەن. ئەوان کەسێکیان گرت و بۆ لای رۆستەمیان نارد. رۆستەم هەواڵەکانی لێپرسی و دواتر ئەوی کوشت.

کوڕی روفەیل لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك رۆستەم بەرێکەوت فەرمانیدا جالینوس لەگەڵ سوپاکەی بەرەو حیرە پێشڕەوی بکات و پێی وت یەکێك لەعەرەبەکان بگرێت. ئەو، هاوڕێ لەگەڵ ئازازمەرد لەگەڵ سەد کەس تا قادسیە پێشڕەوییان کرد و لەنزیك پردی قادسیە پیاوێکیان بینی و ئەویان گرت. عەرەبەکان شوێنیان کەوتن بەڵام نەیانتوانی بیانگرن. تەنیا چەند کەسێك لەوان کەوتنە دەستی موسوڵمانان. کاتێك گەیشتنە نەجەف، پیاوەکەیان بۆ لای رۆستەم لەکوسی ڕەوانە کرد.

رۆستەم پێی وت: بۆچی هاتوون و چیتان دەوێت؟

وتی: لەگەڕان بەدوای بەڵێنەکانی خواوەند.

وتی: بەڵێنەکانی خواوەند چییە؟

وتی: ئەگەر بەموسوڵمان بوون رازی نەبن، زەوی و منداڵ و گیانی ئێوە؟

رۆستەم وتی: ئەگەر پێش ئەوە کوژران؟

وتی: بەڵێنی خواوەند بەمشێوەیە هەرکەس لەئێمە بکوژرێت، دەڕواتە بەهەشت و

ئەوەی باسمان کرد، کەسانی دیکە بەدەستی دێنن، ئێمە دڵنیایین.

ڕۆستەم وتی: کەواتە ئێمەیان تەسلیمی ئێوە کردووە؟

وتی: ئەی ڕۆستەم! کردەوەکانی ئێوەی بەئێمەداوە و خواوەند بەم هۆیەوە ئێوەی تەسلیم کردووە، فریوی بارودۆخی دەورووبەری خۆت مەخۆ چوونکە تۆ ڕووبەڕووی مرۆڤەکان نابیتەوە بەڵکو لەگەڵ قەزا و قەدەر دەجەنگیت.

ڕۆستەم توڕە بوو، فەرمانی کوشتنی ئەوی دەرکرد.

ڕۆستەم بەمەبەستی ڕۆشتن بەرەو بۆرس کوسی بەجێهێشت، سوپاکەی ئەو بەزۆر دەستیان بەسەر سامانی خەڵکاندا گرت و لەگەڵ ژنان خەوتن، شەرابیان خوارد و خەڵکانی ناوچەکە سکالایان بردە لای ڕۆستەم. ڕۆستەم لەناو ئەواندا قسەی کرد و وتی: ئەی فارسەکان سوێند بەخوا ئەو پیاوە عەرەبە ڕاستی دەکرد. سوێند بەخوا کردەوەکانی ئێوە بۆتە هۆی ڕیسوایی ئێمە، سوێند بەخوا کردەوەی عەرەبە دوژمنەکانی ئێمە لەئێوە باشترە، خواوەند لەسەر بنەمای چاکەکاری و دادپەروەری ئێوەی بەسەر دوژمناندا زاڵدەکرد و دەستتان بەسەر وڵات و سەرزەمینەکاندا دەگرت، هەنووکە کردارتان گۆڕاوە و خراپەکاریتان کردۆتە پیشە، خواوەند گۆڕانکاری بەسەر ئەم بارودۆخەدا دێنێت و مەترسی ئەوەمان هەیە دەسەلات لەئێوە بستێنێتەوە.

ڕۆستەم کەسانێکی نارد و چەند کەسێك لەوانەی ببوونە هۆکاری ئەرك بۆ خەڵکانیان هێنا و ئەوانی کوشت. دواتر فەرمانی بەڕێکەوتنی دەرکرد و بەڕێکەوت و لەنزیك دیر الاعوەر دابەزی، لەوێوە ڕووی کردە مەڵتات و لەسەر ڕووباری نەجەف لەکەنار فورات و نزیك خوەرنەق تا غەریین ئوردووی لێدا. خەڵکانی حیرەی کۆکردەوە و هەڕەشەی لێکردن، دەیویست کوشتاریان بکات.

کوڕی بوقیەلە پێی وت: قورسایی دوزیان و بەلا مەخە سەرشانی ئێمە، ناتوانیت هاوکاریمان بکەیت و سەرکۆنەمان دەکەیت بۆ پارێزگاریمان لەخۆمان کردووە.

ڕۆستەم بێدەنگ بوو.

میقدامی حارسی دەڵێت: ڕۆستەم خەڵکانی حیرەی کۆکردەوە، خێوەتەکەی ئەو لەنزیك دێرەکە بوو، پێی وتن: ئەی دوژمنانی خواوەند، دڵخۆش بوون بەوەی عەرەبەکان هاتوونەتە سەرزەمینی ئێمە و بوونەتە سیخوڕی ئەوان و بەسامانی

خۆتان هاوکاریتان کردوون. خەڵك، کوڕی بوقەیلەیان پێش خست و وتیان: تۆ قسەی لەگەڵ بکە.

کوڕی بوقەیلە ڕۆشتە پێش و وتی: ئەوەی دەڵێت لەهاتنی عەرەبەکان دڵخۆش بووین، چییان کردووە تا ببێتە هۆی دڵخۆشی ئێمە، بەگومانی ئەوان، ئێمە بەندەی ئەوانین، باوەڕیان بەدینەکەی ئێمە نییە و ئێمە بەجەهەننەمی دەزانن، ئێستاکە دەڵێیت سیخوڕی ئەوانن، ئەوان پێویستیان بەئێمە نییە تا سیخوڕی ئەوان بین، هاوەڵانی تۆ لەبەرابەر ئەوان هەڵاتن و گوندەکانیان چۆڵ کرد، بەدڵی خۆیان بۆ چەپ و ڕاست دەڕۆن و کەس نییە ڕێگەیان لێ بگرێت. پێمان دەڵێیت بەسامانی خۆمان هاوکاری ئەوان دەکەین، ئێمە بەسامانی خۆمان گیانی خۆمان پاراست چوونکە ئێوە بەرگریتان لەئێمە نەکرد و دەترساین ئەسیرمان بکەن و شەڕ دەسپێبکەن و شەڕکەرانمان بکوژن. سوپاکانی ئێوە نەیانتوانی لەبەرابەر ئەوان خۆڕاگری بکەن، ئێمە لەسوپاکانی ئێوە بێهێزترین، سوێند بەگیانی خۆم، ئێوەمان زیاتر خۆش دەوێت و کردەوەکانی ئێوە زیاتر پەسەند دەکەین. لەبەرابەر عەرەبەکان بمانپارێزن، ئێمە هاوڕێی ئێوەین، ئێمەیش هاوشێوەی خەڵکانی سواد بەندەکانی غالبین.

ڕۆستەم وتی: ئەم پیاوە ڕاست دەکات.

کوڕی ڕوفەیل لەباوکی دەگێڕێتەوە: ڕۆستەم لەدێرەکە لەخەودا بینی فریشتەیەك هاتە ناو سوپای فارسەکان و مۆری لەهەموو سیلاحەکانی ئەواندا.

نەزر دەڵێت: کاتێك ڕۆستەم دڵنیا بوو، جالینوسی لەنەجەفەوە ڕەوانە کرد. ئەو لەگەڵ پێشەنگی سوپاکەی بەرێکەوت و لەنێوان نەجەف و سەلیحین ئوردووی لێدا. ڕۆستەم بەرێکەوت و لەنەجەف دابەزی. لەو کاتەوەی ڕۆستەم لەمەداینەوە بەرێکەوت و لەساباط ئوردووی لێدا تا ئەو کاتەی ئەو ناوچەی بەجێهێشت و ڕووبەڕووی سەعد بوویەوە، چوارمانگی خایاند. پێشڕەوی نەدەکرد و نەدەجەنگا بەو هیوایەی عەرەبەکان لەمانەوە بێزار بن و بڕۆن. حەزی نەدەکرد شەڕ لەگەڵ ئەوان بکات. دەترسا ئەو بەڵای بەسەردا بێت کەبەسەر کەسانی پێشتر هاتبوو. بەردەوام خۆی دوادەخست تا ئەوەی پاشا ئەوی بۆ پێشڕەوی ناچارکرد و ڕۆستەم خوازیاری دەستپێکردنی جەنگ بوو.

کاتێك رۆستەم لەنەجەف دابەزی، دووبارە هەمان فریشتەی لەخەودا بینی کە پێغەمبەر(د.خ) و عومەر کوڕی خەتاب هاورێیەتیان دەکرد، سیلاحی فارسەکانی گرت و مۆری کرد و تەسلیمی پێغەمبەر و ئەو، تەسلیمی عومەر کوڕی خەتابی کرد. بەرەبەیان رۆستەم پەرێشان و خەمبار بوو، کاتێك روفەیل ئەمەی بینی، خوازیاری ئەوە بوو باوەڕ بێنێت. ئەم رووداوە بووە هۆی باوەڕهێنانی ئەو.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب ئاگادار بوویەوە فارسەکان بۆ شەڕ دەسپێشخەری ناکەن، فەرمانی بەسەعددا لەسنووری نزیك سەرزەمینەکانی ئەوان دابەزن و چاوەڕێ بن و ببنە چقڵی چاوی ئەوان.

عەرەبەکان لەقادسیە دابەزین و بڕیاریاندا بوو خۆڕاگری بکەن و لەشوێنەکانی خۆیان بمێننەوە چوونکە خواوەند دەیوست بانگەوازەکەی خۆی بەگوێی خەڵکان بگەیێنێت. مانەوە و دڵنیا بوون. سوادیان تالآن و سەرزەمینەکانی دەوروبەری خۆیان کاول و وێران و بۆمانەوەی درێژخایەن، خۆیان ئامادە کرد. بڕیاریاندا بەمشێوە بمێننەوە تا ئەو کاتەی خواوەند سەرکەوتنیان پێدەبەخشێت. عومەر بەردەوام فەرمانەکانی بۆ دەناردن.

کاتێك پاشا و رۆستەم ئەم هەڵس و کەوتەی عەرەبەکانیان بینی و لەمەبەست و کارەکانی ئەوان ئاگادار بوونەوە، دڵنیابوون ئەم خەڵکە دەست هەڵناگرن. پاشا زانی ئەگەر بێدەنگ بێت، دەستبەرداری وڵاتەکەی نابن لەبەر ئەمە رۆستەمی نارد. رۆستەم بەباشی زانی ئەگەر لەنێوان نەجەف و عەتیق ئوردوو لێبدات، لەکاتی شەڕ و جەنگ کاتی پێویست بەدەست دەهێنێت. چوونکە بەبڕوای ئەو کارەگونجاو و بەتێپەڕ بوونی زەمان دووبارە ئەستێرەی بەختیان دەدرەوشایەوە.

تەڵحە دەڵێت: عەرەبەکان بەهەموو لایەکدا دەڕۆشتن، رۆستەم لەنەجەف و جالینوس لەنێوان نەجەف و سەلیحین و زوئەلحاجەب لەنێوان رۆستەم و جالینوس ئوردووی لێدابوو. هورموزان و مێهران فەرمانەدەی دووباڵی سوپاکە بوون و پیرزان فەرماندەی دواوەی سوپاکە، زاد کوڕی بەهشی فەرمانڕەوای فوراتی سەریا، فەرماندەی پیادەکان و کەناری سەرکردەی تەك سوارەکان، سوپاکە لەسەد و دەهەزار شەڕکەر پێکدەهات، شەست هەزار کەسیان فارس و لەو شەست هەزار کەسە دەهەزارکەسیان لەبنەماڵە شەریف و گەورەکان بوون. شەڕکەرانیان بەزنجیر بەیەکەوە

بەستبوویەوە تا بەو شێوەیە رووبەرووی عەرەبەکان ببنەوە.

موسا کوڕی زەریف دەڵێت: خەڵکان بەسەعدیان وت: لێرەدا شوێنمان تەنگە، پێشڕەوی بکە. بەڵام سەعد سزای ئەو کەسانەی دا ئەم قسەیان کرد و وتی: کاتێك داوای بۆچوونی ئێوەیان نەکردووە، لەخۆوە، پێشنیاری هیچ کارێك مەکەن، ئێمە بەفەرمانی فرەزانەکان پێشڕەوی دەکەین و گرنگی بەوتەی ئێوە نادەین.

سەعد، توڵەیحە و عەمرۆی بێ سوپا وەك پێشەنگ رەوانە کرد و سواد و حەمیزە هەرکام لەگەڵ سەد کەس بەرێکەوتن و لە نەهرین پەلاماری ناوچەکانی ئەو سەرزەمینەیاندا. سەعد فەرمانی پێدابوون، زیاتر لەئەندازەی رێگەپێدراو، پێشڕەوی نەکەن. رۆستەم ئاگادار بوویەوە و دەستەیەکی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەوان نارد. سەعد لەدوورکەوتنەوەی سوپاکەی ئاگادار بوویەوە و عاسم کوڕی عەمرۆ و جابری ئەسەدی بانگ و ئەوانی بەدوای سواد و حەمیزەدا رەوانە کرد و لەهەمان رێگەی ئەوانەوە ملی رێگەیان گرتەبەر. بەعاسمی وت: ئەگەر شەڕ روویدا، تۆ سەرکردەی شەڕکەرانیت. عاسم لەنێوان نەهرەین و ئەستیمیا بەوان گەیشتەوە کەسوارەکانی فارس گەماریان خستبوونەسەر. دەیانویست تالآنییەکان هەڵبگرن. سواد بەحەمیزەی وت: یەك لەم دوو کارە هەڵبژێرە: یا رووبەروویان ببەرەوە و من تالآنییەکان دەبەم، یا من رووبەروویان دەبمەوە و تۆ تالآنییەکان ببە.

حەمیزە وتی: بەرگری بکە، من تالآنییەکان دەبەم.

سواد رووبەرووی فارسەکان بوویەوە و حەمیزە بەرێکەوت. عاسم کوڕی عەمرۆی بینی و حەمیزە گومانی کرد دەستەیەکی دیکە لەعەجەمەکانن و لەبەر ئەمە رێگەی خۆی گۆڕی. بەڵام کاتێك یەکیان ناسییەوە عاسم رێگەی سوادی گرتەبەر و تالآنییەکانی پێش خۆی خست کەفارسەکان بەشێکیان گرتبوو. کاتێك عەجەمەکان عاسمیان بینی، هەڵاتن و سواد تالآنییەکانی خۆی وەرگرتەوە و تەندروست و سەرکەوتوو لەگەڵ تالآنییەکان بۆ لای سەعد گەڕانەوە.

توڵەیحە و عەمرۆ ڕۆشتبوون، توڵەیحە لێپرسراوی ئوردووەکەی رۆستەم و عەمرۆ لێپرسراوی ئوردووەکەی جالینوس بوو. توڵەیحە بەتەنیا ڕۆشت و عەمرۆ لەگەڵ دەستەیەك.

سەعد کوڕی هوبەیرەی بەدوای ئەواندا نارد و وتی: ئەگەر شەڕ روویدا، تۆ سەرکردەبە، دەیوست لەبەر نافەرمانی کردن، تولەیحە ریسوا بکات بەڵام عەمرۆ فەرمانەکانی وەك خۆی جێبەجێ کردبوو.

قەیس ڕۆشت و بەعەمرۆ گەیشتەوە و بەدوای تولەیحەدا گەڕا. وتی: هیچ هەواڵێکم لەو نییە. کاتێك لەلای جووفەوە گەیشتنە نەجەف، قەیس پێی وت: دەتەوێت چی بکەیت؟

عەمرۆ وتی: دەمەوێت هێرش بکەمە سەر کەنارەکانی سوپاکە.

وتی: بەم ژمارە کەمە؟

وتی: بەڵێ.

قەیس وتی: سوێند بەخوا رێگەت پێنادەم، دەتەوێت موسوڵمانەکان رووبەرووی مەترسییەك بکەیتەوە ناتوانن خۆڕاگری بکەن؟

وتی: ئەمە پەیوەندی بەتۆوە نییە.

وتی: منیان کردۆتە سەرکردەی تۆ، ئەگەر سەرکردەیش نەدەبووم، رێگەی ئەم کارەم لێدەگرتی.

ئەسوەد کوڕی یەزید و چەند کەسێك شایەتییاندا کەسەعد، قەیسی کردۆتە سەرکردەی تولەیحە و عەمرۆ.

عەمرۆ وتی: سوێند بەخوا ئەی قەیس! ئەو رۆژگارەی تۆ دەبیتە سەرکردەی من، رۆژگارێکی خراپە، ئەگەر لەدینەکەی ئێوە پەشیمان ببمەوە و جارێکی دیکە ناباوەڕیم و لەو رێگەدا بجەنگم باشترە لەوەی تۆ سەرکردەی من بیت. هەروەها وتی: ئەگەر هاورێکەی تۆ (مەبەست سەعدە) جارێکی دیکە ئەم کارەی دووبارە بکاتەوە، لێی جیادەبمەوە.

قەیس وتی: جارێکی دیکە، خۆت دەزانی.

عەمرۆ گرنگی بەوتەکانی نەدا. هەردووکیان لەگەڵ ژمارەیەك لەکافرەکان وچەند ئەسپێك بۆ لای سەعد گەڕانەوە. هەرکام سکاڵای لەوی دیکە کرد. قەیس لەنافەرمانی عەمرۆ سکاڵای بەرز کردەوە و عەمرۆ لەتوندوتیژی قەیس.

سەعد وتی: ئەی عەمرۆ، هەواڵ و تەندروستی موسوڵمانان لای من باشترە لەوەی سەد کەس لەشەڕ لەگەڵ هەزاران کەس بکوژرێت، چۆن دەتویست لەگەڵ فارسەکان

بجەنگیت و بەسەد شەڕکەر رووبەرووی ئەوان ببیتەوە؟ گومانم دەکرد زۆر بەئەزموونتریت.

وتی: تۆراست دەکەیت.

تولەیحە ڕۆشت و لەشەوێکی مانگەشەو ڕۆشتە ناو ئوردووگای فارسەکان. سەیری کرد و تەناف خێوەتی پیاوێکی بڕی و ئەسپەکەی ئەوی پێش خۆی خست و ڕۆشت تا گەیشتە لای ئوردووگاکەی زوئەلحاجەب (بەهمەن جادویە)، دووبارە تەناف خێوەتێکی کەسێکی دیکە بڕی و ئەسپەکەی ئەوی پێش خۆی خست. دواتر رووی کردە ئوردووگاکەی جالینوس و دووبارە تەناف خێوەتێکی دیکەی بڕی و ئەسپەکەی ئەوی پێش خۆی خست. بەرێکەوت و گەیشتە خەرارە. ئەوی لەئوردووگای بەهمەن جادویە بوو، شوێنی کەوت بەڵام ئەوەی لەئوردووگای جالینوسدا بوو، زووتر پێیگەیشتەوە، دوای ئەو، سوارەکەی ئوردووگای نەجەف دەرکەوت. تولەیحە دووانی یەکەمی کوشت و سێیەم کەسی ئەسیر کرد. گەڕایەوە بۆ لای سەعد و رووداوەکەی بۆ باس کرد. سەعد ئەو کەسەی کردە موسوڵمان و بوو بەهاوەڵی تولەیحە و لەهەموو شەڕەکان هاورێیەتی تولەیحەی کرد.

کوڕی عوسمانی نەهدی دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب، سەعدی بۆ دیاری فارسەکان ڕەوانە دەکرد، پێی وتبوو: لەسەر هەر کام لەئاوەکان ئەگەر رووبەرووی پیاوێکی بەهێز و بوێر بوویەوە، لەگەڵ خۆی بیبات و ئەگەر نەڕۆشت، هەڵیبژێرێت تا عومەر فەرمانی پێدەدات. سەعد لەگەڵ دوانزە هەزارکەس رووی کردە قادسیە کەشەڕکەرانی رۆژگاری پێشوو بوون و هەروەها خەڵکانی سارا کەبەبانگەوازی موسوڵمانەکان رازی و بۆ هاوکاری ئەوان هاتبوون. دەستەیەکیان پێش شەڕ باوەڕیان هێنابوو و دەستەیەکی دیکە دوای شەڕ باوەڕیان هێنا و لەتاڵانییەکان بەشدار بوون و هاوشێوەی شەڕکەرانی قادسیە، دوهەزاریان بەرکەوت.

دەڵێت: موسوڵمانان بەدوای بەهێزترین هۆزەکانی عەرەبەدا دەگەڕان و خەڵکانی تەمیمیان پەیوەستی خۆیان کرد. کاتێك ڕۆستەم نزیك بوویەوە و لەنەجەف دابەزی، سەعد پێشەنگەکانی ڕەوانە کرد و وتی: کەسێك بگرن و بینێرن تا سەبارەت بەپارسەکان پرسیاری لێبکات.

پێشەنگەکان بەرێکەوتن و دوای کەمێك بگرە وبێنە بڕیاریاندا پێشەنگەکان لەیەك کەس تا دەکەس بن، بەلاّم دواتر سەعد، تولەیحەی لەگەڵ پانزە کەس ڕەوانە کرد و عەمرۆ کوڕی مەعدیکەربی لەگەڵ پێنج کەس. ئەمە لەو بەرەبەیانییەدا بوو کەرۆستەم جالینوس و بەهمەن جادویەی ڕەوانە کرد و نەیانـدەزانی ئەوان لەنەجەفەوە بەرێکەوتوون. فەرسەخێك کەمێك زیاتر نەڕۆشتبوون کەرووبەرووی ئەو ئوردووگاو چوارپێیانە بوونە کەدەشتی تەفووفیان پڕکردبوو.

دەستەیەکیان وتیان: بگەڕێنەوە بۆ لای سەرکردەکەی خۆتان و لەم پێشهاتە ئاگاداری بکەنەوە چوونکە فارسەکان لەنەجەف ئوردوویان لێداوە.

دەستەیەکی دیکە وتیان: بگەڕێنە تا دوژمن هەست بەبوونی ئێوە نەکات.

عەمرۆ بەهاوەلاّنی خۆی وت: ڕاستتان وت.

تولەیحە بەهاوەلاّنی خۆی وت: بۆچوونەکەیان هەڵەیە، ئێوەیان ناردووە تا لەهەواڵەکانی ئەم سوپایە ئاگادار ببنەوە.

وتیان: دەتەوێت چی بکەیت؟

وتی: دەمەوێت یا بڕۆمە ناو ئوردووگاکەیان یا گیان ببەخشم.

وتیان: تۆ دەتەوێت خیانەت بکەیت و دوای ئەوەی عوکاشە کوڕی موحسینت کوشت، هیچ کات ڕزگارت نابێت، ئێمە بگەڕێنەرەوە.

بەلاّم عەمرۆ بەگەڕانەوە ڕازی نەبوو.

کاتێك سەعد لەڕۆشتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، قەیس کوڕی هوبەیرەی ئەسەدی لەگەڵ سەد کەس نارد و وتی ئەگەر ئەوانی بینی، سەرکردەیانە. قەیس کاتێك ئەوان بەرێکەوتبوون، گەیشتە لای ئەوان. کاتێك عەمرۆ ئەوی بینی، وتی: بوێری لەخۆتان نیشانبدەن، وای نیشاندا دەیەوێت هێرش بکاتە سەر فارسەکان. بەلاّم قەیس ڕەخنەی لەم کارەیان گرت. تولەیحە لەوان جیابوویەوە. قەیس ئەم دەستەی گەڕاندەوە بۆ لای سەعد و لەنزیك بوونەوەی فارسەکان ئاگاداریان کردەوە.

تولەیحە ڕۆشت و لەئاوەکانی تەفووف تێپەڕی و ڕۆشتە ناو ئوردووگاکەی ڕۆستەم. شەو بەناو ئوردووگاکەدا گەڕاو و کۆتاییەکانی شەو، ئوردووگاکەی بەجێهێشت. باشترین شتی قەراغەکانی ئوردووگاکەی دیاری کرد. ئەسپێك بوو هاوشێوەی نەدەبینرا.

شمشێری دەرکێشا و جڵەوی ئەسپەکەی قرتاند و بەستی بەجڵەوی ئەسپەکەی خۆیەوە و بەخێرایی ئەسپی غاردا. خەڵکان و خاوەنی ئەسپەکە ئاگادار بوونەوە و هاوریان کرد. سوارچوارپێکان بوون و شوێنیان کەوتن. هەندێکیان لەتاو پەلەپەل، سوار چوارپێ بێ زینەکان دەبوون.

بەرەبەیان سواری سوپای فارسەکان پێی گەیشتەوە. کاتێک نزیک کەوتەوە، ڕمەکەی خۆی ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی لێی بدات، تولەیحە گەڕایەوە و فارسەکە پشتی تێکرد. تولەیحە پەلاماریدا و بەڕم پشتی شکاند. دواتر یەکێکی دیکە هات و ئەویشی کوشت. کەسی سێیەم هات و کوژرانی دوو ئامۆزاکەی خۆی بینی. ڕمەکەی خۆی ئامادە کرد و تولەیحە گەڕایەوە و فارسەکە پشتی تێکرد. تولەیحە پەلاماریدا و داوای لێکرد خۆی بەدەستەوە بدات. فارسەکە تەسلیم بوو.

تولەیحە پێی وت لەپێش خۆیەوە بڕوات. فارسەکان گەیشتن و دوو سوارە کوژراوەکە و ئەسیرەکەیان بینی. تولەیحە لەنزیک ئوردووگای موسوڵمانان بوو بەڵام هێرشیان نەکردەسەر و گەڕانەوە. تولەیحە گەیشتە ئوردووگا و موسوڵمانانی ئاگادار کردەوە. ئەویان بردە لای سەعد و کاتێک گەیشت، وتی: هاوار لەتۆ، دەنگ و باس چییە؟

وتی: دوێ شەو ڕۆشتمە ناو ئوردووگاکەیان و گەڕام و باشترینیانم گرت، نازانم کارێکی چاکم کردووە یا خراپ، ئێستا ئامادەیە و پرسیاری لێبکە. وەرگێر وتەکانی سەعد و پیاوی فارسی ئاڵوگۆڕ دەکرد.

فارسی وتی: ئەگەر راستی بڵێم، ئەمانم پێدەبەخشیت؟

وتی: بەڵێ، لای ئێمە راستی لەشەڕ لەدرۆ باشترە.

وتی: پێش ئەوەی سەبارەت بەفارسەکان قسە بکەم سەبارەت بەم پیاوەی ئێوە قسە دەکەم. من لەنۆ ساڵییەوە تا ئەم تەمەنە شەڕی زۆرم بینیوە و لەزۆر جەنگدا بەشداریم کردووە و لەپاڵەوانەکان زۆرم بیستووە و بینیوە، بەڵام نەمبیستوە و نەمبینیوە کەسێک یەک دوو ئوردووگا کەکەس لەپاڵەوانەکان بوێری ئەو کارەی نییە، ببڕێت و بگاتە ئوردووگایەک کەحەفتا هەزار شەڕکەری تیا بێت و هەرکامیان پێنج و دە کەسی لەخزمەتا بێت و بەمەیش بەسەندە نەکات و سامانی تەک سواری سوپاکە

لەگەڵ خۆی بیات و تەنافەکانی خێوەتەکەی ببڕێت و ئاگاداری بکاتەوە وئێمە ئاگادار ببینەوە و شوێنی کەوین. یەکەم کەس کەبەرابەرە لەگەڵ هەزار کەس، بەدەستی ئەو بکوژرێت و دووەم کەسیش بەهەمان شێوەو دواتر من کەلەناو سوپاکەم هاوتام نییە و لەمەرگی دوو ئامۆزاکەی خۆی تووڕەم، تەسلیم ببم.

دواتر لەبارودۆخی فارسەکان ئاگاداری کردنەوە کەسەد وبیست هەزار شەڕکەرن. دوای ئەوە باوەڕی بەئیسلام هێنا و سەعد ناوی موسلیمی پێبەخشی و پەیوەستی توڵەیحە بوو و وتی: سوێند بەخوا تا بەمشێوەیە ئەمەکدار بەراستی و هاوکاری کردنی هەژاران بن، هیچ کات شکست ناخۆن، چیتر پێویستم بەهاودەمی فارسەکان نییە. لەشەڕ دژی فارسەکان بەشداری کرد.

موسا کوڕی تەریف دەڵێت: سەعد بەقەیس کوڕی هوبەیرەی ئەسەدی وت: ئەی بیرمەند، بڕۆ و سەرقاڵی هیچ کارێکی دیکە مەبە تا لەبارودۆخی ئەو سوپایە ئاگادارم دەکەیتەوە. عەمۆ کوڕی مەعدیکەرب و توڵەیحەی لەگەڵ نارد. قەیس ڕۆشت تا گەیشتە بەرابەر پردەکە. دەستەیەك لەفارسەکانی لەوبەر پردەکە بینی کە لەئوردووگاکەوە دەهاتن. ڕۆستەم لەنەجەفەوە بەرێکەوتبوو و زولحاجەب لەشوێنەکەی ئەو جێگیر ببوو. جالینوس لەتیزناباد دابەزیبوو و ئەم دەستەیەی ڕەوانە کردبوو.

دەڵێت: هۆکاری ئەوەی سەعد عەمرۆ و توڵەیحەی لەگەڵ قەیس ڕەوانە کرد، ئەو وتەیە بوو پێشتر لەعەمرۆ بیستبووی و ئەو قسەی پێشتر بەقەیس کوڕی هوبەیرەی وتبوو. پێی وتن: ئەی موسوڵمانان، لەگەڵ دوژمنەکەی خۆتان بجەنگن، شەڕیان لەگەڵ بکەن و بۆ ماوەی کاژێرێك سەرقاڵیان بکەن.

قەیس هێرشی کردنەسەر و شکستیان خوارد و دوانزە کەس لەوان کوژران و سیانیان ئەسیر کرا. تالآنییەکانیان بردە لای سەعد و لەبارودۆخ ئاگاداریان کردەوە.

سەعد وتی: ئینشاالله ئەم هەواڵە خۆشە و هەرکاتێك بەهەموو هێزمانەوە ڕووبەڕوویان ببینەوە، ڕووداوی لەم چەشنە ڕوودەدات.

عەمرۆ و توڵەیحەی بانگ کرد و وتی: قەیستان چۆن بینی.

توڵەیحە وتی: لەئێمە ئازاتر بوو.

عەمرۆ وتی: ئەمیر، پیاوە بوێرەکان باشتر لەئێمە دەناسێت.

سەعد وتی: خواوەند بەئیسلام ئێمەی زیندوو کرد و ژیانی بەدڵە مردووەکانمان بەخشییەوە و دڵە زیندووەکانی پێمراند، ئاگادار بن کاروباری جاهلییەت پێش ئیسلام مەخەن لەکاتێکدا دڵتان بمرێت و خۆتان زیندوو بن. ماف کەسەکان بناسن چوونکە هیچ کەس لەگەڵ ئەو خەڵکانەی خواوەند بەئیسلام ڕێزی لێگرتوون، بەرابەر نین.

سەعید کوڕی مەرزبان دەڵێت: ڕۆژێك دوای ئەوەی ڕۆستەم لەسەلیحین دابەزی، جالینوس و زولحاجەبی ڕەوانە کرد. جالینوس بەرێکەوت و لەبەرابەر پردەکە لەزوهرە جێگیر بوو و لەشوێنی ئالأداری سوپاکەی دابەزی. زولحاجەب لەتیزناباد جێگیر و ڕۆستەم لەخەرارە شوێنەکەی زولحاجەب دابەزی. زولحاجەب پێشڕەوی کرد و کاتێك گەیشتە عەتیق، بەلای چەپدا ڕۆشت و کاتێ لەبەرابەر قەدیس جێگیر بوو، خەندەکی لێدا و جالینوس پەیوەستی بوو.

دەڵێت: زوهرە کوڕی حەویە ئالأداری سوپاکەی سەعد بوو، فەرماندەی باڵی ڕاست و چەپی بە عەبدوڵلە کوڕی موعتیم و شورەحبیل کوڕی حەسەنە سپارد، سەرکردەی تەك سوارەکان عاسم کوڕی عەمرۆ و سەرکردەی تیرهاوێژەکان فلأن و سەرکردەی پیادەکان فلأن و سەرکردەی پێشەنگەکان سواد کوڕی مالیك بوو.

ئالأداری ڕۆستەم جالینوس و فەرماندەی دوو باڵی سوپاکەی هورموزان و مێهران بوون، فەرماندەی سوارەکانی زولحاجەب و پیرزان فەرماندەی پێشەنگەکان و زاد کوڕی مەهیش سەرکردەی پیادەکان بوون. کاتێك ڕۆستەم گەیشتە عەتیق، لەبەرابەر ئوردووگاکەی سەعد دابەزی. بەردەوام خەڵکان لەدەوری کۆدەبوونەوە. لەبەر ئەوەی ژمارەیان زۆر بوو، هەموو شوێنێکیان پڕکردەوە. شەویان لەوێ بەسەر برد بێ ئەوەی لەلایەن موسوڵمانەکانەوە هێرشیان بکرێتەسەر.

دەڵێت: کاتێك ئەو شەوەیان لای عەتیق بەسەر برد، ئەستێرەناسەکەی ڕۆستەم، خەوێکی بینی وبۆ ڕۆستەمی گێڕایەوە: سەتڵێکم لەئاسماندا بینی، سەتڵێك کەئاوەکەی خاڵی ببوویەوە، ماسییەکەم بینی، ماسییەك کەلەئاوی تۆنگێکدا لەرزان بوو، وشترمرەکانم بینی و گوڵەکان کەدەشکۆفانەوە.

ڕۆستەم وتی: هاوار لەتۆ، ئەم خەوت لای کەس باس کردووە؟

وتی: نە.

وتی: کەواتە با نهێنی بێت.

شەعبی دەڵێت: ڕۆستەم ئەستێرەناس ولەوەی لەخەودا دەیبینی و ڕوویدەدا، دەگریا. کاتێك گەیشتە دەرەوەی کوفە، لەخەودا بینی، عومەر کوڕی خەتاب هاتۆتە ناو ئوردووگای فارسەکان و فریشتەیەکی لەگەڵدا بوو، سیلاحەکانی مۆر و تەسلیمی عومەر کوڕی خەتابی کرد.

قەیس کوڕی حازم کە لەقادسیە بەشدار بوو، دەڵێت: ڕۆستەم خاوەنی هەژدە فیل و جالینوس پانزە فیلی لەگەڵدا بوو.

شەعبی دەڵێت: لەڕۆژی قادسیە، ڕۆستەم سی فیلی لەگەڵدا بوو.

سەعید کوڕی مەرزبان دەڵێت: ڕۆستەم لەقادسیە سی و سێ فیلی لەگەڵدا بوو کە فیلە سپییەکەی شاپوور و فیلەدەستەمۆکەی ڕۆستەم لەناویاندا دەبینرا.

کوڕی روفەیل لەباوکی دەگێڕێتەوە: ڕۆستەم سی و سێ فیلی لەگەڵدا بوو، هەژدەیان لەناو دڵی سوپاکەی و پانزەیان لەکەنارەکان دانرابوون.

زیاد دەڵێت: بەرەبەیانی ئەو شەوەی ڕۆستەم لەعەتیق شەوی کردە ڕۆژ، سوار بوو و موسوڵمانەکانی بینی، دواتر ڕووی کردە پردەکە و ژمارەی ئەوانی بەراوەرد کرد و لەولای پردەکە بەرابەریان وەستا. کەسی نارد و پەیامی بۆ ناردن: کەسێك بۆ لای ئێمە بنێرن تا گفتوگۆی لەگەڵ بکەین.

زوهرە پەیامەکەی بۆ سەعد برد. ئەو، موغەیرە کوڕی شوعبەی بۆ لای زوهرە و ئەوی بۆ لای جالینوس نارد. جالینوس ئەوی بۆ لای ڕۆستەم ڕەوانە کرد.

کوڕی روفەیل لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك ڕۆستەم لای عەتیق دابەزی و شەوی لەوێ بەسەر برد، بەرەبەیان دەستی بەلێکۆڵینەوە و بەراوەرد کردن کرد و بەدرێژایی عەتیق بۆ لای خەفان تا کۆتایی ئوردووگای موسوڵمانەکان ڕۆشت و دواتر ڕێگەی سەرەوەی گرتەبەر تا گەیشتە پردەکە و سەیری خەڵکانی کرد و گەیشتە شوێنێك کەبەجوانی دەیتوانی بیانبینێت. کاتێك گەیشتە لای پردەکە، کەسی بۆ لای زوهرە نارد کەهات و لەبەرابەر ئەو جێگیر بووە. ڕۆستەم دەیویست پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ ببەستێت و شتێکیان پێبدات بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە، دەیوت: ئێوە دراوسێی ئێمەن، دەستەیەك لەئێوە لەسنووری فەرمانڕەوایەتی ئێمەدابوون و لەئازار و زیانەکان

دوورمان خستنەوە، بەهەموو شێوەیەك هاوكاریمان كردن و لەشەڕی سارانشینەكان ئەوانمان پاراست، ئاژەڵەكانیان لەلەوەڕگەكانی ئێمە دەڵەوەڕاند و لەسەرزەمینی خۆمان خواردن و توێشوومان پێدەدان، لەسنووری خۆمان ڕێگەی بازرگانیمان لێنەگرتن و بەباشترین شێوە ژیانیان بەسەر دەبرد.

بەمشێوەیە ئامارەی بۆ ئاشتی كرد و باسی هەڵس و كەوت و كردەوەی فارسەكانی دەكرد بەڵام بەراشكاوی مەبەستەكەی نەدەهێنایە سەرزمان.

زوهرە پێی وت: ڕاست دەكەیت، بەوشێوەیە تۆ دەڵێیت. بەڵام بارودۆخی ئێمە هاوشێوەی ئەوان نییە و مەبەستی ئێمە هاوشێوەی مەبەستی ئەوان نییە، ئێمە بۆ بەدەست هێنانی سامانی دنیا نەهاتووین و مەبەست و ئامانجی ئێمە ئەو دنیایە. ئێمە بەو شێوە بووین كەباست كرد و هەر كەس لای ئێمە دەهاتە لای ئێوە، بەپاڕانەوە و لالانەوە داوای مەبەستەكانی خۆی دەكرد. خواوەند پێغەمبەرێكی بۆ ئێمە نارد و بانگەوازی خواپەرەستی لەناو ئێمەدا بلاو كردەوە و ئێمە، وەڵاممان دایەوە. خواوەند بەپێغەمبەرەكەی خۆی وت: من ئەم دەستەیە بەسەر ئەو كەسانەی باوەڕیان بەمن نەهێناوە، زاڵ دەكەم و بەهۆی ئەمانەوە تۆڵەیان لێدەستێنم و تا ئەو كاتەی بەدینەكەی من باوەڕداربن، سەركەوتنیان لەگەڵدایە چوونكە دینەكەی من ڕاستە و هەركەس باوەڕ نەهێنێت، ڕیسوا دەبێت و هەركەس باوەڕ بێنێت، ڕێزدار دەبێت.

ڕۆستەم وتی: دینەكەی ئێوە چییە؟

وتی: كۆڵەكەی دینەكەمان، ئەوەیە شایەتوومان بێنیتە سەرزمان كەخوایەك جگە لەخوای تاقانە بوونی نییە و محەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە.

وتی: پەسەندە، چیتر؟

وتی: ئەوەی بەندەكان لەپەرەستینی بەندەكان بۆ پەرەستینی خواوەند ناچار بكەن؟

وتی: پەسەندە، چیتر؟

وتی: ئەوەی خەڵكان، منالی ئادەم حەوان، و بران لەدایك و باوكەوە.

وتی: پەسەندە.

ڕۆستەم وتی: ئەگەر بەم کارە ڕازی ببم یانی من و خەڵکەکەم بەدینەکەی ئێوە ڕازی ببین، دەگەڕێنەوە؟

وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا دەگەڕێینەوە و هەرگیز لەدیاری ئێوە نزیك نابینەوە مەگەر بۆ بازرگانی یا کارێکی پێویست.

وتی: سوێند بەخوا ڕاست دەکەیت بەڵام فارسەکان لەسەردەمی پاشایەتی ئەردەشێرەوە ڕێگەیان نەداوە کەس لەخەڵکە لاوازەکان سنوری کاروباری خۆیان ببەزێنن وئەگەر ئەو کارە بکەن، لەگەڵ گەورەکانی خۆیان دوژمنی دەکەن.

زوهرە وتی: ئێمە لەهەموو خەڵکان بۆ خەڵکەکەی خۆمان باشترین و ناتوانین بەو شێوە بین کەئێوە دەخوازن، سەبارەت بەخەڵکە لاوازەکان فەرمانەکانی خواوەند ئەنجام دەدەین و هەرکەس سەبارەت بەئێمە نافەرمانی خواوەند بکات، زیان لەئێمە نادات.

دەڵێت: ڕۆستەم ڕۆشت و خەڵکانی فارسی کۆکردەوەو قسەی لەگەڵ کردن بەڵام بەوتەکانی ڕازی نەبوون و یاخیگەرییان کردەپیشە.

ڕۆستەم وتی: خواوەند دووریان بخاتەوە و تێکیان بشکێنێت و ئەو کەسەی ترسەنۆکترە، ڕیسوای بکات.

دەڵێت: کاتێك ڕۆستەم ڕۆشت، ڕۆشتمە لای زوهرە، باوەڕداری من لێرەوە سەرچاوەی گرت و لەگەڵی مامەوە و هاوشێوەی شەڕکەرانی قادسیە لەتالانییەکان بەشم وەرگرت.

زیادیش گێڕانەوەیەکی لەم چەشنەی هەیە و دەڵێت: سەعد، موغەیرە کوڕی شوعبە و بوسرە کوڕی ئەبی ڕۆهم و عەرەفجە کوڕی هەرسیمە و حوزەیفە کوڕی میحسەن و ڕێبعی کوڕی عامر و فەرقە کوڕی زاهیری تیمی وائیلی و مەزعور کوڕی عودەی عیجلی و موزاریب کوڕی یەزیدی عیجلی لەگەڵ مەعد کوڕی موڕەی عیجلی بانگ کرد و وتی: من ئێوە بۆ لای ئەو خەڵکە دەنێرم، بۆچوونی ئێوە چییە؟

وتیان: هەمووان ملکەچی فەرمانەکانی تۆین و پێی ڕازین و ئەگەر پێشهاتێك ڕوویدا، لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین بەشێوەیەك بۆ خەڵکان بەسوود بێت و گفتوگۆ لەگەڵ فارسەکان ئەنجام دەدەین.

سەعد وتی: کاری دوورئەندێشەکان بەمشێوەیە، بڕۆن و هەمووتان ئامادە بن.

ڕێبعی کوڕی عامر وتی: عەجەمەکان بۆچوون و داب و نەریتی تایبەت بەخۆیان هەیە، ئەگەر هەموومان بڕۆینە لایان گومان دەکەن، گرنگی زۆریان پێدەدەین. هەموان لەگەڵی هاوڕا بوون، وتی: من ڕەوانە بکەن. سەعد ئەوی نارد.

ڕێبعی بەرێکەوت تا لەئوردووگاکەی ڕۆستەم بڕواتە لای. ئەوانەی لەسەر پردەکە بوون، ئەویان گرت و کەسیان بۆ لای ڕۆستەم نارد و لەهاتنی ئەو ئاگاداریان کردەوە. ڕۆستەم لەگەڵ گەورەکانی فارس راوێژی کرد و پرسی: بۆچوونی ئێوە چییە؟ گرنگی پێبدەین یا نە؟

هەموان لایەنگری گرنگی پێنەدان بوون. دواتر کەرەستەکانی رازاندنەوەیان هێنا و فەرش و دیباکانیان ڕاخست، هیچ شتێك کەم نەبوو. تەختێکی زێریان بۆ ڕۆستەم دانا و رازاندیانەوە.

ڕێبعی هات. سوار لەسەر ئەسپە لەڕ و لاوازەکەی خۆی بوو. شمشێری بڕەڕ و ئاوداری هەڵگرتبوو کەکالأنەکەی پارچەیەکی کۆنەوە و دڕاو بوو. ڕمەکەی کەمێك شکا بوو، قەڵغانەکەی لەپێستی مانگا و چەرمێکی سوور بوو هاوشێوەی نان. تیر و کەوانی پێبوو. کاتێك لەشا نزیك کەوتەوە، پێیان وت لەئەسپەکەی دابەزێت. ئەو، ئەسپەکەی لەسەر فەرشەکە بردە پێش و دواتر دابەزی. بەم کارەی ئەوانی پەرێشان کرد. ئەویش هەستی بەمەبەستەکەی ئەوان کرد. زرێیەکی لەبەردابوو هاوشێوەی مووی چنراو. عاباکەی بەرگی کۆپانی وشترەکەی بوو کەدڕاندبووی و لەبەری کردبوو. سەری خۆی بەسەربەندێك بەستبوو.

پێیان وت: سیلاحەکانت دانێ.

وتی: بەفەرمانی ئێوە نەهاتووم تا سیلاحەکەم دابنێم، ئێوە منتان بانگ کردووە ئەگەر نەخوازن بەو شێوەی دەمەوێت بێمە لای ئێوە، دەگەڕێمەوە.

ڕۆستەمیان ئاگادار کردەوە، وتی: ڕێگەی بدەن، بێت، مەگەر یەك کەس زیاترە؟

ڕێبعی ڕۆشت و پشتی بەڕمەکەی خۆی دەبەست. هەنگاوی کورتی هەڵدەگرت و فەرش و دیباکانی کون دەکرد. کاتێك لەڕۆستەم نزیك کەوتەوە، پاسەوانەکان پەلاماریاندا و لەسەر زەوی دانیشت و ڕمەکەی لەفەرشەکە چەقاند.

وتیان: بۆ ئەو کارەت کرد؟

وتی: حەز ناکەین لەسەر ئەم شتانە دانیشین.

ڕۆستەم قسەی لەگەڵ کرد و وتی: بۆ هاتوون؟

وتی: خواوەند ئێمەی ناردووە تا هەر کەس لەبەندەکانی کەخوازیاری پەرەستینی ئەوە، بۆ پەرەستین ناچار بکەین و لەرۆژییەکانی دنیا بەئەندازەی پێویست هەڵگرین و ڕێگە لەستەم و بارودۆخ بۆ دادپەروەری ئامادە بکەین، ئێمەی لەگەڵ دینەکەی خۆی بۆ لای خەڵکەکەی خۆی ناردووە تا پێشنیاری ئیسلامیان پێبکەین، هەر کەس رازی ببێت، رازی دەبین و سەرزەمینەکەی بەجێدێڵین و کاروباری سەرزەمین و وڵاتەکەیان بەخۆیان دەسپێرین و هەرکەس رازی نەبێت، بەردەوام شەڕی لەگەڵ دەکەین تا ئەو کاتەی بەڵێنەکانی خواوەند دێتەدی.

وتی: بەڵێنەکانی خواوەند چییە؟

وتی: بەهەشت بۆ ئەو کەسەی لەشەڕ لەگەڵ ناباوەڕان دەکوژرێت و سەرکەوتن بۆ ئەوانەی دەمێننەوە.

ڕۆستەم وتی: وتەکانی ئێوەم بیست، دەتوانن شەڕ دوابخەن تا لێکۆڵینەوە لەپێشنیارەکانتان بکەم و ئێوەیش بەهەمان شێوە.

وتی: بەڵێ، بۆ چەند ڕۆژ؟ یەك ڕۆژ یا دوو ڕۆژ؟

وتی: نا، ماوەیەك تا نامە بۆ سەرکردە و پاشاکانی خۆمان بنوسین.

وتی: پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی داوە و پێشەواکان رایانسپاردووین گوێ لەوتەی دوژمنان نەگرین و کاتی ڕوبەڕوو بوونەوە زیاتر لەسێ ڕۆژ مۆڵەتیان پێنەدەین. ئێمە سێ ڕۆژ چاوەڕوان دەبین تا لێکۆڵینەوە لەکاروباری خۆتان بکەن. لەم ماوەدا یەکێك لەم کارانە هەڵبژێرن: یا ئیسلام و ئێمە خۆتان و سەرزەمینەکەتان بەجێدێڵین، یا جەزیە بدەم و رازی دەبین و ئەگەر پێویستت بەهاوکاری ئێمە نەبێت، دەڕۆین و ئەگەر پێویستت بەهاوکاری ئێمە هەبێت، بەرگری وپشتیوانیت لێ دەکەین و گەرنە لەرۆژی چوارەم شەڕ دەسپێدەکەین. من بەنوێنەرایەتی موسوڵمانان ئەم بەڵێنە دەدەم.

وتی: مەگەر سەرکردەی خەڵکانیت؟

وتی: نە، بەلام موسوڵمانان هاوشێوەی یەك جەستەن و کەسی خوارەوە بەنوێنەرایەتی کەسی سەرەوە، بەڵێن دەدات.

رۆستەم لەگەڵ سەرکردەکانی فارس راوێژی کرد و وتی: بۆچوونی ئێوە چییە، ئایا تا ئێستا وتەیەکی راشکاوتر لەوتەی ئەم پیاوەتان بیستووە؟

وتیان: خوا نەکات، ئارەزوومەندی شتێکی لەم چەشنە ببیت و دینەکەی خۆت بەم سەگە بفرۆشیت، مەگەر جل و بەرگەکانی ئەوت نەبینی؟

وتی: هاوار لەئێوە، سەیری جل و بەرگ مەکەن، گرنگی بەبۆچوون و قسەکانی بدەن، عەرەبەکان گرنگی بەجل و بەرگ و خۆراك نادەن و پارێزگاری لەشەرەف دەکەن، جلەکانیان هاوشێوەی ئێوە نییە و بۆچوونیان بۆ جل و بەرگ هاوشێوەی ئێوە نییە.

فارسەکان لەدەوری رێبعی کۆبوونەوە و دەستیان لەسیلاحەکانی دەدا و سووکایەتیان پێدەکرد.

رێبعی وت: دەتانەوێت بمبینن تا خۆم بەئێوە بناسێنم؟ شمشێرەکەی لەکالآنەکەی دەرهێنا کەهاوشێوەی بڵێسەی ئاگر بوو.

فارسەکان وتیان: شمشێرەکەت بکەرە کالآن. ئەو کارەی کرد. دواتر قەڵغانێکیان هەڵدا و قەڵغانە چەرمییەکەی ئەویشیان هەڵدا. قەڵغانەکەی ئەوان درا و قەڵغانەکەی رێعبی هیچی لێنەهات.

رێبعی وتی: ئەی فارسەکان، ئێوە خواردن و جل و بەرگ و پۆشش بەگرنگ دەزانن و ئێمە گوێی پێنادەین. دواتر گەڕایەوە بۆ لای موسوڵمانان تا لەو ماوەدا فارسەکان لێکۆڵینەوە لەکاروباری خۆیان بکەن.

رۆژی دواتر فارسەکان پەیامیان نارد تا ئەو پیاوە دووبارە بڕواتە لایان، بەلآم سەعد حوزەیفە کوڕی میحسەنی نارد. حوزەیفە بەجل و بەرگێکی هاوشێوەی رێبعی ڕۆشتە لایان و کاتێك گەیشتە لای فەرشەکە، پێیان وت: دابەزە.

وتی: ئەگەر لەسەر داوای خۆم دەهاتم، دادەبەزیم، بەپاشاکەتان بڵێن ئایالەسەر داوای ئەو هاتووم یا داوای خۆم، ئەگەر وتی لەسەر داوای خۆم هاتووم، درۆ دەکات و دەگەڕێمەوە و کارم بەئێوە نییە، بەلآم ئەگەر وتی لەسەر داوای ئەو هاتووم، بەوشێوەی بخوازم هەڵس وکەوت دەکەم.

رۆستەم وتی: رێگەی بدەن با بێت. حوزەیفە تا نزیك ئەو ڕۆشتە پێش. رۆستەم

لەسەر تەختەکەی بوو، پێی وت: دابەزە.

حوزەیفە وتی: دانابەزم.

کاتێك حوزەیفە رازی نەبوو لەئەسپەکەی بێتەخوار، رۆستەم وتی: بۆ هاورێکەی دوێنێکەت نەهات؟

وتی: ئەمیری ئێمە حەز دەکات لەسەختی و سستی دادپەروەری لەناو ئێمەدا بکات، ئێستا سەرەی منە.

وتی: بۆچی هاتوون؟

وتی: خواوەند بەم دینەی خۆی رێزی لێگرتین و ئایات و مۆجیزەکانی خۆی نیشاندااین. خواوەندمان ناسی کەپێشتر حاشامان لێدەکرد. فەرمانی پێداین پێشنیاری یەکێك لەم سێ کارە بەخەڵکان بکەین و بەهەرکامیان رازی بوون، رازی ببین. ئەگەر باوەڕ بەئیسلام بێنن، سەرزەمینی ئێوە بەجێدێڵین، یا جەزیە بدەن و ئەگەر پێویستتان بوو، بەرگری وپشتیوانیتان لێ دەکەین و یا دەجەنگین.

رۆستەم وتی: یا ئاشتی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

وتی: بەڵێ، سێ رۆژ لەئێستاوە.

کاتێك رۆستەم هیچی زیاتری دەستنەکەوت، ئەوی گەراندەوە و بەهاوەڵانی خۆی وت: هاوار لەئێوە، مەگەر ئەوەی من دەیبینم، نایبینن، ئەوەی دوێنێ هات و بەسەر سەرزەمینەکەی ئێمەدا زاڵ بوو و ئەوەی بەگەورەمان دەزانی، ریسوای کرد و ئەسپەکەی خۆی خستە سەر شوێنی رازاندنەوەی ئێمە و بەمشێوەیە ئەوەی لەم زەوییە تایبەتە بەئێمە، لەدەستی ئێمەی دەرهێنا و ئەمڕۆ ئەم کەسە هات و لەسەر زەوی و لەشوێنەکەی ئێمە وەستا.

قسەی زۆری کرد و بووە هۆی تورە بوونی فارسەکان وئەوانیش رۆستەمیان تووڕە کرد.

بۆ رۆژی دواتر رۆستەم داوای کرد کەسێکی دیکە ڕەوانە بکەن و ئەمجارە موغەیرە کوڕی شوعەبیان بۆ لای فارسەکان نارد.

باوکی عوسمانی نەهدی دەڵێت: کاتێك موغەیرە لەپردەکە پەڕییەوە و گەیشتە لای فارسەکان، رێگەیان لێگرت و داوایان لەرۆستەم کرد مۆڵەتی پۆشتنی پێبدات. گۆڕانکارییان بەسەر جل و بەرگەکانی خۆیان نەهێنا بۆ ئەوەی زیاتر گرنگییان

پێنەدەن. کاتێك موغەیرە هات، فارسەکان جل و بەرگی ئاسایی خۆیانیان پۆشیبوو، تاج و جل و بەرگی بەزێرچنراویان لەبەردابوو، بەئەندازەی مەودای تیرێك فەرشیان راخستبوو، دەبوا بەسەر ئەو فەرشەدا بڕۆن تا دەگەیشتنە لای ڕۆستەم.

موغەیرە ڕۆشت و لەسەر تەختەکە لای ڕۆستەم دانیشت، فارسەکان تووڕە بوون و ئەویان لەسەر تەختەکە هێنایە خوار و لێیاندا.

موغەیرە وتی: سەبارەت بەبیرمەندی ئێوە شتی زۆرم بیستبوو، بەڵام کەس لەئێوە نەزانتر نییە، ئێمە عەرەبەکان هەموومان بەرابەرین و کەس لەئێمە کەسێکی دیکە ناکاتە بەندە مەگەر ئەوەی ئەسیری جەنگ بێت. گومانم کرد ئێوەیش لەناو خۆتانا بەرابەرن، بەهەمان شێوەی ئێمە. باشتر بوو پێتان دەوتم کەدەستەیەکەتان خواوەندی دەستەیەکی دیکەن و کارەکەی من ناڕەوایە تا ئەنجامی نەدەم، من خۆم نەهاتووم، لەسەر بانگێشتی ئێوە هاتووم، ئێستا دەزانم باروودۆختان پەرێشان و بەرەو لەناوچوون دەڕۆن چوونکە پاشایەتی بەمشێوەیە بەردەوام نابێت.

لاوازەکانی فارس وتیان: سوێند بەخوا پیاوە عەرەبە راست دەکات.

بەڵام وەرزێرەکان وتیان: سوێند بەخوا وتەیەکی هێنایە سەرزمان کەبەندەکانی ئێمە خوازیاری دەبن، خواوەند پێشینانی ئێمە بکوژێت، چەندە نەزان بوون گرنگییان بەعەرەبەکان نەدەدا.

ڕۆستەم گاڵتەی لەگەڵ موغەیرە کرد تا شوێنەواری کرداری فارسەکان بسڕێتەوە، وتی: ئەی پیاوی عەرەب، هەندێ کات کەسانی دەوروبەری ئێمە کارێك دەکەن پاشا پەسەندی ناکات بەڵام چاوپۆشی لێدەکات لەترسی ئەوەی کاتێك دەبێت کارێك بکەن، نەیکەن، باوردۆخ بەوشێوەیە تۆ دەخوازیت و ئێمە ئەمەکدار و شوێنکەوتەی راستین. ئەم تەشییانە چییە پێتە؟

موغەیرە وتی: بڵێسە چ زیانێکی هەیە ئەگەر درێژ نەبێت. دواتر تیرێکی هاویشت.

ڕۆستەم وتی: بۆ شمشێرەکەت کۆنە؟

وتی: کالانەکەی کۆنە بەڵام زەربەکانی تیژ و کاریگەرە. ئەمەی وت و شمشێرەکەی خۆی دا بەڕۆستەم.

رۆستەم وتی: تۆ قسە دەکەیت یا من؟

موغەیرە وتی: تۆ کەست بەدوای ئێمەدا ناردووە، تۆ قسە بکە.

وەرگێر لەنێوان رۆستەم و موغەیرە وەستا. رۆستەم قسەی کرد و وەسفی خەڵکەکەی خۆی هێنایە سەرزمان و کار و پاشایەتی ئەوانی بەبەردەوام و هەمیشەیی لەقەڵەمدا، وتی: ئێمە وەك جاران بەسەر وڵاتانی دیکەدا و دوژمناندا زاڵین و گەورەی خەڵکانین، کەس لەپاشاکان گەورە و رێز و شکۆی ئێمەی نییە، بەسەر کەسانی دیکەدا سەرکەوتوین و کەسان ناتوانن بەسەر ئێمەدا زاڵ بن، مەگەر یەك رۆژ یا دوو رۆژ یا چەند مانگ وئەمە بەهۆی گوناحەکانی خۆمانەوەیە و کاتێك خواوەند تۆڵەی خۆی بستێنێتەوە، دووبارە رێز و شکۆی خۆمان بەدەست دەهێنینەوە و بارودۆخێك بۆ دوژمنانی خۆمان دروست دەکەین هیچ کات خراپتر لەوەیان نەبینیبێت. بەبڕوای من لەناو هەموو خەڵکان لاوازتر و ریسواتر لەئێوە بوونی نییە چوونکە خەڵکانێکی هەژارن بەبژێوییەکی کەم کەگرنگیتان پێ نادەین. کاتێك وشکەساڵی و قاتوقڕی لەسەرزەمینەکەی ئێوە روویدەدا و خواردنتان دەستنەدەکەوت، داوای هاوکاریتان لەسنورەکانی ئێمە دەکرد و ئێمە، فەرمانماندەدا خورما و جۆ بەئێوە بدەن، دەزانم هاتنی ئێوە لەبەر هەژاری و نەدارییە، فەرمان دەدەم جل و بەرگ بەسەرکردەکەی ئێوە ببەخشن و ئێسترێك و هەزار درەمتان پێدەدەم و بەهەرکام لەئێوە یەکبار خورما و دوو دەست جل و بەرگ تا لەسەرزەمینەکەی ئێمە برۆن چوونکە حەز بەکوشتن یا ئەسیر کردنی ئێوە ناکەم.

موغەیرە کوڕی شوعبە دەستی بەقسە کردن کرد، وەسف و چاکەی خواوەندی هێنایە سەرزمان و وتی:

((خواوەند ئافرێنەری هەموو شتێکە و رۆزی دەری هەموو کەسێك، هەرکارێك مرۆڤ دەیکات، خواوەند ئافرێنەر و بەدیهێنەریەتی، بەڵام ئەوەی سەبارەت بەخۆت و خەڵکی وڵاتەکەت باست کرد کە بەسەر دوژمن و وڵاتاندا زاڵ بون و لەجیهاندا دەسەڵاتتان بڵاو بۆتەوە، ئێمە دەزانین و حاشا لەو راستییە ناکەین چوونکە دەسەڵاتی ئێوە لەهێزی خواوەند سەرچاوەی گرتووە و تایبەت نییە بەخۆتان. ئەوەی سەبارەت بەهەژاری و نەداری و دووبەرەکی و چەند بەرەکی ئێمە باسی دەکەیت، راستە و حاشای لێناکەین چوونکە خواوەند ئێمەی گرفتاری ئەم بەڵا و

زیانـە کـرد، دنیـا بەنۆرەیـە و گرفتـارانی بەدبـەختی و بـەلاّ بـەردەوام چـاوەڕوانی کرانـەوەی دەرگاکـانی بەختـەوەرین و کەسـانی بەختـەوەر بـەرەو بەدبـەختی دەڕۆن. ئەگەر سوپاسی نیعمەتەکانی خواوەندتان کردووە، سوپاس کردنی ئێوە بەئەندازەی نیعمەتـەکان نییـە و کەمتەرخـەمی و بیٚ ئاگـایی بۆتـە هـۆی دروسـت بـوونی گـۆڕان لـەبارودۆخ و دەسـەلاّتی ئێـوە و ئەگـەر ئێمـە گرفتـاری بـەلاّ و بەدبـەختی بـووین، پێشهاتێکی گەورە ڕوویداوە و بۆتە هۆی بەختەوەری ئێمە، ئێستا بارودۆخ جیاوازە لەگومانی ئێوە چوونکە خواوەند پێغەمبەرێکی لەناو ئێمە هەڵبژارد.

دواتـر ئامـاژەی بەوتـەی نێـردراوی یەکەمـدا و وتـی: ئەگـەر پێویـستت بـوو، بەرگریت لیٚ دەکەین، بەندەی ئێمە بە و جەزیە ڕەوانە بکە و ئەگەر ڕازی نەبی، تەنیا شمشێر لەنێوان ئێمە داوەری دەکات.

موغـەیرە ڕۆشـت و ڕۆستەم جارێکی دیکـە لەگـەڵ فارسەکان ڕاوێژی کرد، وتـی: ئەوان لەگەڵ ئێوەدا جیاوازن. دوو کەسی یەکەم هاتن و ئیهانەی ئێوەیان کرد، دواتر کەسێك هات و دوو بەرەکی لەناو ئێوەدا دروست کرد. سوێند بەخوا یەك مەبەستیان بوو و یـەك کاریـان کـرد، ئـەوان ڕاسـتگۆ بن یـا درۆزن، پیـاون. سوێند بـەخوا ئەگـەر دوورئەندێشی و ڕازداری ئەوان بەمشێوەیە یەکدڵ و یەکگرتو بێت، هـیچ کـەس جگـە لـەوان بەمەبەستەکەی ناگـات و ئەگـەر ڕاسـت بکـەن، بـەرگری کـردن لەبەرابـەر ئـەوان سوودی نییە.

بەلاّم فارسەکان پێداگریان کرد.

ڕۆسـتەم وتـی: دەزانم باوەڕتـان بەوتـەکانی مـن هەیـە بـەلاّم ناتانـەوێت ڕازی بـبن. پێداگری ئەوانی زیاد کرد.

کـوڕی ڕوفـەیل لـەباوکی دەگێڕێتـەوە: ڕۆسـتەم پیـاوێکی لەگـەڵ موغـەیرە نـارد و وتی: کاتێك لەپردەکە تێپەڕی و لەسوپاکەی خۆی نزیـك بوویـەوە، هـاوار بکـە و بڵـیٚ پاشـا ئەسـتێرە ناسـە و سـەیری بـورج و شانـسی تـۆی کـردووە و دەڵێـت بـەیانی چاوێکت کوێر دەبێت.

موغەیرە وتی: مژدەی خێر و خۆشیت پێدام، ئەگەر نەمدەویست لەگـەڵ کەسانی وەك ئێوە بجەنگم ئارەزووم دەکرد چاوەکەی دیکەیشم کوێر ببێت. نێردراو بینی

عەرەبەكان لەوتەكانی موغەیرە پێدەكەنن. گەڕایەوە و ڕۆستەمی لەوتەكانی ئاگادار كردەوە.

ڕۆستەم وتی: ئەی فارسەكان شوێنكەوتەی فەرمانەكانی من بن، دەزانم خواوەند بەلآیەكی ڕەوانە كردووە و ناتوانین بەرگری بكەین.

سوارەكانی عەرەب و فارس لەسەر پردەكە ڕووبەڕووی یەكدەبوونەوە و هەموو كات فارسەكان جەنگیان دەستپێدەكرد. موسوڵمانان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ دەستیان لەوان هەڵگرت و كاتێك لەلایەن فارسەكانەوە هێرشیان دەكرایە سەر، ڕووبەڕوویان دەبوونەوە و بەرگرییان دەكرد.

نافیع كوڕی ئەبی عەمرۆ دەڵێت: وەرگێڕەكەی ڕۆستەم ناوی عبود و خەڵكی حیرە بوو.

سەعید كوڕی مەرزبان دەڵێت: ڕۆستەم موغەیرەی بانگ كرد، هات و لەسەر تەختەكەی دانیشت. ڕۆستەم وەرگێڕەكەی خۆی (كەناوی عبود بوو) بانگ كرد و موغەیرە پێی وت: ئەی عبود تۆ پیاوێكی عەرەبیت كاتێك قسە دەكەم، لەوتەكانی من ئاگاداری بكەرەوە بەهەمان شێوە كەمن لەوتەكانی ئەو ئاگادار دەكەیتەوە.

موغەیرە پێشنیاری سێ شتی پێكردن كە ئیسلام بێنن و ئەرك و لێپرسراویەتی هاوشێوەی ئێمەتان لەسەر شان بێت و هیچ جیاوازییەك لەنێوان ئێمەدا نامێنێت یا جەزیە بدەن و ریسوا بن.

وتی: مەبەست لەریسوا بوون چییە؟

وتی: ئەوەی كەسێك لەئێوە لای ئێمە بوەستێت و سوپاسی بكات بۆ ئەوەی جەزیەكەی لێ وەربگرێت تا كۆتایی گفتوگۆكە. وتی: زیاتر حەز بەموسوڵمانی ئێوە دەكەین لەوەی جەزیە بدەن یا بجەنگن.

شەقیق دەڵێت: باڵغ بووم و لەقادسیە بەشداریم كرد. سەعد لەگەڵ دوانزە هەزار شەڕكەر هاتە قادسیە كەشەڕەكەرانی شەڕەكانی پێشوو لەناویاندا دەبینران. پێشەنگەكانی سوپای ڕۆستەم هاتن ودواتر خۆی لەگەڵ سوپایەكی شەست هەزار كەسی هات. كاتێك لەئوردووی عەرەبەكان نزیك كەوتەوە، وتی: ئەی عەرەبەكان كەسێك بۆ لای ئێمە بنێرن تا گفتوگۆی لەگەڵ بكەین.

موغەیرە كوڕی شوعبە و چەند كەسێكی دیكەیان ڕەوانە كرد كاتێك گەیشتنە

لای ڕۆستەم، موغەیرە لەسەر تەختەکەی ڕۆستەم دانیشت و بڕاکەی تووڕە بوو.

موغەیرە وتی: تووڕە مەبە ئەمە پێگە و شەرەف منی زیاد نەکرد و پێگە و شەرەفی براکەی تۆی کەم نەکردوە.

ڕۆستەم وتی: ئەی موغەیرە، ئێوە خەڵکانێکی بەدبەخت بوون... تا ئەو جێگەی وتی: ئەگەر جیاواز لەمە کارێکی دیکەتان هەیە، ئێمەی لێ ئاگادار بکەنەوە.

دەڵێت: ڕۆستەم تیرێکی لەتیردانەکەی موغەیرە دەرهێنا و وتی: گومان دەکەن ئەم تەشییانە دەتوانن هاوکاریتان بکەن.

موغەیرە وەڵامی دایەوە و باسی پێغەمبەری کرد و وتی: لەو شتانەی خواوەند بەهۆی پێغەمبەرەوە بەئێمەی بەخشیوە، دەغڵ و دانێکە لەسەرزەمینی ئێوە دەڕوێت و کاتێک دەرخواردی نانخۆرەکانی خۆماندا وتیان ناتوانین چاو لەمە بپۆشین و هاتووین لەو دانەوێڵەیان بۆ ببەین یا لەم ڕێگەدا بکوژرێین.

ڕۆستەم وتی: بەدڵنیاییەوە گیان دەدەن و دەکوژرێن.

موغەیرە وتی: هەرکەس لەئێمە بکوژرێت، دەڕواتە بەهەشت و هەرکەس لەئێوە بکوژرێت، دەڕواتە جەهەننەم، هەرکەس لەئێمە بمێنێتەوە، بەسەر ئێوەدا سەردەکەوێت. ئێمە بۆ یەکێك لەم سێ پێشنیارە سەرپشکتان دەکەین. تا کۆتایی وتەکە.

ڕۆستەم وتی: لەنێوان ئێمە و ئێوەدا ئاشتی نییە.

زیاد دەڵێت: سەعد بیرمەندەکانی دیکەی پێکەوە بۆ لای ڕۆستەم نارد و ئەو سێ کەسەی هێشتەوە. ئەوان ڕۆشتن تا گەیشتنە لای ڕۆستەم تا زیاتر سەرکۆنەی بکەن و وتیان: ئەمیری ئێمە دەڵێت پێکەوە ژیان هۆکاری بەردەوام بوونی فەرمانڕەواکانە. پێشنیاری کارێکت پێدەکەین بۆ ئێمە و ئێوە باشترە. بەبانگەوازەکەی ئیسلام ڕازی بن و ئێمە دەگەڕێنەوە بۆ سەرزەمینی خۆمان وئێوە بۆ سەرزەمینی خۆتان و دەبینە دۆست و هاوڕێی یەکتر. سەرزەمینی خۆتان لەدەستی خۆتاندا دەبێت و خۆتان فەرمانڕەوایی خەڵکەکەتان دەکەن و ئەوەی لەسەرزەمینەکانی دیکە بەدەستی دێنن، تایبەت دەبێت بەخۆتان، ئەگەر دوژمنێك مەبەستی هێرش کردنە سەر ئێوەی کرد یا بەسەر ئێوەدا زاڵبوو، هاوکاریتان دەکەین. ئەی ڕۆستەم لەخوا بترسە با لەناچوونی

خەڵکەکەت لەسەر دەستی تۆ نەبێت، لەنێوان تۆ و کەڵك وەرگرتن لەئیسلام هیچ لەمپەرێك نییە جگە لەوەی باوەڕ بێنیت و شەیتان لەخۆت دوور بخەیتەوە.

ڕۆستەم وتی: لەگەڵ چەند کەسێك لەئێوە قسەم کرد، ئەگەر ئەوان لەقسەکانی من تێدەگەیشتن هیوادار دەبووم ئێوەیش تێبگەن. ئێستا باسی نمونەی ئێوە دەکەم: بیرتانە خەڵکانێکی هەژار و پرژوبڵاو بوون، نەهێزتان بوو بەرگری لەخۆتان بکەن و نەکەس دادپەروەرانە هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئێوە دەکرد، ئێمە مافی دراوسێیەتیمان جێبەجێ و هاوکاری ئێوەمان دەکرد. بەردەوام دەهاتنە سەرزەمینەکەی ئێمە و خواردنمان پێدەدان و دەگەڕانەوە. بۆ کرێکاری و بازرگانی دەهاتن و چاکەمان لەگەڵ ئێوە دەکرد و کاتێك خواردنی ئێمەتان خوارد و خواردنەوەی ئێمەتان خواردەوە و لەسێبەری دیاری ئێمە وچانتان گرت، تایبەتمەندی دیاری ئێمەتان لای خەڵکەکەی خۆتان باس کرد و لەگەڵ ئەوان گەڕانەوە. نمونەی ئێمە و ئێوە وەك ئەو پیاوەیە کەڕەزێکی بوو. کەمتیارێکی لەناو ڕەزەکەیدا بینی و وتی: ئەم کەمتیارە چ زیانێك لەڕەزەکەی من دەگات، بەلام کەمتیارەکە ڕۆشت و کەمتیارەکانی دیکەی بۆ ناو ڕەزەکە هێنا. خاوەنی ڕەزەکە ئەو کونەی گرت کەلێوەی دەهاتنە ناو و ئەوانی کوشت. دەزانم تەماح و چاوچنۆکی ئێوەی بۆ هاتن ناچار کردووە، ئەمساڵ بگەڕێنە و بەئەندازە پێویست توێشوو هەڵبگرن و هەرکاتێك پێویستتان بوو، بگەڕێنەوە چوونکە ناخوازم ئێوە بکوژم.

کوڕی قەعقاعی زەببی لەیەکێك لەمناڵەکانی یەربوع بەشداری لەقادسیە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕۆستەم وتی: زۆر لەئێوە ئەوەی دەیانویست لەسەرزەمینەکەی ئێمە ڕفاندیان بەلام کوژران یا هەلاتن. ئەو کەسەی ئەم شێوازەی گرتۆتەبەر، بەهێزتر و باشتر لەئێوەیە، ئێوە بینیوتانە هەر کاتێك شتێکیان ڕفاندووە، دەستەیەکیان کوژران و دەستەیەکیان رزگاریان بووە و ئەوەی ڕفاندوویانە لەدەستیان داوە. ئەم کردارەی ئێوە هاوشێوەی ئەو مشکانەیە کەدەفرێکی پڕ دانەوێڵەیان بینیوە و دەفرەکە کونە، مشکی یەکەم دەڕواتە ناو و لەوێ ماوەتەوە، بەلام مشکەکانی دیکە بەشی خۆیان هەڵگرتووە و گەڕاونەتەوە و پێشنیاری گەڕانەوە بەویش دەکەن بەلام رازی نابێت. مشکی ناو دەفرەکە بەتەواوەی قەڵەو و دەخوازێت بگەڕێتەوە بۆ لای کەسەکانی خۆی تا روخساری جوانی خۆی نیشانی

ئەوان بدات بەلاّم کونە تەسکە و ناتوانێت لێی بڕواتەدەر. هاوڕێیانی خۆی لەمە ئاگادار دەکاتەوە و بەدوای ڕێگەی گەڕانەوەدا گەڕاوە بەلاّم پێیان وتووە ناتوانیت بێیتەدەر تا بۆ حاڵەتی یەکەمی خۆت بگەڕێتەوە. ئەو چیتر ناخوات و بەترس و برسیەتی ژیان بەسەر دەبات. بەلاّم خاوەن دەفرەکە دێت و دەیکوژێت. کەواتە ئێوەیش بڕۆن با ئەم بەلاّیەتان بەسەردا نەیێت.

کوڕی روفەیل لەباوکی دەگێڕێتەوە: ڕۆستەم بەنێردراوانی وت: خواوەند بوونەوەرێکی بەتەماحتر و زیانبارتر لەزەردەواڵە نەئافراندووە، ئێوە ئەی عەرەبەکان لەناوچوون دەبینن و تەماح ئێوە پەلکێش دەکات. ئێستا پێتان دەڵێم لەچی دەچن: زەردەواڵە کاتێک هەنگوین دەبینێت، هەڵدەفڕێت و دەڵێت کێ من بەهەنگوین دەگەیێنێت تا دوو درەمی پێبدەم. ئەوسا دەڕواتە ناو هەنگوینەکە و هەرکەس بیەوێت ئەو دوور بکاتەوە، رازی نابێت بەلاّم کاتێک دەکەوێتە ناو هەنگوینەکە و نوقم دەبێت دەڵێت: کێ دەرم دێنێت تا چوار درەمی پێبدەم.

دەڵێت: ڕۆستەم وتی: نمونەی ئێوە هاوشێوەی ئەو کەمتیارە ناتەوان و لەڕەیە کە لەکونێکەوە ڕۆشتە ناو ڕەزێک و هەرچی دەویست دەیخوارد. خاوەنی ڕەزەکە ئەوی بینی و بەزەیی پیایدا هاتەوە. کاتێک ماوەیەکی زۆر لەناو ڕەزەکەدا مایەوە، قەڵەو بوو و بارودۆخی گۆڕا. بەلاّم شۆڕشی کرد و لەناو ڕەزەکە قەرەباڵغی دروست کرد و زیاتر لەوەی دەیخوارد، فیڕۆیی دروست دەکرد. خاوەن ڕەزەکە تووڕە و وتی ناتوانم بەم کارە رازی ببم. دارێکی هەڵگرت و داوای هاوکاری لەکەسەکانی خۆی کرد و شوێن کەمتیارەکە کەوتن. کەمتیارەکە هەلاّت و کاتێک زانی دەستی لێ هەڵناگرن بەرەو کونەکە ڕۆشتە تا لەوێوە بڕواتەدەر بەلاّم گرفتار بوو چونکە ئەو کاتەی لەکونەکە هاتە ناو، لەڕ و لاواز و ئەو کاتەی دەیویست بڕواتەدەر، قەڵەو بوو. خاوەنی ڕەزەکە هات و ئەوەندی لێدا تا گیانیدا. ئێوەش کاتێک هاتن لەڕ و لاواز بوون بەلاّم ئێستا قەڵەو بوون و بزانن چۆن دەڕۆنەدەر؟

هەروەها وتی: پیاوێک سەوەتەیەکی دانا و خواردنەکەی خۆی خستەناوی. مشک هات و سەوەتەکەی کون کرد و ڕۆشتە ناوی. پیاوەکە مەبەستی ئەوەی کرد کونەکە بگرێت بەلاّم وتیان ئەو کارە مەکە، لای کونەکە تونێلێک دروست بکە و قامیشێک

دابنێ و کاتێک مشکەکە دێت لەقامیشەکەوە دێت و دەڕوات. کاتێک مشکەکە دەرکەوت، قامیشەکەی راکێشا. من رێگەکەم بەستووە نەکا بڕۆنە ناو قامیشەکە چوونکە دەکوژرێن. ئێوە نەژمارەتان فراوانە و نە کەرەستەی پێویستتان لەبەردەستایە، بۆ هاتوون؟

زیاد دەڵێت: خەڵکان قسەیان کرد و وتیان: ئەوەی سەبارەت بەرابردووی ئێمە باست دەکرد، نەگەشتیتە ئەنجام چوونکە هەرکەس لەئێمە دەمرد، دەڕۆشتە جەهەننەم و هەرکەس دەمایەوە، گرفتاری سەختی بوو. کاتێک لەم بارودۆخەدا بووین، خواوەند پێغەمبەرێکی لەنێوان مرۆڤ و جنۆکەکان هەڵبژارد. ئەم پێغەمبەرە رەحمەتێك بوو و خواوەند بەهۆی ئەو پێغەمبەرەوە بەزەیی و رەحمەتی خۆی بەسەر خەڵکاندا دەبەخشییەوە و بەهۆیەوە تۆڵەی لەدوژمنەکانی دەستاند. یەك یەك پێشنیاری ئیسلامی بەهۆزەکان کرد و خەڵکەکەی خۆی زیاتر لەهەمووان دژایەتی و بۆ کوشتنی ئەو هەوڵیاندا و حاشایان لەدینەکەی کرد. هۆزەکانی دیکەیش وەك ئەوان بوون. هەمووان دژی ئەو وەستاینەوە. ئەو تەنیا و جگە لە خواوەند کەسی لەگەڵدا نەبوو. بەسەر ئێمەدا سەرکەوت و دەستەیەك لەئێمە بەدڵخواز و دەستەیەك نابەدڵ باوەڕمان بەدینەکەی هێنا و هەمووان هەستمان بەراستییەکان کرد چوونکە نیشان و مۆجیزەکانی نیشانی ئێمەدا. یەکێك لەو فەرمانانەی لەلایەن پەروەدگارەوە بۆ ئێمە هێنای، شەڕ لەگەڵ نەتەوەکانی دراوسێ بوو. ئەو کارەمان لەناو خۆماندا ئەنجامدا لەبەر ئەوەی دڵنیابووین لەوەی بەڵێنی داوە و بەڵێنەکانی خواوەند هەڵەی تیا نییە. عەرەبەکان بۆ ئەم کارە یەکیانگرت و ئەگەر دووبەرەکی لەناو ئەواندا بوونی دەبوو، کەس نەیدەتوانی یەکگرتووی لەناو ئەواندا دروست بکات. ئێمە بەفەرمانی پەروردگار رووماان لەدیاری ئێوەکردووە و لەرێگەی ئەودا شەڕ دەکەین و فەرمانەکانی ئەو ئەنجام دەدەین و بەڵێنەکانی ئەو دەهێنینەدی. پێشنیاری باوەڕهێنانتان پێدەکەین ئەگەر رازی بوون بەجێتان دەهێڵین و دەگەڕێینەوە و کتێبی خواوەند لەناو ئێوەدا بەجێ دەهێڵین و ئەگەر رازی نەبوون ئەرکی سەرشانی ئێمەیە شەڕتان لەگەڵ بکەین مەگەر ئەوەی جەزیە بدەن چوونکە ئەگەر نەیدەن خواوەند ژن و منداڵ و سامانەکانی ئێوە تەسلیم بەئێمە دەکات. کەواتە گوێ لەمۆجیارییەکانی ئێمە بگرن چوونکە سوێند بەخوا باوەڕهێنانی ئێوە لەدەست کەوتنی تالآنی بۆ ئێمە

خۆشتر و پەسندترە و ئەگەر پێچەوانەی ئەمە رووبدات شەڕ کردن لەگەڵ ئێوە لەئاشتی شیرینترە. بەڵام ئەوەی سەبارەت بەکەمی ژمارەی ئێمە و نەبوونی کەرەستەی پێویستت ئاماژەت پێدا، دەڵێین کەرەستەی ئێمە ئەنجامدانی فەرمانەکانی پەروەدگار و جەنگی ئێمە سەرکەوتنی ئێمەیە. ئەو نمونانەی باست کرد، بۆ پیاوان و کاری گەورە و قەشمەرەکان نمونەتان هێنایەوە، بەڵام ئێمە نموونەی ئێوە باس دەکەین کەهاوشێوەی پیاوێکە زەوی کێڵاوە و دار و دانەوێڵەی چاندووە و جۆگەکانی ڕەوانە کردووە و کۆشکەکانی رازاندۆتەوە و ورزێرەکانی لەوێ جێگیر کردووە تا لەکۆشکەکەیدا بژین و چاودێری باخەکانی بکەن بەڵام وەرزێرەکان بەشێوەیەکی نەشیاو هەڵس و کەوت دەکەن. ماوەیەکی درێژ مۆڵەتیان پێدەدات و کاتێك شەرم دایانناگرێت، سەرکۆنەیان دەکات. دواتر کەسانێکی دیکە بانگ دەکات و ئەوان دەردەکات کەئەگەر بڕۆن خەڵکان ئەوان دەڕفێنن وئەگەر بمێننەوە دەبنە ژێر دەستەی ئەوان وبەردەوام گرفتاری ڕەنج و مەینەتی دەبن. سوێند بەخوا ئەگەر ئەوەی بەتۆی دەڵێم راستی نەدەبوو، نەماندەتوانی چاو لەخۆشییەکانی ژیانی ئێوە بپۆشین و هێرشمان دەکردە سەرتان بۆ ئەوەی بەدەستی بێنین.

رۆستەم وتی: ئێوە بۆ لای ئێمە دەپەڕنەوە یا ئێمە بپەڕینەوە.

وتیان: ئێوە بپەڕنەوە.

دەمەو ئێواریێ نێردراوان لای رۆستەم گەڕانەوە و سەعد پەیامی بۆ شەڕکەران نارد تا لەشوێنەکانی خۆیاندا بن. کەسی بۆ لای فارسەکان نارد و رایگەیاند دەتوانن بپەڕنەوە. ویستیان لەپردەکە بپەڕنەوە بەڵام سەعد پەیامیدا: ئەم کارە ناکرێت، ئەوەی لەئێوەمان گرتووە، نایگەڕێنینەوە، جگە لەپردەکان رێگەیەك بۆ پەڕینەوەی خۆتان بدۆزنەوە. فارسەکان تا بەرەبەیان بەکەرەستەکانی خۆیان لەسەر عەتیق بەند و پردیان هەڵدەبەست.

## شەڕی ئەرماس

حەکەم دەڵێت: کاتێ ڕۆستەم ویستی بپەڕێتەوە فەرمانیدا لەبەرابەر قەدیس لەسەر عەتیق پردێک هەڵبەستن. لەو کاتەدا قەدیس لەخوارەوەی شوێنەکەی ئێستای و نزیک عەین شەمس بوو. شەوانە تا بەیانی لەسەر عەتیق بەخۆڵ و قامیش پرد و بەندیان هەڵدەبەست و ڕێگەیەکی پەڕینەوەیان ئامادە کرد کە بۆ ڕۆژی دواتر بەتەواوی کۆتایی پێهات.

زیاد دەڵێت: ڕۆستەم ئەو شەوە لەخەودا بینی فریشتەیەک لەئاسمانەوە هات و کەوانی فارسەکانی هەڵگرت و هەڵفڕی و گەڕایەوە بۆ ئاسمان. خەمبار و خەمۆک لەخەو هەستا و کەسانی نزیکی خۆی بانگ کرد و خەوەکەی بۆ گێڕانەوە، وتی: خواوەند مۆجیاریمان دەکات و ئەگەر فارسەکان ڕێگەم لێنەگرن، گوێ لەمۆجیارییەکانی دەگرم. مەگەر نابینی سەرکەوتنیان لەئێمە سەندۆتەوە و بە لەبەرژەوەندی دوژمن هەڵیکردووە و ئێمە بەکار و کردەوە ناتوانین بەسەر ئەواندا زاڵ ببین.

فارسەکان لەگەڵ بارەکانی خۆیان پەڕینەوە و لای عەتیق دابەزین.

ئەعمەش دەڵێت: لەڕۆژی هەڵبەستنی پردەکە، ڕۆستەم دوو زرێی پۆشی و زرێیەکی لەسەر کرد. سیلاحەکانی هەڵگرت و فەرمانیدا ئەسپەکەی بۆ زین بکەن. سوار ئەسپەکەی بوو بێ ئەوەی دەست لەئەسپەکەی بدات. وتی: بەیانی شکستیان پێدەهێنین.

کەسێک وتی: ئەگەر خوا بخوازێت.

ڕۆستەم وتی: تەنانەت ئەگەر نەخوازێت.

زیاد دەڵێت: ڕۆستەم وتی: کاتێک شێر بمرێت، کەمتیار دەنگی بەرز دەکاتەوە. ئاماژەی بەمەرگی خوسرەو دەکرد. دواتر بەهاوەڵانی خۆی وت: دەترسم ئەمساڵ ساڵی مەیمونەکان بێت. کاتێک فارسەکان پەڕینەوە و ڕیزیان بەست، ڕۆستەم لەسەر تەختەکەی دانیشت و سایەوانێکیان بۆ دروست کرد. دڵی سوپاکەی بەهەژدە فیل

رازاندەوە کەسنوق و شەرکەرەکان لەوێ دەبینران. لەهەر دوو باڵی سوپاکە حەوت و هەشت فیلی دانا. جالینوس لەنێوان رۆستەم و باڵی راست جێگیر و پردەکە لەنێوان موسوڵمانان و فارسەکاندا بوو.

کاتێك یەزدگێرد رۆستەمی رەوانە کرد، پیاوێکی لەبەردەرگای ئەیوان دانا و پێی وت لەوێ بمێنێتەوە و لەهەواڵەکان ئاگاداری بکاتەوە و بەیەکێکی دیکەی وت لەماڵەکەوە هەواڵ ببیستێت و کەسێکی دیکە لەدەرەوەی ماڵەکە و بەمشێوەیە لەهەر شوێنێك کەسێکی دانا.

کاتێك رۆستەم دابەزی، ئەوەی لەساباب بوو، وتی: دابەزی. کەسێکی دیکە وتەکەی دووبارە کردەوە تا ئەوەی ئەو کەسەی لەبەردەرگای ئەیواندا بوو، هەواڵەکەی بەیەزدگێرد گەیاند. کاتێك رۆستەم لەشوێنێك دەوەستا یا بەرێدەکەوت یا پێشهاتێك روویدەدا، ئەو دەیوت و ئەوەی دوای خۆی دووبارەی دەکردەوە تا دەگەیشتە کەسی بەردەم ئەیوان.

بەمشێوەیە لەنێوان عەتیق و مەداین چەندین پیاوی دانا و لەنامەبەر یا هەواڵبەر چاوی پۆشی.

موسوڵمانان ریزیان بەست و زوهرە و عاسم لەنێوان شورەحبیل و عەبدوللە جێگیر بوون. ئاڵاداری بۆ شوێنکەوتنی هەڵاتووان راسپارد و شەرکەرانی دوو باڵی سوپا و دڵی سوپای تێکەڵ کرد. جارچییەکەی جاریدا: تەماح رەوا نییە مەگەر لەجیهاد لەرێگەی خوا. ئەی خەڵکینە بۆ جیهاد تەماحکار بن.

سەعد ئەو رۆژە توانای سوار بوون و دانیشتنی نەبوو. چەند دومەڵێکی چرکین لەجەستەی سەریان بەرز کردبوویەوە و پارچەیەکەی لەژێر سکی دانابوو. لەکۆشکەکەیەوە چاودێری شەرکەرانی دەکرد و فەرمانەکانی بۆ خالید کوڕی عەرفەتە دەنارد. ریزی موسوڵمانان لای کۆشکەکە و خالید سەبارەت بەو شتانەی سەعد نەیدەدی، وەك جێگری سەعد بوو.

کوڕی نەمران دەڵێت: کاتێك رۆستەم پەڕییەوە، شوێنی زوهرە و جالینوس گۆڕانی بەسەرداهات. سەعد زوهرەی لەجیاتی کوڕی سەمت دانا و رۆستەم جالینوسی خستە شوێنەکەی هورموزان. سەعد نەخۆشی عرق النسای بوو لەگەڵ

چەند دومەڵێکی چڵکن و خالید کوڕی عەرەفتەی کردە جێگری خۆی بەڵام خەڵکان گوێیان لەفەرمانەکانی ئەو نەدەگرت. سەعد وتی: بمبەنە شوێنێك بتوانم خەڵکان ببینم. ئەویان بردە سەرەوە و بەهەمان شێوە، خەڵکانی بینی چوونکە ڕیزەکە لای دیواری قەدیس بوو. فەرمانەکانی بەخالیددەدا و خالید فەرمانی بەخەڵکان دەکرد.

لەو کەسانەی دژی خالید ڕاپەڕین، کەسانێك لەناو سەرکردەکان دەبینران کەسەعد ئێهانەی کردن و زیادی کرد: سوێند بەخوا ئەگەر دوژمن لێرە نەدەبوو، ئێوەم دەکردە وانەیەك بۆ خەڵکان. ئەوانی هێشتەوە و لەکۆشکەکەیدا زیندانی کردن. باوکی میحجەنی سەقەفی یەکێك بوو لەوان.

جەریر دەڵێت: من بەیعەتم لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەست تا گوێڕایەڵی فەرمانی کەسێك بم کەخوا کاروبارەکان بەو دەسپێرێت تەنانەت ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی بێت.

سەعد وتی: سوێند بەخوا چیتر ئەگەر کەسێك کارێك بکات موسوڵمانان نەتوانن بەباشی بەرگری بکەن، زیندانی دەکرێت و هەڵسوکەوتێکی لەگەڵ دەکەم، داهاتووان لاسایی بکەنەوە.

زیاد دەڵێت: ئەو ڕۆژە سەعد دوای ئەوەی نەیارەکانی خالیدی لەناوبرد، بۆ کەسانی نزیکی خۆی قسەی کرد و ئەمە لەڕۆژی دووشەممەی موحەرەمی ساڵی چواردەیەمی کۆچ ڕوویدا. سەرەتا سوپاسی خوای کرد و وتی: خواوەند حەقە و لەپاشایەتییەکەی خۆی شەریکی نییە و بەڵێنەکانی بێ گومان دێتەدی. خواوەند دەفەرمێت:

((ولقد كتبنا فى الزبور من بعد الذكران الارض يرثها عبادى الصالحين.

واتاکەی: بەدوای ئەو کتێبەدا لەزەبووردا نوسیمان کەبەندە شیاوەکانی من زەوی بەمیرات دەبەن.))

ئەمە میراتی ئێوەیە و بەڵێنی پەروەردگارە کەسێ ساڵ پێش بەئێوەی داوە و تا ئێستا لێی دەخۆن و لێی هەڵدەگرن و خەڵکان دەکوژن و باجیان لێ دەستێنن و ئەسیریان دەکەن و ئەمە بەهۆی هەوڵ و ڕەنجی شەرکەرانی ئێوەیە. ئێستا سوپای فارسەکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئێوە هاتوون و ئێوە گەورە و سەرکردەکانی عەرەبن و بیرمەندانی هەر هۆزێك و هێزی ئەوان کەئەگەر پشت بکەنە دنیا و

ئارەزوومەندی ئەو جیهانە بن، خواوەند ئەم دنیا و ئەو دنیاتان پێدەبەخشێت و ئەمە کەس لەئەجەلەکەی نزیك ناکاتەوە و ئەگەر سستی لەخۆتان نیشان بدەن، هێزتان لەدەستدەڕوات و ئەودنیاتان لەدەست دەچێت.

عاسم کوڕی عومەر لەناو سوارەکان قسەی کرد و وتی: ئەمە سەرزەمینێکە خواوەند خەڵکەکەی بۆ ئێوە حەلاڵ کردووە و سێ ساڵە لەبەهرەکانی کەڵك وەردەگرن و ئەوان هیچیان لەئێوە دەست ناکەوێت چوونکە لەپێشترن و خواوەند لەگەڵ ئێوەیە و ئەگەر خۆڕاگری بکەن و بەشێوەی پێویست شمشێر بوەشێنن، سامان و ژن و منداڵ و سەرزەمینی ئەوان تایبەتە بەئێوە و ئەگەر سستی و لاوازی لەخۆتان نیشان بدەن، ئەم خەڵکە یەك کەس لەئێوە بەزیندووی ناهێڵنەوە چوونکە دەترسن ببنە هۆکاری لەناو چوونی ئەوان. ئەی خوایە، ئەی خوایە، شەڕەکانی پێشوو و نیعمەتەکانی خواوەند بیر بێننەوە مەگەر نابینن سەرزەمینی ئێوە بیابانێکی بێ بەرهەمە، نەدارستانی هەیە و نەکێو کەبتوانین پەنای بۆ ببەین، تەنیا مەبەستتان ئەو دنیا بێت.

سەعد نامەی بۆ دەستەکانی سوپا نووسی: من خالید کوڕی عەرەفتەم وەك جێگری خۆم دەستنیشان کردووە و هۆکارەکەی ئازارێکە رێگەی جووڵەم لێ دەگرێت و ئەو دومەڵانەی لەجەستەم هاتووە، بەڵام دێمە لای ئێوە، ملکەچی فەرمانەکانی خالید بن چوونکە ئەوەی دەیڵێت فەرمانی منە و پشت بەبۆچوونەکانی من دەبەستێت. ئەم فەرمانەیان بۆ خەڵکان خوێندەوە و ملکەچ و گوێرایەڵی فەرمانەکانی بوون. هەمووان بەفەرمانەکانی سەعد رازی بوون.

مەسعود دەڵێت: سەرکردەی هەر دەستەیەك لەگەڵ شەڕکەرانی خۆی قسەی کرد و کەسیان نارد و بۆ سەقامگیر و گوێرایەڵی فەرمانەکان یەکتریان هان دەدا. هەرکام لەسەرکردەکان لەگەڵ شەڕکەرانی خۆیان کۆبوونەوە. جارچی سەعد جاری کۆبوونەوە بۆ نوێژی نیمەڕۆی دا. رۆستەم هاواری کرد پاشاکەی عومەر جەرگی منی خوارد خوا جەرگی بسووتێنێت چوونکە شتی فێری عەرەبەکان کرد.

کوڕی روفەیل دەڵێت: کاتێك رۆستەم لەنەجەف دابەزی، سیخوڕێکی بۆ ئوردووگای موسوڵمانان نارد کەهاوشێوەی یەکێك لەعەرەبەکان پەیوەستی ئەوان

بوو و بینی لەکاتی نوێژ سیواك دەکەن و نوێژ دەخوێنن و دەگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان. گەڕایەوە و ڕۆستەمی لەکار و کردەوەکانی ئەوان ئاگادار کردەوە. ڕۆستەم پرسی: خواردنیان چییە؟

وتی: ئەو شەوەی من لەناویاندا بووم نەمبینی کەس هیچ بخوات، هەندێ داریان بەدەستەوەیە و شەوانە لەکاتی خەوتن دەیمژن.

دەڵێت: کاتێك ڕۆستەم لەنێوان قەلا و عەتیق دابەزی ئەو کاتە بوو بانگی نوێژیان بەرز کردەوە و بینی عەرەبەکان کەوتنە جموجۆڵ. فەرمانی بەفارسەکاندا سوار بن. پێیان وت: بۆچی؟

وتی: مەگەر نابینین دوژمن کەوتۆتە جموجۆڵ وبۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئێوە خۆیان ئامادە دەکەن؟

سیخوڕەکەی وتی: ئەو کارەیان بۆ نوێژە.

ڕۆستەم وتی: بەرەبەیان دەنگێك دەهات، ئەوە دەنگی عومەر کوڕی خەتاب بوو لەگەڵ خەڵکان قسەی دەکرد و بابەتە عەقڵییەکانی فێر دەکردن.

کاتێك لەپردەکە پەڕینەوە و ڕووبەڕووی یەك ڕیزیان بەست و جارچی سەعد بانگی دا، ڕۆستەم وتی: عومەر جەرگی خواردم.

زیاد دەڵێت: سەعد کەسانی بیرمەند و بوێری بۆ ناو سوپاکەی نارد. یەکێك لەو کەسانە موغەیرە بوو و حوزەیفە و عاسم و هاوەڵانیان لەبوێرەکان، تولەیحە وقەیسی ئەسەدی و غالب و عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب و کەسانی دیکە و لەشاعیرەکان شەماخ و حەتیئە و ئەوس کوڕی مەغرا و عەبدە کوڕی تەییب و کەسانی دیکە. پێش ئەوەی ڕەوانەیان بکات، وتی: بڕۆن و لەگەڵ خەڵکان سەبارەت بەوەی لەکاتی شەڕ شیاوی ئێوە و ئەوانە، قسە بکەن چوونکە ئێوە لەناو عەرەبەکان پێگەیەیەکی بەرزتان هەیە و شاعیر و بوێر و بیرمەندانی خەڵکن، بڕۆن و ئاگاداریان بکەنەوە و بۆ شەڕ هانیان بدەن.

ئەو دەستەیە ڕۆشتن. قەیس کوڕی هوبەیرەی ئەسەدی وتی: ئەی خەڵکینە، بۆ ئەو ڕزگارییەی خواوەند پێی بەخشیوەن و ئەوەی پێشهاتووە، سوپاسی خوا بکەن تا ڕۆژیتان فراوان بکات. نیعمەتەکانی خواتان لەبیر بێت و بەبەخشینەکانی هیوادار بن چوونکە یا تالانی یا بەهەشتتان پێدەبڕێت. پشت سەری ئێوە کەئەم کۆشکە

زێرینــەتان لەبەردەمدایــە، بیابــانێکی بــێ بەرهــەم و بــەردەلآنێکی ڕەق و ســارایەکی دژوارە.

غالیب وتی: ئەی خەڵکینە، بۆ بەخشینەکانی خواوەند سوپاسی بکەن و داوای لێبکەن رۆژیتان فراوان بکات و بیپارێنەوە تا دۆعاکانتان گیرا بکات.

ئەی خـەڵکانی مەعد، لەچی دەترسـن لەکاتێکدا ئێستا لـەناو قـەلآکانی خۆتـانن، یانی ئەسپ و کەسی نافەرمان و سەرپێچیکەرتان لەگەڵدا نییە، یانی شمشێر، وتەی خـەڵکانتان لـەبیر بێـت چوونکە بـەیانی سـەرەتا باسـی ئێـوە دەکـەن دواتـر خـەڵکانی دیکە.

کوڕی هوزەیلی ئەسەدی وتی: ئەی خەڵکانی مەعد، شمشێرەکانی خۆتان بکەنە دیـواری خۆتـان و لەبەرابـەر فارسـەکان هاوشـێوەی شـێری دارسـتان بن و وەك پـیرە توڕەکەکان بجوڵێنەوە، تـەپ و تۆز بکەنە پەناگـەی خۆتـان و پـشت بـەخوا ببەستن و چـاوتان دابخــەن و کاتێـك شمـشێرەکانتان کـول بـوو، فارسـەکان بـەردباران بکـەن. چوونکە بەرد توانای ئەنجامدانی کارێکی هەیە کەئاسن ناتوانێت.

بوسر کوڕی ئـەبی رۆهمـی جوهـەنی وتـی: سوپاسـی خواوەند بکەن و وتـەکانی خۆتان بەکردەوە پشت ڕاست بکەنەوە. خواوەند تـەنیا لەبەر ئەوە رێگـەی رزگـاری نیشاندان چوونکە سوپاستان کرد و ئەوتان بەتاقانە زانی کەخوایەك جگە لەو بوونی نییە و باوەڕتان بەپێغەمبەرەکەی هێنا. وەك موسوڵمان بمرن و گرنگی بـەدنیا مـەدەن چوونکە هـەر کـەس پـشت بکاتـە دنیـا، روو دەکاتـە خواوەند. خوازیـاری ئـەم دنیایـە مەبن چوونکە لەئێوە خۆی دوور دەخاتەوە، هاوکاری خواوەند بکـەن تـا هاوکاریتـان بکات.

عاسـم کـوڕی عــەمرۆ وتــی: ئــەی عەرەبــەکان ئێــوە ســەرکردەی عەرەبــەکانن و ڕووبـەرووی سـەرکردەی عەجەمـەکان بوونەتـەوە. ئێـوە خوازیـاری بەهەشـت و ئـەوان خوازیاری دنیان. ئاگادار بن ئەوان بەدنیای خۆیان زیاتر لە بەهەشتی ئێوە تامەزرۆ نەبن. کارێك مەکەن بەیانی ببنە هۆکاری نەنگی عەرەبەکان.

ڕەبیـع کـوڕی بـیلاد وتـی: بـۆ دیـن و دنیـا بجـەنگن و روو بکەنـە بەخـشینەکانی پـەروەردگار و ئـەو بەهەشـتەی بـەپانتایی ئاسمـان و زەوییەکانـە و بـۆ خواپەرەستان

ئامادەیان کردووە. ئەگەر شەیتان کاروباری لەئێوە دژوار کرد بیرتان بێت تا ئەو کاتەی شوێنکەوتەی هەواڵە ئاسمانییەکانن، لەوەرزەکاندا لەهەواڵەکان ئاگادارتان دەکەنەوە.

ڕێبعی کوڕی عامر وتی: خواوەند ڕێگەی ئیسلامی نیشاندان و لەسێبەری ئیسلام ڕۆژی وبەرەکەتی پێبەخشین. خۆڕاگری هۆکاری ئاسایشە. خۆڕاگربن و لەدڵەراوکێ خۆتان بەدوور بگرن.

هەرکام لەوان قسەی لەم چەشنەی هێنایە سەرزمان و خەڵکان بەڵێن و پەیمانیاندا بەو پەڕی هێزیانەوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە ئامادە بن. فارسەکانیش خۆیان ئامادە کرد و پەیمانیان بەست و بەزنجیر خۆیان بەستەوە. ئەوانەی خۆیان بەزنجیر بەستەوە، سی هەزار کەس بوون.

شەعبی دەڵێت: فارسەکان سەد و بیست هەزار شەڕکەر بوون. سی فیل و هەر فیلێك چوار هەزار کەسی لەگەڵدا بوو.

مەسعود کوڕی خەراش دەڵێت: ڕیزی ئاباوەڕان لەکەنار عەتیق و ڕیزی موسوڵمانان لەنزیك دیوارەکانی قەدیس و خەندەك لەپشت سەریانەوە بوو. موسوڵمانان و فارسەکان لەنێوان خەندەك و عەتیقدا بوون. سی هەزار کەس بەزنجیر خۆیان بەستبوویەوە و سی فیلی شەڕکەریان پێبوو لەگەڵ فیلێك کەپاشاکان سواری دەبوون و بۆ شەڕ کەڵکیان لێوەرنەدەگرت. سەعد فەرمانیدا سووری جیهاد بۆ خەڵکان بخوێننەوە.

زیاد دەڵێت: سەعد وتی: لەشوێنی خۆتان بمێننەوە و هیچ کارێك مەکەن تا ئەو کاتەی نوێژی نیمەڕۆ دەخوێنن. من تەکبیر دەڵێم و ئێوەیش تەکبیر بڵێن، بزانن تەکبیریان پێش ئێوە بەکەسێك نەبەخشیوە و بەئێوەیان بەخشیوە تا هۆکاری بەهێز بوونی ئێوە بێت. کاتێك تەکبیری دووەمتان بیست، تەکبیر بڵێن و سوارەکانتان خەڵك بۆ هێرش بردن هان بدەن و دوای تەکبیری چوارەم، هەمووتان هێرش بەرن و ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە و بڵێن لا حول و لا قوە الا باللە.

باوکی ئیسحاق دەڵێت: لەڕۆژی قادسیە سەعد پەیامی بۆ شەڕکەران نارد کاتێك دەنگی تەکبیرتان بیست، بەندێ پێپۆشەکانی خۆتان توند ببەستن و بەتەکبیری دووەم خۆتان ئامادە بکەن و لەگەڵ تەکبیری سێیەم ددان لەیەك گیر بکەن و هێرش

بەرن.

زیاد دەڵێت: کاتێك سەعد نوێژی نیمەڕۆی خوێند بەگەنجێك کەعومەر کوڕی خەتاب کردبوویەوە هاوڕێی و یەکێك بوو لەقورئان خوێنەکان، فەرمانیدا سوری جیهاد بخوێنێتەوە. ئەو سوری جیهادی بۆ دەستەیەکی نزیك لەشەڕکەران خوێندەوە و لەناو هەموو دەستەکاندا خوێندرایەوە. دڵەکان بەهێز و چاوەکان ڕووناك بوویەوە و شەڕکەران بەخوێندنی سوورەکە دڵنیا بوون.

دەڵێت: کاتێك قورئان خوێنەکان تەواو بوون، سەعد تەکبیری وت و ئەوانەی لەتەنیشت ئەودا بوون تەکبیریان وت و شەڕکەران یەك لەدوای یەك تەکبیریان وت و کەوتنە جموجۆڵ. جارێکیتر تەکبیری وت و خەڵکان خۆیان ئامادە کرد. تەکبیری سێیەمی هێنایە سەرزمان و سەرکردە و بوێرانی سوپاکە هێرشیان برد و شەڕیان دەستپێکرد. بوێر و پاڵەوانەکانی فارس ڕووبەڕوویان بوونەوە.

غالیب کوڕی عەبدوڵلەی ئەسەدی لەکاتێکدا هۆنراوەی دەخوێندەوە، هاتە ناو گۆڕەپانی شەڕ و هورموز ڕووبەڕووی بوویەوە. هورموز یەکێك بوو لەپاشاکان و تاجی لەسەردا بوو. غالب ئەوی ئەسیر کرد و بردییە لای سەعد و لەوێ ڕایانگرت. غالیب گەڕایەوە بۆ گۆڕەپانی جەنگ. عاسم کوڕی عەمرۆیش بەدەم شێعر خوێندنەوە ڕووی لەگۆڕەپانی جەنگ کرد و شوێن یەکێك لەفارسەکان کەوت کەهەڵات. عاسم شوێنی کەوت و کاتێ گەیشتە ریزەکانی دوژمن، سوارێکی بینی کەئێسترێکی پێبوو. ئێسترەکەی بەرەڵا کرد و پەنای بۆ هاوەڵانی خۆی برد. فارسەکان پشتیوانیان لێکرد وعاسم ئێستر و بارەکەی پێش خۆیدا و کاتێك گەیشتە ناو سوپای موسوڵمانان بۆیان دەرکەوت ئەو کەسە نانەوای پاشاکان و بارەکە نانی تایبەتی پاشا و هەنگوین بوو. بارەکەی بردە لای سەعد و خۆی گەڕایەوە بۆ گۆڕەپانی جەنگ. کاتێك سەعد بینی، وتی: ئەمە ببەن بۆ شەڕکەرانی عاسم و بڵێن ئەمیر بەخشیویەتی بەخۆتان، بیخۆن.

دەڵێت: لەو کاتەی شەڕکەران چاوەڕوانی تەکبیری چوارەم بوون، قەیس کوڕی حەدیم سەرکردەی پیادەکانی منداڵەکانی نەهد قسەی کرد و وتی: ئەی منداڵەکانی نەهد، هێرش ببەن چوونکە بەئێوە دەڵێن نەهد (نەهد بەمانای هێرش بردنە).

خالید کوڕی عەرەفتە پەیامی بۆنارد: ئەگەر دەستبەرداری ئەو کارانە نەبیت، کەسێکی دیکە لەجێگەی تۆ دادەنێم.

کاتێک سوارەکان رووبەرووی یەکبوونەوە، یەکێك لەفارسەکان هاتە پێش و هاواری دەکرد: پیاو! پیاو! عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب رووبەرووی بوویەوە و شەڕی لەگەڵ کرد. عەمرۆ سەری بڕی و رووی کردە خەڵکان و وتی: پیاوی فارسی کاتێك کەوانەکەی خۆی لەدەست بدات، بزنە. دوای ئەوەی دەستەکانی فارسی و عەرەب کۆبوونەوە، قەیس کوڕی ئەبی حازم دەڵێت: عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب لای ئێمە تێپەڕی و شەڕکەرانی بۆ جەنگ هاندەدا و دەیوت: پیاوی عەجەم کاتێك ڕمە کورتەکەی فڕێبدات، بزنە. لەم کاتەدا یەکێك لەفارسەکان رووبەرووی بوویەوە و لەنێوان دوو ریزەکە وەستا و تیری دەهاویشت. کەوانەکەی خۆی بەسەر شانییەوە هەڵواسیبوو، تیرەکەی بەهەڵەدا نەچوو. عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب پەلاماریدا و پشتێنی کەمەری گرت و بەرزی کردەوە و خستیە بەردەم ئەسپەکەی خۆی و گەڕایەوە. کاتێك گەیشتە لای ئێمە، ملی شکاند و دواتر سەری بڕی و وتی: بەمشێوەیە بجەنگن.

وتم: ئەی باوکی سور، کێ دەتوانێت وەك تۆ بجەنگێت.

هەروەها قەیس کوڕی ئەبی حازم دەڵێت: عەجەمەکان سیانزە فیلیان بۆ ناوچەیەك نارد کەتایەفەی بوجەیلە لەوێ بوون.

ئیسماعیل کوڕی ئەبی خالید دەڵێت: شەڕی قادسیە لەموحەڕەمی ساڵی چواردەیەم ولەسەرەتای مانگی مەی روویدا. یەکێك لەعەرەبەکان ڕۆشتە لای فارسەکان و پێیان وت: شوێنێکمان نیشان بدە. ئەو تایەفەی بوجەیلەی نیشاندان و شانزە فیلیان بۆ لای ئەوان ڕەوانە کرد.

زیاد دەڵێت: کاتێك دوای یەکەم دەرگیرییەکان دەستەکان کۆبوونەوە، فیلەکان هێرشیان کردنەسەر و ئەوانیان پەرژ و بڵاو کردەوە. ئەسپەکان ڕەمیان کرد و زۆری نەمابوو خەڵکانی بوجەیلە لەناو بچن. تەنیا پیادەکانیان مابوویەوە. سەعد فەرمانی بەخەڵکانی ئەسەددا لەخەڵکانی بوجەیلە و هاوەڵانی ئەوان بەرگری بکەن. تەڵحە کوڕی خوەیلد و حەمال کوڕی مالیك و غالیب کوڕی عەبدوللە و زەبیل کوڕی عەمرۆ لەگەڵ دەستەکانی خۆیان رووبەرووی فیلەکان بوونەوە و پاشەکشێیان بەفیل

سوارەکان کرد. هەر فیلێك بیست شەڕکەری لەسەر بوو.

موسا کوڕی تەریف دەڵێت: کاتێك سەعد داوای هاوکاری لەخەڵکانی ئەسەد کرد، تولەیحە وتی: فریایان کەون چوونکە کاتێك ناوی کەسێك دەبەن کەبڕواپێکراو بێت. ئەگەر سەعد دەیزانی کەسێك باشتر لەئێوە دەتوانێت ئەوان رزگار بکات، داوای هاوکاری لەوان دەکرد، هاوشێوەی شێرە چاونەترسەکان هێرش بکەنە سەر فارسەکان، ئێوەیان بەئەسەد ناوبردووە و کاری شێرەکان ئەنجام دەدەن. هێرش بەرن و پاشەکشێ مەکەن، پێشڕەوی بکەن و پشت مەکەنە گۆڕەپانی شەڕ. ئافەرین بۆ رەبیعە چەندە بوێری لەخۆیان نیشان دەدەن و روو لەکوێ دەکەن. مەگەر کەس دەتوانێت بەوان بگاتەوە. شوێنەکانی خۆتان بەجێبێڵن تا خواوەند هاوکاریتان بکات، بەناوی خواوەند هێرش بکەنە سەر فارسەکان.

مەغرور کوڕی سوەید و شەفیق دەڵێن: منداڵەکانی ئەسەد هێرشیان دەسپێکرد و بەردەوام شمشێریان دەوەشاند تا ئەو کاتەی فیلەکەمان لەمنداڵەکانی بوجەیلە دوور خستەوە. تولەیحە رووبەرووی یەکێك لەگەورەکانی فارس بوویەوە و شەڕی لەگەڵ کرد و کوشتی.

زیاد دەڵێت: ئەشعەس کوڕی قەیس قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکانی کیندە، دەسخۆش بۆ منداڵەکانی ئەسەد چەند بەجوانی دەجەنگن و چەند بەخێرایی پێشڕەوی دەکەن. هەردەستەیەك بۆ هاوکاری دەستەکانی نزیك خۆیان ئەسپیان غاردا، ئێوە چاوەڕوانن کێ قورسایی شەڕ لەسەر شانی ئێوە هەڵبگرێت. بەراستی لەخەڵکەکەی خۆتان، عەرەبەکان ناچن. ئەوان دەکوژرێن و دەجەنگن و ئێوە بێ جووڵە لەسەر ئەسپەکانی خۆتان چاوەڕوانن.

دەڵێت: دەکەس لەوان لەدەوری کۆبوونەوە و وتیان: ئێمە لەهەموو خەڵکان شەڕکەرترین، چۆن دەڵێیت هاوکاری خەڵکەکەی خۆمان نەکردووە و هاوشێوەی ئەوان نەبووین. ئێستاکە لەگەڵ تۆین.

ئەشعەس هێرشی برد و ئەوانیش هێرشیان برد و فارسەکانیان ناچار بەپاشەکشێ کرد.

کاتێك فارسەکان پاشەکشێی فیلەکەیان لەبەرابەر منداڵەکانی ئەسەد بینی،

تیربارانیان کردن و بەسەرکردایەتی زوئەلحاجەب و جالینوس هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان. بەڵام موسوڵمانان چاوەڕوانی تەکبیری چوارەمی سەعد بوون. بەشی سەرەکی هێزی فارسەکان هاوڕێ لەگەڵ فیلەکە دژی مناڵەکانی ئەسەد کەوتە جووڵە. کاتێک سەعد تەکبیری چوارەمی وت و موسوڵمانان هێرشیان دەسپێکرد، ئاشی جەنگ بەسەر مناڵەکانی ئەسەد دەسوڕا و فیلەکان لەراست و چەپ هێرشیان دەکردە سەر ئەسپەکان و پاشەکشێیان پێدەکردن. سوارەکان داوایان لەپیادەکان کرد فیلەکان دوور بخەنەوە. سەعد کەسی بۆ لای عاسم کوڕی عەمرۆ نارد و پەیامیدا: ئەی مناڵەکانی تەمیم، ئێوە خاوەن ئەسپ و وشتر بوون، ناتوانن چارەی ئەو فیلانە بکەن؟

وتیان: بۆ نا، سوێند بەخوا دەتوانین.

عاسم دەستەیەك لەتیرهاوێژەکانی خەڵکەکەی خۆی و کەسانی شارەزای کۆکردەوە و وتی: ئەی تیر هاوێژەکان، فیل سوارەکان بکەنە نیشانە و ئێوە ئەی خەڵکانی بەئەزمون و شارەزا، پاشەکشێ بەفیلەکان بکەن. هانی ئەوانیان. ئاشی جەنگ لەسەر مناڵەکانی ئەسەد دەسوڕا وجموجۆڵ لەراست و چەپ دروست ببوو. هاوەڵانی عاسم روویان کردە فیلەکان و کلکی فیل و دواوەی سنووقەکانیان دەگرت. لووتی فیلەکانیان بڕی و هاواریان بەرز بوویەوە. فیل سوارەکان کوژران و دوو سوپاکە رووبەرووی یەکبوونەوە و زەخت و گوشار لەسەر مناڵەکانی ئەسەد نەما و فارسەکانیان لەخۆیان دوور خستەوە. شەر تا ئاوا بوونی هەتاو و بەشێك لەشەو بەردەوام بوو. دوو سوپا گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان.

لەو شەوەدا پێنسەد کەس لەمناڵەکانی ئەسەد کوژران. عاسم پێشەنگی خەڵکان بوو. ئەمە یەکەم رۆژی جەنگی قادسیە و بەجەنگی ئەرماس ناوی دەرکرد.

قاسم لەیەکێك لەمناڵەکانی کەنانە دەگێڕێتەوە: لەرۆژی ئەرماس باڵەکانی سوپای فارس دژی مناڵەکانی ئەسەد کەوتنە جموجۆڵ و لەو شەوەدا پێنسەد کەس لەوان کوژرا.

## شەڕی ئەغواس

تەڵحە دەڵێت: سەعد پێشتر، سەلما کچی خەسفە ژنی موسەنا کوڕی حارسەی ئەشەراف وەك هاوسەر هەڵبژاردبوو. ئەوی هێنابوویە قادسیە و کاتێك لەجەنگی ئەرماس عەرەبەکان کەوتنە جموجوڵ، سەعد توانای دانیشتنی نەبوو مەگەر بۆ چەند ساتێك. لەسەر سك ڕاکشا بوو و کاتێك سەلما هێرشی فارسەکانی بینی، وتی: هاوار لەموسەنا، سوپا ئێستاکە موسەنای نییە. ئەم وتەی کاتێك هێنایە سەرزمان کەسەعد لەبارودۆخی خۆی و هاوەڵانی خەمبار و پەرێشان بوو. شەقەزللەیەکی لەڕوخساری ژنەکەدا و وتی: موسەنا کەی سوپایەکی لەمشێوەی هەبوو کەئاشی جەنگ بەسەریاندا دەسوڕێت.

مەبەستی منداڵەکانی ئەسەد و عاسم و دەستەکەی ئەو بوو.

سەلما وتی: ڕژدی دەبەیت و دەترسیت؟

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر تۆ بەپاساوەکەی من ڕازی نەبیت کەس بەپاساوەکەم ڕازی نابێت. کاتێك تۆ حاڵی من دەبینیت و بەمشێوەیە قسە دەکەیت، خەڵکان مافی خۆیانە هەرچی بڵێن.

کەسان ئەم وتەیان بەزەین سپارد و کاتێك عەرەبەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، شاعیرەکان وتەکانی ئەویان دووبارە کردەوە کەنەترسەنۆك بوو و نەشیاوی سەرکۆنە کردن.

دەڵێت: بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر عەرەبەکان بۆ شەڕ ڕیزیان بەست. سەعد کەسانێکی ڕاسپارد کوژراوەکان بەرەو عوزەیب ببەن و بریندارەکان بگوازنەوە. بریندارەکانیان بەژنان سپارد تا خواوەند فەرمانی خۆی سەبارەت بەوان ڕەوانە بکات. کوژراوەکانیان لەنێوان عوزەیب و وادی شەمس بەخاك سپارد. عەرەبەکان لەسەرەتای جەنگ چاوەڕوانی بردنی کوژراو و بریندارەکانیان دەکرد. کاتێك کوژراو و بریندارەکانیان خستە سەر وشترەکان و بەرێکەوتن، پێشەنگی سوپاکە لەشامەوە دەرکەوت.

گرتنی دیمەشق یەك مانگ پێش قادسیە ڕوویدا و کاتێك نامەی عومەر کوڕی

خەتاب بەباوکی عوبەیدە گەیشت تا سوپاکەی خالید بۆ هاوکاری موسوڵمانان لەعێراق ڕەوانە بکات بێ ئەوەی ناوی خالید ببات، باوکی عوبەیدە خالیدی هێشتەوە و سوپاکەی ڕەوانە کرد کە لەشەش هەزار شەڕکەر پێکهاتبوون. پێنج هەزار کەس لەخەڵکانی ڕەبیعە و موزێر و حەوت هەزار کەس لەخەڵکانی یەمەن و حیجاز و سەرزەمینەکانی دەوروبەر و سەرکردایەتی ئەوانی بەهاشم کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی وەقاس سپارد. فەرماندەی پێشەنگەکانی هاشم قەعقاع کوڕی عەمرۆ بوو.

یەکێك لەباڵەکانی سوپاکەی بەقەیس کوڕی هوبەیرە کوڕی عەبد یەغوسی موورادی سپارد و باڵەکەی دیکەی بەهەزهاز کوڕی عەمرۆ عیجلی. ئەنس کوڕی عەباس فەرماندەی کۆتایی سوپاکە بوو.

قەعقاع بەخێرایی ڕێگەی بڕی و بەرەبەیانی ڕۆژی ئەغواس گەیشتە قادسیە. بەهاوەڵانی خۆی وتبوو بۆ دەستەی دەکەسی دابەش بن. هەزار کەس بوون و کاتێك دەستەیەکی دەکەسی لەبەر چاو نەدەما، دەستەیەکی دیکە بەرێدەکەوت.

قەعقاع لەگەڵ هاوەڵانی خۆی (دەکەس) دەرکەوت، سڵاوی کرد و مژدەی گەیشتنی هێزی پشتیوانی پێدان، وتی: ئەی خەڵکینە، لەگەڵ شەڕکەرانێك هاتووم کەئەگەر لێرە دەبوون و ئێوە دەکوژران، لەو سەرکەوتنەی بەدەستتان هێناوە، ڕژدیان پێدەبردن و ئارەزوویان دەکرد لەجێگەی ئێوەبن. ئێوەیش ئەو کارە بکەن کەمن دەیکەم. ڕۆشتە پێش و داوای شەڕکەری کرد و عەرەبەکان وتەکانی ئەبوبەکریان سەبارەت بەو هێنایە سەرزمان کەوتبووی: سوپایەك کەسێکی هاوشێوەی ئەوی تیابێت، هیچ کات شکست ناخوات. لەبوونی ئەو هەستیان بەئارامی و دڵنیایی دەکرد.

زوئەلحاجەب ڕووبەڕووی قەعقاع بوویەوە. قەعقاع پرسی: کێیت؟

وتی: بەهمەن جادویەم.

قەعقاع هاواری کرد: ئەمە تۆڵەی باوکی عوبەید و سەلیت و کوژراوانی شەڕی پردە! شەڕیان کرد و بەهمەن جادویە کوژرا.

سوپاکەی قەعقاع دەستە لەدوای دەستە دەگەیشتن و تا شەو بەردەوام بوو. عەرەبەکان دڵخۆش بوون وەك بڵێی دوێنێ تامی شکستیان نەکردبێت. شەڕ

لەکوژرانی بەهمەن جادویە و هاتنی دەستە دەکەسییەکان قەقعاع دەستی پێکرد. عەجەمەکان لەهاتنی ئەوان خەمبار بوون.

دووبارە قەعقاع هاواری بەرز کردەوە و داوای شەڕکەری کرد. دوو کەس رووبەرووی بوونەوە. یەکیان پیرزان و ئەوی دیکەیان بەندوان بوو. حارس کوڕی زەبییان کوڕی حارس لەتایەفەی منداڵەکانی تیم الات پەیوەستی قەعقاع بوو. قەعقاع رووبەرووی پیرزان بوویەوە و سەری ئەوی پەڕاند و حارس رووبەرووی بەندوان بوویەوە و ئەوی کوشت. سوارەکانی موسوڵمان هێرشیان کردە سەر فارسەکان. قەعقاع هاواری دەکرد: ئەی موسوڵمانەکان بەشمشێر رووبەروویان ببنەوە چوونکە خەڵکان بەشمشێر دروێنە دەکەن. عەرەبەکان دڵنەوایی یەکیان دەدایەوە و هێرشیان کرد و تا ئێواریێ سەرقاڵ بوون. فارسەکان ئەو رۆژە، رۆژێکی تاڵیان بەسەر برد و ژمارەیەکی زۆریان بەدەستی عەرەبەکان کوژران.

لەم رۆژەدا فارسەکان لەسەر فیل شەڕیان نەکرد چوونکە رۆژی پێشتر سنوقی فیلەکانیان بڕیبوو و بەیانییەکەی سەرقاڵی چاککردنەوەی بوون و تا رۆژی دواتر ئامادە نەبوونەوە.

شەعبی دەڵێت: ژنێك لەتایەفەی نەخەغع چوار کوڕی بوو کەهەموویان لەقادسیە بەشدار بوون. بەکوڕەکانی خۆی وت: ئێسلامتان هێنا و باوەڕتان نەگۆڕا. کۆچتان کرد و هیچ کارێکی نەشیاوتان ئەنجامنەدا. نەڕۆشتوونەتە سەرزەمینێکی دوور و گرفتاری سەختی نەبوون. ئێستا دایکە پیرەکەی خۆتان هێناوە و لەبەرابەر فارسەکان داتاننناوە. سوێند بەخوا ئێوە منداڵی یەك پیاون وەك چۆن منداڵی یەك ژنن، من خیانەتم لەباوکتان نەکردووە و خاڵۆتانی ریسوا و سەرشۆڕ نەکردووە، بڕۆن و لەسەرەتا و کۆتایی جەنگ بەشدار بن.

کوڕەکان بەخێرایی ڕۆشتن و کاتێك لەچاوی ئەو دوور کەوتنەوە، دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: ئەی خوایە، کوڕەکانی من بپارێزە.

دەڵێت: کوڕەکانی گەڕانەوە بۆ لای دایکیان. بەباشی جەنگابوون. کەسیان بریندار نەببوو. دوای ئەوە هەرکام یەکی دوو هەزار درەمیان بەرکەوت و دەیانبردە لای دایکیان. دایکی بۆی دەگەڕاندنەوە و بەشێوەیەکی شیاو لەناو ئەواندا دابەشی

دەکرد.

زیاد دەڵێت: لەو ڕۆژەدا سێ کەس لەریاحیانی منداڵەکانی یەربوع هاوکاری قەعقاعیان دەکرد. کاتێك دەستەیەکی دەکەسی سوپای موسوڵمانان دەردەکەوت، قەعقاع تەکبیری دەوت و موسوڵمانان تەکبیریان دەوت. قەعقاع هێرشی دەبرد و موسوڵمانان هێرشیان دەبرد. یەربوعییەکان نەعیم کوڕی عەمرۆ کوڕی عتاب و عتاب کوڕی نەعیم و عەمرۆ کوڕی شەبیب کوڕی ریباع بوون.

لەم ڕۆژەدا نێردراوی عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ چوار ئەسپ و چوار شمشێر هات. وتبووی: ئەگەر شەڕ ڕوویداوە، سەعد شمشێر و ئەسپەکان لەناو بوێر و تێکۆشەرەکانی سوپاکەی دابەش بکات. سەعد، حەمال کوڕی مالك و ڕەبیل کوڕی عەمرۆ کوڕی ڕەبیعە هەردووان والبی و تولەیحە کوڕی خوەیلد فەقعەس کەهەر سێکیان لەمنداڵەکانی ئەسەد بوون، لەگەڵ عاسم کوڕی عەمرۆ تەمیمی بانگ کرد و شمشێرەکانی بەواندا. قەعقاع کوڕی عەمرۆ و یەربوعییەکانی بانگ کرد و ئەسپەکانی پێشکەشی ئەوان کرد. سیان لەمنداڵەکانی یەربوع سێ ئەسپ و سیان لەمنداڵەکانی ئەسەد سێ شمشێریان هەڵگرت.

سەلیم کوڕی عەبدولرەحمان سەعدی لەباوکی دەگێڕێتەوە: قۆناغی یەکەمی جەنگ لەهەموو ڕۆژەکان شەڕ و هەڵاتن بوو. کاتێك قەعقاع هات، وتی: ئەی خەڵکینە ئەو کارە بکەن کەمن دەیکەم. هاواری بەرز کردەوە و داوای شەرکەری کرد. بەهمەن جادویە ڕووبەڕووی بوویەوە و کوژرا. شەڕکەران کۆبوونەوە و جەنگ و شمشێر وەشاندن دەستی پێکرد. ئامۆزاکانی قەعقاع دەکەس لەپیادەکانیان سوار وشترەکان کردبوو و بەهۆی سوارەکانەوە پارێزگارییان لێدەکرا. فەرمانیدا وشترەکان هاوشێوەی فیلەکان بۆ نێوان دوو ڕیزی سوپای فارسەکان ببەنە پێش. لەرۆژی ئەغواس عەرەبەکان بەهۆی وشترەوە ئەو کارەیان کرد کە فارسەکان لەرۆژی ئەرماس بەفیلەکانی خۆیان کردیان. وشترەکان لەهیچ نەدەترسان و ڕەمیان بەئەسپەکان دەکرد. سوارە موسوڵمانەکان هێرشیان دەبرد و کەسانی دیکە چاولێکەری ئەمانیان کرد. لەرۆژی جەنگی ئەغواس فارسەکان بەئەندازەی ڕۆژی شەڕی ئەرماس لەوشترەکانی عەرەب زیانیان بەرکەوت.

دەڵێت: یەکێك لەتەمیمییەکان کەپارێزەری وشتر سوارەکان و ناوی سواد بوو،

بەدوای شەهید بووندا دەگەڕا. ماوەیەك جەنگا و نەکوژرا. سەرەنجام رووی لەرۆستەم و مەبەستی کوشتنی ئەوی کرد و لەبەردەم ئەو کوژرا.

قاسم کوڕی سەلیم لەباوکی دەگێڕێتەوە: یەکێك لەفارسەکان هات و دەنگی بەرز کردەوە و داوای شەڕکەری کرد. عەلبا کوڕی جەحشی عێجلی رووبەرووی بوویەوە و بەیەك زەربە سینەی قەڵیشت. پیاوی فارسی بەشمشێر زەرەبەیەکی لەعەلبادا و ریخۆڵەکانی کەوتە سەر زەوی. هەردووکیان کەوتن. پیاوی فارسی دەستبەجێ کوژرا. عەلبا کەریخۆڵەکانی کەوتبووە سەرزەوی توانای هەستانەوەی نەبوو. هەوڵیدا بیاخاتە شوێنی خۆی بەڵام نەیتوانی. بەیەکێك لەموسوڵمانانی وت: فلاّن کەس وەرە هاوکاریم بکە. ریخۆڵەکانی خستە شوێنی خۆی و عەلبا دەستی بەسکیەوە گرت و هێرشی کردە سەر فارسەکان. سەیری موسوڵمانەکانی نەکرد. سی زەراع پۆشتە پێش و نزیك ریزی فارسەکان لەپێ کەوت.

قاسم لەباوکی دەگێڕێتەوە: یەکێك لەفارسەکان هات و داوای شەڕکەری کرد. ئەعرەف کوڕی ئەعلامی عەقیلی رووبەرووی بوویەوە و کوشتی. دواتر کەسێکی دی بۆ رووبەروو بوونەوەی هات و ئەویشی کوشت. چەند سوارێکی فارسی دەوریان گرت و ئەعرف کەوتە سەرزەوی. سیلاحەکەی لەدەست کەوتە خوار. ئەعرەف خۆڵی بەسەر و روخساری ئەواندا پرژاند و گەڕایەوە بۆ ناو ریزی موسوڵمانان.

دەڵێت: لەو رۆژەدا قەعقاع سێ جار هێرشی برد. هەرکاتێك دەستەیەك لەهێزی پشتیوانەکان دەردەکەوتن، ئەو هێرشی دەبرد.

زیاد دەڵێت: قەعقاع لەرۆژی ئەغواس سی کەسی لەسی هێرشدا کوشت. لەهەر هێرشێك کەسێکی دەکوشت کەدوایین کەسیان بۆزۆرگمێهری هەمەدانی بوو. ئەعومر کوڕی قەتییە رووبەرووی شەهربەرازی سیستان بوویەوە و هەردووکیان کوژران.

کوڕی میخراق دەڵێت: لەبەرەبەیانەوە تا نیمەڕۆ، سوارەکان شەڕیان کرد و کاتێك ئێواری هاتە پێش، دوو سوپاکە هێرشیان کردەسەر یەك و شەڕی گشتی تا نیوەی شەو بەردەوام بوو.

دەڵێت: شەوی ئەرماسیان بەئارامش ناو دەبرد و شەوی ئەغواسیان بەسواد ناو برد. نیوەی یەکەمی بەسواد ناوبرا. لەرۆژی ئەغواس بەردەوام موسوڵمانان

سەركەوتوو بوون و زۆربەی گەورەكانی فارسیان كوشت. سوارەكانی ناو دڵی سوپای فارسەكان كەوتنە جموجوڵ بەڵام پیادەكان لەشوێنی خۆیان مابوونەوە. ئەگەر هێرشی سوارەكان نەدەبوو، رۆستەم ئەسیر دەكرا.

دوای نیوەی شەو موسوڵمانان وەك شەوی ئەرماس ئارمیان گرت. لەئێواریێ تا كاتی گەڕانەوە موسوڵمانان بەردەوام بەدەنگی بەرز ناو و نەژادی خۆیان دەهێنایە سەرزمان. كاتێك سەعد ئەمەی بیست خەوت و بەیەكێك لەكەسەكانی نزیكی خۆی وت: ئەگەر خەڵكان بەردەوام ناو و نەژادی خۆیان هێنایە سەرزمان، هەڵمەستێنە چوونكە بەسەر دوژمندا زاڵبوون و ئەگەر بێدەنگ بوون و فارسەكان ناو و نەژادی خۆیان نەهێنایە سەرزمان، دووبارە هەڵمەستێنە چوونكە بەرابەرن بەڵام ئەگەر فارسەكان ناو و نەژادی خۆیان هێنایە سەرزمان، هەڵمسێنە چوونكە نیشانەیەكی خۆش نییە.

دەڵێت: كاتێك شەڕ رووی لەدژواری كرد، باوكی میحجەن كە لەكۆشكەكەدا زیندانی بوو، ڕۆشتە سەر و داوای بەخشینی لەسەعد كرد بەڵام سەعد بەشێوەیەكی توند وەڵامی دایەوە و ئەوی بۆ زیندان گەڕاندەوە. ئەو ڕۆشتە لای سەلما كچی خەسفە و وتی: سەلما، كچی بنەماڵەی خەسفە، دەتوانیت كارێكی چاكە ئەنجام بدەیت؟

وتی: چ كارێك؟

وتی: رزگارم بكە و ئەسپی بەلقا بەمن بسپێرە، خوا بەشایەت دەگرم ئەگەر نەكوژرام، دەگەڕێمەوە لای تۆ و دەڕۆمە زیندان.

سەلما وتی: ئەم كارە لەتوانای مندا نییە.

باوكی میحجەن هۆنراویەكی خوێندەوە بەم ناوەرۆكە:

((ئەم خەمەم بەسە كەسوارەكان بەڕم لەناو دەچن

و من لێرە ئەسیر و پێم لەزنجیردا بێت

كاتێك هەڵدەستم ئاسن ڕێگەم لێدەگرێت

دەرگاكان بەسەر مندا داخراون

سامانی زۆر و هاوەڵانی فراوانم بوو

منیان پشتگوێ خست و ئێستا كەسم نییە

خوا بەشایەت دەگرم ئەگەر رزگارم بکەن
هیچ کات روو ناکەمە مەیخانە.))

سەلما وتی: بەبەڵێنەکەی تۆ رازی دەبم. ئەوی ئازاد کرد و وتی: ئەسپەکە بەتۆ نادەم.

باوکی میحجەن ئەسپەکەی پیش خۆیدا و لەدەرگای کۆشك لەنزیك خەندەکەکە هاتەدەر. سواری بوو و ئەسپی غاردا تا گەیشتە نزیك باڵی راست و تەکبیری دەوت. دواتر هێرشی کردە سەر باڵی راستی سوپای فارس و لەنێوان دوو ریزەکە بەرِم و شمشێرەکەی خۆی هونەرەکانی جەنگی نیشاندەدا. بەوتەیەك ئەسپەکەی زین کراو و بەوتەیەك بێ زین بوو. دواتر لەپشتی موسوڵمانانەوە هێرشی کردە سەر باڵی راست و تەکبیری وت و هێرشی کردە سەر باڵی چەپ. ئەوسا لەپشتی موسوڵمانانەوە رووی کردە دڵی سوپای فارسەکان. هێرشی کردە سەر فارسەکان. خەڵکان لەکارەکانی ئەو سەریان سوڕمابوو چوونکە نەیاندەناسییەوە و لەکاتی رۆژدا ئەویان نەبینیبوو.

دەستەیەکیان وتی: ئەمە یەکێك لەیەکەم شەڕکەرانی سوپاکەی هاشم، یا ئەگەری هەیە خودی هاشم بێت.

سەعد کەوتبووە سەر پشت، لەسەرەوەی کۆشکەکەی سەیری گۆڕەپانی جەنگی دەکرد، دەیوت: سوێند بەخوا ئەگەر باوکی میحجەن زیندانی نەدەبوو، دەموت خۆیەتی و ئەو ئەسپەیش بەڵقایە.

دەستەیەك وتیان: خزر لەشەڕەکان بەشداری دەکات و گومان دەکەین سوارکاری سەر بەڵقا، خزرە.

دەستەیەکی دیکە وتیان: ئەگەر فریشتەکان شەڕیان نەدەکرد، دەمانوت فریشتەیە و بۆ هاوکاری ئێمە هاتووە. کەس ناوی میحجەنی نەدەبرد چوونکە دەیانزانی ئەو زیندانییە.

لەنیوەشەودا فارسەکان دەستیان لەشەڕ هەڵگرت و موسوڵمانان گەڕانەوە. باوکی میحجەن هات و لەهەمان دەرگای رۆشتبووەدەر، گەڕایەوە. سیلاح و ئەسپەکەی خۆی دانا و دووبارە پێی بەزنجیر بەستەوە و هۆنراویەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

((سەقیفییەکان دەزان و ئەمە شانازی کردن نییە
کاتێك ئەوان خۆڕاگر نەبن
زیاتر لەهەمووان خۆڕاگری دەکەم
من لەهەموو شوێنێك نوێنەری ئەوانم
و ئەگەر نازانن لەعەریف بپرسن
شەوی قادسیە منیان نەناسییەوە
خەڵکان هەستیان بەڕۆشتنەدەرەوەی من نەکرد
ئەگەر زیندانیم بکەن ئەمە زیانی منە
ئەگەر رزگارم بکەن، تامی مەرگ بەدوژمنان دەچێژم))

سەلما پێی وت: ئەی باوکی میحجەن بۆ ئەم پیاوە تۆی زیندانی کردووە؟

وتی: سوێند بەخوا زیندانی کردنی من بەهۆی حەرامێك نەبووە کەخواردبێتم یا خواردبێتمەوە. لەسەردەمی جاهلییەت مەیخۆر بووم. پیاوێکی شاعیرم و هۆنراوە دێنە سەرزمان و هەندێ کات سەر لێوم و ناوم بەخراپە دەردەچێت. لەبەر ئەوە منی زیندانی کردووە کەوتم:

((کاتێك بمرم
لەبن دار مێوێکدا بمنێژن
تا دوای مەرگ
ڕەگەکانی ئێسقانەکانم تێراو بکەن
لەبیابان مەمنێژن
چوونکە دەترسم دوای مردن تامی شەراب نەکەم
گۆڕەکەی من لێوانلێوکەن لەشەراب
چوونکە بەردەوام ئەسیری شەرابم))

سەلما شەوی ئەرماس و شەوی ئارامی و شەوی سواد قسەی لەگەڵ سەعد نەدەکرد. بۆیەیانی ڕۆشتە لای و لەگەڵی ئاشت بوویەوە و لەداستانەکەی خۆی و باوکی میحجەن ئاگاداری کردەوە.

سەعد باوکی میحجەنی ئازاد کرد و وتی: بڕۆ، تۆ لەبەر وتەکانت سزا نادەم مەگەر ئەو کاتەی کردەوەت لێ ببینم.

وتی: چیتر سوێند بەخوا هیچ کات قسەی ناڕەوا ناهێنمە سەرزمان.

## ڕۆژی عەماس

کوڕی میخراق دەڵێت: لەڕۆژی سێیەم موسوڵمانان و فارسەکان لەشوێنی خۆیاندا بوون، گۆڕەپان بەئەندازەی یەك میل سوور بەرچاو دەکەوت. دوو هەزار کەس لەموسوڵمانان کوژراو و بریندار و لەفارسەکان نزیکەی دەهەزار کەس.

سەعد وتی: هەرکەس دەخوازێت کوژراوەکەی خۆی بشوات و هەرکەس ناخوازێت، بەهەمان شێوە خوێناوی بەخاکیان بسپێرێت.

موسوڵمانان کوژراوەکانی خۆیان هەڵگرت و لەپشت ریزەکانەوە دایاننا. ئەوانەی لێپرسراوی کاروباری تایبەت بەکوژراوان بوون هاتن و ئەوانیان بۆ ئەسپەردە کردن لەگەڵ خۆیان برد. بریندارەکانیان بردە لای ژنەکان. حاجب کوڕی زەید لێپرسراوی کوژراوەکان بوو. ژنان و منداڵان بۆ ماوەی دوو ڕۆژ، ڕۆژی ئەغواس و ڕۆژی ئەرماس، لەسەر تەپۆڵکەکانی ڕۆژهەلات، گۆڕیان هەڵدەکەند و دوو هەزار و پێنسەد کەس لەشەڕکەرانی قادسییەیان بەخاك سپارد.

حاجب و کەس و کاری کوژراوەکان لەنێوان قادسیە و عوزەیب لای دارخورمایەك گوزەریان کرد. لەو ڕۆژگارەدا تەنیا ئەو دارخورمایەی لێبوو. کاتێك بریندارەکانیان بردە ئەوێ، یەکیان بەئاگا بوو. دەیویست لەژێر سێبەری دارخورماکە داینێن بۆ ئەوەی کەمێك بحەسێتەوە. یەکێك لەبریندارەکان بەناوی بوجەیر لەژێر سێبەری دارخورماکە هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( تەندروست بە ئەی دارخورما چوونکە
لەنێوان قادسیە و عوزەیبی
و لەتەنیشت تۆ هیچ دارخورمایەکی دیکە نابینرێت))

چەند کەسێك لەبریندارەکانی دیکە هۆنراوەی لەمشێوەیان سەبارەت بەو دارخورمایە هۆنییەوە.

زیاد دەڵێت: شەوەکەی قەعقاع هاوەڵانی خۆی بردە ئەو شوێنەی کەپێشتر لێیان جیاببوویەوە، پێی دەوتن: کاتێك هەتاو هەڵهات، سەد کەس سەد کەس وەرن و

کاتێك دەستەیەك لەبەرچاوتان نەما، دەستەکەی دیکە بەرێکەوێت. ئەگەر هاشم گەیشت، چ باشتر و گەرنە بەمشێوەیە ورەی شەڕکەران زیاد دەکەن.

ئەو کارەیان کرد و کەس بەمەی نەزانی.

بەرەبەیانی موسوڵمانان لەشوێنەکەی خۆیان بوون. کوژراوەکانیان کۆکردبوویەوە و بەحاجب کوڕی زەیدیان سپاردبوو. کوژراوی فارسەکان لەنێوان دوو ریزدا و بۆگەنیان کردبوو چوونکە ئەوان گرنگییان بەکوژراوانی خۆیان نەدەدا. ئەمە یەکێك بوو لەبەخشینەکانی خواوەند و بەمشێوەیە کردەوەی موسوڵمانانی پشتڕاست دەکردەوە.

کاتێك هەتاو هەڵهات، قەعقاع نیگەرانی سوارەکان بوو، دەرکەوتن و تەکبیری وت. موسوڵمانانیش تەکبیریان وت و وتیان: هێزی پشتیوان هات.

عاسم کوڕی عەمرۆ فەرمانی بەشەڕکەرانی خۆیدابوو ئەو کارە بکەن و ئەوان لەلای خەفانەوە هاتن.

لەم کاتەدا سوارەکانی موسوڵمان پێشڕەویان کردو دەستەکان کەوتنە جموجۆڵ و شمشێر وەشاندنیان دەستپێکرد. هیزی پشتیوان بەردەوام دەگەیشت و هێشتا دوایین هاوەڵانی قەعقاع نەگەیشتبوون کەهاشم دەرکەوت و حەوتسەد کەسی لەگەڵدا بوو. کاتێك لەکارەکەی قەعقاع ئاگاداریان کردەوە، ئەویش شەڕکەرانی خۆی حەفتا حەفتا جیا کردەوە و کاتێك دوایین هاوەڵانی قەعقاع گەیشتنە گۆڕەپانی جەنگ، هاشم لەگەڵ حەفتا کەس هات کەقەیس کوڕی هوبەیرە کوڕی عەبد یەغوس لەناویاندا دەبینرا. ئەو لەشەڕکەرانی ڕۆژەکانی پێشوو نەبوو. لەیەمەنەوە ڕۆشتبووە یەرموك و لەگەڵ هاشم گەیشتە قادسیە.

هاشم پێشڕەوی کرد و پەیوەستی دڵی سوپای موسوڵمانان بوو. تەکبیری وت و موسوڵمانان تەکبیریان وت و ریزیان بەست.

هاشم وتی: یەکەم قۆناغی جەنگ، جەنگ و هەڵاتنە و دوای ئەوە تیر هاویشتن. ئەمەی وت و کەوانەکەی خۆی هەڵگرت و تیرێکی خستە ناو کەوان. ئەسپەکەی سەری بەرز کردەوە و گوێی ئەسپەکەی قرتا. هاشم پێکەنی و وتی: چ تیرهاوێشتنێکی قێزەون بوو لەکەسێك کەهەمووان چاودێری دەکەن! گومان دەکەن تیرەکەی من بەکوێ دەگات؟

وتیان: عەتیق.

هاشم ئەسپەکەی بۆ پێشەوە برد و تیری خستە کەوان و دووبارە ئەسپەکەی بۆ پێشەوە برد تا گەیشتە عەتیق. ریزەکانی دوژمنی بڕی و گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی. دەستە پشتیوانەکان یەك لەدوای یەك دەگەیشتن.

فارسەکان شەو سنوقی سەرفیلەکانیان چاککردبوویەوە و بەرەبەیان ریزیان بەست. فیلەکان هاتن و پیادەکان هاورێیەتیان دەکردن. سوارەکان لەگەڵ پیادەکان بوون تا پارێزگارییان لێ بکەن. کاتێك دەیانویست هێرش بکەنە سەر دەستەیەك، فیلەکان روویان دەکردە ئەو دەستەیە تا ڕەم بەئەسپەکانیان بکەن. بەڵام شەڕی فیلەکان هاوشێوەی رۆژی یەکەم نەبوو چوونکە ئەگەر فیل تەنیا بێت و کەسی لەگەڵ نەبێت، ترسناکترە و کاتێك کەسانی زۆر دەوریان گرتبێت، زیاتر نەرمی لەخۆی نیشان دەدات. شەڕ بەمشێوەیە بەردەوام بوو تا رۆژ کۆتایی پێهات.

رۆژی عەماس لەسەرەتا تا کۆتایی دژوار بوو. عەرەب و عەجەم وەك یەك گرفتار ببوون. هەر پێشهاتێك روویدەدا، پیاوەکانی ناو رێگە هاواریان دەکرد تا هەواڵەکە بەگوێی یەزدگێرد دەگەیشت. یەزدگێرد لەسوپاکەی خۆی ڕەوانە دەکرد. بەهۆی رووداوەکەی رۆژی پێشوو، هێزی پشتیوان بەردەوام ڕەوانە دەکرا و ئەگەر بەخششی خواوەند و گەیشتنی هاشم و کارەکانی قەعقاع نەدەبوو، موسوڵمانان شکستیان دەخوارد.

شەعبی دەڵێت: دوای گرتنی یەرموك و گرتنی دیمەشق، هاشم کوڕی عوتبە لەشامەوە هات. قەیس کوڕی مەکشوحی مورادی لەگەڵ حەوتسەد کەس هاورێیەتیان دەکرد و سەعید کوڕی غەرانی هەمەدانی لەگەڵ حەفتاکەس لەوان بەخێرایی خۆی گەیاندە گۆڕەپانی جەنگ.

موجالید دەڵێت: قەیس کوڕی ئەبی حازم لەگەڵ قەعقاع و یەکێك بوو لەپێشەنگەکانی سوپاکەی هاشم.

عیسمەی وائیلی بەشدار لەقادسیە دەڵێت: هاشم لەگەڵ عێراقییەکان لەشامەوە هات و لەگەڵ دەستەیەکی کەم، پێش کەوتن کەکوڕی مەکشوح یەکێك بوو لەوان. کاتێك لەقادسیە نزیك کەوتنەوە، سێسەد کەسی لەگەڵدا بوو. کاتێك گەیشتن

عەرەبەکان خۆیان بۆ شەڕ ئامادە و هاشم پەیوەستیان بوو.

شەعبی دەڵێت: ڕۆژی سێیەم ڕۆژی عەماس بوو. هیچ یەك لەڕۆژەکانی قادسیە بەو شێوە نەبوو. هەردوو سوپا بەرابەر و لەزیانەکانی خۆیان دەیانناڵاند. بەهەمان ئەندازە کەعەرەبەکان لەفارسەکانیان کوشتبوو، فارسەکانیش لەعەرەبەکانیان کوشتبوو.

ئیسماعیل کوڕی محەممەد کوڕی سەعد دەڵێت: هاشم کوڕی عوتبە لەڕۆژی عەماس گەیشتە قادسیە. ئەو، هەمیشە لەسەر ماین شەڕی دەکرد و سوار ئەسپی نێر نەدەبوو. کاتێك لەناو دوو ریزەکە وەستا، تیرێکی هاویشت و بەرگوێچکەی ئەسپەکەی کەوت و وتی: قێزەون بوو، گومان دەکەن ئەگەر تیرەکەم بەر گوێچکەی ئەسپەکەم نەدەکەوت، دەگەشتە کوێ؟

وتیان: فلاَن شوێن.

لەئەسپەکەی دابەزی و هێرشی بردە سەر دوژمن. شمشێری وەشاند و گەیشتە ئەو شوێنەی ناویان بردبوو.

زیاد دەڵێت: ئەو لەباڵی ڕاستی سوپاکەدا بوو.

ئیسماعیل کوڕی محەممەد دەڵێت: دەمانبینی هاشم لەراست و زۆربەی شەڕکەران لەجیاتی قەڵغان کۆپانی سەر ئەسپەکانیان هەڵگرتبوو و لقی خورمایان پێوەبەستبوو. ئەوانەی قەڵغانیان پێنەبوو، سەری خۆیان بەتەناف بەستبوو.

باوکی کەبران کوڕی حەسەن کوڕی عوقبە دەڵێت: کاتێك قەیس کوڕی مەکشوح لەگەڵ هاشم لەشامەوە هات، قسەی کرد و وتی: ئەی عەرەبەکان، خواوەند یا ئیسلام منەتی خستە سەر ئێوە و بەهۆی پێغەمبەرەوە ڕێزی پێبەخشین و لەنیعمەتەکانی خواوەند بوونە برای یەك، لەدوای ئەوەی وەك شێر پەلاماری یەکتان دەدا و هاوشێوەی گورگ هێرشتان دەکردە سەر یەك، قسەتان یەکە و مەبەستتان یەکە. هاوکاری خواوەند بکەن تا هاوکاریتان بکات. داوا لەخوا بکەن سەرزەمینی فارسەکانتان بۆ ئاوەڵا بکات چوونکە خواوەند شامی بۆ براکانی ئێوە ئاوەڵا کرد و دەستیان بەسەر کۆشك و قەڵا سوورەکاندا گرت..

شەعبی دەڵێت: عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب وتی: من هێرش دەکەمە سەر ئەو فیلەی ڕووبەڕوومان. زیاتر لەکاتی کوشتنی یەك وشتر دوا مەکەون. چوونکە ئەگەر

دوا کەون باوکی سورتان لەدەستداوە چوونکە بۆ ئێوە هاوشێوەی باوکی سورم. ئەگەر بگەنە من، دەمبینن کەشمشێرەم بەدەستەوەیە.

هێرشی برد و نەوەستا تا گەیشتە ریزەکانی دوژمن و لەناو تەپ و تۆزدا ونبوو.

هاوەڵانی عەمرۆ وتیان: چاوەڕوانی چین، بەو ناگەنەوە و ئەگەر ئەو لەدەست بدەن، شاسواری موسوڵمانانتان لەدەستداوە. ئەمەیان وت و هێرشیان کرد.

فارسەکان عەمرۆیان خستبووە سەرزەوی و ئەو شمشێر بەدەست بەرگری دەکرد. ئەسپەکەی کوژرا بوو. کاتێك عەرەبەکان هێرشیان کرد، فارسەکان دەوری ئەویان چۆڵ کرد. عەمرۆ قاچی یەکێك لەئەسپەکانی گرت. پیاوی فارسی ویستی ئەسپەکەی غار پێبدات بەلام ئەسپەکە نەیتوانی بڕوات. پیاوی فارسی هەستی بەعەمرۆ کرد و ویستی بیکوژێت. موسوڵمانان ئەمەیان بینی و هێرشیان کردە سەر پیاوەکە. پیاوی فارسی لەئەسپەکەی هاتەخوار و هەڵات. عەمرۆ وتی: جڵەوی ئەسپەکەم پێبدەن. جڵەوی ئەسپەکەی گرت و سوار بوو.

ئەسوەد کوڕی قەیس لەو کەسانەی لەجەنگی قادسیە بەشدار بوون، دەگێڕێتەوە: لەرۆژی عەماس یەکێك لەفارسەکان هات و کاتێك لەناو دوو ریزەکەدا وەستا، دەنگی بەرز کردەوە و داوای شەڕکەری کرد. یەکێك لەئێمە بەناوی شبر کوڕی عەلقەمە کەپیاوێکی کورتەبالا و لەڕ و ناشیرین بوو، هات و وتی: ئەی موسوڵمانەکان، ئەم پیاوە داوای دادپەروەری دەکات بەلام کەس وەڵامی نەدایەوە و کەس بۆ شەڕی ئەو نەڕۆشتە پێش، سوێند بەخوا ئەگەر ئیهانەم نەکەن، رووبەرووی دەبمەوە.

کاتێك بینی کەس رێگەی لێ ناگرێت، شمشێر و قەڵغانەکەی خۆی هەڵگرت و رووبەرووی پیاوەکە بوویەوە. کاتێك فارسەکە ئەوی بینی، هاواری کرد و لەئەسپەکەی هاتەخوار. هەڵیگرت و کێشای بەزەویدا. لەسەر سکی دانیشت تا خوێنی برێژێت. جڵەوی ئەسپەکەی بەکەمەری خۆیەوە بەستبوو. کاتێك شمشێری دەرکێشا، ئەسپەکە گەڕایە دواوە و جڵەوەکەی راکێشا. پارسی لەسەر سکی عەلقەمە کەوت و کوڕی عەلقەمە لەهەمان کات پەڕییە سەرسنگی و هاوەڵانی دەنگیان بەرز کردەوە. عەلقەمە وتی: چەندەتان پێخۆشە دەنگ بەرز بکەنەوە، من دەستی لێ هەڵناگرم تا دەیکوژم و کەرەستەکانی هەڵدەگرم. ئەوی کوشت و کەل وپەلەکانی

هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ لای سەعد. پێی وت: لەکاتی نیمەڕۆ وەرە لای من.

لەکاتی نیمەڕۆ کەل و پەلی جەنگی پیاوی فارسی بردە لای سەعد. سەعد سوپاسی خوای کرد و وتی: بۆچوونی من ئەوەیە کەل و پەلەکان بەخۆی ببەخشم چوونەکە هەرکەسێك لەکاتی جەنگ شتێك لەدوژمن بستێنێت، تایبەتە بەخۆی. عەلقەمە کەل و پەلەکانی بەدوانزە هەزار درەم فرۆشت.

زیاد دەڵێت: لەرۆژی ئەرماس کاتێك سەعدی بینی فیلەکان بڵاوە بەدەستە شەڕکەرەکان دەکەن، کەسی بۆ لای زەخم و موسلیم و رافیع و عەشنەق و کەسانیتر لەهاوەڵانی فارسی کەباوەڕیان بەئیسلام هێنابوو، نارد و هاتن. لەوانی پرسی: شوێنی هەستیاری فیلەکان کوێیە؟

وتیان: لووت و چاوەکانی کاتێك زیانی بەرکەوێت، چیتر ناتوانن هیچ کارێك بکەن.

سەعد کەسی بۆ لای عاسم و قەعقاع هەردووکیان کوڕەکانی عەمرۆ نارد تا فیلە سپییەکە لەناو ببەن لەبەر ئەوەی فیلەکە رووبەرووی ئەوان بوو. کەسی بۆ لای حەمال ورەبیل نارد تا فیلە ڕەشەکە لەناو ببەن چوونکە لەبەرابەر ئەواندا بوو.

قەعقاع و عاسم دوو ڕمی کورتیان هەڵگرت و لەگەڵ سوار و پیادەکان پێشڕەوییان کرد و وتیان دەوری فیلەکان بگرن و گێژی بکەن. خۆیشیان لەگەڵ ئەوان بوون. حەمال و ڕەبیلیش ئەو کارەیان کرد. کاتێك لەفیلەکان نزیك کەوتنەوە، دەوریان گرتن. فیلەکان سەیری راست و چەپی خۆیان دەکرد و دەیانویست هێرش ببەن. قەعقاع و عاسم لەو کاتەی فیلەکە سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد، ڕمەکانی خۆیان لەچاوی فیلەکە چەقاند کەسەری خۆی راوەشاند و فیل سوارەکەی خستە خوار. لووتی بەرز کردەوە و قەعقاع زەربەیەکی لێدا و لووتی پەڕاند. فیلەکە بەلادا کەوت و هەموو فیل سوارەکان کوژران.

حەمال بەرەبیلی وت: یەکیان هەڵبژێرە یا لووتی بقرتێنە و من چاوی کوێر دەکەم یا چاوی کوێر بکە و من لووتی دەقرتێنم.

رەبیل، لووتی فیلەکەی هەڵبژارد. حەمال هێرشی کردە سەر فیلەکە. فیل سوارەکان تەنیا لەقرتاندنی تەناف سنووقی سەر فیلەکە دەترسان. ئەوان هێرشیان کردە سەر فیلەکە. حەمال بەڕم چاوی کوێر کرد و کەوتە سەر ئەژنۆ و هەستایەوە.

رەبیل بەشمشێر لەلووتیدا و فیل سوارەکە بینی و بەتەور ناوچاوی قەڵیشت.

شەعبی دەڵێت: دەستەیەك لەمناڵەکانی ئەسەد بەحەمال و رەبیلیان وت: ئەی موسوڵمانەکان، چ مەرگێك لەهەمووان دژوارترە.

وتیان: ئەوەی هێرش بکەنە سەر فیلەکە.

ئەوان ئەسپەکانی خۆیان غاردا و هێرشیان کردە سەر فیلەکەی بەرابەریان. یەکیان هێرشی کردە سەر چاوی فیلەکە و یەکی دیکە لووتی قرتاند. فیلسوار بەتەور لەروخساری ئەویدا بەڵام حەمال و رەبیل فیلەکەیان کوشت.

دەڵێت: قەعقاع وبراکەی هێرشیان کردە سەر فیلەکەی بەرابەریان و چاویان کوێر و لووتیان قرتاند. فیلە لەناو دوو ریزەکەدا رایدەکرد و کاتێك دەگەیشتە ناو ریزی موسوڵمانان، بەرم لێیان دەدا و کاتێك دەگەیشتە ریزی فارسەکان، پاشەکشێان پێدەکرد.

هەروەها شەعبی لەحەدیسێکی دیکەدا دەڵێت: دوو فیل لەناو فیلەکان دەبینرا کەفیلەکانی دیکەیان فێر دەکرد. لەرۆژی قادسیە ئەو دوو فیلەیان لەناو دڵی سوپای فارسەکان دانا. سەعد، قەعقاع و عاسمی تەمیمی و حەمال و رەبیلی ئەسەدی بۆ کوشتنی فیلەکان راسپارد.

پاشماوەی گێڕانەوەکە هاوشێوەی گێڕانەوەی یەکەمە جگە لەوەی دەڵێت فیلەکان زیندوو بوون و هاوشێوەی بەراز دەیانناڕاند. ئەو فیلەی کوێر بوو رۆشت تا کەوتە ناو عەتیق و فیلەکەی دیکە بەدوایدا رۆشت و ریزی فارسەکانی پرژ و بڵاو کردەوە و بەدوای فیلی یەکەم لەعەتیق تێپەڕی. فیلەکە لەگەڵ سنوقەکەی رووی لەمەداین کرد و هەموو فیل سوارەکان کوژران.

زیاد دەڵێت: کاتێك فیلەکان رۆشتن، موسوڵمانان رێگەیان بۆ ناو فارسەکان دەستکەوت و سێبەر دروست بوو. موسوڵمانان هێرشیان برد و سوارەکان کەسەرەتای رۆژ شەڕیان کردبوو، پشتیوانییان لەپیادەکان کرد. بوێریان لەخۆیان نیشاندا و تا ئاوا بوونی هەتاو جەنگ بەردەوام بوو. زیان و کوژراوەکانی هەردوولا وەك یەك بوو.

زیاد دەڵێت: کاتی شەو، جەنگ بەردەوام بوو. شەڕ دژوار و هەردوو لا خۆڕاگری

دەکرد و بەرابەر بوون. لەهەردوولا دەنگ بەرز بوویەوە و بە الیلە الهریر ناویان برد چوونکە دوای ئەوە لەقادسیە لەکاتی شەو شەڕ روویندا.

عەبدولرەحمان کوڕی جەیش دەڵێت: لەالیلە الهریر سەعد، تولەیحە و عەمرۆی بۆ ڕێڕەوێك لەخوارەوەی ئوردووگاکە نارد تا چاودێری بکەن لەبەر ئەوەی نەکا دوژمن لەوێوە هێرشیان بکاتەسەر. وتی: ئەگەر دوژمن پێش ئێوە گەیشتە ئەوێ، لەبەرابەر ئەوان جێگیر بن و ئەگەر بینیتان هیچ هەواڵێکیان نییە، لەوێ بمێننەوە تا فەرمانەکانی من بگات.

عومەر کوڕی خەتاب فەرمانی بەسەعددا بوو سەرانی هەڵگەڕاوەکان نەکاتە فەرماندەی سەد کەس و کاتێك عەمرۆ و تولەیحە گەیشتنە ڕێڕەوەکە، کەسیان لەوێ نەبینی. تولەیحە وتی: باشترە لەئاوەکە بپەڕینەوە و لەپشتەوە هێرش بکەینە سەر عەجەمەکان.

عەمرۆ وتی: نا لەخوارەوە گوزەر دەکەین.

تولەیحە وتی: ئەوەی من دەیڵێم، بۆ خەڵکان سوودمەنترە.

عەمرۆ وتی: پێشنیاری کارێك دەکەیت ناتوانم بەرگەی بگرم.

لەیەك جیابوونەوە و تولەیحە لەپشتەوەی عەتیق بەتەنیای ڕێگەی ئوردووگاکەی گرتەبەر و عەمرۆ لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی لەگەڵ خۆیان بردبوویان، ڕۆشتەخوار و هێرشیان کردە سەر دوژمن و فارسەکان کەوتنە جموجۆڵ.

سەعد لەدووبەرەکی ئەوان دەترسا، قەیس کوڕی مەکشوحی لەگەڵ حەفتا کەس بەدوای ئەواندا نارد. قەیس یەکێك بوو لەو سەرکردانەی سەرکردایەتی ئەو بەسەر زیاتر لەسەد کەس ڕەوا نەبوو بەڵام سەعد پێی وت: ئەگەر ئەوانت بینی، تۆ سەرکردەیت.

دەڵێت: قەیس بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە ڕێڕەوەکە کەدوژمن هێرشی کردبووە سەر عەمرۆ و هاوەڵانی و پاشەکشێیان پێکردبوون. قەیس لەعەمرۆ نزیك کەوتەوە و سەرکۆنەی کرد و یەکتریان جوێنباران کرد. هاوەڵانی قەیس وتیان: ئەویان کردۆتە سەرکردەی تۆ.

عەمرۆ بێدەنگ بوو، وتی: کەسێکیان کردۆتە سەرکردەی من کە لەسەردەمی جاهلییەت بەئەندازەی تەمەنێك لەگەڵی جەنگاوم؟ ئەمەی وت و گەڕایەوە بۆ

ئوردووگاکە.

تولەیحە ڕۆشت و کاتێك گەیشتە بەنداوەکە، سێ جار تەکبیری هێنایە سەرزمان. فارسەکان شوێنی کەوتن و نەیانزانی لەکام لاوە ڕۆشتووە. ئەو ڕێگەی خوارەوەی گرتەبەر و لەکەدار تێپەڕی. دواتر گەڕایەوە بۆ ناو ئوردووگاکە و بۆ لای سەعد و بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە. ئەم کارە بۆ فارسەکان ناخۆش بوو. موسوڵمانان رازی بوون بێ ئەوەی بزانن چی ڕوویداوە؟

قەدامەی کاهلی دەڵێت: دەبرا لەمناڵەکانی کاهل کوڕی ئەسەد بوون کەپێیان دەوتن مناڵەکانی حەرب. لەالیلە الهریر، یەکیان لەگۆڕەپانی جەنگ شێعری دەخوێندەوە. یەك لەو دە برایە ناوی عەفاق بوو کاتێك ڕانی پیاوی شێعر خوێن قرتا، هۆنراوەیەکی بەم ناوەڕۆکە خوێندەوە:

((عەفاق چاوەڕوان بە ئەمانە شاسوارەکانن

چاوەڕوان بە و قاچێکی قرتاو تۆ نیگەران نەکات))

هەمان ڕۆژ مرد.

حەمید کوڕی ئەبی شەجار دەڵێت: سەعد تولەیحەی بۆ کارێك نارد بەڵام ئەو کارەکەی پشتگوێ خست و لەعەتیق تێپەڕی و ڕوویکردە ئوردووگای فارسەکان. کاتێك گەیشتە شوێنی بەنداوەکە، سێ جار تەکبیری هێنایە سەرزمان و فارسەکانی ترساند. موسوڵمانان سەریان سوڕما و دەستیان لەیەك هەڵگرت بۆ ئەوەی بزانن ئەمە چییە. فارسەکان کەسیان بۆ لێکۆڵینەوە نارد و موسوڵمانان لەمبارەوە پرسیاریان کرد. فارسەکان لێکدانەوەکانی خۆیان گۆڕی. موسوڵمانان لەشوێنەکانی خۆیان بوون و تولەیحە دەیوت: خۆزگە هەمیشە کەسێك بۆ پەرێشان کردنی فارسەکان بوونی دەبوو.

ئەوسا مەسعود کوڕی مالکی ئەسەدی و عاسم کوڕی عەمرۆی تەمیمی و کوڕی زی ئەلبوردەین هیلالی و کوڕی زی ئەلسەهمەین و قەیس کوڕی هوبەیرەی ئەسەدی و کەسانێکی هاوشێوەی ئەوان ڕووبەڕووی فارسەکان بوونەوە و شەڕیان دەسپێکرد. فارسەکان کۆبوونەوە و لەوان نەدەترسان چوونکە دەیانویست هێرش دەستپێبکەن. ریزێکیان ناردەپێش کە دوو گوێچکەی (؟) بوو. ڕێزێکی دیکە لەدوایانەوە و ڕێزێکی

دیکە و ریزێکی دیکە تا سیانزە ریز لەناو دڵی سوپاکە و شەڕکەرانی هەر دوو باڵی سوپاکە کۆبوونەوە. کاتێک سوارەکانی عەرەب رووبەروویان بوونەوە، تیرهاویشتنیان دەسپێکرد. تیرهاویشتن رێگەی پێشڕەوی لێنەگرتن. سوارەکانی فارس هێرشیان کردە سەر سوارەکانی عەرەب.

لەو شەوەدا خالید کوڕی یەعمەری تەمیمی کوژرا و قەعقاع هێرشی کردە سەر ئەو شوێنەی تیریان بۆ خالید هاویشتبوو. شەڕێکی قورس دەستپێکرد و عەرەبەکان ئالآکانی خۆیانیان بەدەستەوە بوو. قەعقاع مۆڵەتی لەسەعد وەرنەگرتبوو. سەعد وتی: خواوەند ئەم هەڵەی ئەو ببەخشە و هاوکاری بکە چوونکە ئەگەر داوای مۆڵەتی لەمن دەکرد، مۆڵەتم پێدەدا.

موسوڵمانان جگە لەدەستەیەکی کەم کەشەڕیان دەسپێکردبوو، لەشوێنەکانی خۆیان مابوونەوە.

سێ ریز بوون. ریزێکی پیادە و ڕم و شمشێر بەدەست، ریزێك تیرهاوێژەکان و ریزێك سوارەکان کە لەپێش پیادەکانەوە جێگیر ببوون. هەردوو باڵی سوپاکەیش بەمشێوە بوو.

سەعد وتی: کار بەو شێوە بوو کەقەعقاع وتی: کاتێك سێ جار تەکبیرم وت، هێرش دەسپێبکەن. خەڵکان خۆیان ئامادە و لەگەڵ وتەکانی هاودەنگ بوون. ئاشی جەنگ لەسەر قەعقاع و هاوەڵانی دەسوڕا.

عەمرۆ کوڕی موڕە دەڵێت: قەیس کوڕی هوبەیرەی مورادی کەرۆژەکانی پێشتر لەجەنگی قادسیە بەشداری نەکردبوو، بەکەسانی دەوروبەری خۆی وت: دوژمن مەبەستی هێرش کردنی هەیە و بۆچوون، بۆچوونی سەرکردەی سوپایە، نابێت شەڕکەران هێرش بەرن بێ ئەوەی پیادەکانیان لەگەڵدا بێت چوونکە کاتێك هێرش ببەن و دوژمن سوار لەسەر ئەسپ رووبەروویان ببێتەوە و پیادەیان لەگەڵ نەبێت، رێگەیان دەبەستێت و ناهێڵن پێشڕەوی بکەن. بۆ هێرش خۆتان ئامادە بکەن و چاوەڕوانی تەکبیر بن و پێکەوە هێرش دەسپێبکەن.

تیری فارسەکان دەگەیشتە ریزی موسوڵمانان.

موستەنیر کوڕی یەزید دەڵێت: زەید کوڕی کەعبی نەخەعی کەئالآی هۆزی نەخەعی بەدەستەوە بوو، وتی: موسوڵمانان بۆ هێرش کردن ئامادە بوون. ئەمشەو

لەشەڕکەرانی دیکە بۆ جیهاد لەڕێگەی خوا پێشکەون چوونکە هەر کەس ئەمشەو پێشکەوێت، بەو ئەندازەیە پاداشتی دەستدەکەوێت. بۆ شەهید بوون چاولێکەری لەیەکتر بکەن و خوازیاری مەرگ بن چوونکە ئەگەر ژیانتان خۆش دەوێت، تەنیا ڕێگەی زیندوو مانەوە ئەمەیە و ئەگەر خوازیاری ئەو دنیان، پێی دەگەن.

ئەجلەح دەڵێت: ئەشعەس کوڕی قەیس وتی: ئەی عەرەبەکان، ڕەوا نییە ئەم خەڵکە بۆ مەرگ زیاتر لەئێمە تامەزرۆ بن و ئاسانتر چاو لەگیانی خۆیان بپۆشن. لەژن و منداڵەکانی خۆتان بوگزەرێن و لەکوژران مەترسن چوونکە ئارەزووی بەخشەرەکان گیان بەخشین و شەهید بوونە. ئەمەی وت و لەئەسپەکەی هاتەخوار.

عەمرۆ کوڕی محەممەد دەڵێت: حەنزەلە کوڕی ڕەبیع و سەرکردەی دەستە دەکەسییەکان وتیان: ئەی شەڕکەران، لەئەسپەکانتان وەرنەخوار و لەمەرگ مەترسن چوونکە خۆڕاگری باشترین ڕێگەی ڕزگار بوون لەترسە.

دەڵێت: تولەیحە و غالیب و حەماڵ و بویرەکانی دیکە، قسەی هاوشێوەی هێنایە سەرزمان.

نەزر کوڕی سەری دەڵێت: زەرار کوڕی خەتابی قورەشی لەئەسپەکەی هاتەخوار و عەرەبەکان لەکاتی تەکبیرەکانی سەعد و چاوەڕوانی تەکبیرەکانی دیکە، پێشڕەوییان بۆ لای فارسەکان دەستپێکرد و کاتێك تەکبیری دووەمی هێنایە سەرزمان، عاسم کوڕی عەمرۆ هێرشی برد و پەیوەستی قەعقاع بوو. خەڵکانی نەخەعیش هێرشیان برد و هەموو شەڕکەران نافەرمانی سەعدیان کرد جگە لەسەرکردەی خەڵکان کەچاوەڕوانی تەکبیری سێیەمی سەعدیان دەکرد. کاتێك تەکبیری سێیەمی هێنایە سەرزمان، هەمووان هێرشیان برد و پەیوەستی هاوەڵانی خۆیان بوون. شەڕیان لەگەڵ فارسەکان دەستپێکرد و دوای ئەوەی نوێژی ئێوارێیان خوێند، شەڕی شەوانە هەڵگیرسا.

ئەبی تەییبە دەڵێت: لەشەوی لیلە ئەلهریر عەرەبەکان هێرشیان برد و چاوەڕوانی فەرمانی سەعدیان نەکرد. یەکەم کەس هێرشی برد قەعقاع بوو کەسەعد وتی: خواوەندا، ئەم هەڵەی ببەخشە و هاوکاری بکە. پاشماوەی شەو بەردەوام دەیوت: ئەی هاوار لەتەمیمییەکان.

دواتر وتی: پێم وابێت کارەکە بەو شێوەیە ئەو ئەنجامی دەدات، کاتێك سێ جار تەکبیرم وت، هێرش ببەن.

سەعد یەکجار تەکبیری وت و منداڵەکانی ئەسەد پەیوەستی هێرشبەران بوون.

پێیان وت: منداڵەکانی ئەسەد هێرشیان برد.

وتی: خواوەندا بیانبەخشە و هاوکارییان بکە. پاشماوەی شەو دەیوت: ئەی هاوار لەمنداڵەکانی ئەسەد.

دواتر وتیان: تایەفەی نەخەع هێرشیان برد.

وتی: خواوەندا بیانبەخشە و هاوکاریان بکە. پاشماوەی شەو وتی: ئەی هاوار لەخەڵکانی نەخەع.

دوای ئەوە وتیان: بوجەیلە هێرشی برد.

وتی: خواوەندا بیانبەخشە ئەی هاوار لەبوجەیلە.

کێندییەکان هێرشیان برد.

وتی: ئەی هاوار لەخەڵکانی کێندە.

سەران و سەرکردەکان و ئەو کەسانەی چاوەڕوانی تەکبیریان دەکرد، هێرشیان برد و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد کەتا بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر بەردەوام بوو. ئەمە شەوی لیلە الهریر بوو.

ئەنس کوڕی جەلیس دەڵێت: لەو شەوەدا بەشدار بووم و تا بەرەبەیانی دەنگی بەریەك کەوتنی شمشێرەکان تا بەیانی وەك چەکوشی ئاسنگەران بوو. خۆڕاگریان کرد وسەعد شەوێکی بەسەر برد پێشتر هاوشێوەی نەبینیبوو. عەرەب و فارسەکان پێشتر هیچ کات ڕارودۆخێکی لەو شێوەیان بەسەر نەهاتبوو. هەواڵەکان چیتر بەرۆستەم و سەعد نەدەگەیشت. سەعد دەستی بەپاڕانەوە کرد و بۆ بەیانی عەرەبەکان دەستیان لەشەڕ هەڵگرت و لەمەوە بۆی دەرکەوت عەرەبەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە.

محەممەد کوڕی ئەعوەر دەڵێت: یەکەم دەنگ ئەو شەوە سەعد بیستی و نیشانەی سەرکەوتن بوو، دەنگی قەعقاع کوڕی عەمرۆ بوو کە لەنیوەی دووەم شەو بەگوێچکەی سەعد گەیشت. قەعقاع هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەڕۆکە:

(( ئێمە دەستەیەك و زیاترمان کوشت

چوار و پێنج و یەك
کە ئازاتر لەشێرەکان بوون
کاتێك کوژران لەخواپاڕامەوە
بەهەموو هێزمەوە هەوڵمدا.))

کوڕی روفەیل دەڵێت: ئەو شەوە لەسەرەتای شەو تا بەرەبەیان شەڕیان کرد. قسەیان نەدەکرد و هاواریان بەرز دەکردەوە و ئەم شەوەیان بەلیلە الهریر ناوبرد. هەریر بەمانای هاواری کردنە.

مەسعەب کوڕی سەعد دەڵێت: لەو شەوەدا سەعد، بوجادی تازە پێگەیشتووی بۆ ناو ریزەکانی دوژمن نارد چوونکە نێردراوی دەست نەکەوت. پێی وت: بزانە بارودۆخی ئەوان چۆنە؟

کاتێك بوجاد گەڕایەوە، پێی وت: کوڕم چیت بینی؟

وتی: بینیم گەمە و یارییان دەکرد.

عابس کوڕی جەعفەر لەباوکی دەگێڕێتەوە: لەرۆژدا عەماسی جوعەفی لەناو دەستەیەك لەفارسەکان بوو کەسیلاحی تەواویان هەڵگرتبوو. لێیان نزیك کەوتنەوە و شمشێریان وەشاند بەڵام بینیان شمشێرەکان کاریگەری لەسەر ئاسن دانانێت و گەڕانەوە.

حەمیزە وتی: چی روویدا؟

وتی: شمشێر کاریگەری لەسەر ئەوان دانانێت.

وتی: سەیرکەن با نیشانتان بدەم.

هێرشی کردە سەر یەکێك لەفارسەکان و پشتی ئەوی بەڕم کون کرد. سەیری هاوەڵانی خۆی کرد و وتی: خۆ دەبینن، دەتوانن ئەوان بکوژن. عەرەبەکان هێرشیان برد و پاشەکشێیان پێکردن.

شەعبی دەڵێت: سوێند بەخوا لەقادسیە لەهۆزی کێندە زیاتر لەحەوتسەد کەس بەشداری نەکردبوو. تورکی تەبەری لەبەرابەر ئەوان جێگیر ببوو.

ئەشعەس وتی: ئەی خەڵکینە هێرش ببەن. هێرشیان برد و تورك کوژرا.

## شەوی قادسیە

زیاد دەڵێت: شەوی قادسیە بەرەبەیانی لیلە الهریر بوو و لەبەر ئەمە ڕۆژەکەیان بەشەوی قادسیە ناو برد چوونکە شەڕکەران شەکەت و هەمووان چاویان خستبووە سەرەیەك. قەقعاع بەناو سوپاکەیدا گەڕا و وتی: سوپایەك کەئێستا کەشەڕ بکات، دوای کاژێرێك سەرکەوتن بەدەست دێنێت. یەك کاژێر خۆڕاگری بکەن و هێرش ببەن چوونکە سەرکەوتن بەرهەمی خۆڕاگرییە. خۆڕاگری بکەن و سستی لەخۆتان نیشان مەدەن.

دەستەیەك لەسەرکردەکان لەدەوری سوپاکەی ئەشعەس کۆبوونەوە و هێرشیان کردە سەر ڕۆستەم و بەرەبەیان لەگەڵ ئەو دەستە لەشەڕکەرانی فارس کە لەبەردەم ڕۆستەمدا بوون، زاری شەڕیان هەڵدا.

کاتێك خەڵکی هۆزەکان ئەمەیان بینی، دەستەیەك لەناو ئەواندا قسەیان کرد. قەیس کوڕی عەبدیەغوس و ئەشعەس کوڕی قەیس و عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب و کوڕی زی ئەلسەهمەینی خەسعەمی و کوڕی زی ئەلبوردەینی هیلالی قسەیان کرد و وتیان: ئاگادار بن ئەوان لەکاروباری تایبەت بەخواوەند لەئێوە تێکۆشەرتر نەبن و ئاگادار بن ئەوان، فارسەکان، زیاتر لەئێوە خوازیاری مەرگ نەبن و لەکوژران پێش ئێوە نەکەون.

دەستەکانی عەرەب هێرشیان کردە سەر دەستەکانی بەرابەری خۆیان و شەڕیان لەگەڵ کردن. لەناو خەڵکانی ڕەبیعەیش کەسانێك قسەیان کرد و وتیان: ئێوە لەرابردوودا، فارسەکانتان باشتر دەناسی و بەرابەر بەوان بوێرتر بوون، بۆ هەنووکە لەرابردوو بوێرتر نەبن.

کاتی نیمەڕۆ ئەو کەسانەی پاشەکشێیان کرد هورموزان و پیرزان بوون. پاشەکشێیان کرد و دووبارە سەنگەریان گرتەوە. لەکاتی نیمەڕۆ دڵی سوپای فارسەکان کەلێنی تێکەوت و تەپوتۆز بەرز بوویەوە و بایەکی قورس و سەخت هەڵیکرد. سایەوانەکەی ڕۆستەم با بردی و کەوتە ناو عەتیق. ئەمە بای دەبوور و تەپ و تۆز لەزیانی فارسەکان بوو. قەعقاع و هاوڕێکانی گەیشتنە نزیك تەختەکەی ڕۆستەم و بینیان کەسی لەسەر نییە. ڕۆستەم دوای ئەوەی با سایەوانەکەی

رووخاند پەنای بۆ ئاخوری ئێسترەکان برد کە ئەو رۆژە باریان بۆ هێنابوو و لەوێ باریان خستبوو. لەسێبەری ئێسترێك و بارەکەی دانیشتبوو.

هیلال کوڕی عەلەفە بەشمشێر لەو بارەیدا کە رۆستەم لەژێریدا بوو، تەنافەکانی بڕی و تایەکی بار کەوتە سەر رۆستەم. هیلال ئەوی نەدەبینی و لەبوونی ئەو ئاگادار نەبوو. مۆرەکانی پشتی رۆستەم شکا. هیلال بەشمشێر لێیدا و بۆنی موشك بەرز بوویەوە. رۆستەم رووی لەعەتیق کرد و خۆی خستە ناو عەتیق. هیلال شوێنی کەوت و ئەوی لەناو ئاوەکە گرتەوە. قاچی ئەوی گرت و لەئاوەکە دەریهێنا. بەشمشێر کەوتە سەری تا ئەوەی گیانی ئەسپەردە کرد. جەستەی ئەوی هێنا و خستیە بەردەم سمی ئەسپەکان و دواتر خستیە سەر تەختەکەی. هاواری کرد: رۆستەم کوژرا. سوێندتان دەدەم بەخوا کەعبە لەدەوری من کۆببنەوە.

خەڵکان لەدەوری کۆبوونەوە بەشێوەیەك تەختەکەی بەدەرەوە نەبوو و ئەویان نەدەبینی. تەکبیریان وت و دەنگیان بەرز کردەوە.

لەم کاتەدا دڵی سوپای فارسەکان بڵاوەی لێکرد و شکست لەناویاندا بڵاو بوویەوە.

جالینوس لەسەر بەنداوەکە وەستا و هاواری کرد تا فارسەکان بپەڕنەوە. تەپ و تۆز نەما. ئەوانەی بەزنجیر بەستراببوونەوە، پەلەیان کرد و کەوتنە ناو عەتیق. موسوڵمانان بەڕم لێیان دەدان و کەس لەوان رزگاری نەبوو. هەر سی هەزار کەسەکە کوژرا.

زەرار کوڕی خەتاب ئاڵای کاویانی هەڵگرت و سیَ هەزار درەمی پیَ وەرگرت. بەهای ئاڵاکە یەك هەزار هەزار و دووسەد هەزار بوو. لەگۆڕەپانی شەڕ دەهەزار کەس لەفارسەکان کوژرا جگە لەوانەی لەرۆژەکانی پێشوو کوژرا بوون.

عەمرۆ کوڕی سەلمە دەڵێت: لەرۆژی قادسیە هیلال کوڕی عەلەفە رۆستەمی کوشت.

باوکی کەعبی تایی لەباوکی دەگێڕێتەوە: پێش لیلە الهریر دوو هەزار و پێنسەد کەس لەموسوڵمانان کوژرا و لەشەوی لیلە الهریر و رۆژی قادسیە شەش هەزار کەسی دیکەیان لێکوژرا و لەناو خەندەکەکە رووبەرووی ناباوەڕان بەخاکیان

سپاردن.

زیاد دەڵێت: کاتێك فارسەکان لەشوێنەکانی خۆیان هەڵکەنران و لەنێوان قەدیس و عەتیق کەس لەوان نەمایەوە و نێوان خەندەك و عەتیق لەکوژراوەکان پڕ ببوو، سەعد فەرمانی بەزوهرەدا شوێن فارسەکان بکەوێت. ئەو هاواری کرد وپێشەنگەکانی کۆکردەوە و بەقەعقاعی وت بەدوایاندا بڕوات کەرێگەی خوارەوەیان گرتبووەبەر. فەرمانی بەشورەحبیلدا شوێن ئەو کەسانە بکەوێت کەرێگەی سەرەوەیان گرتبووە بەر. فەرمانی بەخالید کوڕی عەرەفتەدا کەل و پەلی کوژراوەکان کۆبکاتەوە و کوژراوەکانی خۆیان بەخاك بسپێرێت.

دوو هەزار و پێنسەد کەس لەکوژراوەکانی لیلە الهریر و کوژراوەکانی پێش ئەو شەوە لەدەوروبەری قەدیس لەو لای عەتیق رووبەرووی رۆژهەلآت دفن کران و کوژراوەکانی دوای لیلە الهریر لەرۆژهەلآت دفن کران.

ساز و بەرگ و کەل و پەلەکان کۆکرایەوە. بەئەندازەیەك بوو پێشتر ئەوەندە تالآنییان بەدەست نەهێنا و دواتریش نەیانتوانی لەهیچ شەڕێکدا بەو ئەندازەیە تالآنی بەدەست بێنن.

سەعد هیلالی بانگ کرد. بۆی پاڕایەوە و وتی: هاورێکەت چی بەسەر هات؟

وتی: خستمە ژێر ئێسترەکان.

وتی: بڕۆ و بیهێنە.

هیلال ڕۆشت و رۆستەمی هێنا.

سەعد وتی: رووتی کەرەوە و ئەوەی ویستت بەجێی بێڵە. هیلال ساز و بەرگ و هەموو شتەکانی لێکردەوە و هیچ پێوە نەهێشت.

کاتێك قەعقاع و شورەحبیل هاتن، هەرکامی بۆ ئەو لایەی کەئەویتر ڕۆشتبوو، راسپارد. قەعقاع رێگەی سەرەوەی گرتەبەر و شوەرحبیل رێگەی خوارەوە و تا خەرارەی قادسیە پێشڕەوییان کرد.

زوهرە کوڕی حەوییە شوێن فارسە هەلآتووەکان کەوت تا گەیشتە بەنداوەکە بەلآم بەنداوەکەیان وێران کردبوو بۆ ئەوەی رێگر بێت لەشوێنکەوتنی عەرەبەکان.

زوهرە وتی: بوکەیر، پێشڕەوی بکە. ئەو، ئەسپەکەی خۆی غاردا، ئەو، هەمیشە لەسەر مێچکە ئەسپ شەڕی دەکرد و وتی: ئیتلال بازدە. ئەسپەکەی دەست و پێی

کۆکردەوە. وتی: سوێندت دەدەم بەسووری بقرە بازدە.

زوهەریش سوار ئەسپێکی نێر بوو، ئەسپەکەی خۆی غارپێدا و سوارەکانی دیکەیش بەهەمان شێوە. لەئاوەکە پەڕینەوە. ژمارەیان سێسەد سوار بوو.

زوهرە بەسوارەکانی دیکەی وت: بۆ لای پردەکە بڕۆن و خۆتان بەئێمە بگەیێنن. ڕۆشت. سوارەکانی ڕوویان لەپردەکە کرد و بەدوای ئەودا ملی ڕێگەیان گرتەبەر. بەفارسەکان گەیشتنەوە کەجالینوس پارێزگاری لەدواوەی سوپاکەی دەکرد. زوهرە ڕووبەڕووی بوویەوە و شەڕ دەستپێکرد. زوهرە ئەوی کوشت و کەل و پەلەکانی هەڵگرت. هەموو ئەو شەڕکەرانەی لەنێوان سەلیحین و نەجەفدا بوون بەدەستی عەرەبەکان کوژران. لەئێوارێدا گەڕانەوە و شەویان لەقادسیە بەسەر برد.

شەقیق دەڵێت: سەرەتای ڕۆژ لەقادسیە پێشڕەویمان کرد و کاتێ گەڕاینەوە، کاتی نوێژ بوو. بانگدەرەکەمان کوژرا بوو. خەڵکان لەسەر بانگدان پێش یەکدەکەوتن. زۆری نەمابوو دەست بۆ شمشێر ببەن. سەعد تیروپشکی لەناو ئەواندا هەڵدا و بەناوی کەسێك دەرچوو و بانگی وت.

دەڵێت: دووبارە ئەو کێشەیە ڕوویدایەوە. ئەوانەی شوێن هەڵاتووان کەوتبوون گەڕانەوە و کاتی نوێژ بوو. لەبەر ئەوەی بانگدەری ئەوان کوژرا بوو بۆ ئەو کارە پێشبڕکێیان دەکرد. سەعد تیروپشکی لەناو ئەوانیش هەڵدا و پاشماوەی ڕۆژ و شەویان بەسەر برد تا زوهرە گەڕایەوە.

بەرەبەیان هەمووان کۆببوونەوە. چاوەڕوانی کەسیان نەدەکرد. سەعد هەواڵی سەرکەوتنی لەگەڵ ژمارەی کوژراوەکانی فارس و عەرەب نووسی و یەکێك لەشارەزاکانی لەگەڵ سەعد کوڕی عومەیلەی فەزاری بۆ لای عومەر کوڕی خەتاب ڕەوانە کرد.

کوڕی ڕوفەیل لەباوکی دەگێڕێتەوە: سەعد منی بانگ کرد و ڕەوانەی کردم تا بەناو کوژراوەکانی خۆماندا بگەڕێم و ناوی سەرکردەکان ببەم. گەڕامەوە و ئاگادارم کردەوە. بەڵام ڕۆستەمم لەشوێنەکەی خۆیدا نەبینی. سەعد کەسی نارد و یەکێك لەمناڵەکانی تیم بەناوی هیلال هات و پێی وت: مەگەر ناڵێیت ڕۆستەمت کوشتووە؟

وتی: بۆ نا.

وتی: کوا جەنازەکەی؟

وتی: خستمە ژێر سمی ئێسترەکان.

وتی: ئەوت چۆن کوشت.

هیلال سەعدی لەچۆنیەتی کوشتنی رۆستەم ئاگادار کردەوە تا ئەوەی کەوتی: بەشمشێر لەسەر و روخساری ئەومدا.

وتی: بیهێنە.

دەڵێت: کاتێك جەستەی رۆستەمی هێنا، ساز و بەرگ و کەل و پەلەکانی بەهیلال بەخشی.

کاتێك رۆستەم کەتبووە ناو ئاوەکە، خۆی سووك کردبوو. هیلال کەل و پەلەکانی ئەوی بەحەفتا هەزار درەم فرۆشت. ئەگەر کڵاوەکەی رۆستەمی دەست دەکەوت، سەد هەزار درەمی دەستدەکەوت..

دەڵێت: چەند کەسێك لەعیبادییەکان هاتنە لای سەعد و وتیان: ئەی ئەمیر جەستەی رۆستەممان لەبەردەم دیواری کۆشکەکەی تۆدا بینی کەسەرێکی دیکەی بەسەرەوە بوو. سەعد پێکەنی.

زیاد دەڵێت: دەیلەمییەکان و سەرانی پادگانەکان کە بەبانگەوازی موسوڵمانەکان رازی ببوون و بێ ئەوەی باوەر بێنن لەشەڕەکەدا هاوکاری موسوڵمانانیان کرد، وتیان: براکانی ئێمە کە لەسەرەتاوە باوەڕیان بەئیسلام هێنا، باشتر و بەختەوەرتر لەئێمە بوون. سوێند بەخوا فارسەکان دوای رۆستەم سەرکەوتن بەدەست ناهێنن مەگەر ئەوەی موسوڵمان بن. و موسوڵمان بوون.

دواتر منداڵەکانی نوردووگاکە هاتن کەقومقومەی چەرمینیان بەدەستەوە بوو. ئاویان بەموسوڵمانەکان دەدا و ئەو فارسانەیان دەکوشت کەهێشتا نیوە گیانێکیان بەبەردا مابوو و شەوانە لەعوزەیب سەرەوخوار دەبوونەوە.

دەڵێت: زوهرە شوێن جالینوس کەوت و قەعقاع و براکەی شورەحبیل شوێن ئەو کەسانە کەوتن کەرێگەی سەرەوەیان گرتبووە بەر. ڕۆشتن و لەگوندەکان و کەنار روبار و دارستانەکان ئەوانیان کوشتار کرد و کاتی نوێژی نیمەڕۆ گەڕانەوە. سەعد دەسخۆشی لەشەڕکەران کرد و تایبەتمەندییەکانی هەر تایەفەیەکی هێنایە سەرزمان و بەچاکە ناوی بردن.

سەعید کوڕی مەرزبان دەڵێت: زوهرە ڕۆشت و لەنێوان خەرارە و سەلیحین بەجالینوس گەیشتەوە. جالینوس یەکێك لەپاشاکانی فارس و تەوق و دوو دەستبەند و دوو گوارەی لەگوێدا بوو. ئەسپەکەی دواکەوت و زوهرە خوێنی ڕشت.

دەڵێت: سوێند بەخوا ئەو ڕۆژە زوهرە سوار لەسەر ئەسپێك بوو کەجڵەوەکەی تەنافێکی چنراو بوو. کەل و پەل و ساز و بەرگی جالینوسی هێنایە لای سەعد. ئەو ئەسیرانەی لای سەعد بوون، ناسیانەوە و وتیان: ئەمە کەل و پەل و ساز و بەرگی جالینوسە.

سەعد وتی: ئایا کەس لەکوشتنی ئەو هاوکاری کردیت؟

وتی: بەڵێ.

وتی: کێ؟

وتی: خواوەند.

سەعد کەل و پەلەکانی جالینوسی بەو بەخشی.

ئیبراهیم دەڵێت: سەعد ئەو هەموو کەل و پەلەی بۆ زوهرە بەزیاد دەزانی. عومەر کوڕی خەتاب لەمبارەوە نامەی بۆ نووسی و وتی: فەرمانم داوە هەرکەس کەسێك بکوژێت، کەل و پەلەکانی بۆ خۆی دەبێت. سەعد ساز و بەرگەکەی تەسلیمی زوهرە کرد و بەحەفتا هەزار درەم فرۆشتی.

شەعبی دەڵێت: زوهرە بەجالینوس گەیشتەوە و هێرشی کردەسەر و تیری بۆ هاویشت و نیشانەکەی پێکا. کاتێك ڕووبەڕووی یەکبوونەوە، زەربەیەکی لێدا و کوشتی.

زوهرە ئەو ڕۆژە پرچی هۆنیبوویەوە. ئەو لەڕۆژگاری جاهلیەت پێگەی بەرز ببوویەوە و لەئیسلامدا کەسێکی تێکۆشەر و پێشنەیەکی چاکەکاری لەخۆی بەجێهێشتبوو. لەو کاتەدا گەنج و ئەوەی جالینوس دەیپۆشی، لەبەری کرد کەباییەکەی حەفتا هەزار درەم بوو. کاتێك هاتە لای سەعد، ساز و بەرگەکەی لێ سەند و وتی: بۆ چاوەڕوانی منت نسەکرد؟ نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و عومەر وەڵامی دایەوە. بەو شێوەیە لەگەڵ زوهرە هەڵس و کەوت دەکەیت لەکاتێکدا بوێری لەخۆی نیشاندا و هێشتا شەڕت لەبەردەم ماوە، دەتەوێت دڵی ڕەش و پیس

بکەیت، ساز و بەرگەکانی پێ ببەخشە و لەکاتی دابەش کردنی تالآنییەکان پێنسەد درەمی زیاتر لەهەمووان پێبدە.

عەسمە دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ سەعد نووسی: من زوهرە باشتر لەتۆ دەناسم. زوهرە هیچ شتێکی لەساز و بەرگەکان نەشاردۆتەوە، ئەگەر سەبارەت بەوان پێداگری کرد، درۆزنە. فەرمانم داوە هەر کەس کەسێك بکوژێت، هەموو کەل و پەلەکانی بۆ بکوژەکە دەبێت.

سەعد ساز و بەرگەکەی بەزوهرەدا و بەحەفتا هەزار درەم فرۆشتی.

عامر دەڵێت: ئەوانەی لەرۆژی قادسیە بوێرانە هەوڵیاندابوو و لەبەخششە ئاساییەکان پێنسەد درەمیان زیاتر وەرگرت، بیست و پێنج کەس بوون کەزوهرە و عەسمە و زەببی و کەلج لەناو ئەواندا دەبینران. شەڕکەرانی شەڕەکانی پێشوو سێ هەزاریان وەردەگرت چوونکە لەشەڕکەرانی قادسیە لەپێشتر بوون.

یەزید کوڕی زەخم دەڵێت: بەعومەر کوڕی خەتابیان وت: چی دەبێت ئەگەر هاوشێوەی شەڕکەرانی پێشوو بەخشش بەشەڕکەرانی قادسیە بدەیت؟

وتی: ئەو کەسانەی لەو رۆژانەدا بەشدار نەبوون، پەیوەستی ئەوان ناکەم.

دەڵێت: هەروەها سەبارەت بەشەڕکەرانی قادسیە بەعومەر کوڕی خەتابیان وت: چی دەبێت ئەو کەسانەی لەماڵ و دیاری خۆیان دوور بوون، زیاتر لەو کەسانەی ماڵ و دیاریان نزیکترە، زیاتریان پێببەخشیت؟

وتی: چۆن ئەوان بەهۆی دووری سەرزەمینەکەیان لەو کەسانەی نزیك دوژمنن، پێش بخەم؟ ئەوانم وەك یەك لەقەڵەمدا بۆ ئەوەی رێگەی چاکەکاری بگرنەبەر چوونکە کۆچکەران لەگەڵ ئەنسارییەکان کەنزیك دیاری خۆیان شەڕیان دەکرد، ئەو کارەیان نەکرد؟

سەعید کوڕی مەرزبان دەڵێت: کاتێك رۆستەم لەشوێنەکەی خۆی دوور کەوتەوە، سوار ئێسترێك بوو. کاتێك هیلال لێی نزیك کەوتەوە، تیرێکی بۆ هاویشت و قاچی ئەوی بەشوێن قاچی ئەسپەکەیەوە دووری.

هیلال لێی نزیك کەوتەوە و رۆستەم لەئێسترەکەی هاتەخوار و پۆشتە ژێر ئێسترەکە. کاتێك هیلال نەیتوانی دەستی پێی بگات، تەنافی بارەکەی بڕی و بارەکە کەوتە سەر پشتی رۆستەم و سەری شکاند.

شەقیق دەڵێت: لەرۆژی قادسیە کەبەشێوەیەکی گشتی هێرشمان کردە سەر فارسەکان، خواوەند شکستی پێهێنان. من ئیشارەم بۆ یەکێك لەشاسوارەکانی فارسی کرد کەبەرەو رووی من دەهات. کوشتم و ساز و بەرگەکەیم هەڵگرت.

سەعید کوڕی مەرزبان دەڵێت: لەو رۆژەدا فارسەکان دوای شکست ئەو بەڵایان بەسەرهات کەتێکشکاوەکان بەسەریاندا دێت، کوژران تا ئەو جێگەی یەکێك لەموسوڵمانان بانگی کەسێك لەوانی دەکرد و نزیك دەکەوتەوە و پیاوی موسوڵمان دەیکوشت. ئەوی بەسیلاحەکەی خۆی دەکوشت. هەندێ کات دوو پیاوی فارسیان دەگرت و بەیەکێکیان دەوت هاورێکەی خۆی بکوژێت.

یونس کوڕی ئەبی ئیسحاق دەڵێت: سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی دەستەیەك لەعەجەمەکانی بینی کە لەژێر ئاڵاکەی خۆیاندا بوون. ئاڵاکەیان لەزەوی چەقاندبوو و وتبوویان لێرە ناجوڵێین تا ئەو کاتەی دەمرین. هێرشی کردە سەریان و هەموو شەرکەرانی ژێر ئاڵاکەی کوشت و ساز و بەرگی ئەوانی هەڵگرت.

دەڵێت: سەلمان لەرۆژی قادسیە شاسواری موسوڵمانان بوو. یەکێك بوو لەو کەسانەی دوای شکست هێرشی دەکردە سەر ئەو فارسانەی خۆڕاگریان دەکرد.

کەسێکی دیکە دەڵێت: دوای ئەوە سەعد، قەعقاع و شورەحبیل بۆ شوێنکەوتنی هەڵاتووان رەوانە کرد. لەرێگە عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعەی زوئەلنور هێرشی کردە سەر دەستەیەك لەفارسەکان کەبۆ هێرش کردنە سەر موسوڵمانان کۆببوونەوە و هاورێ لەگەڵ سوارەکانی خۆی ئەوانی کوشتار کرد.

شەعبی دەڵێت: سەلمان بەندی کەسانی لەخۆیان باشتر دەناسییەوە چوونکە سیلاح بەندی ئاژەڵی قوربانی باش دەناسێت. ئەو شوێنەی هەنووکە زیندانە، ماڵی عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعەی باهلی و شوێنێك کەلەنێوان ئەو شوێنە و ماڵەکەی موختارە، ماڵی سەلمان بوو. ئەشعەس کوڕی قەیس ناوچەیەکی لەبەردەم ئەو شوێنە کەهەنووکە کەوتۆتە ناو ماڵەکەی موختار، وەك وەقف داوا کرد و پێیاندا. سەلمان پێی وت: ئەی ئەشعەس، بەرابەر بەمن بوێر بوویت، سوێند بەخوا ئەگەر داوای ئەو زەوییە بکەیت، بەشمشێر دەتکوژم، بزانە چی لەتۆ دەمێنێتەوە؟ ئەشعەس چاوی لەو زەوییە پۆشی و چیتر داوای نەکرد.

تەڵحە دەڵێت: دوای شکست، سی و چەند دەستە خۆڕاگریان کرد و بەمەرگ رازی بوون. لەهەڵاتن شەرمیان دەکرد و خواوەند ئەوانی لەناو برد. سی و چەند کەس لەسەرکردەی موسوڵمانەکان سەرقاڵی کوشتنی ئەوان بوون و شوێن هەڵاتووان نەکەوتن. سەلمان کوڕی رەبیعە سەرقاڵی لەناوبردنی دەستەیەك و عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە زوئەلنور سەرقاڵی لەناوبردنی دەستەیەکی دیکە و کەسانێك لەسەرکردەکان بەکوشتاری دەستەکانی دیکەوە سەرقاڵ بوون.

شەڕی ئەم دەستانە بەدوو شێوە بوو، دەستەیەکیان نەیانتوانی خۆڕاگری بکەن و هەڵاتن و دەستەیەکی دیکە تا کوژران خۆڕاگرییان کرد.

یەکێك لەسەرکردەی هەڵاتووان هورموزان بوو کەعەتار رووبەروو بوویەوە. ئەو لەبەرابەر حەنزەلە کوڕی رەبیعە دەبیرەکەی پێغەمبەر(د.خ) و زاد کوڕی بەهێش لەبەرابەر عاسم کوڕی عەمرۆ و قارن لەبەرابەر قەعقاع کوڕی عەمرۆ بەرگری دەکرد.

دەڵێت: لەوکەسانەی تا گیاندان بەرگری کرد، شەهریار کوڕی کەنارا کەرووبەرووی سەلمان بوویەوە، کوڕی هوربوز لەبەرابەر عەبدولرەحمان، فەرخانی ئەهوازی لەبەرابەر بوسر کوڕی ئەبی رۆهمی جوهەنی، خوسرەو شەنوومی هەمەدانی لەبەرابەر کوڕی هوزەیلی کاهلی.

ئەبوجەعفەری تەبەری دەڵێت: حەدیسی کوڕی ئیسحاق بەمشێوەیە، دەڵێت: موسەنا کوڕی حارسە مرد و سەعد کوڕی ئەبی وەقاس کچی خەسفە، هاوسەری موسەنای کردە هاوسەری خۆی. ئەم پەیوەندییە لەساڵی چواردەی کۆچ روویدا. لەو ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب سەرکردەی حاجییەکان بوو.

دەڵێت: لەمساڵەدا باوکی عوبەیدەی جەراح رۆشتە ناو دیمەشق و زستانی لەو شارە بەسەر برد. لەهاویندا هێرقل لەگەڵ رۆمییەکان هاتە ئەنتاکییە و لەبەعەرەب بووەکان لەهۆزی لەخم و جوزام و بەلقین و بەلی و عاملە و هۆزەکانی قوزاعە و غەسان و لەخەڵکانی ئەرمەنییە کەسانێکی زۆر هاورێیەتیان دەکرد.

هێرقل لەئەنتاکییە مایەوە و سەقلانی لەگەڵ سەد هەزار کەس نارد کەدوانزە هەزارکەسیان لەئەرمەنییەکان بوون. سەرکردەی ئەرمەنییەکان جەرجە و دوانزە هەزار کەس لەبەعەرەب بووەکان لەغەسان و هۆزەکانی قوزاعە و سەرکردەکەیان جەبەلە کوڕی ئەیهەمی غەسانی و شەرکەرانی دیکە رۆمی بوون. سەقلار فەرماندەی

هەموویان بوو.

دەڵێت: موسوڵمانان لەگەڵ بیست و چوار هەزار کەس بەسەرکردایەتی باوکی عوبەیدەی جەراح بەرێکەوتن و لەرەجەبی ساڵی پانزەیەم لەیەرموك رووبەرووی یەکبوونەوە. شەڕێکی قورس روویدا و رۆمییەکان هاتنە ناو ئوردووگای موسوڵمانان. کەسانێك لەژنانی قوڕیش لەکاتی هاتنی رۆمییەکان بۆ ناو ئوردووگای موسوڵمانان شمشێریان هەڵگرت و پیاوانە جەنگان. دایکی حەکیم کچی حارس لەناویاندا دەبینرا.

دەڵێت: کاتێك موسوڵمانان بۆ رووبەروو بوونەوەی رۆمییەکان بەرێکەوتن، کەسانێك لەهۆزی لەخم و جوزام پەیوەستیان ببوون و کاتێك قورسی شەڕەکەیان بینی، هەڵاتن و روویان لەگوندەکانی دەوروبەر کرد و موسوڵمانانیان بەجێهێشت.

عورووە کوڕی زوبەیر دەڵێت: یەکێك لەموسوڵمانان سەبارەت بەکردەوەی خەڵکانی لەخم و جوزام هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەرۆکە:

((خەڵکانی لەخم و جوزام هەڵاتن
ئێمە و رۆمییەکان دەجەنگاین
ئەگەر دوای ئەمە بێن، چتیر رێگە نادەین پەیوەستمان بن.))

عەبدوڵلە کوڕی زوبەیر دەڵێت: لەساڵی یەرموك لەگەڵ باوکم بووم و کاتێك موسوڵمانەکان بۆ شەڕ ریزیان بەست، زوبەیر زرێکەی پۆشی و سوار ئەسپەکەی بوو. بەدووان لەکۆیلەکانی خۆی وت: عەبدوڵلە لای بارەکان رابگرن چوونکە هێشتا منالە.

دەڵێت: پۆشت و پەیوەستی سوپاکە بوو. کاتێك موسوڵمان و رۆمییەکان جەنگیان دەستپێکرد، دەستەیەکم بینی لەسەر تەپۆڵکەیەك وەستابوون و شەڕیان نەدەکرد. سوار ئەسپەکەی خۆم بووم و پۆشتمە لای ئەو دەستەیە. لەگەڵ ئەوان وەستام وبەخۆم وت: بزانم چی دەکەن. بینیم ئەبوسوفیان کوڕی حەرب لەگەڵ دەستەیەك لەپیرەکانی قورەیش لەکۆچکەرانی گرتنی مەککە وەستابوون و نەدەجەنگان. کاتێك منیان بینی، چوونکە منالْ بووم، گوێیان پێنەدام.

دەڵێت: سوێند بەخوا کاتێك موسوڵمانان پاشەکشێیان دەکرد و رۆمییەکان

لەسەرکەوتن نزیك دەبوونەوە، دەیانوت: زەردەکان، زیاتر، زیاتر، کاتێك موسوڵمانان پێشڕەوی و ڕۆمییەکان پاشەکشێیان دەکرد، دەیانوت: ئەی هاوار لەزەردەکان.

من لەوتەکانی ئەوان سەرمسوڕمابوو. کاتێك خواوەند شکستی بەڕۆمییەکان هێنا و زوبەیر گەڕایەوە، ئەم بەسەرهاتەم بۆ گێڕایەوە، پێکەنی و وتی: خوا بیانکوژێت، دەست لەکینە هەڵناگرن، ئەگەر ڕۆمییەکان بەسەر ئێمەدا سەرکەون، ئەوان چییان پێدەبڕێت؟ ئێمە لەڕۆمییەکان بۆ ئەوان باشترین.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و ڕۆمییەکان وسوپاکەی هێرقل شکستیان خوارد. لەسوپاکەی ڕۆم لەخەڵکانی ئەرمەنییە و بەعەرەب بووەکان نزیکەی حەفتا هەزار کەس کوژرا. خواوەند سەقلار و باهانی کوشت کەهێرقل لەگەڵ سەقلار ڕەوانەی کردبوو.

کاتێك هێرقل ڕووداوەکەی بیست، کەسی نارد تا پیاوە شەڕکەرەکان و خەڵکانی مەڵتییە بێنن و فەرمانیدا شارەکە بسووتێنن.

دەڵێت: لەشەڕی یەرموك لەموسوڵمانان لەتایەفەی مناڵەکانی ئومەییە، عەمرۆ کوڕی سەعید کوڕی عاس و ئەبان کوڕی سەعید کوڕی عاسم و لەمناڵەکانی مەخزوم، عەبدوللە کوڕی سوفیان کوڕی عەبدولئەسەد و لەمناڵەکانی سەهم، سەعید کوڕی حارس کوڕی قەیس کوژران.

دەڵێت: لەکۆتایی ساڵی پانزەیەمی کۆچ، خواوەند لەعێراق ڕۆستەمی کوشت و سوپاکەی یەرموك دوای تەواو بوون لەجەنگ، بۆ هاوکاری کردنی سەعد لەقادسیە شەڕیان کرد.

کاتێك زستان کۆتایی پێهات، سەعد لەشەرافەوە بەرەو قادسیە بەڕێکەوت و ڕۆستەم ئاگادار بوویەوە و بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو، پێشڕەوی کرد. کاتێك سەعد لەپێشڕەوی کردنی ڕۆستەم ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و داوای هاوکاری کرد. عومەر کوڕی خەتاب، موغەیرە کوڕی شوعبەی سەقەفی لەگەڵ چوارسەد کەس لەمەدینەوە نارد، قەیس کوڕی مەشکوحی موڕادی لەگەڵ حەوتسەد کەس ڕەوانە و نامەی بۆ باوکی عوبەیدە نووسی هەزار کەس لەشەڕکەرانی خۆی بۆ هاوکاری کردنی سەعد ڕەوانەی عێراق بکات. باوکی عوبەیدە ئەو کارەی کرد و عەیاز کوڕی غەنەمی فیهری کردە سەرکردەی ئەو هەزارکەسە.

دەڵێت: لەو ساڵە کەساڵی پانزەیەم بوو، عومەر کوڕی خەتاب سەرپەرەستی حەج و حاجییانی دەکرد. کەسرا لەکۆشکی مناڵەکانی موقاتیل پادگانێکی بوو و نەعمان کوڕی قەبیسە سەرکردایەتی پادگانەکەی لەئەستۆدا بوو. نەعمان کوڕی حەییەی تایی و کوڕی مامی قەبیسە کوڕی ئەیاسی تایی فەرمانڕەوای حیرە، لەکۆشکەکەی خۆیدا بوو. کاتێك لەسەعد کوڕی وەقاس ئاگادار بوویەوە، لە عەبدوللە کوڕی سەنانی ئەسەدی سەبارەت بەو پرسیاری کرد. وتی: یەکێکە لەقورەیشییەکان.

نەعمان وتی: سوێند بەخوا ئەگەر قورەیشی بێت هیچ نییە، شەڕی لەگەڵ دەکەم چوونکە قورەیشییەکان بەندەی ئەو کەسەن کەبەسەریاندا زاڵ بێت. سوێند بەخوا پشتیوانی لەپارێزەران ناکەن و بێ پارێزەر سەرزەمینی خۆیان بەجێ ناهێڵن.

عەبدوللە کوڕی سەنان لەم قسەیە توڕە بوو بەڵام چاوەڕێی کرد تا خەوت. لەکاتی خەو ڕۆشتە سەر سەری و ڕمەکەی لەپشتی چەقاند و ئەوی کوشت و ڕۆشتە لای سەعد و باوەڕی هێنا.

دەڵێت: کاتێك موغەیرە کوڕی شوعبە و قەیس کوڕی مەکشوح لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان پەیوەستی سەعد کوڕی ئەبی وەقاس بوون، ڕۆستەم پێشڕەوی کرد و لەقادس کەگوندێکە لەنزیك عوزەیب، دابەزی و خەڵکان لەوێ ئوردوویان لێدا و سەعد لەکۆشکی عوزەیب جێگیر بوو. ڕۆستەم لەگەڵ سوپای فارسەکان لەقادسیە دابەزی. سوپاکەی وەك لەدیوان تۆمار کرابوو جگە لەکۆیلەکان و کەسانی دیکە لەشەست هەزار کەس پێکدەهات. لەنێوان ڕۆستەم و سوپای موسوڵمانان لەعەتیق، پردی قادسیە، جیایی دروست دەکرد.

سەعد لەماڵەکەی خۆی نەخۆش و قورحەیەکی توندی لەگەڵدا بوو. باوکی میحجەنی سەقەفی لەکۆشکەی زیندانی و بەهۆی شەرابخۆری ئەوی زیندانی کردبوو.

کاتێك ڕۆستەم هات کەسی نارد و پەیامیدا تا کەسێکی بیرمەند و فرەزان بۆ لای ئەو بنێرن بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵ بکات. موغەیرە کوڕی شوعبەیان نارد. موغەیرە چوار پرچی هۆنیبوویەوە و بەسەر گوێچکەکانیدا شۆڕی کردبوویەوە. ڕۆشتە لای ڕۆستەم لەو بەر پردی عەتیق. موسوڵمانان لەلای حیجاز لەنێوان قادسیە و عوزەیب جێگیر ببوون.

ڕۆستەم لەگەڵ موغەیرە ئاخاوت و وتی: ئێوە عەرەبەکان خەڵکانێکی هەژار و بەدبەخت بوون. بۆ بازرگانی یا کرێکاری دەهاتنە ولاّتەکەی ئێمە و لەخواردنی ئێمەتان دەخوارد و لەئاوی ئێمەتان دەخواردەوە و لەسێبەری ئێمەدا وەچانتان دەگرت. هاوەڵانی خۆتان هاندا و ئەوانیش هاتن. نموونەی ئێوە هاوشێوەی پیاوێکە کەڕەزێکی ترێی بوو. کەمتیارێکی لەناو ڕەزەکەی خۆیدا بینی و بەخۆی وت ئەم کەمتیارە هیچ نییە بەلاّم کەمتیارەکە ڕۆشت و کەمتیارەکانی هاورێی بۆ ناو ڕەزەکە برد. کاتێك کۆبوونەوە، خاوەنی ڕەزەکە هات و ئەو کونەی کەمتیارەکان لێوەی ڕۆشتبوونە ناو باخەکە، گرتی و هەموویانی کوشت.

دەزانین هەژاری ئێوەی عەرەبی بۆ ئەم کارە ناچار کردووە، ئەمساڵ بگەڕێنەوە چوونکە ڕێگر بوون لەئاوەدان کردنەوەی ولاّتەکەمان و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دوژمنان. وشترەکانتان بەگەنم و جۆ باردەکەین و جل و بەرگتان پێدەدەین. لەدیاری ئێمە بڕۆن بۆ ئەوەی تەندروست بمێننەوە.

موغەیرە وتی: وەك ئاماژەت پێدا هەژار بووین و خراپتر لەوەیش. بەختەوەرترینی ئێمە کەسێك بوو کوڕە مامەکەی خۆی دەکوشت و سامانی ئەوی تالاّن دەکرد و دەیخوارد. مردار و خوێن و ئێسقانمان دەخوارد. بەمشێوەیە بووین تا ئەوەی خواوەند پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە فەرمووین و کتێبێکی بەودا نارد. پێشنیاری خواپەرەستی پێکردین. یەکمان وتەکانی پشتڕاستکردەوە و یەکیتر حاشای لەوتەکانی کرد. ئەوانەی بەراستگۆیان دەزانی شەڕیان لەگەڵ ئەو کەسانە کرد کەبەدرۆزنیان دەزانی تا ئەوەی هەموومان بەدڵنیایی تەواو باوەڕمان بەدینەکەی هێنا چوونکە دەرکەوت کەسێکی ڕاستگۆیە و نێردراوی خواوەندە. ئەو، فەرمانی بەئێمەدا لەگەڵ نەیارەکانمان بجەنگین و پێی وتین هەرکەس لەرێگەی ئەم دینە بمرێت، دەرواتە بەهەشت و هەرکەس بمێنێتەوە، پاشایەتی پێدەبڕێت و بەسەر نەیارەکانی خۆیدا سەردەکەوێت. پێشنیارت پێدەکەین باوەڕ بەخوا و پێغەمبەرەکەی بێنیت، ئەگەر باوەڕ بێنیت، دیاری تۆ بۆ خۆت بەجێدێڵین وهیچ کەس بەبێ ڕەزامەندی تۆ نایێتە ناو سەرزەمینەکەی تۆ بەلاّم دەبێت زەکات وپێنج یەك بدەیت و ئەگەر بەم پێشنیارە رازی نەبوویت، پێویستە جەزیە و ئەگەر رازی نەبوویت، لەگەڵ تۆ دەجەنگین تا خواوەند لەنێوانمان داوەری بکات.

رۆستەم وتی: هیچ کات گومانم نەدەکرد لەئێوەی عەرەب قسەی لەمشێوەیە ببیستم. بەیانی هەمووتان کوشتار دەکەم.

فەرمانیدا لەسەر عەتیق پردێك هەڵبەستن. تەواوی شەو تا بەرەبەیان بەخاك و قامیش و ئاڵف پەردەکەیان هەڵبەست و رێگەکەی ئامادە بوو.

دەڵێت: موسوڵمانان ریزیان بەست. سەعد سەرکردایەتی سوپاکەی بەخالید کوڕی عەرەفتە هاوپەیمانی مناڵەکانی ئومەییە سپارد، باڵی راستی سوپاکەی بەجەریر کوڕی عەبدوللەی بوجلی و باڵی چەپی بەقەیس کوڕی مەکشوح سپارد. رۆستەم هێرشی برد و موسوڵمانان وەڵامیان دایەوە. زۆربەی موسوڵمانەکان قەڵغانیان نەبوو. دارێکیان بەبەرگی کۆپانی وشترەکەی خۆیانەوە بەستبوو و هاوشێوەی قەڵغان کەڵکیان لێوەردەگرت و زۆربەیان بەتەناف سەری خۆیان بەستبوو. هەرکەس تەناف بارەکەی خۆی لەسەری دەپێچا تا سەری بپارێزێت. فارسەکان سەرتاپا زرێپۆش بوون. شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. سەعد لەکۆشکەی سەیری شەڕەکەی دەکرد و سەلمە کچی خەسفە کەپێشتر هاوسەری موسەنا کوڕی حارسە بوو، لای ئەو دانیشتبوو. کاتێك سوپاییەکان کەوتنە جموجۆڵ، وتی: ئەی هاوار بۆ موسەنا، ئەمڕۆ موسەنامان نییە. سەعد شەقەزللەیەکی لەروخساریدا.

سەلما وتی: بۆیە لێتدام چوونکە رژدی بەموسەنا دەبەیت وکەسێکی ترسەنۆکیت.

کاتێك باوکی میحجەن لەزیندانی کۆشکەوە جموجۆڵی سوپاکەی بینی، بەزەبرای ((کەنیزەکەی سەعد کەلای ئەو زیندانی بوو))، وت: ئەی زەبرا، ئازادم بکە، سوێند دەخۆم ئەگەر نەکوژرام دەگەڕێمەوە تادووبارە زنجیر لەقاچم بکەیت.

زەبرا ئازادی کرد و بەلقا ئەسپەکەی سەعدی پێدا. باوکی میحجەن هێرشی کردە سەر سەعد و سەعد لەسەر دیواری کۆشکەکەی سەیری دەکرد. ئەسپەکەی خۆی دەناسییەوە و نەیدەناسییەوە.

کاتێك جەنگەکە کۆتایی پێهات و خواوەند شکستی بەفارسەکان هێنا، باوکی میحجەن گەڕایەوە بۆ لای زەبرا و دووبارە قاچی بەزنجیر بەستەوە. کاتێك سەعد

لەسەرەوەی دیوارەکە هاتەخوار، ئەسپەکەی خۆی بینی کەئارەقی کردبوویەوە. زانی کەسێك سوار ئەسپەکەی بووە. لەزەبرای پرسی و ئەو راستی رووداوەکەی بۆ باس کرد. سەعد فەرمانیدا باوکی میحجەن ئازاد بکەن.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب لەگەڵ موسوڵمانان بەشداری شەڕی قادسیەی کرد.

ئەسوەدی نەخەعی دەڵێت: لەقادسیە بەشدار بووم. بینیم نەوجەوانێك لەخەڵکانی نەخەع شەست تا هەشتا کەس لەمناڵی ئازادەکانی بۆ پێشەوە دەبرد، وتم: خواوەند مناڵی کەسانی ئازادەی ریسوا کرد.

قەیس کوڕی ئەبی حازمی بیجلی لەقادسیە لەگەڵ موسوڵمانەکان بوو، دەڵێت: لەجەنگی قادسیە یەکێك لەسەقیفییەکان هاروێیەتی دەکردین، لەدین هەڵگەڕایەوە و پەیوەستی فارسەکان بوو. بەوانی وت شوێنی بەرگری کردنی عەرەبەکان ناوچەیەکە کەخەڵکانی بوجەیلە لەویّ جێگیرن.

دەڵێت: ئێمە یەك لەسەر چواری سوپاکە بووین. شانزە فیلیان بۆ لەناوبردنی ئێمە نارد و دوو فیلی دیکەیان بۆ پاشماوەی سوپاکە. درکی ئاسنییان دەخستە ژێر سمی ئەسپەکانی ئێمە و دەتوت بارانە لەکاتی باریندا. ئەسپەکانی خۆیان بەیەکەوە بەستبوو بۆ ئەوەی پاشەکشیّ نەکەن.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب لای ئێمە گوزەری کرد، دەیوت: ئەی موهاجیرەکان، شێر بن چوونکە هەرکەس بەباشی تێبکۆشێت، شێرە و پیاوی فارس کاتێك ڕمەکەی خۆی لەدەست بچێت، هاوشێوەی بزنە.

دەڵێت: یەکێك لەشاسوارەکانی فارس کەهیچ کات تیرەکانی بەهەڵەدا نەدەچوون، هێرشی کردەسەرمان. بەعەمرۆمان وت: ئەی باوکی سوور، ئەم سوارە دوور بخەرەوە چوونکە تیرەکانی بەهەڵەدا ناچن. عەمرۆ رووبەرووی بوویەوە و پیاوی فارسی تیرێکی بۆ هاویشت و بەر کەوانەکەی کەوت. عەمرۆ پەلاماریدا و خوێنی ڕشت. دوو تەوق و پشتێنێکی زێرین و قوبایەکی دیبای دەستکەوت.

دەڵێت: خواوەند رۆستەمی کوشت و ئوردووگاکەی کردە تالانی موسوڵمانان. موسوڵمانان شەش یا حەوت هەزار کەس بوون. ئەو کەسەی رۆستەمی کوشت هیلال کوڕی عەلەفەی تەمیمی بوو. ئەوی بینی و رووبەرووی بوویەوە. لەو کاتەی شوێن

ڕۆستەم کەوتبوو تیرێکی بۆ هاویشت و بەرقاچی کەوت. ڕۆستەم بەفارسی دەیوت: ((بپایە)) یانی بەو شێوەی کەهات یا بەو شێوەی کە هەیت.

هیلال هێرشی کردە سەر ڕۆستەم و خوێنی ڕۆشت و سەری بڕی و هەڵیواسی. فارسەکان پاشەکشێیان کرد و موسوڵمانەکان شوێنیان کەوتن و کوشتاریان کردن. کاتێك فارسەکان گەیشتنە خەرارە، دابەزین و شەرابیان خواردەوە و نانیان خوارد. دواتر هاتنەدەر. سەریانسوڕما بوو چوونکە تیرەکانیان کاریگەری لەسەر عەرەبەکان دانەدەنا. جالینوس هات، بێچوویکیان دانا. تیرێکی لێدا و کونی کرد. لەو شوێنەدا بوون کەسوارەکانی موسوڵمان هێرشیان کردە سەر و زوهرە کوڕی حەویەی تەمیمی پەلاماری جالینوسیدا و کوشتی. فارسەکان شکستیان خوارد و ڕوویان لەدێر قوڕە کرد. سەعد لەگەڵ موسوڵمانان هات و لەبەرابەر فارسەکان لەو ناوچەیە سەنگەری گرت. لەم کاتەدا عەیاز کوڕی غەنەم لەگەڵ هێزی پشتیوان لەخەڵکانی شام کەپێکهاتبوون لەهەزار شەڕکەر، پەیوەستیان بوون. سەعد لەتالانییەکانی قادسیە بەشی ئەوانیدا. سەعد لەتاو دومەڵەکانی خۆی ئازاری دەکێشا و جەریر کوڕی عەبدوللە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((من جەریرم و نازناوەکەم باوکی عەمرۆیە
سەعد لەکۆشکەکەیدا بوو خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشی)).

هەروەها یەکێك لەموسوڵمانان هۆنراوەیەکی هۆنییەوە بەم ناوەڕۆکە:

((شەڕمان کرد تا خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین
سەعد لەقادسیە پەنای بۆ کۆشکەکەی بردبوو
لەجەنگ گەڕاینەوە و ژمارەیەکی زۆر لەژنەکان بێوەژن ببوون
بەڵام لەناو ژنەکانی سەعد کەس بێوە نەبوو.))

دەڵێت: کات ئەم هۆنراوانە بەگوێی سەعد گەیشت، هاتە ناو موسوڵمانان و باسی ئازارەکەی خۆی کرد و دومەڵە چڵکاوییەکانی خۆی نیشاندان. موسوڵمانان بەپاساوەکەی ڕازی بوون چوونکە سەعد ترسەنۆك نەبوو. سەعد لەوەڵامی هۆنراوەکەی جەریر کوڕی عەبدوللە وتی:

((سەبارەت بەبوجەیلە هیچ ئارەزوویەکەم نییە

جگە لەوەی لەرۆژی هەستانەوە پاداشتیان پێببڕێت
چوونکە سوارەکانیان رووبەرووی سوارەکان بوونەوە
سوارەکان جەنگان
فیلەکان روویان لەگۆڕەپانی جەنگ کرد
کەهاوشێوەی وشترە تیژپێکان بوون.))

فارسەکان لەدێر قورەوە بەرەو مەداین هەڵاتن. دەیانویست بڕۆن بۆ نەهاوەند. زێر و زیو و دیبا و سیلاح و جل و بەرگەکانی کەسرا و کچەکانی ئەویان لەگەڵ خۆیان برد و جگە لەمانە هەموو شتەکانی دیکەیان بەجێهێشت. سەعد دەستەیەك لەموسوڵمانانی بەشوێن ئەواندا ڕەوانە کرد: خالید کوڕی عەرەفتە هاوپەیمانی مناڵەکانی ئومەییەی نارد، عەیاز کوڕی غەنەم و شەڕکەرەکانی پەیوەستی خالید کرد، هاشم کوڕی عوتەبەی کردە فەرماندەی پێشەنگی سوپاکەی ئەو، جەریر کوڕی عەبدوللە بوجلی وەك فەرماندەی باڵی راست دەستنیشان کرد و زوهرە کوڕی حەویەی تەمیمی وەك فەرماندەی باڵی چەپ. سەعد بەهۆی ئازارەکەی خۆی بەجێما و کاتێك رزگاری بوو، لەگەڵ موسوڵمانانی دیکە، بەدوای ئەواندا بەرێکەوت و لەبێهرسیر نزیك دیجلە پێیان گەیشتەوە. کاتێك لەکەنارەکانی دیجلە ئوردوویان لێدا و باریان خست، بەدوای رێگەیەکدا دەگەڕان بەڵام نەیاندۆزییەوە تا ئەوەی ناباوەڕێك لەخەڵکانی مەداین ڕۆشتە لای سەعد و وتی: رێگەیەکتان نیشان دەدەم و پێش ئەوەی فارسەکان مەودایەکی زۆر لەئێوە دوور بکەونەوە، پێیان دەگەن. ئەوانی لەرێگەی نزیك قەتەربولەوە برد. یەکەم کەس ڕۆشتە ناو رێڕەوەکە، هاشم کوڕی عوتەبە بوو. کاتێك گوزەری کرد سوارەکانی بەدوای ئەودا ڕۆشتن. دواتر خالید کوڕی عەرەفتە لەگەڵ سوارەکانی خۆی گوزەری کرد ودوای ئەوان عەیاز کوڕی غەنەم لەگەڵ شەڕکەرانی خۆی. خەڵکان دەستە لەدوای دەستە هاتن ولەرێگەکە پەڕینەوە. دەڵێن: دوای ئەوە چیتر کەس ئەم رێگەیەی نەدۆزییەوە.

ڕۆشتن تا گەیشتنە سیاچاڵەکانی سابات. ترسان لەوەی دوژمن بۆسەی دانابێت. دوودڵ بوون. یەکەم کەس هاشم کوڕی عوتەبە ڕۆشتە ناو سیاچاڵەکان و کاتێك شمشێرەکەی خۆی بۆ موسوڵمانان تەکاندا دڵنیا بوون هیچ هۆکارێك بۆ ترس و گومان بوونی نییە. خالید کوڕی عەرەفتە ئەوانی پەڕاندەوە.

سەعد پەیوەستی موسوڵمانان بوو و گەیشتنە جەلەولا. دەستەیەك لەفارسەكان لەوێ بوون و شەڕی جەلەولا روویدا. فارسەكان شكستیان خوارد و موسوڵمانان زیاتر لەقادسیە تالانییان دەستكەوت. یەكێك لەكچەكانی كەسرا و بەوتەیەك كچی كوڕەكەی بەناوی مەنجانە كوژرا. یەكێك لەشاعیرانی موسوڵمان لەمبارەوە هۆنراوەیەكی هەیە بەم ناوەرۆكە:

(( چەند زۆر بوون ئەو بێچووە ئەسپە قەڵەوانەی

باری موسوڵمانیان دەگواستەوە

كە لەرێگەی رەحمان لەجەهەننەم رزگاری ببوو

ئەمە لەرۆژی جەلەولا بوو و رۆژی رۆستەم

و رۆژی هێرشی كوفە

ئەو رۆژەی دینی كافران لەناوچوو.))

سەعد هەواڵی سەركەوتنەكەی بۆ عومەر كوڕی خەتاب نووسی. وەڵامی بۆ هاتەوە: لەشوێنەكەی خۆتان بمێننەوە و پێشڕەوی مەكەن.

سەعد نامەی بۆ نووسی: دەستمان بەسەر ناوچەیەكی نزیكدا گرتووە و زەوی بۆ ئێمە كراوەیە.

عومەر كوڕی خەتاب وەڵامی دایەوە: لەشوێنی خۆت بمێنەرەوە و شوێن فارسەكان مەكەوە و بۆ موسوڵمانان وماڵی كۆچ، مەنزڵگەیەكی جیهاد دروست بكە و رووبار مەخەرە نێوان من و موسوڵمانان.

سەعد موسوڵمانانی لەئەنبار كۆكردەوە و گرفتاری ((تا)) بوون.

سەعد نامەی بۆ عومەر كوڕی خەتاب نووسی و ئاگاداری كردەوە.

وەڵامی دایەوە: ئەو ناوچەیە وشتر و مەڕی باشی هەیە و لەوەڕگەیە و شیاو نییە بۆ عەرەبەكان. لەنزیك رووبار بیابانێك بدۆزەرەوە و لەو ناوچەیە شوێنی مانەوە بۆ موسوڵمانان پەیا بكە.

دەڵێت: سەعد بەرێكەوت تا گەیشتە نزیك ناوچەی كویفەی عومەر كوڕی سەعد. میش و تا بڵاو ببوویەوە و لەگەڵ خەڵكان سازگار نەبوو. سەعد، حارس كوڕی موسلیمە و بەوتەیەك عوسمان كوڕی حەنیف لەمناڵەكانی عومەری ((یەكێك بوو

لەئەنسارییەکان) ڕەوانە کرد تا ئەوەی شوێنی ئێستای کوفەی دۆزییەوە. سەعد لەگەڵ موسوڵمانەکان لەوێ دابەزین و بناغەی مزگەوتی کوفەیان داڕشت و گەڕەکەکان بۆ خەڵکان دیاری کران.

عومەر کوڕی خەتاب ئەو ساڵە رووی کردە شام و لەجابیە دابەزی و دەستی بەسەر ئیلیا و شاری بیت المقدسدا گرت.

هەروەها لەم ساڵەدا باوکی عوبەیدەی کوڕی جەراح، حەنزەلە کوڕی توفەیلی سولەمی بۆ حیمس ڕەوانە کرد و خواوەند ئەو شارەی لەسەر دەستی ئەو بەموسوڵمانان بەخشی.

سەعد کوڕی ئەبی وەقاس، شورەحبیل کوڕی سمتی وەك فەرمانڕەوای مەداین دەستنیشان کرد.

## گێڕانەوەوی بارودۆخی خەڵکانی سواد

قەبیسە کوڕی جابر دەڵێت: لەرۆژی قادسیە کاتێك سەرکەوتن بەدەست هات، یەکێك لەئێمە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە و سەرکۆنەی سەعدی کرد. هۆنراوەکەی ئەو کەوتە سەر زاران و سەعد ئاگادار بوویەوە و وتی: خواوەندا ئەگەر درۆزنە یا بۆ ریاکاری و بەدەست هێنانی ناوبانگ ئەم کارەی کردووە، من لەدەست و زمانی ئەو بپارێزە.

قەبیسە دەڵێت: سوێند بەخوا بێژەری هۆنراوەکە لەناو دوو ریزدا بوو، بەهۆی دۆعاکەی سەعدەوە تیرێك هات و لەزمانی چەقی و لایەکی جەستەی وشك کرد و هیچ کات نەیتوانی وشەیەك بێنێتە سەرزمان تا ئەوەی کوژرا.

عوسمان کوڕی رەجای سەعدی دەڵێت: سەعد کوڕی مالك لەهەمووان بوێرتر و ئازاتر بوو. لەکۆشکێکی نەزۆر تۆکمە لەنێوان دوو ریزدا بوو، لەوێوە سەیری سوپاکەی دەکرد.

دایکی کەسیر ژنی هومام حارسی نەخەعی دەڵێت: ئێمە لەگەڵ هاوسەرەکانی خۆمان لەقادسیە بووین و کاتێك لەکۆتایی هاتنی جەنگەکە ئاگادار بووینەوە، جل و بەرگمان لەخۆمانەوە ئالاند و دەفرە ئاوەکانمان هەڵگرت و بۆ لای بریندارەکان

ڕۆشتین. ئاومان بەهەموو موسوڵمانەکاندا و ئەوانمان گواستەوە و فارسە بریندارەکانمان دەکوشت. منداڵەکانیش بەدوامانەوە دەهاتن و ئەم کارەمان بەوان سپارد.

سەیف کوڕی عەتییە دەڵێت: لەشەڕی قادسیە هیچ کام لەعەرەبەکان زیاتر لەبوجەیلە و نەخەع ژنیان لەگەڵ نەبوو. نەخەعییەکان حەوتسەد ژنی بێ هاوسەر و بوجەیلە هەزار ژنیان لەگەڵدا بوو. ئەوان شوویان بەهەزارکەس لەهۆزەکانی عەرەب کرد و ئەوانیش بەحەوتسەد کەسی دیکە.

خەڵکانی نەخەع و بوجەیلەیان بەخزمی موهاجیرەکان ناودەبرد. ئەوان بۆ کاروباری گواستنەوەی کەل و پەل چاونەترس بوون چوونکە خالید بواری بۆ ڕەخساندن و موسەنا دوای خالید و باوکی عوبەید دوای موسەنا و شەڕکەرانی پێش قادسیەیش بواریان ڕەخساندبوو.

تەڵحە دەڵێت: بوکەیر کوڕی عەبدوللەی لەیسی و عوتەبە کوڕی فەرقەد سەهمی و سەماك کوڕی خەرەشەی ئەنساری (ئەم سەماکە جیاوازە لەئەبو دوجانە) لەشەڕی قادسیە خوازبێنیان لەژنێك کرد چوونکە عەرەبەکان ژنەکانی خۆیانیان هێنابوو. نەخەعیەکان حەوتسەد ژنی بێ مێردیان لەگەڵدا بوو و ئەوانیان بەخزمی موهاجیرەکان ناودەبرد. لەکاتی جەنگ پێش سەرکەوتن و دوای سەرکەوتن، موهاجیرەکان ئەوانیان دەکردە هاوسەری خۆیان و حەوتسەد کەس لەخەڵکی هۆزەکان بوونە هاوسەری ئەوان و کاتێك کاروبارەکان کۆتایی هات، ئەم سێ کەسە خوازبێنیان لەو ژنە کرد. ئەو، ئەروی کچی عامری هیلالی، هیلالی نەخەع، بوو و خوشکەکەی هونەیدە ژنی قەعقاع کوڕی عەمرۆ تەمیمی بوو. ئەروی بەخوشکەکەی خۆی وت: لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆت راوێژ بکە بۆ ئەوەی بزانم کامیان بۆ من شیاوترە، ئەم پێشهاتە دوای جەنگەکەوە و هێشتا لەقادسیە بوون. قەعقاع وتی: ئەوان لەهۆنراوەیەکدا بۆ تۆ وەسف دەکەم و تۆ بۆچوونی خۆت بەخوشکەکەت بڵێ. هۆنراوەیەکی بەم ناوەڕۆکە هۆنییەوە:

((ئەگەر درمەکانت دەوێت

بەسەماکی ئەنساری یا کوڕی فەرقەد

بلێ بەڵێ

ئەگەر بوێری کاتی جەنگت دەوێت

بوکەیر هەڵبژێرە

هەموویان پێگەیەکی گەورەیان هەیە

ئاگادار بە ئەم وتانە تایبەتە بەبەیانی تۆ))

دەڵێت: لەعوزەیب تا عەدەنی ئەبین و لەئۆبلەوە تا ئیلە عەرەبەکان چاوەڕوانی جەنگی قادسیەیان دەکرد و دەیانبینی سەقامگیری و پاشایەتی فارسەکان تایبەتە بەو جەنگە و لەهەموو شوێنێك گوێیان هەڵخستبوو بۆ ئەوەی لەسەرئەنجامی جەنگەکە ئاگادار ببنەوە تا ئەو جێگەی ئەگەر کەسێکیان کارێکی دەبوو، دەیوت: چاوەڕێ دەکەین بزانین ئەنجامی جەنگی قادسیە چی دەبێت. کاتێك جەنگی قادسیە روویدا، جنۆکەکان ڕۆشتن و هەواڵی جەنگەکەیان بەچەند کەسێك لەمرۆڤەکان راگەیاند و بەمشێوەیە هەواڵەکە بلاّو بوویەوە.

دەڵێت: شەوانە ژنێك لەسەر سەنعا کەنەیانزانی کێیە، هۆنراوەیەکی لەبارەی شەڕی قادسیە خوێندەوە و دەسخۆشی لەشەڕکەران کرد. خەڵکانی یەمامەیش بیستیان رێبوارێك چەندین هۆنراوە لەبارەی جەنگی قادسیە باس دەکات. لەهەموو سەرزەمینی عەرەبەکان هۆنراوەکان سەبارەت بەجەنگی قادسیە دەخوێندرانەوە.

تەڵحە دەڵێت: سەعد هەواڵی سەرکەوتن و ژمارەی کوژراوەکانی فارس و عەرەبی بەناو بردنی ناوی کەسە ناودارەکان نووسی و بەسەعد کوڕی عەمیلەی فەزاری ڕەوانەی مەدینەی کرد.

کوڕی روفەیل کوڕی میسوریش گێڕانەوەیەکی لەم چەشنەی هەیە. نامەکەی سەعد بەمشێوە بوو:

(( دوای شەڕێکی دووردرێژ و دڵەڕاوکێ، خواوەند ئێمە بەسەر فارسەکاندا زاڵ کرد و پاشایەتی لەوان سەندەوە. لەگەڵ سوپایەك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی موسوڵمانان هاتن کەهیچ کەس شکۆ و گەورەیی هاوشێوەی ئەو سوپایەی نەبینیوە، بەڵام سوودی پێنگەیاندن و خواوەند شکۆی ئەوانی لەناو برد و بەخشی بەموسوڵمانان. موسوڵمانەکان تا ڕووبارەکان و ناو دارستانەکان و دۆڵەکان شوێن فارسە هەڵاتووەکان کەوتن. لەموسوڵمانان سەعد کوڕی عوبەیدی قورئان خوێن و

فلان کەس و فلان کەس و ئەوکەسانەی نازانین و خواوەند باشتر دەزانێت، کوژران کەشەوان قورئانیان دەخوێندەوە و سەرکردەی خەڵکان بوون. هاوتای شێر بوون بەڵام ئەوانەی کوژراون رێزدارتر و گەورەتر لەزیندووەکان نین مەگەر لەپلەی شەهید بوون چونکە خواوەند هێشتا ئەو پێگەی بەمان نەبەخشیوە.))

موجالید کوڕی سەعید دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب لەهاتنی رۆستەم بۆ قادسیە ئاگادار بوویەوە، لەبەرەبەیان تا ئێواریێ لەسەر رێگەی کاروانییەکان دادەنیشت و پرسیاری شەڕکەرانی قادسیەی دەکرد و دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.

دەڵێت: کاتێت مژدەبەری بینی، وتی: لەکوێ؟ ئەو بۆی باس کرد.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەی بەندەی خوا لەگەڵ من قسە بکە.

وتی: خواوەند شکستی بەدوژمن هێنا.

عومەر بەپیادە لەگەڵ ئەو رێگەی دەبڕی و سەبارەت بەهەواڵەکان پرسیاری لێدەکرد. پیاوەکە سوار لەسەر وشترەکەی خۆی و عومەر کوڕی خەتابی نەدەناسی تا ئەو کاتەی رۆشتە ناو مەدینە و خەڵکان بەناوی سەروەری باوەڕداران سڵاویان لەعومەر کوڕی خەتاب کرد، وتی: خوا بتبەخشێت، بۆ نەتوت سەروەری باوەڕدارانیت،

عومەر کوڕی خەتاب وتی: براکەم مەترسە.

زیاد دەڵێت: موسوڵمانان لەچاوەڕوانی گەیشتنی مژدەی سەرکەوتن و فەرمانەکانی عومەر کوڕی خەتاب، تالانییەکانی خۆیان دەخەملاند و سەرقاڵی بریندارەکانی سوپاکە بوون و کارەکانی خۆیانیان رێکدەخست.

دەڵێت: خەڵکانی عێراق لەشەڕکەرانی پێشوو کە لەیەرمووك و دیمەشق ئامادە ببوون، بۆ هاوکاری کردنی سوپاکەی پەیوەستی سوپاکەی قادسیە هاتن و بۆ رۆژەکانی دواتریش هاتنی هێزی پشتیوان بەردەوام بوو. یەکەم دەستەی ئەوان رۆژی ئەغواس گەیشتنە قادسیە و دوایین دەستەیان دوو رۆژ دوای رۆژی سەرکەوتن.... لەناو هێزەکانی پشتیوان لەخەڵکانی هەمەدان و موراد و هۆزەکانی دیکە، کەسانێك دەبینران و نامەیان بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی بۆ ئەوەی فەرمانی خۆی سەبارەت بەوان دەربکات. ئەمە نامەی دووەم دوای سەرکەوتن و

بەنەزیر کوڕی عەمرۆ ڕەوانە کرا.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب لەهەواڵی سەرکەوتن ئاگادار کرایەوە، لەناو خەڵکان وتارێکیداو نامەی سەرکەوتنی بۆ خوێندنەوە، وتی: ئارەزوومە پێویستیەکانی خەڵکان نەهێڵم لەئەگەرێك کەهۆکارەکانی ژیانێکی خۆش بۆهەمووان ئامادە بێت و گەرنە دەبێت لەرۆژییەکان لەگەڵ کەسانی دیکە ببینە شەریك تا هەرکەس ببێتە خاوەنی شتێك. حەزدەکەم لەنهێنییەکانی دڵم ئاگادار ببنەوە و بەکردەوە بۆتان دەردەکەوێت. سوێند بەخوا پادشا نیم ئێوەم کردبێتە بەندەی خۆم، بەندەی خوام کەئەمانەتی ئەویان بەمن سپاردووە، ئەگەر وەرینەگرم و بۆ ئێوەی نەگەڕێنمەوە و یەکێك بم لەشوێنکەوتەکان و ئێوە لەماڵەکانی خۆتان بەخۆشی و کامەرانی ژیان بەسەر ببەن، کەسێکی بەختەوەرم و ئەگەر ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆ و ئێوە لەبەردەرگای ماڵەکەی خۆم کۆبکەمەوە و دەستبەرداری خەلافەت نەبم، کەسێکی بەدبەختم کەبۆماوەیەکی کەم رازی و ماوەیەکی دووردرێژ خەمبار دەبم.

دەڵێت: بەئەنس کوڕی حەلیس نامەیەکیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی کەدەستەیەك لەخەڵکانی سوادی بانگەشەی پەیمان دەکەن و وەك دەزانین هیچکەس جگە لەخەڵکانی بەلقا و خەڵکانی ئەلیسی خواروو پەیمان و بەڵینەکانی خۆیان بەسەر نەبردووە. خەڵکانی سواد دەڵێن فارسەکان ناچاریان کردوون و ئەوانیان کۆکردۆتەوە بەڵام دژایەتی ئێمەیان نەکردووە و لەشەڕەکەدا بەشدار نەبوون. سەعد بەباوکی هەیاجی ئەسەدی نامەیەکی نارد و نووسی کەخەڵکانی سواد ڕۆشتوون و ئەوانەی بۆ بەڵێن و پەیمانەکەی خۆیان ئەمەکدار بوون، هاتوونەتە لای ئێمە و دەڵێن خەڵکانی سواد روویان لەمەداین کردووە. فەرمان خۆت سەبارەت بەوانەی ڕۆشتوون و ئەوانەی دەڵێن بەناچاری کۆکراونەتەوە و هەڵاتوون و لەشەڕەکاندا بەشداریان نەکردووە و ئەوانەی ڕێزیان لەپەیمانەکەی گرتووە یا خۆیان بەدەستەوەدا، دەربکە چوونکە لەسەرزەمینێکی پان و بەرین بڵاو بووینەتەوە و زەوی لەخەڵکانی خاڵی و ژمارەی ئێمە کەمە وئەوانەی پێشنیاری ئاشتیمان پێدەکەن ژمارەیەکی فراوانن. بەدەست هێنانی دڵی ئەوان دەبێتەهۆی ئاوەدانی زەوی و لاوازی دوژمن.

عومەر کوڕی خەتاب لەناو خەڵکان قسەی کرد و وتی: هەرکەس بەپێی هەوا و هەوەس بجووڵێتەوە لەناو دەچێت و جگە لەخۆی زیان لەکەسی دیکە نادات و

هەرکەس بۆ بەدەست هێنانی پاداشت بۆ شوێنکەوتەکانی ڕێگەی ڕزگاری ببێتە یەکێك لەشوێنکەوتەکانی سوونەت و پێیەندی شەریعەتی ئیسلام و ئەرکە ولێپرسراویەتی موسوڵمانان بێت، کاروبارەکان سامان دەگرن و بەمەبەستەکانی خۆی دەگات چوونکە خواوەند دەفەرمێت:

((ووجدوا ما عملوا حاضرا و لا يظلم ربك احدا.

واتاکەی: هەرچییان کردووە ئامادە بن چوونکە پەروەردگار ستەم لەکەس ناکات.))

سەبارەت شەرکەرانی پێشوو و شەرکەرانی قادسیە کە بەسەر سوپای دوژمندا زاڵ بوون و خەڵکانی ئەوێ ڕۆشتوون و ئەوانەی ڕێزیان لەپەیمانەکەی خۆیان گرتووە و پەیوەستی موسوڵمانان بوون و ئەوانەی دەڵێن بەزۆر بۆ بەشداری کردن لەجەنگ ناچاریان کردوون و ئەوانەی کەماونەتەوە و نەڕۆشتوون و ئەوانەی خۆیان بەدەستەوە داوە، چ بۆچوونێکتان هەیە.

خەڵکان هاودەنگ بوون لەسەر ئەوەی ئەوانەی ڕێزیان لەپەیمانەکەی خۆیان گرتووە و هیچ کارێکیان دژی موسوڵمانان ئەنجام نەداوە، هۆکارێکی خێرە و ئەوانەی هاتوون و ڕاستگۆن هاوشێوەی دەستەی یەکەمن و ئەگەر درۆزن بن، پەیمانەکەیان هەڵدەوەشێتەوە و دووبارە دەبێت پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ ببەسترێت و ئەوانەی ڕوویان لەسەرزەمینی فارسەکان کردووە، سەرپشك بکرێن: ئەگەر بخوازن پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ ببەستن و لەپەنای موسوڵماناندا بن و ئەگەر بخوزان بەهەمان شێوە بمێننەوە بەڵام لەزەوییەکانیان دوور دەکەونەوە و بەردەوام موسوڵمانان دژی ئەوان دەجەنگن وئەوانەی ماونەتەوە و تەسلیم بوون، سەرپشك بکرێن لەوەی جەزیە بدەن یا بڕۆن. وەرزێرەکانیش بەهەمان شێوە.

عومەر کوڕی خەتاب نامەکەی ئەنس کوڕی حەلیسی بەمشێوەیە وەڵام دایەوە:

((بەڵام دواتر: خواوەند سەبارەت بەکارەکان ئاسانکاری کردووە جگە لەو کارانەی دادپەروەری وئاگادار کردنەوە و ئاسانکاری نایانگرێتەوە و تەنیا بەوە ڕازی نابێت. لەدادپەروەریش سەبارەت بەنزیك و دوور و سەختی و سستی، ئاسانکاری ناکرێت چوونکە دادپەروەری هەرچەند نەرم و نیان بەرچاو بکەوێت بۆ

لەناو بردنی ستەم و خراپەکاری لەستەم بەهێزترە و ئەگەر ڕەق بێت بۆ لەناو بردنی کوفر بەتواناترە، هەرکەس لەخەڵکانی سواد کە ڕێزی لەپەیمانەکەی خۆی گرتووە و دژی ئێوە هاوکاری فارسەکانی نەکردووە، لەپەنای ئێوەدایە و دەبێت جەزیە بدات و هەرکەس دەڵێت بەزۆر بۆ شەڕ دژی موسوڵمانان ناچارکراوە بەڵام نەجەنگاوە و لەشوێنی خۆیان ماونەتەوە، بەڕاستگۆیان مەزانن مەگەر ئەوەی بخوازن و ئەگەر نەتانخواست پەیمانەکەیان هەڵبوەشێننەوە و ئەوان بگەیێنە شوێنی ئەمانی خۆیان.))

وەڵامی نامەکەی باوکی هەیاجی بەمشێوەیە دایەوە:

((ئەوەی ماوەتەوە و نەڕۆشتووە و پەیمانی نییە، هاوشێوەی ئەو خەڵکانەیە پێشتر پەیمانیان بەستووە و لەگەڵ ئێوەدا ماونەتەوە و دژایەتی ئێوەیان نەکردووە، وەرزێرەکانیش ئەگەر بەمشێوەیە بوون، هاوشێوەی ئەوانن و هەروەها هەموو ئەو کەسانەی کەدەڵێن بەوشێوە بوون، وتەکانیان پشتڕاست بکەنەوە، ئەهلی زەممە بمێننەوە و ئەگەر بەدرۆ خرانەوە، پەیمانەکەیان هەڵبوەشێتەوە و هەرکەس هاوکاری دوژمنی کردووە و ڕۆشتووە، خواوەند سامان و گیانی ئەوانی تایبەت کردووە بەئێوە، ئەگەر دەخوزان بانگیان بکەن بۆ ئەوەی لەسەر زەوییەکان کار بکەن و لەپەنای ئێوەدا بن و جەزیە بدەن و ئەگەر نەتانویست، ئەوەی دەستتان کەوتووە، وەك تالآنی لەناو خۆتاندا دابەشی بکەن.))

کاتێك نامەی عومەر کوڕی خەتاب گەیشتە دەستی سەعد و موسوڵمانان، پێشنیاریان بەو کەسانە کرد کە لەسواد ڕۆشتبوون بگەڕێنە و جەزیە بدەن و ئەوان گەڕانەوە و هاوشێوەی ئەو کەسانەی ڕێزیان لەپەیمانەکەیان خۆیان گرتبوو لەقەڵەمدران بەڵام باج و خەراجی سەرشانیان قورستر بوو. ئەوانەی دەیانوت بەزۆر کۆکراونەتەوە و لەگۆڕەپانی جەنگ هەڵاتوون وەك ئەوان حسێبیان بۆ کردن و پەیمانیان پێدان و هەروەها بەهەمان شێوە مامڵەیان لەگەڵ وەرزێرەکانیش کرد. سامانی بنەماڵەی کەسرا و سامانی ئەو کەسانەی لەگەڵ فارسەکان ڕۆشتبوون و بەجەزیەدان و ملکەچ بوون بۆ ئیسلام ڕازی نەبوون، وەك تالآنی بەموسوڵمانەکان بڕا و لەگەڵ ئەو سامان و تالآنییانەی پێشتر دەستیان بەسەردا گرتبوو لەناو شەڕکەراندا دابەش کرا. خەڵکانی دیکە سواد ئەهلی زەممە بوون و ئەو خەراجەی تەسلیمی

فارسەکانیان دەکرد، بەموسوڵمانانیان دەدا. خەراجی کەسەکان لەخۆگری ژمارەی کەسەکان و سامان و دارایی ئەوان بوو. یەکێك لەو شتانەی خواوەند وەك تالآنی بەموسوڵمانانی بەخشی، سامانی بنەماڵەی کەسرا بوو لەگەڵ ئەوکەسانەی روویان لەسەرزەمینی فارسەکان کرد لەگەڵ ژن و منالی ئەو کەسانەی بۆ هاوکاری کردنی فارسەکان جەنگابوون و سامانی ئاتەشکەدەکان و دارستان و زۆلکاوەکان و ملك و ماڵەکانی تایبەتی کەسرا.

بەلآم دابەش کردنی تالآنییە بەدەست هاتووەکان لەسامانی کەسرا یا ئەو کەسانەی لەگەڵ فارسەکان رۆشتبوون، ئەنجام نەدرا چوونکە لەهەموو سوادا بلآو ببوویەوە و کەسانی بڕواپێکراو بەڕێوبردنی ئەوانیان گرتە ئەستۆ و تالآنی وەرگرەکان تەنیا لەسەر ئەمە کێشەیان بوو. خاوەن ویلایەتەکان لەکاتی کۆکردنەوەی کەسەکان سەبارەت بەدابەش کردن کەمتەرخەمییان دەکرد لەبەر ئەمە نائاگاکان لەکاروباری زەوی و زارەکانی سواد تووشی هەڵە بوون، ئەگەر بیرمەندەکان لەگەڵ بێ ئاوزەکان کەخوازیاری دابەش کردنی ئەم زەوی و زارانە بوون، یەکیاندەگرت، دابەش دەکرا بەلآم بیرمەندەکان رازی نەبوون و کەسانی دیکە شوێن بۆچوونی ئەوان کەوتن و وتاری بێ ئاوزەکان دەور و کاریگەری نەما. عەلی کوڕی ئەبی تالبیش لەسەر ئەم شێوەیە بەردەوام بوو و هەموو ئەوکەسانەی خوازیاری دابەش کردن بوون، گرنگییان بەبۆچوونی کەسانی بیرمەند دەدا و وتیان: با لەسەر ئەم زەوی و زارە کێشە و ئاژاوە دروست نەبێت.

محەممەد کوڕی قەیس دەڵێت: لەعامری شەعبیم پرسی: بارودۆخی سواد چۆنە؟

وتی: بەشەڕ دەستی بەسەرداگیرا، هەموو زەوییەکان بەهەمان شێوە، جگە لەقەلآکان کەخەڵکەکەی ڕۆشتن و پێشنیاری دانی جەزیەیان پێکردن کەرازی بوون و گەڕانەوە و کەوتنە ژێر چەتری موسوڵمانان. ڕەوڕەوی کارەکان بەمشێوە دەڕۆشتە پێش. پێغەمبەریش(د.خ) سەبارەت بەخەڵکانی دومە ئەو کارەی کرد، سامانی کەسرا و ئەوکەسانەی لەگەڵ فارسەکان ڕۆشتبوون، وەك تالآنی لەنێوان موسوڵمانان دابەش کرا.

ماهان دەڵێت: خواوەند بەشەڕ دەستی بەسەر سوادا گرت و بارودۆخی هەموو

زەوییەکانی نێوان سواد و رووباری بەلّخ بەوشێوە بوو جگە لەقەلاّکان، پێشنیاری ئاشتییان بەخاوەن زەوییەکاندا و بوونە ئەهلی زەممە و زەوییەکان تایبەت کرابەوان، بەلاّم سامانی بنەماڵەی کەسرا و کەسانی شوێنکەوتەی ئەوان، بەمشێوەیە نەبوو بەڵکو وەك تالاّنی لەنێوان موسوڵمانان دابەش کرا. زەوییە کراوەکان تالاّنی نەبوو تا دابەش بکرێت، خواوەند فەرموویەتی: ئەوەی ببێتە تالاّنی ئێوە، یانی دابەشتان کرد.

حەسەن کوڕی باوکی حەسەن دەڵێت: هەموو خەڵکانی سواد بۆ شەڕ ناچار کران دواتر پێشنیاریان بەخەڵکان کرد بگەڕێنەوە و جەزیە بدەن. ئەوان رازی بوون و موسوڵمانان پەنایان پێ بەخشین.

عەمرۆ کوڕی محەممەد دەڵێت: بەشەعبیم وت: دەستەیەك گومان دەکەن خەڵکانی سواد بەندەن.

وتی: کەواتە بۆ لەبەندەکان جەزیە وەردەگرن، سواد و هەموو زەوییەکانی دەوروبەری بەشەڕ دەستی بەسەردا گیرا مەگەر قەلاّیەك لەسەر کێوێك یا شتێکی لەو چەشنە. دواتر پێشنیاری گەڕانەوەیان بەخەڵکان کرد و گەڕانەوە و سەرانەیان لێوەرگیرا. لەوانەی دەستیان بەسەردا گیراوە تەنیا ئەوانەی دابەش دەکرێت وەك تالاّنی لەقەڵەم دەدرێت بەلاّم ئەوەی تالاّنی نەبێت و پێش ئەوەی دابەش ببێت خاوەنەکانی بەجەزیەدان رازی بن، تایبەتە بەخۆیان، بارودۆخ بەمشێوە بووە.

محەممەد کوڕی سیرین دەڵێت: هەموو ویلایەتەکان بەجەنگ دەستی بەسەردا گیرا مەگەر دەستەیەك لەقەلاّکان کەپێش تەسلیم بوون پەیمانیان بەست و ئەوانەی سامانیان بەجەنگ دەستی بەسەرداگیرا بوو،پێشنیاریان پێکرا بگەڕێنەوە و جەزیە بدەن بەمشێوەیە هەموو خەڵکانی سواد وکێوەکان لەئەهەلی زەممەن و سەبارەت بەتالاّنییەکانی ئەوان بەمشێوەیە هەڵسوکەوت دەکرێت. عومەر کوڕی خەتاب و موسوڵمانان سەبارەت بەسەرانە و ئەهلی زەممە هاوشێوەی پێغەمبەر(د.خ) دەجووڵانەوە.

پێغەمبەر(د.خ) خالید کوڕی وەلیدی لەتەبوکەوە بۆ دومەئەلجەندەل ڕەوانە کرد کەبەشەڕ دەستی بەسەردا گرت و پاشای دومەئەلجەندەل یانی ئەکیدەر کوڕی عەبدولمەلیکی ئەسیر وپێشنیاری پێکرد جەزیە بدات چوونکە سەرزەمینەکەی

بەجەنگ دەستیبەسەر گیرا و خۆی ئەسیر بوو. لەگەڵ دوو کوڕەکەی عەریزیش بەمشێوەیە جوولاّیەوە چوونکە کاتێك گیران وتیان، بەمەبەستی هاتن بۆ لای تۆ بەرێکەوتن و بەمشێوەیە بەدانی جەزیە ناچار کران.

کاروباری یەحیا کوڕی روبە فەرمانڕەوای ئیلەیش بەمشێوەیە بوو. گێڕانەوەی ناسایی وەك گێرانەوەی تایبەت نییە و هەرکەس شتێك جگە لەکردەوەی پێشینانی دادپەروەر و موسوڵمانان بگێڕێتەوە، درۆ دەکات و پێچەوانەی بۆچوونی ئەوانە.

موسلیم موالی حوزەیفە دەڵێت: موهاجیر و ئەنسار لەخەڵکانی سواد کەشوێنکەوتەی کتێب بوون، چەندین ژنیان وەك هاوسەر هەڵبژارد، ئەگەر بەردە دەبوون ئەم کارەیان بەڕەوا نەدەزانی و ڕەوا نەبوو کەنیزەکانی شوێنکەوتەی کتێب بکەنە هاوسەری خۆیان چوونکە خواوەند دەفەرمێت:

((ومن لم یستطع منکم طولا ان ینکح المحصنات فمن ما ملکت ایمانکم من فتیاتکم المؤمنات.

واتاکەی: هەرکەس لەئێوە لەبەر هەژاری نەیتوانی ژنانی داوێنپاکی باوەڕدار مارە بکات لەوەی بوونەتە خاوەنی لەکەنیزە باوەڕدارەکان هاوسەر هەڵبژێرێت.))

نەیفەرمووە، کچەکانی شوێنکەوتەی کتێب.

سەعید کوڕی جوبەیر دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب دوای ئەوەی حوزەیفەی کردە فەرمانڕەوای مەداین و ژنانی موسوڵمان فراوان بوون، نامەی بۆ نووسی: بیستوومە یەکێك لەژنانی مەداینی شوێنکەوتەی کتێبت کردۆتە هاوسەری خۆت، تەلاّقی بدە.

حوزەیفە لەوەلاّمدا نووسی: ئەو کارە ناکەم تا پێم بڵێی حەرامە یا حەلاّڵ و مەبەستت چییە؟

وەلاّمی دایەوە: حەلاّڵە بەلاّم ژنانی عەجەم دڵ بزوێنترن و ئەگەر باوەش بۆ ئەوان بکەنەوە، ئێوە لەژنانی عەرەب دوور دەخەنەوە.

حوزەیفە وتی: هەنووکە، ژنەکەی تەلاّق دا.

جابر دەڵێت: لەگەڵ سەعد لەقادسیە بووم و ژنانی شوێنکەوتەی کتێبمان وەك هاوسەر هەڵدەبژارد چوونکە ژنانی موسوڵمان بەئەندازەی پێویست نەبوون. کاتێك گەڕاینەوە، دەستەیەکیان ئەوانیان تەلاّقدا و دەستەیەکیان رایانگرتن.

سەعید کوڕی جوبەیر دەڵێت: سوادبەجەنگ دەستی بەسەردا گیرا و پێشنیاریان بەخەڵکەکەی کرد بگەڕێنەوە و جەزیە بدەن. ئەوان رازی بوون و گەڕانەوە. جگە لەسامانی بنەماڵەی کەسرا وشوێنکەوتەکانیان کەوەك تاڵانی لەناو موسوڵماناندا دابەش کرا. ئەم بابەتەیە خەڵکانی کوفە کێشەیان لەسەری هەیە و هێشتا بەئاڵۆزی ماوەتەوە و گومان دەکەن تەواوی سواد بەمشێوە بووە بەڵام بەشی زۆری دانیشتووانی سواد بەو شێوە بوون.

ئیبراهیم کوڕی یەزیدی نەخەعی دەڵێت: سواد بەجەنگ دەستی بەسەرداگیرا و پێشنیاریان پێکرا بگەڕێنەوە. هەرکەس گەڕایەوە جەزیەی لەسەر دانرا و هەرکەس نەگەڕایەوە سامانەکەی وەك تاڵانی لەناو موسوڵمانان دابەش کرا. کڕین و فرۆشی شتێك لەم تاڵانییە، جگە لەزەمینەکانی سواد، لەنێوان کێوەکان تا عوزەیب ڕەوا نییە.

شەعبی دەڵێت: کڕین و فرۆشی شتێك لەم تاڵانییە لەنێوان کێوەکان و عوزەیب ڕەوا نییە.

عامر دەڵێت: زوبەیر و خەباب و کوڕی مەسعود و کوڕی یاسر و کوڕی هوبار لەرۆژگای عوسمان کوڕی عەفان (لەزەمینەکانی سواد) کەڵکیان وەرگرت، ئەگەر عوسمان هەڵەی کرد، هەڵەی ئەوان گەورەترە و ئەم کەسانە بوون ئەوانمان لەدینەکەی خۆمان دوور خستەوە. عومەر کوڕی خەتاب بەتەڵحە و جەریر کوڕی عەبدوللە و رەبیل کوڕی عەمرۆ چەندین پارچە زەوی بەخشی تا بتوانن ژیانی خۆیانی پێدابین بکەن. دار ئەلفیلی بەئەبا مەفرەز بەخشی و هەروەها زەوەی بەچەندین کەسی دیکەدا. ئەم زەوییانە بەشێوەی بەخشش لەپێنج یەکی تاڵانییەکان بوو.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بەهۆی جەریر نامەی بۆ عوسمان کوڕی حەنیف نووسی:

بەجەریر کوڕی عەبدوللە زەوی ببەخشە بەئەندازەی دابین کردنی بژێوی ژیان نەکەمتر نەزیاتر.

عوسمان کوڕی حەنیف لەوەڵامدا نووسی: جەریر نامەیەکی لەتۆوە بۆ هێنام تا زەوی پێببەخشم، نەمویست ئەو کارە بکەم تا لەمەبەستەکەی خۆت ئاگادارم

بکەیتەوە.

عومەر کوڕی خەتاب وەڵامی دایەوە: جەریر ڕاست دەکات، ئەو کارەی بۆ بکە و کارێکی چاکت کرد کەخواستت لەڕاستی وتەکانی دڵنیا ببیت.

دەڵێت: باوکی موسایش زەوی بەکەساندا، عەلی کوڕی ئەبی تالبیش ئەو کارەی کرد و وەسیەی بەکردوس کوڕی هانی دا، هەروەها بەسوەید کوڕی غەفەلە.

سوەید کوڕی غەفەلە دەڵێت: داوای زەوی لەعەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد. وتی: بنووسە ئەمە نامەیەکە عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسیویەتی وزەوی پێدان لەنێوان فلان شوێن تا فلانە شوێن و ئەوەی خوای بیەوێت، بەسوەیل دەدات.

ئیبراهیم کوڕی یەزید دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: کاتێك پەیمان لەگەڵ خەڵکێك دەبەستن، وێرانکاری سوپاییەکان مەگرنە ئەستۆ. موسوڵمانان لەپەیمان نامەکان، لەگەڵ ئەوکەسانەی پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ دەبەستن، دەیانووسی کەوێرانکاری سوپاییەکان لەئەستۆی ئێمەدا نییە.

واقدی دەڵێت: شەڕ و گرتنی قادسیە لەسالی شانزەیەمی کۆچ ڕوویدا، دەستەیەك لەخەڵکانی کوفەیش وتوویانە شەڕی قادسیە لەساڵی پانزەیەم ڕوویدا بەلاّم بەبڕوای ئێمە گێرانەوەی ڕاست ئەوەیە کە ئەم جەنگە لەساڵی چواردەیەم ڕوویدا.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەساڵی پانزەیەم ڕوویدا. پێشتر ئامارژەمان بەگێڕانەوەی ئەودا.

## بنیاتنانی بەسرە

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەگومانی واقدی عومەر کوڕی خەتاب لەساڵی چواردەیەم بەخەڵکانی مەدینەی وت مانگی ڕەمەزان لەمزگەوتەکان بمێننەوە. هەروەها نامەی بۆ خەڵکی ویلایەتەکان نووسی ئەوانیش بەهەمان شێوە.

دەڵێت: بەپێی حەدیسی مەداینی و لەم ساڵەدا، یانی ساڵی چواردەیەم، عومەر کوڕی خەتاب عوتبە کوڕی غەزوانی بۆ بەسرە نارد و فەرمانی پێدا لەگەڵ هاوەلاّنی خۆی لەو ناوچەیە نیشتەجێ ببێت تا پەیوەندی فارسەکانی مەداین و خەڵکانی

دەوروبەری بەسرە لەناو ببات.

بەگومانی سەیف، بەسرە لەمانگی رەبیعی سالّی شانزەیەم بناغەی بۆ دارێژرا و دوای ئەوەی سەعد لەجەلەولا و تکریت و حەسنین تەواو بوو، عوتبە کوڕی غەزوان لەمەداینەوە رووی کردە بەسرە. سەعد بەفەرمانی عومەر کوڕی خەتاب ئەوی ڕەوانە کرد.

شەعبی دەڵێت: مێهران لەساڵی چواردەیەم لەمانگی سەفەر کوژرا و عومەر بەعوتبە کوڕی غەزوانی وت: خواوەند حیرە و ناوچەکانی دەوروبەری بۆ برا موسوڵمانەکانی ئێوە ئاوەلاّ کرد و یەکێك لەگەورەکانی ئەوان کوژرا، دەترسم برا فارسەکانیان هاوکاریان بکەن. دەمەوێت تۆ بۆ سەرزەمینی هیند ڕەوانە بکەم تا ڕێگە نەدەیت خەڵکانی حیرە لەبراکانیان دژی موسوڵمانان هاوکاری وەربگرن. لەگەڵ ئەوان بجەنگە، ئەگەری هەیە خواوەند چەندین ناوچە بەئێوە ببەخشێت. بۆ بەدەست هێنانی بەرەکەتی خواوەند بەرێکەوە و تا ئەو جێگەی دەتوانی لەخوا بترسە و دادپەروەری بکەرە پیشە. لەکاتی خۆیدا نوێژ بخوێنە و بەردەوام ناوی خواوەند وێردی سەرزمانت بێت.

عوتبە لەگەڵ سێسەد و چەند کەس بەرێکەوت. دەستەیەك لەعەرەبە سارانشینەکان پەیوەستیان بوون و لەگەڵ پێنسەد کەس یا زیاتر یا کەمتر گەیشتە بەسرە و لەمانگی رەبیع الاوەل یا رەبیع الاخری ساڵی چواردەیەم لەو ناوچەیە دابەزی. لەو کاتەدا بەسرەیان بەسەرزەمینی هیند ناو دەبرد چوونکە پڕبوو لەبەردی سپی ڕەق.

عوتبە لەخورەیبە دابەزی و لەسنووری خورەیبە و رابووقە و شوێنی منالّەکانی تەمیم و ئەزد زیاتر لەحەوت بینا نەدەبینرا: دووانیان لەخورەیبیە و دووانیان لەشوێنی منالّەکانی ئەزد و دووانیان لەشوێنیب منالّەکانی تەمیم و یەکیان لەرابوقە.

عوتبە نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و شوێنەکەی خۆی بۆوەسف کرد. عومەر لەوەلاّمدا نووسی: خەڵکان لەیەك جێگە کۆبکەرەوە و بلاّوەیان پێمەکە. عوتبە چەند مانگێک لەوێ مایەوە بێ ئەوەی شەڕ بکات و رووبەرووی کەسێك ببێتەوە.

خالید کوڕی عومەیر دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب عوتبە کوڕی غەزوانی نارد و

وتی: لەگەڵ هاوەڵانی خۆت بڕۆ و کاتێك گەیشتنە کۆتایی سەرزەمینی عەرەبەکان و لەدیاری عەجەم نزیك بوونەوە، لەو ناوچەیە نیشتەجێ بن.

دەڵێت: عوتەبە و هاوەڵانی بەرێکەوتن تا گەیشتنە مەربود. دوو بەردیان بینی و وتیان ئەمە بەسرە نییە و ڕۆشتن تا گەیشتنە پردی بچوك، لەوێ قامیش ڕوا بوو و وتیان: دەبێت لێرە بمێننەوە. لەنزیك فەرمانڕەوای فورات دابەزین. کەسانێك ڕۆشتنە لای فەرمانڕەوای فورات و وتیان: خەڵکانێك هاتووم ئاڵایان هەیە و دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر تۆ.

فەرمانڕەوای فورات لەگەڵ چوارهەزار سوارکار هات و وتی: ئەمانەم دەویست، تەناف بکەنە ملیان و بیانهێنن بۆ لای من.

عوتەبە دەستی بەهۆنراوە خوێندنەوە کرد و دەیوت: من هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) بەشداری جەنگەکانم کردووە.

کاتێك هەتاو ئاوا بوو، عوتەبە وتی: هێرش بەرن. موسوڵمانان هێرشیان برد وئەوانیان کوشتار کرد. لەوان جگە لەفەرمانڕەوای فورات کەس بەزیندووی نەمایەوە. ئەویان ئەسیر کرد.

عوتەبە کوڕی غەزوان وتی: بەدوای نشینگەیەکی پاکتر لەم شوێنە بگەڕێن.

ڕۆژێکی گەرم بوو. مینبەرێکیان بۆ عوتەبەدانا. ڕۆشتە سەر مینبەر و وتی: دنیا بەکۆتایی گەیشتووە و تەنیا بەشێکی بچووکی لێ ماوەتەوە، ئێوە لێرەوە بۆ دار القرار دەڕۆن، لەگەڵ کردەوەی چاکە دەڕۆن، پێیان وتووم ئەگەر بەردێك لەلێواری جەهەننەم بکەوێتە خوار، بۆ حەفتا پاییز دەڕواتە خوار ئەوسا دەگاتە بن، ئایا سەرتان سووردەمێنێت؟

پێیان وتووم لەنێوان دوو تای دەرگای دەرگاکانی بەهەشت، چل ساڵ ڕێگەیە و ڕۆژێك دێت ئەوێ پڕ دەبێتەوە، ڕۆژانێك من حەوتەم هاوەڵی پێغەمبەر(د.خ) بووم و جگە لەگەڵای دار خواردنمان دەست نەدەکەوت. ئەوەندەمان گەڵا خوارد لێومان ئاوسا. گەڵایەکەم هەڵگرت و لەگەڵ سەعد دابەشمان کرد. هەرکەس لەم حەوت کەسە ئەمیری یەکێك لەویلایەتەکانە. دوای ئێمە کەسانی دیکە دەبنە ئەزموون بۆ ئێوە.

عەمرۆ دەڵێت: کاتێك عوتەبە کوڕی غەزوانی مازنی، لەمناڵەکانی مازن مەنسور،

لەمەداینەوە رووی کردە دەروازەی هیند، لەکەنار دەریا لەبەرابەر دوورگەی عەرەب دابەزی تا لەوێ بمێنێتەوە. دواتر شوێنەکەی گۆڕی. خەڵکان سکاڵایان بەرز بوویەوە. عومەر کوڕی خەتاب فەرمانی پێدا، لەبەردەڵاندا مەنزڵ بگرێت، پێشتر سێ شوێنی گۆڕیبوو چوونکە حەزیان بەشوێنی گڵی نەدەکرد. مەنزڵگەی چوارەم بەسرە بوو. بەسرە سەرزەمینێکە هەموو بەردەکانی گەچە. فەرمانیان پێدرا رووبارێك لەدیجلە جیا بکەنەوە و جۆگەیەکیان بۆ ئاوی خواردنەوە دروست کرد. نیشتەجێ بوونی خەڵکانی بەسرە لەبەسرە و نیشتەجێ بوونی خەڵکانی کوفە لەکوفە، لەیەك مانگدا بوو. پێش ئەوەی لەو شوێنانە نیشتەجێ بن، لەمەداین بوون تا ئەوەی روویان لەکوفە کرد. خەڵکانی بەسرە لەکەناری دیجلە بوون و چەند جارێك شوێنیان گۆڕی تا ئەوەی لەبەسرە ئارامیان گرت. لەسەرەتا فەرسەخێك ڕۆشتن و جۆگەیەکیان دروست کرد. دوای ئەوەی گەیشتنە بەردەڵان و جۆگەکەیان تا ئەو ناوچەیە درێژ کردەوە. هاوشێوەی کوفە پلانی گەڕەکانی بەسرەیان داڕشت. کاروباری تایبەت بەنیشتەجێ کردنی خەڵکان لەبەسرە لەئەستۆی باوکی جەڕ و عاسم کوڕی دولف لەمناڵەکانی عیلانی تەمیم بوو.

نەسر کوڕی ئیسحاقی سولەمی دەڵێت: قوتەبە کوڕی قتادەی سەدووسی هێرشی دەکردە سەر ناوچەی خورەیبەی بەسرە بەهەمان شێوە کەموسەنا کوڕی حارسە هێرشی دەکردە سەر ناوچەی حیرە. قوتەبە نامەی بۆ عومەر نووسی و لەبارودۆخی خۆی ئاگاداری کردەوە و وتی: ئەگەر ژمارەیەکی کەمی لەگەڵدا بێت دەتوانێت بەسەر فارسەکاندا سەرکەوێت و ئەوان لەسەرزەمینەکەیان دەربەڕێنێت. دوای شەڕی خالید لەرووباری زەن، عەجەمەکانی ئەم ناوچەیە لەقوتەبە دەترسان.

عومەر کوڕی خەتاب وەڵامی دایەوە: نامەکەی تۆ بەمن گەیشت، نووسیبووت هێرش دەکەیتە سەر عەجەمەکانی دەوروبەری خۆت، کارێکی چاکت کردووە و هیوادارم سەرکەوتن بەدەست بێنیت، لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە و ئاگات لەموسوڵمانان بێت تا فەرمانەکانی منت بەدەست دەگات.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب، شورەیح کوڕی عامر لەمناڵەکانی سەعدی بۆ بەسرە ڕەوانە کرد و وتی: لەوێ فەرماندەی پاشکۆی موسوڵمانان بە. ئەو، گەیشتە بەسرە و قوتەبەی لەوێ دانا و رووی کردە ئەهواز تا گەیشتە دارس. پادگانێك

لەعەجەمەکان لەوێ بوو، ئەویان کوشت. عومەر کوڕی خەتاب دوای ئەو عوتەبە کوڕی غەزوانی نارد.

عەبدولمەلیك کوڕی عومەیر دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب عوتەبە کوڕی غەزوانی بۆ بەسرە دەنارد، پێی وت: ئەی عوتەبە! تۆ وەك فەرمانڕەوای سەرزەمینی هیند دەستنیشان دەکەم کەیەکێکە لەناوچەکانی دوژمن و هیوادارم خواوەند هاوکاریت بکات و بەسەر سەرزەمینەکانی دەوروبەری زاڵ ببیت. نامەم بۆ عەلا کوڕی حەزرەمی نووسیوە تا عەرەفجە کوڕی هەرسیمە کەبۆ فێڵ و شەڕ لەگەڵ دوژمن کەسێکی بەئەزموونە بۆ هاوکاری تۆ ڕەوانە بکات. کاتێك هاتە لای تۆ، راوێژی لەگەڵ بکە و رێزی بگرە. پێشنیاری ئیسلام بەخەڵکان بکە، هەرکەس رازی بوو، رازی ببە و هەرکەس رازی نەبوو، دەبێت بەریسواییەوە بەدانی جەزیە رازی ببێت و گەرنە بێ دوودڵی شمشێر داوەری دەکات. لەو ئەرکەی بەتۆیان سپاردووە، لەخوا بترسە، لەخۆت بایی مەبە تا دڵی هاوەڵانت لێ پیس نەبێت. تۆ هاودەمی پێغەمبەر(د.خ) بوویت و بەهۆی ئەوەوە، دوای ریسوایی، رێزت پێبەخشراوە و بوویتە خاوەن دەسەڵات و فەرمان دەکەیت و فەرمانەکانت جێبەجێ دەکرێن، چ نیعمەتێکە ئەگەر تۆ لەپێگەکەی ئێستا بەرز نەکاتەوە و لەگەڵ ژێر دەستەکان خراپەکاری نەکەیتە پیشە. لەگوناح خۆت بەدوور بگرە چوونکە لای من لەگوناح ترسێنەرترە. ئاگادار بەنیعمەتەکان فریوت نەدەن و هەڵە و خراپەکاری بکەیتە پیشە چوونکە دەڕۆیتە جەهەننەم. هیوادارم خواوەند من و تۆ لەو ئازابە بپارێزێت. خەڵکان کاتێك دنیا باوەشی بۆ کردنەوە، ڕوویان لەخوا کرد چوونکە مەبەستیان دنیا بوو. خوات لەبیر بێت و دنیا بکەرە مەبەستی خۆت و لەڕووخانی ستەمگەران بترسە.

شەعبی دەڵێت: عوتەبە کوڕی غەزوان لەگەڵ سێسەد کەس گەیشتە بەسرە و کاتێك قامیشەڵانەکانی بینی و دەنگی قرپۆکی بیست، وتی: سەروەری باوەڕداران فەرمانی پێداوم لەدوورترین شوێنی عەرەب و نزیکترین گوندی سنووری عەجەمەکان مەنزڵ بگرین. ئێرەیە و جێبەجێ کردنی فەرمانی سەروەری باوەڕداران پێویستە. لەخورەیبیە دابەزی.

لەمەداینەوە رووی کردە دەروازەی هیند، لەکەنار دەریا لەبەرابەر دوورگەی عەرەب دابەزی تا لەوێ بمێنێتەوە. دواتر شوێنەکەی گۆڕی. خەڵکان سکاڵایان بەرز بوویەوە. عومەر کوڕی خەتاب فەرمانی پێدا، لەبەردەڵاندا مەنزڵ بگرێت، پێشتر سێ شوێنی گۆڕیبوو چوونکە حەزیان بەشوێنی گڵی نەدەکرد. مەنزڵگەی چوارەم بەسرە بوو. بەسرە سەرزەمینێکە هەموو بەردەکانی گەچە. فەرمانیان پێدرا رووبارێك لەدیجلە جیا بکەنەوە و جۆگەیەکیان بۆ ئاوی خواردنەوە دروست کرد. نیشتەجێ بوونی خەڵکانی بەسرە لەبەسرە و نیشتەجێ بوونی خەڵکانی کوفە لەکوفە، لەیەك مانگدا بوو. پێش ئەوەی لەو شوێنانە نیشتەجێ بن، لەمەداین بوون تا ئەوەی روویان لەکوفە کرد. خەڵکانی بەسرە لەکەناری دیجلە بوون و چەند جارێك شوێنیان گۆڕی تا ئەوەی لەبەسرە ئارامیان گرت. لەسەرەتا فەرسەخێك رۆشتن و جۆگەیەکیان دروست کرد. دوای ئەوەی گەیشتنە بەردەڵان و جۆگەکەیان تا ئەو ناوچەیە درێژ کردەوە. هاوشێوەی کوفە پلانی گەڕەکانی بەسرەیان داڕشت. کاروباری تایبەت بەنیشتەجێ کردنی خەڵکان لەبەسرە لەئەستۆی باوکی جەڕ و عاسم کوڕی دولف لەمناڵەکانی عیلانی تەمیم بوو.

نەسر کوڕی ئیسحاقی سولەمی دەڵێت: قوتەبە کوڕی قتادەی سەدووسی هێرشی دەکردە سەر ناوچەی خورەیبەی بەسرە بەهەمان شێوە کەموسەنا کوڕی حارسە هێرشی دەکردە سەر ناوچەی حیرە. قوتەبە نامەی بۆ عومەر نووسی و لەبارودۆخی خۆی ئاگاداری کردەوە و وتی: ئەگەر ژمارەیەکی کەمی لەگەڵدا بێت دەتوانێت بەسەر فارسەکاندا سەرکەوێت و ئەوان لەسەرزەمینەکەیان دەرپەڕێنێت. دوای شەڕی خالید لەرووباری زەن، عەجەمەکانی ئەم ناوچەیە لەقوتەبە دەترسان.

عومەر کوڕی خەتاب وەڵامی دایەوە: نامەکەی تۆ بەمن گەیشت، نووسیبووت هێرش دەکەیتە سەر عەجەمەکانی دەوروبەری خۆت، کارێکی چاکت کردووە و هیوادارم سەرکەوتن بەدەست بێنیت، لەشوێنەکەی خۆت بمێنەرەوە و ئاگات لەموسوڵمانان بێت تا فەرمانەکانی منت بەدەست دەگات.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب، شورەیح کوڕی عامر لەمناڵەکانی سەعدی بۆ بەسرە ڕەوانە کرد و وتی: لەوێ فەرماندەی پاشکۆی موسوڵمانان بە. ئەو، گەیشتە بەسرە و قوتەبەی لەوێ دانا و رووی کردە ئەهواز تا گەیشتە دارس. پادگانێك

لەعەجەمەکان لەوێ بوو، ئەویان کوشت. عومەر کوڕی خەتاب دوای ئەو عوتەبە کوڕی غەزوانی نارد.

عەبدولمەلیك کوڕی عومەیر دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب عوتەبە کوڕی غەزوانی بۆ بەسرە دەنارد، پێی وت: ئەی عوتەبە! تۆ وەك فەرمانڕەوای سەرزەمینی هیند دەستنیشان دەکەم کەیەکێکە لەناوچەکانی دوژمن و هیوادارم خواوەند هاوکاریت بکات و بەسەر سەرزەمینەکانی دەوروبەری زاڵ ببیت. نامەم بۆ عەلا کوڕی حەزرەمی نووسیوە تا عەرەفجە کوڕی هەرسیمە کەبۆ فێڵ و شەڕ لەگەڵ دوژمن کەسێکی بەئەزموونە بۆ هاوکاری تۆ ڕەوانە بکات. کاتێك هاتە لای تۆ، راوێژی لەگەڵ بکە و رێزی بگرە. پێشیناری ئیسلام بەخەڵکان بکە، هەرکەس رازی بوو، رازی ببە و هەرکەس رازی نەبوو، دەبێت بەریسواییەوە بەدانی جەزیە رازی ببێت و گەرنە بێ دوودڵی شمشێر داوەری دەکات. لەو ئەرکەی بەتۆیان سپاردووە، لەخوا بترسە، لەخۆت بایی مەبە تا دڵی هاوەڵانت لێ پیس نەبێت. تۆ هاودەمی پێغەمبەر(د.خ) بوویت و بەهۆی ئەوەوە، دوای ریسوایی، رێزت پێبەخشراوە و بوویتە خاوەن دەسەڵات و فەرمان دەکەیت و فەرمانەکانت جێبەجێ دەکرێن، چ نیعمەتێکە ئەگەر تۆ لەپێگەکەی ئێستا بەرز نەکاتەوە و لەگەڵ ژێر دەستەکان خراپەکاری نەکەیتە پیشە. لەگوناح خۆت بەدوور بگرە چوونکە لای من لەگوناح ترسێنەرترە. ئاگادار بەنیعمەتەکان فریوت نەدەن و هەڵە و خراپەکاری بکەیتە پیشە چوونکە دەڕۆیتە جەهەننەم. هیوادارم خواوەند من و تۆ لەو ئازابە بپارێزێت. خەڵکان کاتێك دنیا باوەشی بۆ کردنەوە، روویان لەخوا کرد چوونکە مەبەستیان دنیا بوو. خوات لەبیر بێت و دنیا بکەرە مەبەستی خۆت و لەرووخانی ستەمگەران بترسە.

شەعبی دەڵێت: عوتەبە کوڕی غەزوان لەگەڵ سێسەد کەس گەیشتە بەسرە و کاتێك قامیشەڵانەکانی بینی و دەنگی قرپۆکی بیست، وتی: سەروەری باوەڕداران فەرمانی پێداوم لەدوورترین شوێنی عەرەب و نزیکترین گوندی سنووری عەجەمەکان مەنزڵ بگرین. ئێرەیە و جێبەجێ کردنی فەرمانی سەروەری باوەڕداران پێویستە. لەخورەیبیە دابەزی.

پێنسەد کەس لەسوارەکان لەئۆبلە و پارێزگاریان لەو ناوچەیە دەکرد. ئۆبلە لەنگەرگەی ئەو کەشتییانە بوو لەچین و ناوچەکانی دیکەوە دەهاتنە ئەو سەرزەمینە. عوتبە ڕۆشت و لەنزیك ئۆجانە مەنزڵی گرت. بۆ ماوەی یەك مانگ مایەوە. دوای خەڵکانی ئۆبلە دەورەیاندا، ڕووبەڕوویان بوویەوە و قوتبە کوڕی قتادەی سەدووسی و قسامە کوڕی زوهەیری مازنی لەگەڵ دە سواری دیکەی هەڵبژارد و فەرمانی پێدان لەپشت سەری ئەوانەوە بن و هەلاتووان بگەڕێننەوە. هەرکەس لەپشتەوە هێرشی کردە سەر ئێمە، ڕووبەڕووی ببنەوە.

کاتێك جەنگ دەستیپێکرد، بەئەندازی کوشتنی یەك وشتر و دابەش کردنی گۆشتەکەی جەنگان و عەرەبەکان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. عەجەمەکان شکستیان خوارد وگەڕانەوە بۆ شارەکەی خۆیان. عوتبە گەڕایەوە بۆ ئوردووگاکەی. عەجەمەکان چەند ڕۆژێك لەشارەکە مانەوە و خواوەند دڵی ئەوانی لێوانلێو کرد لەترس. شارەکەیان بەجێهێشت و کالآ سووك و گرانباییەکان و ژنەکانی خۆیان هەڵگرت و لەفورات پەڕینەوە. موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو شارەکە و بڕێك کالآ و سیلاح و ئەسیر و درەمی نەقدیان دەست کەوت. دەرمەکانیان دابەش کرد. هەرکەسێك دوو درەمی بەرکەوت.

١

عوتبە، نافیع کوڕی حارسی بۆ تۆمار کردنی تالآنییەکانی ئۆبلە ڕاسپارد. پێنج یەکی جیا کردەوە و پاشماوەکەی لەناو شەڕکەراندا دابەش کرد. ڕووداوەکەی بەنافیع کوڕی حارس بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی.

داوود کوڕی ئەبی هیند دەڵێت: موسوڵمانان لەئۆبلە شەشسەد درەمیان دەستکەوت و هەر شەڕکەرێك دوو درەمی بەرکەوت. عومەر کوڕی خەتاب بۆ هەموو ئەو شەڕکەرانی دوو درەمیان پێبڕابوو، دوو هەزار درەم بەخششی دیاری کرد.

گرتنی ئۆبلە لەرەجەب یا شەعبانی ئەم ساڵەدا بوو.

شەعبی دەڵێت: لەگرتنی ئۆبلە دووسەد و حەفتا کەس ئامادە بوون. ئەبوبەکرە و نافیع کوڕی حارس و شیبل کوڕی مەعبەد و موغەیرە کوڕی شوعبە و موجاشیع کوڕی مەسعود و باوکی مریەمی بەلەوی و ڕەبیعە کوڕی کەلدە کوڕی ئەبی سەلتی سەقەفی و حەجاج لەناو ئەواندا دەبینران.

عیبایە کوڕی عەبد عەمرۆ دەڵێت: لەگرتنی ئۆبلە هاوڕێیەتی عوتبەم دەکرد،

نافیع کوڕی حارسی لەگەڵ هەواڵی سەرکەوتن بۆ لای عومەر کوڕی خەتاب ڕەوانە کرد. خەڵکانی دەشتی میشان دژی ئێمە کۆبوونەوە. عوتبە وتی: بۆچوونی من ئەوەیە هێرشیان بکەینەسەر. ڕۆشتین و لەگەڵ سنووردای دەشتی میشان ڕووبەڕوو بووینەوە. شەڕمان لەگەڵ کرد و سوپاکەی شکستی خوارد. خۆی ئەسیر کرا و عابا و پشتێنەکەیان لێسەند. عوتبە بەئەنس کوڕی حەجییەی یەشگەری بۆ مەدینەی نارد.

باوکی مەلیحی هوزەلی دەڵێت: عوتبە ئەنس کوڕی حەجییەی لەگەڵ پشتێنەکەی سنورداری دەشتی میشان بۆ لای سەروەری باوەڕداران ڕەوانە کرد. عومەر کوڕی خەتاب پێی وت: موسوڵمانان چۆن بوون.

وتی: دنیا باوەشی بۆ کردوونەتەوە و لەزۆری زێڕ و زیو، گرفتارن. لەبەر ئەمە خەڵکان خوازیاری ڕۆشتن بۆ بەسرە بوون و ژمارەیەکی زۆر لەموسوڵمانان ڕوویان لەو دیارە کرد.

عەلی کوڕی زەید دەڵێت: کاتێك عوتبە دەستی بەسەر ئۆبلەدا گرت، سنووردای دەشتی میشان سوپایەکی دژی ئەو کۆکردەوە. عوتبە لەئۆبلەوە هێرشی کردەسەر و ئەوی کوشت. موجاشیع کوڕی مەسعودی بۆ کەنارەکانی فورات ڕەوانە کرد کەشارێك لەو ناوچەیەدا بوو. عوتبە گەڕایەوە بۆ لای عومەر کوڕی خەتاب و فەرمانی بەموغەیرە کوڕی شوعبەدا پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات تا ئەو کاتەی موجاشیع دەگەڕێتەوە. کاتێك گەڕایەوە، ئەو فەرماندەی خەڵکانە.

دەڵێت: موجاشیع بەسەر خەڵکی کەنارەکانی فورات سەرکەوت و گەڕایەوە بۆ بەسرە. فیلکان یەکێك لەگەورەزادەانی ئەبزقوباد سوپایەکی دژی موسوڵمانان کۆکردەوە. موغەیرە کوڕی شوعبە ڕووبەڕووی بوویەوە و لەزۆنکاوێکدا جەنگ ڕوویدا. موغەیرە سەرکەوتنی بەدەست هێنا و هەواڵی سەرکەوتنەکەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی.

کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە مەدینە، عومەر کوڕی خەتاب بەعوتبەی وت: چ کەسێکت وەك فەرمانڕەوای بەسرە دەستنیشان کردووە؟

وتی: موجاشیع کوڕی مەسعود.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: چۆن پیاوێکی سارانیشن دەکەیتە فەرمانڕەوای خەڵکانی شارنشین؟ دەزانی چی ڕوویداوە؟

وتی: نە.

عومەر کوڕی خەتاب لەکارەکەی موغەیرە ئاگاداری کردەوە. فەرمانی بەعوتبەدا بۆ سەر کارەکەی خۆی بگەڕێتەوە. بەڵام عوتبە لەڕێگەدا مرد و سەروەری باوەڕداران، موغەیرە کوڕی شوعبەی وەك فەرماندە و سالاری خەڵکان دەستنیشان کرد.

قتادە دەڵێت: خەڵکانی دەشتی میشان دژی موسوڵمانان کۆبوونەوە. موغەیرە ڕووبەڕوویان بوویەوە. بارە قورسەکانیان لەپشت سەری خۆیانەوە بەجێهێشت. هێشتا نەگەیشتبوونە دیجلە ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە. ئەردە کچی حارس کوڕی کەلدە وتی: باشترە پەیوەستی موسوڵمانان ببین و لەگەڵ ئەواندا بین. دواتر ئاڵایەکی بەسەرپۆشەکەی خۆیەوە بەست و ژنانی دیکەیش سەرپۆشەکانی خۆیان کردە ئاڵا و بەمەبەستی پەیوەست بوون بەموسوڵمانان بەڕێکەوتن. کاتێك گەیشتنە لای موسوڵمانان کەسەرقاڵی جەنگ لەگەڵ عەجەمەکان بوون. کاتێك ئاڵاکانیان بینی، عەجەمەکان گومانیان کرد، هێزی پشتیوانی موسوڵمانانە. پاشەکشێیان کرد. موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و ژمارەیەکیان لەوان کوشت.

حارسە کوڕی مەزرەب دەڵێت: ئۆبلە بەجەنگ دەستی بەسەردا گیرا. عوتبە لەناو موسوڵمانان کەککە، یانی نانی سپی دابەش کرد.

تەبەری دەڵێت: یەسار یەکێك بوو لەو کەسانەی لەدەشتی میشان ئەسیر کرا ودواتر بەباوکی حەسەنی بەسری نازناوی دەرکرد، هەروەها ئەرتەبان باوەگەورێی عەبدوللە کوڕی عون کوڕی ئەرتەبان.

سەلمە دەڵێت: لەگرتنی ئۆبلە بەشدار بووم. قازانێکی مسینم بەرکەوت. کاتێك سەیرم کرد، زێر و هەشتا هەزار مسقاڵ زێری تیا بوو. لەمبارەوە نامەیان بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی. وەڵامی دایەوە: سەلمە سوێند دەخوات ئایا ئەو کاتەی قازانەکەی وەرگرتووە، بەقازانێکی مسینی زانیووە، ئەگەر سوێندی خوارد، بۆی بگەڕێننەوە و گەرنە لەناو موسوڵماناندا دابەشی بکەن.

دەڵێت: سوێندم خوارد. قازانەکەیان تەسلیمی من کرد. سامانەکەی من لێرەوە

سەرچاوەی گرت.

عەمرە کچی قەیس دەڵێت: کاتێك خەڵکان بۆ شەڕی ئوبلە بەرێکەوتن، هاوسەر و کوڕەکەی منیش لەگەڵیان ڕۆشتن. دوو درەم و پێوانە پێوانە کشمیشیان وەرگرت.

کاتێك گەیشتنە رووبەرووی ئوبلە، بەدوژمنیان وت: ئێمە بپەڕێینەوە یا ئێوە دەپەڕنەوە؟

وتیان: ئێوە بپەڕنەوە.

موسوڵمانان لقی دارەکانیان هەڵگرت و بەیەکەوە بەستیانەوە و بۆلای دوژمن پەڕینەوە. ناباوەڕان وتیان: کارتان بەیەکەم کەس نەبێت تا ئەو کاتەی دووایین کەس دەپەڕێتەوە. کاتێك گەیشتنە سەرزەوی، تەکبیریان وت. بۆ جاری دووەم تەکبیریان وت و چوارپێکانیان هەستانە سەرپێ. بۆ جاری سێیەم تەکبیریان هێنایە سەرزمان. ئێمە دەمانبینی سەری ناباوەڕان دەکەوتە سەرزەوی، بەڵام نەماندەزانی کێ ئەو کارە دەکات. بەمشێوەیە خواوەند گرتنی ئوبلەی بۆ ئێمە ئاسان کرد.

مەداینی دەڵێت: سەفییە کچی حارس کوڕی کەلدە ژنی عوتەبە کوڕی غەزوان بوو و خوشکەکەی ئەو ئەردە کچی حارس، ژنی شیبل کوڕی مەعبەدی بوجلی بوو. کاتێك عوتەبە بوو بەسەرکردەی خەڵکان، خزمەکانی ئەو ئەبوبەکرە و نافیع و شیبل کوڕی مەعبەد لەگەڵ ئەو هاتن. زیادیشان لەگەڵدا بوو. کاتێك دەستیان بەسەر ئوبلەدا گرت، کەس نەبوو تالانییەکان لەناو ئەواندا دابەش بکات. زیاد ئەو کارەی گرتە ئەستۆ. لەو کاتەدا تەمەنی چواردەساڵ بوو. پرچی درێژ و ڕۆژانە دوو درەمیان پێدەدا.

دەڵێت: سەرکردایەتی عوتەبە کوڕی غەزوان لەساڵی پانزەیەم و بەوتەیەك لەساڵی شانزەیەمدا بوو. وتاری یەکەم ڕاستترە. ماوەی سەرکردایەتی عوتەبە لەبەسرە شەش مانگی خایاند. دوای ئەو عومەر کوڕی خەتاب موغەیرە کوڕی شوعبەی وەك سەرکردەی خەڵکان دەستنیشان کرد. دوو ساڵ سەرکردەی خەڵکانی بەسرە بوو. خەڵکان سەبارەت بەو لای عومەر کوڕی خەتاب قسەیان کرد. سەروەری باوەڕداران، باوکی موسای وەك سەرکردەی بەسرە دانا. بەوتەیەك عومەر کوڕی خەتاب دوای عوتەبە، سەرەتا باوکی موسای کردە سەرکردە و دوای ئەو موغەیرە کوڕی شوعبە.

هەروەها لەم ساڵەدا، یانی ساڵی چواردەیەم، عومەر کوڕەکەی خۆی، عوبەیداللە و هاوڕێکانی بەهۆی شەراب خواردنەوە، داری حەدی لێدان و هەروەها باوکی میحجەنیش.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب سەرپەرەستی حاجییەکان بوو. سالاری مەککە عەتاب کوڕی ئەسید و سالاری یەمەن، یەعلی کوڕی ئومەییە و سالاری کوفە سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و سالاری شام باوکی عوبەیدەی جەراح و سالاری بەحرەین عوسمان کوڕی ئەبی عاس و بەوتەیەك عەلا کوڕی حەزرەمی وسالاری عەمان حوزەیفە کوڕی میحسەن بوو.

## ساڵی پانزەیەمی کۆچ دەستپێکرد

کوڕی جەریر دەڵێت: بەوتەی دەستەیەك لەم ساڵەدا، سەعد کوڕی ئەبی وەقاس کوفەی کردە شار. کوڕی بوقیلە شوێنی کوفەی نیشانی موسوڵماناندا و بەسەعدی وت: ڕێگەی سەرزەمینێکت نیشان دەدەم کەمێشوولەی نییە و لەخوارەوەی دەشتەکانە. شوێنی ئێستای شاری کوفەی نیشاندان.

## جەنگی مەرج ئەلروم

لەم ساڵەدا جەنگی مەرج ئەلروم ڕوویدا. ڕوداوەکە بەم شێوە بوو: باوکی عوبەیدەی جەراح لەگەڵ خالید کوڕی وەلید لەدیمەشقەوە مەبەستی حیمسیان کرد و لەگەڵ ئەو کەسانەی لەیەرموك پەیوەستی ئەوان ببوون، پێشڕەویان کرد و هەمووان لەبەرابەر سوپاکەی زو ئەلکەلاغ ئوردوویان لێدا. هێرقل ئاگادار بوویەوە و توزرای بەتریقی ڕەوانە کرد کە لەسەوزەلانی (مەرج) دیمەشق لەرۆژئاوای شارەکە ئوردووی لێدا. باوکی عوبەیدە سەرقاڵی مەرج ئەلروم و دەستەکانی ئەوێ بوو. زستان هێرشی کردە سەر موسوڵمانان و خەڵکانێکی زۆر بریندار بوون. کاتێك باوکی عوبەیدە لەمەرج ئەلروم ئوردووی لێدا، هەمان ڕۆژ شەنسی ڕۆمی لەگەڵ سوپایەك هاوشێوەی سوپاکەی توزرا بۆ هاوکاری و پارێزگاری کردن لەخەڵکانی حیمس گەیشت و بەشێوەیەکی جیا ئوردووی لێدا. لەکاتی شەودا، ئوردووگای توزرا کە بەرابەر بەخالید بوو، چۆڵ کرا، ئوردووگای باوکی عوبەیدە لەبەرابەر شنس بوو. خالید ئاگادار بوویەوە کەتوز بەرەو دیمەشق دەڕوات. لەگەڵ باوکی عوبەیدە بڕیاریاندا خالید شوێنی بکەوێت. هەمان شەو خالید لەگەڵ دەستەیەك لەسوارەکان شوێن توز کەوت و کاتێك یەزید کوڕی ئەبی سوفیان لەکارەکەی خالید ئاگادار بوویەوە، ڕووبەڕووی توز بوویەوە و شەڕ دەستی پێکرد. خالید لەکاتی جەنگەکە گەیشت و لەپشتەوە هێرشی کردە سەر ڕۆمییەکان. کوژراوەکان فراوان بوون و

ژمارەیەکی کەم لەرۆمییەکان توانییان گیانی خۆیان دەرباز بکەن. موسوڵمانان کەل و پەلەکانی ئەوانیان کۆکردەوە. یەزید کوڕی ئەبی سوفیان تالآنییەکانی لەنێوان هاوەڵانی خۆی و خالید دابەش کرد. یەزید رووی کردە دیمەشق و خالید گەڕایەوە بۆ لای باوکی عوبەیدە. خالید توزی کوشت و هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

((ئێمە توزرا و شوزرامان کوشت

پێش ئەوانیش حەیدەرمان کوشت

و ئەکیدەر))

دوای ئەوەی خالید شوێن توز کەوت، باوکی عوبەیدە هێرشی کردە سەر شنس و لەمەرج ئەلروم شەڕیان کرد. ژمارەیەکی زۆر لەرۆمییەکان کوژران و باوکی عوبەیدە شنسی کوشت و مەرج لەکوژراوە رۆمییەکان لێوانلێو بوو. زەوی بۆنی گرت و ژمارەیەکی زۆر لەرۆمییەکان هەلآتن بەلآم رزگاریان نەبوو. موسوڵمانان تا حیمس شوێنیان کەوتن.

## گرتنی حیمس

سەیف لەکتێبێك کەسەبارەت بەباوکی عوسمان نووسیویەتی، دەڵێت: کاتێك هێرقل لەکوشتاری رۆمییەکان لەمەرج ئاگادار بوویەوە، فەرمانی بەئەمیری حیمسدا بەرەو حیمس بڕوات، وتی: بیستوومە خواردنی عەرەبەکان گۆشتی وشترە و خواردنەوەیان شیری وشتر. ئێستا زستانە، تەنیا لەرۆژە ساردەکان شەڕیان لەگەڵ بکەن چوونکە تا هاوین ئەو کەسانەی ئەمە خواردن و خواردنەوەیان بێت، زیندوو نامێنن. دواتر لەئوردووگاکەی بەرەو رەها ڕۆشت. باوکی عوبەیدە هات و لەبەرابەر حیمس ئوردووی لێدا. خالید دوای ئەو خۆی گەیاندە حیمس.

رۆمییەکان لەرۆژە ساردەکان بەیانی و شەو هێرشیان دەکردە سەر موسوڵمانان. موسوڵمانان لەسەرمای سەخت وبازنەی گەمارۆی رۆمییەکان، لەرەنج و دژواریدا بوون بەلآم خۆڕاگرییان کرد و مانەوە و خواوەند سەبری ئەوانی زیاد کرد. سەرکەوتن دواکەوت. رۆمییەکان لەپشت قەلآکانەوە سەنگەریان گرتبوو بەو هیوایەی

زستان موسوڵمانان لەناو ببات.

کوڕی زەهرای قوشەیری دەڵێت: خەڵکانی حیمس بەیەکیان دەوت: لەقەڵاکاندا بمێننەوە، ئەوان پێپەتین و کاتێك سەرمایان پێبگات، بەم خواردن و خواردنەوە، پێیان لەناو دەچێت.

دەڵێت: کاتێك ڕۆمییەکان لەجەنگ دەگەڕانەوە، لەگەڵ ئەوەی خواردن و خواردنەوەی پێویستیان لەبەردەستا بوو، قاچی هەندێکیان لەناو پێپۆشەکاندا بەجێ دەما بەڵام موسوڵمانان کەپێپۆشێکی ئەوتۆیان لەپێدا نەبوو، تەنانەت یەك پەنجەیان زیانی بەرنەکەوت.

دوای کۆتایی هاتنی زستان، یەکێك لەپیرەکانی خەڵك قسەی لەگەڵ کردن و وتی: پەیمانی ئاشتی لەگەڵ موسوڵمانان ببەستن.

وتیان: بۆ پەیمانی ئاشتی ببەستین لەکاتێکدا هێز و دەسەڵاتی پاشا لەجێگەی خۆیەتی و لەنێوان ئێمە و موسوڵمانان هیچ ڕووداوێك ڕووی نەداوە. پیرەکە ئەوانی بەجێهێشت.

دوای ئەو، یەکێکی دی لەوان قسەی کرد و وتی: زستان کۆتایی پێهات و هیوامان نەما. چاوەڕوانی چین؟

وتیان: چاوەڕوانین نەخۆشی برسام بێت. ئەم نەخۆشییە لەزستاندا نییە و هاوینان بڵاو دەبێتەوە.

وتی: ئەوان خەڵکانێکی خۆڕاگرن، ئەگەر پەیمانیان لەگەڵ ببەستن باشترە لەوەی بەجەنگ دەست بەسەر شارەکەی ئێوەدا بگرن. بەدڵخواز تەسلیمی ئەوان بن پێش ئەوەی بەناچاری خۆتان بەدەستەوە بدەن.

وتیان: پیرێکی خڵەفاوە و لەشەڕ بێ ئاگا.

دەستەیەك لەپیرەکانی غەسان و بەڵقین وتیان: خواوەند پاداشتی خۆڕاگری موسوڵمانانی لەرۆژگاری حیمس دایەوە و خەڵکانی حیمسی گرفتاری بومەلەرزە کرد. موسوڵمانان هێرشیان کردنەسەر و هاواری تەکبیریان بەرز کردەوە. ڕۆمییەکان لەشارەکەدا گرفتاری ئەردهەژێن بوون و دیوارەکان داڕما. ترساو و خەمبار ڕۆشتنە لای سەرکردە و کەسانی بیرمەندی خۆیان کەپێشتر داوایان دەکرد پەیمانی ئاشتی

ببەستن. بەلاّم وەلاّمیان نەدانەوە و سەرکۆنەی خەڵکانیان کرد. موسوڵمانان دووبارە تەکبیریان وت و ژمارەیەکی زۆر لەماڵەکانی ناو شارەکە رووخا. دووبارە خەڵکان پەنایان بۆ پیران و بیرمەندەکانی خۆیان برد و وتیان: مەگەر ئازابەکانی خواوەند نابینن.

وتیان: دەبێت داوای پەیمانی ئاشتی بکەن.

خەڵکان لەسەر دیوارەکانەوە هاواریان کرد: ئاشتی، ئاشتی.

موسوڵمانان لەرووداوەکە ئاگادار نەبوون. بەداواکەیان رازی و لەسەر نیوەی ماڵەکانیان پەیمانی ئاشتییان واژۆ کرد بەو مەرجەی بینا و مڵك و ماڵی رۆمییەکان بەجێبێڵن و لەویّ مەنزڵ نەگرن. دەستەیەکیان هاوشێوەی پەیمانی ئاشتی دیمەشق پەیمانی ئاشتییان بەست یانی یەك دینار بدەن و دانەوێڵە لەبەرهەمی هەر جەریبێك بۆ هەمیشە، لەکاتی فراوانی و لەقاتوقڕیدا. دەستەیەکیان بەپێی توانایی خۆیان پەیمانی ئاشتییان بەست یانی ئەگەر داهاتەکەیان فراوان بوو زیاتر بدەن و ئەگەر کەمبوویەوە، کەمتر.

ئاشتی دیمەشق و ئەردەن بەمشێوە بوو. بەڵێنیاندا بوو چ بەرهەمیان فراوان بێت چ گرفتاری قاتوقڕی بن، سامان و بەرهەم تەسلیمی موسوڵمانان بکەن. دەستەیەکیان بەئەندازەی توانای خۆیان پەیمانی ئاشتییان بەست. بەڕێوبردنی ئەو زەوییانەی پاشاکان بەوانیان سپاردبوو، لەدەستی خۆیاندا مایەوە.

باوکی عوبەیدە سمت کوڕی ئەسوەدی لەگەڵ مناڵەکانی معاویە و ئەشعەس کوڕی مێناسی لەگەڵ خەڵکانی سەکوون و کوڕی عابسی لەگەڵ خەڵکانی بەلی و بیلال و خالید و سەباح کوڕی بەشیر و زوهەیل کوڕی عەتییە و زوئەلشمستانی لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە کرد کەلەناوەندی ویلایەتەکان نیشتەجیّ بوون. باوکی عوبەیدە خۆی لەئوردووگاکە مایەوە وهەواڵی سەرکەوتنەکانی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و پێنج یەکی بە عەبدوللە کوڕی مەسعود ڕەوانە کرد.

کاتێك کوڕی مەسعودی ڕەوانە کرد، ئاگادار بوویەوە هێرقل لەناو پەڕیوەتەوە و رووی کردۆتە جەزیرە و لەرها دابەزیوە. هەندیّ کات خۆی حەشار دەدات و هەندیّ کات خۆی نیشان دەدات. کاتێك کوڕی مەسعود گەیشتە لای عومەر کوڕی خەتاب، ئەوی گەڕاندەوە، دوای ئەوە، ئەوی بۆ کوفە بۆ لای سەعد نارد. نامەی بۆ باوکی

عوبەیدە نووسی: لەشارەکەی خۆت بمێنەرەوە و خەڵکانی بەهێز و بوێر لەعەرەبەکان لەدەوری خۆت کۆبکەرەوە. منیش بەخواستی خوا لە ڕەوانە کردنی هێزی پشتیوان بۆ تۆ، کەمتەرخەمی ناکەم.

## قینسرین

کوڕی عوسمان دەڵێت: دوای گرتنی حمس، باوکی عوبەیدە خالید کوڕی وەلیدی بۆ قینسرین نارد و کاتێك گەیشتە حازر، ڕۆمییەکان بەسەرکردایەتی میناس کەدوای هێرقل گەورە و سەروەری ڕۆمییەکان بو، هێرشیان کردەسەر. لەحازر جەنگ ڕوویدا و میناس کوژرا. ژمارەیەکی زۆر لەسوپاکەی کوژرا کەهاوشێوەی نەبینراوە. ڕۆمییەکان لەبەردەم جەستەی کوژراوی ئەو، گیانی خۆیان دەبەخشی. کەس لەوان نەمایەوە. خەڵکانی حازر کەسیان بۆ لای خالید نارد کەعەرەبن و ئەوانیان بەزۆر بۆ جەنگ ناچار کردووە و مەبەستی جەنگیان لەسەردا نەبووە. خالید بەوتەکانیان ڕازی بوو.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب لەڕووداوەکە ئاگادار بوویەوە، وتی: خالید خۆی خۆی کردە سالار، خواوەند لەئەبوبەکر خۆش بێت، ئەو خەڵکانی باشتر لەمن دەناسی.

عومەر کوڕی خەتاب کاتێك خەلافەتی گرتەدەست، خالید و موسەنای لەسەر کار لابرد و وتی: لابردنی ئەوان بەهۆی سەرپێچی کردن لەفەرمانەکان نەبووە بەڵام خەڵکان ئەوانیان بەگەورە دەزانی، دەترسام پشت بەوان ببەستن. کاتێك خالید لەقینسرین سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بۆچوونی عومەر کوڕی خەتاب سەبارەت بەو گۆڕا.

خالید ڕۆشت و لەدەروازەی قینسرین دابەزی. خەڵکان لەپشت دیواری شارەکەوە سەنگەریان گرت. خالید وتی: ئەگەر لەناو هەورەکان خۆتان بشارنەوە، خواوەند ئێمە بۆ ناو هەورەکان بەرز دەکاتەوە یا ئەوەی ئێوە دێنێتە خوار.

دەڵێت: خەڵکانی قینسرین لێکۆڵینەوەیان لەبارودۆخی خۆیان کرد و چارەنووسی خەڵکانی حمسیان بیرکەوتەوە. پێشنیاری ئاشتی هاوشێوەی پەیمانی

ئاشتی حمسیان بەخالید کرد بەلاّم رازی نەبوو، وتی: دەبێت شارەکە وێران بکەم و وێرانی کرد. کاتێك حمس و قینسرین دەستی بەسەردا گیرا، هێرقل کشایەوە.

هۆکاری کشانەوەکەی ئەوە بوو: کاتێك خالید میناسی کوشت و رۆمییەکان لەبەردەم جەستەی کوژراوی ئەو گیانیان بەخشی و خالید لەگەڵ خەڵکانی حازر پەیمانی بەست و قینسرینی بەجێهێشت و عەمرۆ کوڕی مالك لەکوفەوە و لەرێگەوی قرقیسیاوە هات و وەلید کوڕی عوقبە لەدیاری تەغلەب لەگەڵ تەغلەبییەکان و عەرەبەکانی جەزیرە بەرێکەوت و شارەکانی جەزیرە چیتر گرنگییان بەهێرقل نەدەدا، هێرقل کشایەوە. خەڵکانی جەزیرە لەحەران و رەقە و نەسیبین و شوێنەکانی دیکە پەیوەستی هێرقل نەبوون چوونکە ترسان بەلاّم وەلیدیان لەجەزیرە بەجێهێشت تا لەپشتەوە پارێزراو بن. خالید و عەیاز لەسنوورەکانی شام و عومەر و عەبدوللە لەسنوورەکانی جەزیرەوە هێرشیان کردە سەر سەرزەمینی رۆم و گەڕانەوە. پێشتر هێرشیان نەکردبووە سەر سەرزەمینی رۆم. ئەمە یەکەم هێرشی ئەوان بوو لەرۆژگاری ئیسلام لەناو سەرزەمینی رۆم ئەنجامدرا و لەساڵی شانزەیەمی کۆچ روویدا. کاتێك خالید رووی کردە قینسرین و لەوێ مەنزڵی گرت، ئەمارەتی پێبڕا و کاتێك لەسەر کار دوورخرایەوە، وتی: عومەر کاروباری شامی بەمن سپارد و کاتێك بارودۆخ سامانی گرت، منی لەسەر کار لابرد.

ئەبوجەعفەری تەبەری دەڵێت: هێرقل رووی کردە قوستەنتەنییە. سەبارەت بەکاتی ڕۆشتنی ئەو و بەجێهێشتنی ویلایەتی شام، بۆچوونەکان جیاوازە. کوڕی ئیسحاق دەڵێت لەساڵی پانزەیەم و سەیف دەڵێت لەساڵی شانزەیەم، ویلایەتی شامی بەجێهێشت.

## ڕۆشتنی هێرقل بۆ قوستەنتەنییە

باوکی زەهرای قوشەیری دەڵێت: کاتێك هێرقل لەرەها ڕۆشت و مەبەستی ئەوەی کرد خەڵکی ئەو ناوچەیە لەگەڵ خۆی ببات، وتیان: لێرە بین باشترە لەوەی هاوڕێی تۆ بین. رازی نەبوون لەگەڵی بڕۆن و خۆیان لەهێرقل و موسوڵمانەکان بەدوور گرت. زیاد کوڕی حەنزەلە یەکەم کەس لەموسوڵمانەکان بوو گەیشتە ئەو سەرزەمینە.

یەكێك بوو لەئەسحابەكانی پێغەمبەر(د.خ) و لەگەڵ عەمرۆ كوڕی مالك لەفەرمانڕەوایەتیدا شەریك و هاوپەیمانی منداڵەكانی عەبدقوسەی بوو.

پێشتر هێرقل تا شەمشات پاشەكشێی نەكردبوو. كاتێك عەرەبەكان هاتنە رەها، فەرمانی ئامادەباشی دەركرد و رێگەی قوستەنتەنییەی گرتەبەر. یەكێك لەرۆمییە ئەسیرەكان هەڵاتبوو، هاتە لای هێرقل. وتی: لەو خەڵكە ئاگادارم بكەرەوە.

وتی: بەشێوەیەك وەسفی ئەوانت بۆ دەكەم وەك بڵێی سەیریان دەكەیت، بەرۆژدا سوارەكان و بەشەودا راهیب، لەسنووری خۆیان هیچ شتێك وەرناگرن مەگەر ئەوەی باییەكەی بدەن، هەركەس رووبەروویان ببێتەوە، ئەوەندە شەڕی لەگەڵ دەكەن تا لەناوی دەبەن.

هێرقل وتی: ئەگەر راست بكەیت، ئەم شوێنەی ئێستا لەژێر قاچی مندایە، دەستی بەسەردا دەگرن.

عوبادە دەڵێت: هێرقل هەركات بۆ زیارەتی بیت ئەلمقدس دەهات و سوورییەی بەجێدەهێشت، دەگەڕایەوە بۆ رۆم و دەگریا، دەیوت: سڵاو لەتۆ سوورییە، سڵاوی كەسێك كەلەتۆ تێر نەبووە و دەگەڕێتەوە.

كاتێك موسوڵمانان روویان لەحمس كرد، لەئاو پەڕییەوە و رەهای كردە مەنزڵگەی خۆی. لەوێ بوو تا خەڵكانی كوفە هاتن و قێنسرین دەستی بەسەردا گیرا و میناس كوژرا. هێرقل بەرەو شەمشات پاشەكشێی كرد و كاتێك لەوێوە مەبەستی رۆشتن بۆ رۆمی كرد، ڕۆشتە سەر تەپۆڵكەیەك و سەیری سورییەی كرد و وتی: سڵاو لەتۆ ئەی سوورییە، سڵاو و ماڵئاوایی دووایین جار چوونكە دوای ئەمە هیچ رۆمییەك نایێتە لای تۆ مەگەر بەترس و لەرزەوە. تا ئەوكاتەی زادەی شووم لەدایك دەبێت و خۆزگە هیچ كات لەدایك نەبێت. هەرچەند كاری ئەو بۆ رۆمییەكان سازگار و شیرینە بەڵام سەرئەنجامێكی تاڵی هەیە.

عەمرۆ كوڕی مەیمون دەڵێت: كاتێك هێرقل لەشەمشاتەوە بەرێكەوت و ڕۆشتە ناو سەرزەمینی رۆم، سەیری سوورییەی كرد و وتی: پێشتر وەك رێبوارێك سڵاوم لەتۆ دەكرد، بەڵام هەنووكە سڵاو لەتۆ ئەی سوورییە، سڵاوی جیابوونەوە، چوونكە چیتر هیچ رۆمییەك ناگەڕێتەوە مەگەر بەترس تا ئەو كاتەی زادەی شووم چاو بەدنیا

هەڵدێنێت و خۆزگە لەدایك نەبێت. ئەمەی وت و ڕۆشت تا گەیشتە قوستەنتەنییە. خەڵکانی قەڵاکانی نێوان ئەسکەندەرییە و تەرسووی لەگەڵ خۆی برد بۆ ئەوەی موسوڵمانان لەنێوان ئەنتاکییە و دیاری ڕۆم، بەئاوەدانییەکاندا تێنەپەڕن. قەڵاکانی چۆڵ کرد. موسوڵمانان کەسیان لەوێ نەدەبینی. هەندێ جار ڕۆمییەکان لەنزیك قەڵاکان بۆسەیان دادەنا و ژمارەیەکی سوپاکەیان ناکاوگیر دەکرد. موسوڵمانان زیاتر وشیار بوون.

## گرتنی قیسارییە و گەمارۆ خستنە سەر غەزە

عوبادە دەڵێت: کاتێك باوکی عوبەیدە و خالید لەفەحلەوە ڕوویان لەحمس کرد، عەمرۆ و شورەحبیل لای بیسان دابەزین و دەستیان بەسەر ئەو ناوچەدا گرت. خەڵکانی ئەردەن پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ بەستن و سوپاکەی ڕۆم لەئەجنادین و بیسان و غەزە کۆبوونەوە. بڵاوبوونەوەی ئەوانیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی. ئەو، نامەی بۆ یەزید کوڕی ئەبی سوفیان نووسی تا موسوڵمانان بەناردنی هێزی پشتیوان دڵگەرم و دڵخۆش بکات. معاویەی بۆ قیسارییە نارد و نامەی بۆ عەمرۆ نووسی ڕووبەڕووی ئەرتەبوون ببێتەوە و بۆ عەلقەمەی نووسی شەڕ لەگەڵ فیقار بکات.

نامەی عومەر کوڕی خەتاب بۆ معاویە بەمشێوە بوو:

((بەڵام دواتر، من تۆم وەك فەرمانڕەوای قیسارییە دەستنیشان کرد، ڕوو بکەرە ئەو سەرزەمینە و داوای سەرکەوتن لەخوا بکە. بەردەوام بڵێ، لا حول و لا قوة الا بالله، الله ربنا و ثقتناو رجاؤنا، و مولانا، نعم المولى و نعم النصير.

عەمرۆ و عەلقەمە بۆ شوێنی کارەکانی خۆیان ڕۆشتن و معاویە لەگەڵ سوپاکەی بەڕێکەوت تا لەبەرایەر سوپاکەی قیسارییە ئوردووی لێدا. سەرکردەکەیان ئەبنی بوو، شکستی خوارد و لەناو قیسارییەدا سەنگەری گرت. دواتر خەڵکانی قیسارییە هێرشیان کردە سەر معاویە بەڵام هەرجارێك هێرشیان دەبرد، شکستیان دەخوارد و دەگەڕانەوە بۆ ناو شارەکە.

بۆ دوایین جار هێرشیان برد. لەقەڵاکانی خۆیان هاتنەدەر و شەڕێکی دژوار و

قورسیان هەڵگیرساند. لەکاتی شەڕەکە هەشتا هەزار کەسیان لیٚ کوژرا و لەکاتی شکست و هەڵاتن ژمارەی کوژراوان گەیشتە سەد هەزار کەس. معاویە هەواڵی سەرکەوتنی بەدوو کەس لەمناڵەکانی زەبیب ڕەوانە کرد بەڵام لەلاوازی ئەوان ترسا و عەبدوڵلە کوڕی عەلقەمەی فەراسی و زوهەیر کوڕی جەلابی خەسعەمی نارد و فەرمانی پێدان بەدوای ئەو دووانەدا بڕۆن و پێشیان بکەونەوە. ئەو دووانە ڕۆشتن و بەدوو نێردراوەکەی سەرەتا گەیشتنەوە کەخەوتبوون. ئەوانیان بەجێهێشت.

عەلقەمە کوڕی موحریز ڕۆشت و لەغەزە گەمارۆی خستە سەر فیقار. نامەیان گۆڕییەوە بەڵام سوودی نەبوو. عەلقەمە خۆی ڕۆشتە لای فیقار وەك بڵێی نێردراوی عەلقەمە بوو. فیقار کەسێکی راسپارد تا لەسەر ڕێگەی دانیشێت و خوێنی بڕێژێت. عەلقەمە هەستی بەم پلانە کرد و وتی: چەند کەسێکم لەگەڵدایە و دەبێت بۆچوونی ئەوانیش وەربگرم، دەڕۆم و دەیانهێنم. فیقار پەیامی بۆ ئەو پیاوە نارد ڕێگە لەعەلقەمە نەگرێت. ئەو لای فیقار ڕۆشت و چیتر نەگەڕایەوە. ئەو کارەی کرد کەعەمرۆ لەگەڵ ئەرتەبوون کردبووی.

نێردراوی معاویە هەواڵەکەی بەعومەر کوڕی خەتاب گەیاند. ئەو، شەوانە خەڵکی کۆکردەوە و هەواڵی سەرکەوتنی پیٚ ڕاگەیاندن. سوپاسی خواوەندی کرد و وتی: بۆ گرتنی قیساریە، سوپاسی خواوەند بکەن.

معاویە پێش گرتن و دوای گرتن ئەسیرەکانی لای خۆی دەهێشتەوە و دەیوت: میخائیل هەرچی لەئەسیرەکانی ئێمە بکات، ئێمەیش ئەو بەڵایان بەسەردا دێنین. بەمشێوەیە نەیهێشت لەگەڵ ئەسیرە موسوڵمانەکان بەشێوەیەکی خراپ هەڵس و کەوت بکات تا ئەو کاتەی قیساریە دەستی بەسەردا گیرا.

## گرتنی بیسان و شەڕی ئەجنادین

کاتێك عەلقەمە رووی کردە غەزە و معاویە رووی کردە قیساریە، عەمرۆ کوڕی عاس بۆ ڕووبەڕووی بوونەوەی ئەرتەبوون ڕۆشت. شورەحبیل کوڕی حەسەنە فەرماندەی پێشەنگی سوپاکەی بوو. باوکی ئەعوەری لەئەردەن کردە جێگری خۆی و فەرماندەیی دوو باڵی سوپاکەی بە عەبدوڵلە کوڕی عەمرۆ و جونادە کوڕی تەمیمی

مالکی سپارد. بەرێکەوت و لەبەرابەر ئەجنادین دابەزی. رۆمییەکان لەناو قەلاَ و خەندەکەکانی خۆیان بوون. سەرکردەکەیان ئەرتەبوون و لەهەموو رۆمییەکان بوێرتر و دووربینتر و کارزانتر بوو. سوپایەکی گەورەی لەرەملە و سوپایەکی گەورەی لەئیلیا بەجێهێشتبوو.

عەمرۆ ئەم هەواڵەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی و کاتێك نامەکەی گەیشت، عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەرتەبوونی عەرەبمان بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەرتەبوونی رۆم نارد. با بزانین سەرئەنجام چی دەبێت.

عومەر کوڕی خەتاب کاتێك سەرکردەکانی شامی دەنارد، بۆ هەرکام لەسەرکردەکان سوپایەکی پشتیوانی دەنارد. کاتێك نامەکەی عەمرۆ گەیشت و لەبلاَو بوونەوەی سوپای رۆم ئاگاداری کردەوە، نامەی بۆ یەزید کوڕی ئەبی سوفیان نووسی تا معاویە و سوپاکەی بۆ قیساریە رەوانە بکات. نامەی بۆ معاویە نووسی کەسەرکردایەتی شەڕی قیساریە بەو دەسپێرێت تا ئەوان سەرقاڵ بکات بۆ ئەوەی نەتوانن زیان لەعەمرۆ بدەن.

عەمرۆ، عەلقەمە کوڕی حەکیمی فەراسی و مەسروق کوڕی فلأنی عەکی بۆ شەڕی خەڵکانی ئیلیا رەوانە کرد. رووبەرووی خەڵکانی ئەنجا بوونەوە و رێگەیان نەدا هێزی خۆیان بۆ شەڕ لەگەڵ سوپاکەی عەمرۆ رەوانە بکەن. هەروەها باوکی ئەیووبی مالکی بۆ رەملە نارد کەسەرکردەکەیان تەزاروق بوو. کاتێك بەبەردەوامی هێزی پشتیوان بۆ عەمرۆ دەگەیشت، محەممەد کوڕی عەمرۆی بۆ هاوکاری کردنی عەلقەمە و مەسروق نارد و عومارە کوڕی عەمرۆ کوڕی ئومەییەی زەموری بۆ هاوکاری باوکی ئەیووب نارد.

عەمرۆ لەبەرابەر ئەجنادین بوو بەلاَم دەستی بەئەرتەبوون نەدەگەیشت. نێردراوەکان نەیاندەتوانی هیچ کارێك بکەن. خۆی ئەم کارەی گرتە ئەستۆ و هاوشێوەی نێردراو رۆیشتە لای ئەرتەبوون. سەبارەت بەوەی دەیویست، گفتوگۆی لەگەڵ کرد و ئەوەی دەبوا، بیستی. قەلاَکانی ئەوی بینی و لەهەموو نهێنییەکانی ئاگادار بوویەوە. ئەرتەبوون بەخۆی وت، سوێند بەخوا ئەمە عەمرۆ خۆیەتی یا کەسێکە عەمرۆ گرنگی بەبۆچوونەکانی دەدات و هیچ زیانێك بۆ موسوڵمانان گەورەتر لەکوشتنی ئەو نییە. دواتر یەکێك لەپاسەوانەکانی بانگ کرد و سەبارەت

بەکوشتنی عەمرۆ قسەی لەگەڵ کرد، وتی: بڕۆ لەفلاّنە شوێن بۆسەی بۆ دابنێ و کاتێك لای تۆ گوزەری کرد، بیکوژە.

عەمرۆ هەستی بەمە کرد و وتی: وتەکانی منت بیست و وتەکانی تۆم بیست، ئەوەی باست کرد، کاریگەری لەسەر من دانا، من یەکێك لەو دەکەسەم کەعومەر کوڕی خەتاب ئێمەی لەگەڵ فەرمانڕەوای ئەم ناوچەیە ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی هاوکاری بکەین و چاودێری کاروبارەکانی ئەو بکەین. دەڕۆم و ئەوانیش دێنمە لای تۆ چوونکە ئەگەر بۆچوونی ئەوان سەبارەت بەوتەکانی تۆ هاوشێوەی من بێت، بۆچوونی سەرکردە و سوپاکەیش بەوشێوە دەبێت وئەگەر بۆچوونی ئەوان وەك من نەبوو، ئەوان دەگەڕێنیتەوە و کاروبار بەشێوەی ئاسایی خۆی دەڕواتە پێش.

ئەرتەبوون وتی: رازیم. پیاوێکی بانگ کرد و وتی: بڕۆ لای فلاّن کەس و بیگەڕێنەرەوە بۆ لای من. ئەو پیاوە گەڕایەوە بۆ لای ئەرتەبوون. ئەوسا بەعەمرۆی وت: بۆ لای هاورێکانی خۆت بگەڕێرەوە.

عەمرۆ گەڕایەوە و بڕیاریدا چیتر ئەو کارە نەکات. پیاوی رۆمی زانی فریوی خواردووە و وتی: ئەم پیاوە فریویدام، ئەمە لەهەموو شتێك بۆ خەڵکەکەم خراپترە.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب لەم پێشهاتە ئاگادار بوویەوە، وتی: عەمرۆ بەسەر ئەودا زاڵبوو، دەسخۆش عەمرۆ.

عەمرۆ کە لەبارودۆخی ئەرتەبوون ئاگادار ببوویەوە، هێرشی کردەسەر. شەڕ دەستیپێکرد چوونکە هیچ رێگە چارەیەکی دیکە نەمابوو. لەئەجنادین شەڕ و شەڕەکە رووی لەدژواری کرد. هاوشێوەی شەڕی یەرمووك بوو، کەسانێکی زۆر لەهەر دوو سوپا کوژران. ئەرتەبوون و سوپاکەی شکستیان خوارد و رووی کردە ئیلیا. عەمرۆ لەئەجنادین نیشتەجێ بوو.

کاتێك ئەرتەبوون گەیشتە ئیلیا، موسوڵمانان رێگەیان بۆ کردەوە تا ڕۆشتە ئەو ناوچەیە. بۆ ئەجنادین پاشەکشێی پێکردن و عەلقەمە و مەسروق و محەممەد کوڕی عەمرۆ و باوکی ئەییووب لەئەجنادین پەیوەستی عەمرۆ بوون. ئەرتەبوون نامەی بۆ عەمرۆ نووسی: تۆ هاورێ و هاوشێوەی منیت، تۆ پێگەیەکت لەناو خەڵکەکەی خۆت هەیە هاوشێوەی پێگەی من لەناو خەڵکەکەم. سوێند بەخوا دوای ئەجنادین

لەفەلەستین دەست بەسەر هیچ ناوچەیەکی دیکەدا ناگریت، بگەڕێرەوە و لەخۆت بایی مەبە چوونکە تۆیش هاوشێوەی کەسانی پێش خۆت، شکست دەخۆیت.

عەمرۆ کەسێکی رۆمی بانگ کرد و ئەوی بۆ لای ئەرتەبوون نارد. فەرمانی پێدا بەزمانی رۆمی قسە نەکات. وتی: گوێ لەوتەکانی بگرە و بەخواستی خوا کاتێک گەڕایتەوە، منی لێ ئاگادار بکەرەوە. نامەی بۆ ئەرتەبوون نووسی کە نامەکەی تۆ بەدەستم گەیشت و تۆ لەناو خەڵکەکەت ئەو پێگەت هەیە کەمن هەمە، ئەگەر کەم و کوڕیت دەبوو، هەستت بەگەورەیی و پێگەی من نەدەکرد، تۆ دەزانی کەسێکم ئەم شارەم گرتووە بەلاّم فلاّن فلاّن و فلاّن، ناوی وەزیرەکانی ئەوی برد، بەسەر تۆدا زاڵبوون. نامەکەی من بۆ ئەوان بخوێنەرەوە تا بۆچوونی خۆیان سەبارەت بەمن و تۆ باس بکەن.

نێردراو لەگەڵ نامەکەی عەمرۆ بەرێکەوت و کاتێک گەیشتە لای ئەرتەبوون، نامەکەی بەئامادە بوونی کەسە نزیکەکان، تەسلیمی ئەرتەبوون کرد. بەدرۆ ناوی برد و ئەوان پێکەنین. سەریانسوڕما و بەئەرتەبوونیان وت: چۆن دەزانی ئەو دەستی بەسەر ئەم شارەدا نەگرتووە؟

وتی: ئەو کەسەی دەستی بەسەر ئەم شارەدا گرت ناوی (عمر)ە و ناوەکەی سێ پیتە.

نێردراو بۆ لای عەمرۆ گەڕایەوە. عەمرۆ زانی مەبەستی ئەرتەبوون عومەر کوڕی خەتابە. نامەی بۆ نووسی و داوای هاوکاری لێکرد.

نووسی: من لەبەرابەر شارێك کەگرتنەکەی بەناوی تۆمار کراوە، شەڕێکی قورسم دەستپێکردووە، بزانە بۆچوونی تۆ چییە؟

کاتێك نامەکەی بەدەستی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت، دڵنیابوو بێ هۆ ئەم قسەی نەهێناوەتە سەرزمان، خەڵکانی ئاگادار کردەوە و لەگەڵ ئەوان بەرێکەوت تا گەیشتە جابیە. عومەر کوڕی خەتاب چوار جار بۆ شام سەفەری کردبوو. جاری یەکەم سوار لەسەر ئەسپ، جاری دووەم سوار لەسەر وشتر، سەفەری سێیەم کۆتایی پێنەهات چوونکە تاعوون بلاّو ببوویەوە، سەفەری چوارەم سوار لەسەر کەرێك و رۆشتە ناو سەرزەمینی شام. کەسی لەوێ دانا و خۆی گەڕایەوە.

کاتێك دەیویست سەفەر بکات، بۆ سەرکردەی سوپاکانی دەنووسی لەرۆژی

دیاریکراو لەگەڵ سوارەکانیان لەجابیە لای ئەو کۆببنەوە و کەسێك وەك جێگری خۆیان دەستنیشان بکەن. ئەوان، بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی لەجابیە کۆدەبوونەوە. یەکەم کەس ئەوی بینی، یەزید بوو، دوای ئەو باوکی عوبەیدە و دوای ئەو خالید کەهەر سێکیان سوار ئەسپ و دیبا و حەریریان لەبەردابوو. عومەر دابەزی و ئەوانی بەردباران کرد و وتی: چەندە زوو پشتتان کردۆتە دینەکەی خۆتان، ئێوە کەدوو ساڵە تێر بوون، بەم جل و بەرگانە پێشوازی لەمن دەکەن! چەند خێرا ڕێگەی خۆتان ون کرد. سوێند بەخوا ئەگەر سەرکردەی دووسەد کەس دەبوون و ئەم هەڵس و کەوتەم لەئێوە دەبینی، لەسەر کار لام دەبردن و کەسانی دیکەم لەجێگەی ئێوە دادەنا.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەمە عابایە لەبەرماندا، سیلاحمان هەڵگرتووە.

وتی: کەواتە، کێشە نییە.

سوار بوو و ڕۆشتە جابیە. عەمرۆ و شورەحبیل لەئەجنادین بوون و لەشوێنی خۆیان نەجووڵان.

## گرتنی بیت المقدس

سالم کوڕی عەبدوللە دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتە جابیە، پیاوێکی جوولەکە پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆ سەرزەمینی خۆت مەگەرێڕەوە تا خواوەند ئیلیا لەسەر دەستی تۆ بگرێت.

لەو کاتەی عومەر کوڕی خەتاب لەجابیە بوو، دەستەیەك سواری بینی کەهاتن. هەر ئەوەندەی نزیك کەوتنەوە، شمشێرەکانیان لەکالان دەرکێشا.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەو دەستەیە داوای ئەمان دەکەن.

کاتێك هاتنە پێش، دەرکەوت لەخەڵکانی ئیلیان. پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب بەست لەسەر ئەوەی جەزیە بدەن و دەروازەی شارەکانیان بۆ کردەوە. کاتێك شارەکە دەستی بەسەردا گیرا، پیاوی جوولەکەی بانگ کرد. پێیان وتبوو کەسێکی زانایە.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب لەپیاوی جوولەکە سەبارەت بەدەجال پرسیاری کرد

چوونکە سەبارەت بەدەجال زۆری دەپرسی.

جوولەکە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سەبارەت بەچی دەپرسیت چوونکە سوێند بەخوا ئێوەی عەرەب لەدووری دە و چەند زەراع لەدەروازەی لەد، دەیکوژن.

سالم دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتە شام، یەکێك لەجوولەکانی دیمەشق ئەوی بینی، وتی: سڵاو لەتۆ ئەی فاروق، چوونکە دەست بەسەر شاری ئیلیادا دەگریت، سوێند بەخوا لێرە ناڕۆیت تا ئەو کاتەی ئیلیا دەگریت.

خەڵکانی ئیلیا ڕەنجی زۆریان بۆ عەمرۆ دروست کردبوو و ئەو، نەیدەتوانی شارەکە بگرێت. ڕەملەیش هێشتا نەگیرا بوو.

دەڵێت: لەو کاتەی عومەر کوڕی خەتاب ئوردووی لێدابوو، خەڵکان دەستیان بۆ شمشێر برد.

عومەر کوڕی خەتاب پرسیاری کرد: چی ڕوویداوە؟

وتی: مەگەر سوارەکان وشمشێرەکان نابینی؟

کاتێك سەیری کرد، دەستەیەك سواری بینی کەشمشێرەکانیان ڕادەوەشاند، وتی: ئەوان ئەمانیان دەوێت، مەترسن و ئەمانیان پێ ببەخشن.

ئەمانیان پێدرا و بۆیان دەرکەوت لەخەڵکانی ئیلیان. شوێنکەوتەی موسوڵمانان بوون و پەیمان نامەیەکیان سەبارەت بەئیلیا و ڕەملە و سەرزەمینەکانی دەوروبەری وەرگرت. خەڵکانی فەلەستین بوون بەدوو دەستە: دەستەیەك لەگەڵ خەڵکانی ئیلیا بوون و دەستەیەك لەگەڵ خەڵکانی ڕەملە. دەویلایەت و سەرزەمینی فەلەستین بەئەندازەی هەموو شام بوو، پیاوی جوولەکە بوو بەشایەتی پەیمان نامەکە.

عومەر کوڕی خەتاب سەبارەت بەدەجال لەو پیاوە پرسیاری کرد.

وتی: ئەو، لەمناڵەکانی بنیامینە، سوێند بەخوا عەرەبەکان لەدووری دە و چەند زەراع لەدەروازی لەد دەیکوژن.

عوبادە دەڵێت: خەڵکانی فەلەستین سەبارەت بەئیلیا و ڕەملە پەیمانی ئاشتییان بەست و کاتێك عومەر کوڕی خەتاب هاتە جابیە، ئەرتەبوون و تەزاروق ڕوویان لەمیسر کرد و دوای ئەوە، لەیەکێك لەجەنگەکانی هاوینە کوژران.

دەڵێت: هۆکاری ڕۆشتنی عومەر کوڕی خەتاب بۆ شام ئەوە بوو باوکی عوبەیدە گەمارۆی خستبووە سەر بیت المقدس و خەڵکەکەی داوایان کرد هاوشێوەی

مەرجەکانی ئاشتی شام، پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ واژۆ بکات و پەیمانەکە لەلایەن عومەر کوڕی خەتابەوە مۆر بکرێت. باوکی عوبەیدە رووداوەکەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و لەمەدینەوە بەرێکەوت.

عودەی کوڕی سەهل دەڵێت: کاتێك سوپای شام لەعومەر کوڕی خەتاب سەبارەت بەفەلەستین داوای هاوکاری کرد، عەلی کوڕی ئەبی تالبی وەك جێگری خۆی دانا و بۆ هاوکاری کردنی ئەوان رێگەی شامی گرتەبەر.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: بۆخۆت دەڕۆیت چوونکە رووبەرووی دوژمنێکی سەرسەخت دەبیتەوە.

وتی: دەمەوێت بەجیهاد کردن و شەڕ لەگەڵ دوژمنان مەرگی عەباس دوابخەم چوونکە ئەگەر عەباس لەدەست بدەن، شەڕ لەدەوری ئێوە کۆدەبێتەوە بەهەمان شێوە کەسەری تەناف کۆدەبێتەوە.

عوبادە دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب لەجابیە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ خەڵکانی ئیلیا بەست و پەیمانەکەی نووسی، جگە لەخەڵکانی ئیلیا، بۆ هەرکام لەویلایەتەکان نامەیەکی جیاوازی نووسی بەم ناوەرۆکە:

(( ئەمە نامەی ئەمانە کەعومەر کوڕی خەتاب سەروەری باوەڕداران بۆ خەڵکانی ئیلیای دەنووسێت، خۆیان و سامانەکانیان و کەنیسە و خاچەکانیان، ساغ و نەخۆشیان و کەسانی دیکەی خەڵکەکەیان ئەمان دەبەخشێت و بەڵێن دەدات کەنیسەکانیان وێران نەبێت و سنووریان کەم نەکەنەوە، لەخاچ و سامانی ئەوانیش و لەدینەکەیان هیچ کەسێك نابێتە ئەرك بۆیان. کەسیان زیانی بەرناکەوێت و کەس لەجوولەکەکان لەئیلیا لەگەڵ ئەوان نیشتەجێ نابێت.

خەڵکانی ئیلیا دەبێت جەزیە بدەن بەهەمان شێوە کەخەڵکانی شارەکان دەیدەن و دەبێت رۆمییەکان و دزەکان لەوێ دەربکەن. ئەو کەسانەی بڕۆن گیان وماڵیان پارێزراوە تا دەگەنە شوێنی ئەمانی خۆیان، هەرکەس بمێنێتەوە، پارێزراوە و ئەوانیش دەبێت هاوشێوەی خەڵکانی ئیلیا جەزیە بدەن و ئەو کەسانەی لەخەڵکانی ئیلیا بخوازن لەگەڵ سامانی خۆیان پەیوەستی رۆمییەکان بن و خاچ و کەنیسەکانیان بەجێبێڵن، گیان و کەنیسە و خاچەکانیان لەئەماندایە تا دەگەنە

شوێنی ئەمانی خۆیان. ئەو خاوەن زەوییانەی پێش کوژرانی فلان لەوێ بوون، هەرکەس لەوان بخوازێت، بمێنێتەوە و دەبێت هاوشێوەی خەڵکانی دیکە جەزیە بدات و هەرکەس دەخوازێت لەگەڵ ڕۆمییەکان بڕوات و هەرکەس دەخوازێت بۆ سەرزەمینەکەی خۆی بگەڕێتەوە و هیچیان لێوەرنەگرن تا کاتی دروێنە و کۆ کردنەوەی بەرهەم بگات. تا ئەو کاتەی جەزیەی دیاریکراو بدەن، پەیمانی خوا و پێغەمبەر(د.خ)و نووسەرانی ئەم پەیمانە و بەڵێنی باوەڕداران، ڕێزی لێدەگیرێت. خالید کوڕی وەلید و عەمرۆ کوڕی عاس و عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و معاویە کوڕی ئەبی سوفیان شایەتی ئەم پەیمان نامەن. لەساڵی پانزەیەم نووسراوە.))

لەنامەکانی دیکە، نامەی لەد بەمشێوە بوو:

((بسم الله الرحمان الرحیم. ئەمە پەیمان نامەی ئەمانێکە کەبەندەی خوا عومەر، سەروەری باوەڕداران، بەخەڵکانی لەدی دەدات لەگەڵ خەڵکانی فەلەستین کەپەیوەستی ئەوان بوون. ئەمانیان پێدەبەخشێت بۆ خۆیان و سامان و کەنیسە و خاچەکانیان، بەساغ و نەخۆشییان و خەڵکانی دیکە: بەڵێن دەدات کەنیسەکانیان وێران نەکرێت و هیچی لێ کەم نەکەنەوە و سنووری دانەبڕن. و موسوڵمانەکان بەهیچ جۆرێك نەبنە ئەرك بۆیان.

خەڵکانی لەد و ئەو کەسانەی لەفەلەستینییەکان پەیوەستیان بوون، دەبێت جەزیە بدەن بەهەمان شێوە کەخەڵکانی دیکە شام دەیدەن و ئەگەر بڕۆن، بەم شێوەیە..... تا کۆتایی نامەکە.

دواتر عومەر کوڕی خەتاب نێردراوی خۆی بۆ لای ئەوان نارد: فەلەستینی لەنێوان دوو کەسدا دابەش کرد، عەلقەمە کوڕی حەکیمی کردە سەرکردەی بەشێکی و ئەوی لەرەملە نیشتەجێ کرد و عەلقەمە کوڕی موجەزەزی کردە سەرکردەی بەشەکەی دیکە و ئەوی لەئیلیا نیشتەجێ کرد. هەرکام سوپایەکی لەگەڵدا بوو و لەسنووری فەرمانڕەوایەتی خۆیان جێگیر بوون.

سالم دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب، عەلقەمە کوڕی موجەزەزی وەك فەرمانڕەوای ئیلیا دەستنیشان کرد و عەلقەمە کوڕی حەکیمی وەك سەرکردەی کاروباری ڕەملە و سوپاکەی عەمرۆ راسپارد. عەمرۆ و شورەحبیلی لەجابیە بانگ کرد و کاتێك گەیشتنە جابیە، عومەر کوڕی خەتاب سوار ببوو، ئەژنۆی ئەویان ماچ کرد و عومەر

کوڕی خەتاب ئەوانی لەئامێز گرت.

عوبادە دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب پەیمان نامەکەی خەڵکانی ئیلیای نارد و سوپاکەی، لەوێ نیشتەجێ بوو، لەجابیەوە بەرەو بیت المقدس بەڕێکەوت. بینی ئەسپەکەی شەلە و لەئەسپەکەی هاتەخوار، مایینێکیان بۆ هێنا و سوار بوو بەڵام عومەری راوەشاند. لەمایینەکە دابەزی و بەعاباکەی خۆی لەناوچاوی مایینەکەی دا و وتی: خواوەند قێزەون بکات ئەوەی ئەم کارەی فێر کردی. دواتر چەند رۆژێك ئەسپەکەی خۆی حەواندەوە و سمی ئەسپەکەی دەرمان کرد. سواری بوو و ڕۆشت تا گەیشتە بیت المقدس.

باوکی سەفییە یەکێك لەشێخەکانی منداڵەکانی شەیبان دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب هاتە شام، مایینێکیان بۆ هێنا، سواری بوو و کاتێك بەڕێکەوت، ئەوی راوەشاند. عومەر کوڕی خەتاب لەمایینەکە هاتەخوار و لەناوچاوی مایینەکەیدا، وتی: خواوەند هیچ شتێك فێری ئەو کەسە نەکات کەئەمەی فێری تۆ کرد. پێشتر هیچ کات سوار مایین نەبوو و دوای ئەوەیش هیچ کات سواری نەبوو.

دەڵێت: ئیلیا و هەموو سەرزەمینەکان بەدەستی عومەر کوڕی خەتاب دەستی بەسەردا گیرا جگە لەئەجنادین کە لەسەر دەستی عەمرۆ و قیساریە کە لەسەر دەستی معاویە دەستی بەسەرداگیرا.

باوکی حارسە دەڵێت: ئیلیا و سەرزەمینەکەی لەکۆتایی رەبیع الاوەلی ساڵی شانزەیەم لەسەر دەستی عومەر کوڕی خەتاب دەستی بەسەردا گیرا.

باوکی مریەم موالی سەلامە دەڵێت: لەگرتنی ئیلیا هاوڕێی عومەر کوڕی خەتاب بووم، ئەو لەجابیەوە رووی کردە ئیلیا و ڕۆشتە ناو مزگەوتەکە. رووی کردە میحرابەکەی داوود، ئێمە لەگەڵیدا بووین، سوورەی داوودی خوێندەوە و سەری کورنوشی دانەواند، ئێمەش سوجدەمان برد.

رەجە کوڕی حەیوە لەزمانی یەکێك لەئامادەبووان دەگێڕێتەوە: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب لەجابیەوە ڕۆیشتە ئیلیا و گەیشتە بەردەم مزگەوتەکە، وتی: کەعب بێننە لای من. کاتێك گەیشتە لای درگاکە، وتی: ئامادەم، خواوەندا ئامادەم، بۆ ئەوەی ئارەزووی دەکەیت. دواتر روویکردی میحرابی داوود و ئەمە لەکاتی شەودا

بوو، نوێژی خوێند و زۆری نەخایاند بەرەبەیان دەرکەوت. بانگدەر بانگیدا وت و عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ موسوڵمانان نوێژی خوێند. سوری (ص) لەنوێژەکەیدا خوێندەوە و سەری بۆ سوجدە دانەواند، دواتر هەستا و لەرەکعەتی دووەم بەشی یەکەمی سوورەی بنی اسرائیلی خوێند. رکوعی برد و کۆتایی بەنوێژەکەی هێنا، وتی: کەعب بێننە لای من.

کاتێك کەعبیان هێنا، پێی وت: بەبڕوای تۆ نوێژگە لەکوێدا جێگیر بکەین؟

وتی: لەبن تاشەبەردەکە.

وتی: ئەی کەعب، سوێند بەخوا شێوازی جوولەکەکانت گرتۆتەبەر، بینیم هەر دوو پێپۆشەکەت لەپێ دەرهێنا.

وتی: دەمویست، قاچم بەر زەوییەکە بکەوێت.

وتی: بینیمیت، ئێمە سەرەوەی مزگەوتەکە دەکەینە قیبلە چوونکە پێغەمبەر(د.خ) قیبلەی ئێمەی موسوڵمانی بەمشێوەیە دیاری دەکرد. ئەم وتەیەت پشتگوێ بخە چوونکە لەبارەی تاشەبەردەوە هیچ فەرمانێکمان پێنەدراوە بەڵام سەبارەت بەتۆ ئەی کەعب دەزانین چی بکەین. سەرەوەی مزگەوتەکەی کردە قیبلە.

دواتر لەنوێژگەکەی خۆی بەرەو ئەو خۆڵدانە ڕۆشت کەرۆمییەکان لەرۆژگاری منداڵەکانی ئیسرائیل بیت ئەلمقدسیان کردبووە ژێر خۆڵ و کاتێك دووبارە دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت، بەشێکیان لەژێر خاکدا دەرهێنا و بەشەکەی دیکەیان پشتگوێ خست، وتی: ئەی خەڵکینە ئەو کارە بکەم کەمن دەیکەم. ئەمەی وت و کەوتە سەر ئەژنۆ و بەشێك لەعاباکەی خۆی پڕ کرد لەخۆڵ. لەم کاتەدا لەپشت سەری خۆیەوە دەنگی تەکبیری بیست. عومەر کوڕی خەتاب حەزی لە بێ ئەزمی نەدەکرد، وتی: ئەمە چییە؟

وتیان: کەعب تەکبیری وت و خەڵکیش بەدوای ئەو تەکبیریان وت.

وتی: بیهێنن.

کەعب وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، یەکێك لەپێغەمبەران، پێنسەد ساڵ پێش کارەکەی ئەمڕۆی پێشبینی کردبوو.

وتی: چۆن؟

وتی: رۆمییەکان هێرشیان کردە سەر منداڵەکانی ئیسرائیل و بەسەریاندا زاڵبوون

و بیت المقدسیان کردە ژێر خۆڵ و جارێکی دیکە دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت، بەڵام گرنگییان پێنەدا تا ئەو کاتەی فارسەکان هێرشیان برد و بەسەر منداڵەکانی ئیسرائیدا زاڵبوون. دواتر رۆمییەکان تا رۆژگاری تۆ بەسەر ئەواندا زاڵبوون و خواوەند پێغەمبەرێکی بۆ لای ئەم خۆڵدانە نارد و فەرمووی: ئورشەلیم مژدەت لێ بێت چوونکە فاروق تۆ پاك و خاوێن دەکاتەوە. پێغەمبەرێکی بۆ قوستەنتەنییە رەوانە فەرمووو کە لەسەر تەپۆڵکەیەك وەستا و وتی: ئەی قوستەنتەنییە، خەڵکانی تۆ چییان لەماڵەکەی من کرد، وێرانیان کرد و تۆیان بەهاوتای عەرشەکەی من زانی. فەرمانمداوە رۆژێك بەدەستی منداڵەکانی قازرسەبا و وەدان وێرانت بکەن بەشێوەیەك کەس سەردانت نەکات و کەس لەسێبەری تۆدا نەحەسێتەوە و شەو هەڵنەیێت مەگەر ئەوەی هیچ شتێکی لێ نەمێنێتەوە.

رەبیعەی شامی حەدیسێکی لەم شێوەی هەیە بەم زیادەیە کەفاروق لەگەڵ سوپا شوێنکەوتەکەی من دێتە لای تۆ و تۆڵە لەرۆمییەکان دەستێنێتەوە. سەبارەت بەقوستەنتەنییە وتی: وێرانت دەکەم تا کەس روو نەکاتە تۆ و سێبەر بۆ کەس دروست نەکەیت.

ئەنس کوڕی مالك دەڵێت: لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب لەئیلیا بووم، رۆژێك کە لەوێ خواردنی بەخەڵکان دەدا، راهیبەکەی ئیلیا هات، نەیدەزانی شەراب حەرامە، وتی: دەخوازیت خواردنەوەیەکت بۆ بێنم چوونکە لەکتێبەکانی ئێمەدا باسی کراوە هەر کاتێك شەراب حەرام بکرێت، بەهەمان شێوە حەڵاڵە؟

وتی: بیهێنە و پرسی ئەمە چییە؟

وتی: کوڵاوی گوشراوی ترێیە و دوو بەشی لەناو چووە.

عومەر کوڕی خەتاب پەنجەی تێکرد و وتی: ئەمە رۆنە و دەبێت لەجەستەی بسوون. شوبهاندی بەقەتران و لێی خواردەوە. بەسەرکردەکانی سوپای شامی وت و بۆ ویلایەتەکانی نووسی کەخواردنەوەیەکیان بۆ من هێناوە کە لەگوشراوی ترێ دروستیان کردووە و دوو بەشی لەناو چووە و بەشێکی ماوەتەوە، ئێوەیش دروستی بکەن و دەرخواردی موسوڵمانانی بدەن.

باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك عومەر هاتە جابیە، ئەرتەبوون رووی لەمیسر کرد

و ئەوانەی بەپەیمانی ئاشتی رازی ببوون، پەیوەستی بوون و کاتێك پەیمانی ئاشتی لەگەڵ خەڵکانی میسر مۆر کرا و رۆمییەکان بەزێنران، رووی کردە دەریا و ماوەیەك لەدەریا مایەوە و سەرکردەی جەنگە هاوینییەکانی رۆمییەکانی لەئەستۆدابوو. رووبەرووی سەرکردەی جەنگە هاوینییەکانی موسوڵمانان بوویەوە و لەگەڵ پیاوێك لەهۆزی قەیس بەناوی زەریس شەڕی کرد و دەستی ئەوی بڕی، بەڵام پیاوی قەیسی ئەوی کوشت.

## دیاریکردنی مانگانە و رێکخستنی دیوان

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب بۆ موسوڵمانان مانگانەی دیاری کرد و دیوانەکانی رێکخست. مانگانەی بەپێی پێشینە دیاری کرد، سەفوان کوڕی ئومەییە و حارس کوڕی هوشام و سوهەیل و ئەو کەسانەی لەگرتنی مەککە موسوڵمان ببوون، مانگانەیەکی کەمتری لەموسوڵمانە کۆنەکان بۆ دیاری کردن. ئەوان بەوەرگرتنی ئەو مانگانەیە رازی نەبوون و وتیان: رازی نین کەس لەئێمە بەرێزتر و رێزدارتر بێت.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: مانگانە بەپێی پێشینە لەئیسلام بۆ کەسەکان دیاری دەکەم نەك بەپێی رێز و پێگە.

وتیان: رازین. وەریانگرت.

حارس و سوهەیل لەگەڵ کەسەکانی خۆیان روویان لەشام کرد و لەرێگەی خوادا جەنگان تا ئەوەی لەیەکێك لەهێرشەکان بۆ سەرزەمینی رۆم کوژران و بەوتەیەك بەهۆی تاعوونی عەمواس مردن.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب مەبەستی ئەوەی کرد کاروبارەکانی دیوان رێکبخات، عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عەبدولرەحمان کوڕی عەوف وتیان: لەخۆتەوە دەست پێبکە.

وتی: نە، لەمامی پێغەمبەرەوە دەست پێدەکەم، دواتر هەرکەس لەو نزیکترە.

مانگانەی بۆ عەباس دیاری کرد. سەرەتا لەعەباسەوە دەستی پێکرد. دواتر بۆ شەڕکەرانی بەدر پێنج هەزار پێنج هەزار مانگانەی دیاری کرد. بۆ موسوڵمانان

لەبەدر تا حودەیبییە چوار هەزار چوار هەزار، بۆ موسوڵمانان لەحودەیبیە تا ئەو کاتەی ئەبوبەکری راستگۆ لەشەڕی هەڵگەڕاوەکان رزگاری بوو، سێ هەزار سێ هەزار. ئەوانەی لەگرتنی مەککە بەشدار بوون یای لەرۆژگاری ئەبوبەکر جەنگابوون و شەڕکەرانی پێش قادسیە، هەمووان سێ هەزاریان وەردەگرت. بۆ شەڕکەرانی قادسیە و شەڕکەرانی شام، دوو هەزار دووهەزاری دەستنیشان و بۆ تێکۆشەرەکان دوو هەزار و پێنسەد دوو هەزار و پێنسەدی دیاری کرد.

پێیان وت: چی دەبێت ئەگەر شەڕکەرانی قادسیە پەیوەستی شەڕکەرانی پێشوو بکەیت.

وتی: ئەوان ناخەمە ئەو قۆناغەی تیایدا نەژیاون.

وتیان: بۆچی ئەوانەی لەسەرزەمینی خۆیان دوور بوون بەبەراوەرد لەگەڵ ئەو کەسانەی لەنزیك سەرزەمینەکانی خۆیان شەڕیان کردووە، زیاتریان پێ نابەخشیت؟

وتی: ئەو کەسانەی سەرزەمینەکەیان نزیکترە، ماف خۆیانە زیاتر وەربگرن چوونکە لەبەردەم هەڕەشە و بەزەییەکانی دوژمندا بوون. بۆ موهاجیرەکان کەئەوانمان لەگەڵ ئەنسار بەرابەر کرد، ئەم قسەیان نەهێنایە سەرزمان. ئەنسار لەماڵی خۆیان هاوکاریی ئیسلامیان کرد و موهاجیرەکان لەرێگەی دوورەوە هاتن.

بۆ شەڕکەرانی دوای قادسیە و یەرموك، هەزار هەزاری دیاری کرد. بۆ چینی دووەم پێنسەد پێنسەد و بۆ چینی سێیەم سێسەد سێسەد، مانگانەی هەموو کەسەکانی لەلاواز و بەهێز و عەرەب و عەجەم وەك یەك دابەش کرد. چینی چوارەم دوسەد و پەنجای وەرگرت و بۆ چینی دواتر کەخەڵکانی هیجر و عیبادییەکان بوون، دوسەدی دیاری کرد. چوارکەس جگە لەشەڕکەرانی بەدر یانی حەسەن و حسەین و ئەبوزەر و سەلمانی پەیوەستی شەڕکەرانی بەدر کرد، مانگانەی عەباسی مامی پێغەمبەر(د.خ) بیست پێنج و هەزار و بەوتەیەك دوانزە هەزار درەم بوو. بۆ ژنانی پێغەمبەر(د.خ) مانگانەیەکی دەهەزاری دەستنیشان کرد مەگەر ئەوانەی پێشتر کۆیلە بوون. هاوسەرانی پێغەمبەر(د.خ) وتیان: پێغەمبەر(د.خ) لەوان زیاتری بەئێمە نەدەبەخشی، ئێمە دەبێت بەرابەر بین. عومەر کوڕی خەتاب ئەو کارەی کرد. مانگانەی عایشەی دوو هەزار زیاتر کرد چوونکە پێغەمبەر(د.خ) ئەوی لەهەموو

ژنەکانی زیاتر خۆش دەویست بەڵام عایشە رازی نەبوو.

ژنانی شەڕکەرانی بەدر پێنسەد پێنسەدیان وەرگرت. ژنانی چینی دواتر تا حودەیبیە چوارسەد و ژنانی دواتر تا شەڕەکانی پێش قادسیە، سێسەد سێسەدیان وەرگرت. ژنانی شەڕکەرانی قادسیە دووسەد دووسەد و دوای ئەو بەشێوەیەکی یەکسان بۆ هەموو ژنان مانگانەی دیاری کرد. منداڵەکان بەشێوەیەکی یەکسان سەد سەدیان وەرگرت. دواتر شەست هەژاری کۆکردەوە و خۆراکی پێدان. بڕی خواردنەکەیان خەملاند و دوو هەمانە بوو. بۆ هەرکام لەوان مانگانەیەکی بەرابەر لەگەڵ دوو هەمانە دیاری کرد.

عومەر کوڕی خەتاب پێش مەرگ وتبووی: دەمەوێت مانگانەکان بۆ چوار هەزار چوار هەزار زیاد بکەم تا پیاو، هەزاری لای خێزانەکەی دابنێت، هەزاری بکاتە توێشو، هەزاری بۆ کرینی سیلاح بەکار ببات و هەزاری بۆ خۆشگوزەرانی خەرج بکات. بەڵام پێش ئەوەی ئەو کارە بکات، مرد.

ئەبی سەلمە دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب مانگانەی بۆ تالآنی وەرگرەکان کەخواوەند تالآنی بەوان دەبەخشی، دیاری کرد کەسوپاکەی مەداین بوون و دواتر ڕێگەی کوفەیان گرتەبەر و لەمەداین بۆ کوفە و بەسرە و دیمەشق و حمس و ئەردەن و فەلەستین و میسر کۆچیان کرد. عومەر کوڕی خەتاب وتی: تالآنی تایبەتە بەو خەڵکە و هەر کەس پەیوەستی ئەوان بێت چوونکە بەهۆی ئەوانە شار و گوندەکان ئاوەدان بوونەتەوە و ئەوان پەیمانی ئاشتییان بەستووە و جەزیە بەوان دەدرێت و سنوورەکان بەهۆی ئەوانەوە دەپارێزرێن و دوژمن لەسەر دەستی ئەوان شکستی خواردووە.

دواتر فەرمانیدا مانگانەی ساڵی پانزەیەم، پێکەوە بدەن، یانی هەردوانزە مانگەکەیان لەپێشەوەدا.

کەسێك وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، چی دەبێت ئەگەر بۆ پێشهاتێکی چاوەڕوان نەکراو پاشەکەوتی بکەیت و لەبیت المال بیپارێزیت.

وتی: ئەمە وتەی شەیتانە، خواوەند من لەشەڕی وتەکەی تۆ بپارێزێت چوونکە دەبێتە هۆکاری ئاژاوەی داهاتووان، بۆ ئەوان ئەوەی خواوەند و پێغەمبەر(د.خ) فەرمانی پێداوە، پاشەکەوت دەکەم یانی پەرەستینی خواوەند وئەنجامدانی

فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) کەباشترینی پاشەکەوتەکانە و بەهۆی ئەوانەوە ئەم پێگەیەمان پێبڕاوە. ئەگەر ئەم سامانە ببێتە بەهای دینی یەکێك لەئێوە، لەناو دەچن.

سەعید دەڵێت: کاتێك خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و ڕۆستەم کوژرا وعومەر کوڕی خەتاب لەهەواڵی سەرکەوتنەکانی شام ئاگادار بوویەوە، موسوڵمانانی کۆکردەوە و وتی: بۆ خەلیفە لەم سامانە چەندە ڕەوایە؟

وتیان: بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانی ژیانی ئەو، بۆ بژێوی ژیانی خۆی و خێزانەکەی و پۆشش خۆی و پۆششی ئەوان بۆ زستان و هاوین و دوو چوارپێ بۆ جیهاد لەڕێگەی خوا و پێداویستییەکانی ڕێگەی حەج و عەمرە. دابەش کردنی بەرابەر ئەوەیە خەڵکانی تێکۆشەر بەئەندازەی تێکۆشینەکانی خۆیان پێیان ببەخشێت و کاروبارەکانی خەڵکان سامان بدات و لەکاتی زیان و گرفتاری بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ئەوان بگرێتە ئەستۆ تا زیانەکان نەمێنن.

کوڕی عومەر کوڕی خەتاب دەڵێت: کاتێک هەواڵی سەرکەوتنی قادسیە و دیمەشق بە سەروەری باوەڕداران گەیشت، کەسانی کۆکردەوە و وتی: من پیاوێکی بازرگان بووم و خواوەند نیازی بنەماڵەکەمی بەهۆی بازرگانییەوە بەراوەردە دەکرد، من بەکاروباری ئێوەوە سەرقاڵم، بەبڕوای ئێوە چەندە لەم سامانە بۆ من حەلاڵە؟

خەڵکان زۆریان قسە کرد بەڵام عەلی بێدەنگ بوو.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەی عەلی بۆچوونی تۆ چییە؟

وتی: بەو ئەندازەی بەشی پێویستییەکانی خۆت و بنەماڵەکەت بکات، جگە لەوە مافت بەسەر ئەو سامانەوە نییە.

خەڵکان وتیان: کوڕی ئەبی تالیب ڕاست دەکات.

کوڕی ئەسلەم دەڵێت: کەسێك لای عومەر کوڕی خەتاب وتی: لەم سامانە چەندەی بۆ تۆ ڕەوایە؟

وتی: ئەوەندەی بەشی پێداویستییەکانی خۆم و بنەماڵەکەم بکات و جل و بەرگی زستانە و هاوینە و دوو چوارپێ و پێویستییەکانی حەج و عەمرە و چوارپێیەك بۆ جیهاد لەڕێگەی خوا.

سالم کوڕی عەبدوڵلە دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب خەلافەتی گرتە دەست،

ئەو مانگانەی بۆ ئەبوبەكر دیاریكرابوو، هەڵیدەگرت، بەمشێوە بوو تا ئەوەی نیازەكانی زیادی كرد. دەستەیەك لەموهاجیرەكان و لەناو ئەوان عوسمان كوڕی عەفان و عەلی و تەڵحە و زوبەیر كۆبوونەوە، زوبەیر وتی: چی دەبێت ئەگەر بەعومەر كوڕی خەتاب بڵێین مانگانەكەی كەمێك زیاتر بكات.

عەلی كوڕی ئەبی تالیب وتی: باشتر بوو ئەم كارەمان پێشتر ئەنجامدەدا، با بڕۆین.

عوسمان وتی: هەمووتان عومەر كوڕی خەتاب بەباشی دەناسن، با لەرێگەیەكی دیكەوە هەست بەبۆچوونی خۆی بكەین، دەڕۆینە لای حەفسە و لێی دەپرسین و پێی دەڵێین ئەمە نهێنی بێت.

ڕۆشتنە لای حەفسە و وتیان بەنوێنەرایەتی ئەوان لەعومەر بپرسێت و ناوی كەس نەبات مەگەر ئەو كاتەی بەزیاد كردنی مانگانەكەی رازی ببێت. ئەمەیان وت و حەفسەیان بەجێهێشت.

حەفسە عومەری بینی و قسەی لەگەڵ كرد. بەلام نیشانەكانی توڕەیی لەروخساری دەركەوت و وتی: ئەوان كێن؟

وتی: تا بۆچوونی تۆ نەزانم ناوی ئەوان نابەم.

وتی: ئەگەر دەمزانی كێن، ڕووڕەشم دەكردن، تۆ كە لەنێوان ئەوان و مندایت، سوێندت دەدەم بەخوا باشترین جل و بەرگی پێغەمبەر(د.خ) كامە بوو؟

وتی: دوو دەست جلی خەتدار كە لەكاتی ئامادە بوونی خەڵك و لەكاتی وتارخوێندنەوە لەبەری دەكرد.

وتی: ئەو خواردنەی لای تۆ دەیخوارد، چی بوو، بێڵێ؟

وتی: نانی ئێمە نانی جۆ و كاتێك گەرم بوو بنی دەفری رۆنەكەمان پیا دەساوی كەچەور و نەرم دەبوو و لێی دەخوارد. بەلایەوە زۆر خۆش بوو.

وتی: لای تۆ لەسەر چ فەرشێك دادەنیشت؟.

وتی: راخەرێكی زبرمان بوو، لەهاویندا رامان دەخست و لەزستان نیوەیمان رادەخست و نیوەیمان دەدا بەخۆماندا.

وتی: ئەی حەفسە، بەنوێنەرایەتی من بەم كەسانە بڵێ پێغەمبەر(د.خ) ئارامی گرت و زیادەكانی پشتگوێ خست و بەئەندازەی پێویست بەسەندەی كرد، منیش

بەهەمان شێوە زیادەکان پشت گوێ دەخەم و بەئەندازەی پێویست بەسەندە دەکەم چوونکە داستانی من و دوو هاورێکەم وەك ئەو سێ کەسە وایەکەرێگەیەکیان بڕی، یەکەمی ڕۆشت و توێشووی هەڵگرت، دووەمی بەدوای ئەودا ملی ڕێگەی گرتەبەر و خۆی بەو سپارد و پێی گەیشتەوە، سێیەمی شوێنیان کەوت، ئەگەر بەرێگەی ئەواندا بڕوات و بەتوێشووی ئەوان رازی بێت، پەیوەستیان دەبێت و لەگەڵیان دەمێنێتەوە و ئەگەر بەرێگەیەکی دیکەدا بڕوات، هیچ کات پێیان ناگاتەوە.

کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك قادسیە دەستی بەسەردا گیرا و خەڵکانی سواد پەیمانی ئاشتییان بەست و دیمەشق دەستی بەسەردا گیرا و خەڵکانی دیمەشق پەیمانی ئاشتییان بەست، عومەر بەخەڵکانی وت: کۆببنەوە و زانست و لەبۆچوونی خۆتان سەبارەت بەو تالآنییانەی موسوڵمانان لەقادسیە و شام دەستیان کەوتووە، ئاگادارم بکەنەوە. عومەر و عەلی و عوسمان بڕیاریاندا پشت بەقورئان ببەستن و وتیان: بەپێی فەرموودەی قورئان ئەوەی خواوەند لەم گوندانە تایبەتی کردووە بەپێغەمبەر، تایبەت بەخوا و پێغەمبەرە (یانی تایبەت بەخوا و پێغەمبەرە کەخوا فەرمان بدات و پێغەمبەر(د.خ) دابەشی بکات وخزمەکانی پێغەمبەر(د.خ) و هەتیوەکان و هەژاران و نەداران، ئەم ئایەیان پێ زیاد کرد کەدەڵێت: وتایبەت بەموهاجیرە هەژارەکان کەلەسەرزەمینی خۆیان و سامانەکەیان دوور خراونەتەوە، چوار لەسەر پێنجی تالآنییەکانیان بۆ ئەو کەسانەی ئەم ئایانە ئەوانی دەگرتەوە، دیاری کرد، پێنج یەك تایبەت بوو بەچینی یەکەم و دووەم و سێیەم و چوار لەسەر پێنجی تایبەت بوو بەوانەی تالآنییان وەردەگرت. ئایەیەکی دیکەیان بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم کارەیان هێنایەوە کەدەڵێت هەرچی وەك تالآنی بەدەستی بێنن، پێنج یەکی تایبەتە بەخواوەند، پێنج یەکەکانیان بەمشێوەیە دابەش کرد و عومەر و عەلی بەمشێوەیە بڕیاریاندا و موسوڵمانان رازی بوون.

بۆ دابەش کردن لەموهاجیرەکانەوە دەستیان پێکرد. دوای ئەوان ئەنسار و دواتر شوێنکەوتەکانی ئەوان و ئەوکەسانەی هاوکاری ئەوانیان کردبوو. دواتر لەداهاتی جەزیە بۆ ئەو کەسانەی پەیمانی ئاشتییان بەستبوو یا پێشنیاری ئاشتییان پێکرابوو، مانگانە دیاریکرا و بەتەواوی پێیان دەدرا. جەزیە پێنج یەکی نەبوو و

داهاتەکەی تایبەت بوو بەوکەسانەی پارێزگارییان لەخەڵکان دەکرد (ئەوانەی جەزیەیان دەدا) و ئۆدەداری پەیمانەکان بوون مەگەر ئەوەی بەدڵخوازی خۆیان بەکەسانی دیکەیان دەبەخشی.

تەبەری دەڵێت: بەوتەی سەیف کوڕی عەمرۆ لەم ساڵە یانی ساڵی پانزەیەم، چەندین جەنگ روویدا بەڵام بەوتەی کوڕی ئیسحاق ئەم شەڕانە لەساڵی شانزەیەم روویانـدا و پێشتر ئاماژەمان بەحەدیسەکانی ئەوانـدا. هەروەها حەدیسەکەی واقدیمان گێڕایەوە.

ئێستا سەبارەت بەو پێشهات و رووداوانەی لەکاتی نێوان شەڕەکان روویدا تا کۆتایی هاتنی ئەو ساڵەی وەك ئاماژەمان پێدا سەبارەت بەرووداوەکانی بۆچوون و گێڕانەوەکان جیاوازە، دەدوێین.

سەعید دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب فەرمانی بەسەعد دەدا روو بکاتە مەداین، پێی وت ژنان و نانخۆرەکان لەعەتیق بەجێبێڵێت و دەستەیەك سوپا بۆ پارێزگاری کردنی ئەوان راسپێرێت. سەعد ئەو کارەی کرد. هەروەها پێی وت ئەو دەستەیە لەسوپاکە کەبۆ پارێزگاری کردن لەژن و منداڵەکان راسپێردرابوون، لەهەموو تالآنییەکاندا شەریك بکات.

دەڵێت: سەعد دوای سەرکەوتن، دوو مانگ لەقادسیە مایەوە و سەبارەت بەو کارانەی دەبوا ئەنجامی بدات، نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و زوهرەی بۆ زەبانە رەوانە کرد. زەبانە بەشێك بوو لەو دەشتەی بەشێکی گوندەکەی گرتبوویەوە و کوفەی ئێستا لەوێدایە و حیرەی کۆن لەوێدابوو. تەخیرجان لەوێ ئوردووی لێدابوو و

کاتێك لەهاتنی عەرەبەکان ئاگادار بوویەوە، ڕۆشت و شوێنەکەی بەجێهێشت و پەیوەستی هاوەڵانی خۆی بوو.

دەڵێت: یەکێك لەو وتانەی منداڵەکان لەناو ئوردووگا بەدەم گاڵتە کردنەوە دەیانوت و ژنان ئەو کاتەی لەکەنارەکانی عەتیق بوون، ئەوانیان فێر کردبوو، ئەو وشانە بوو کەژنان لەزەرود و زیقار و ئەو ناوچانە بەدەم گاڵتە کردنەوە دەیانوت لەبەر ئەوەی لەمانگی جومادی فەرمانیان پێدرابوو، بەرەو قادسیە بەرێکەون و ئەمە یەکێك بوو لەو هۆنراوانەی بەسەر زمانەکاندا دەگەڕا چوونکە لەنێوان جومادی و

ڕەجەب هیچ ڕووداوێك ڕووی نەدابوو، دەیانوت:

(( سەیر و سەرسوڕهێنەرە

لەنێوانە جومادی و ڕەجەب

قەزا و قەدەرە

و ئەوەی لەتەپ و تۆز و دەنگەدەنگی پاڵەوانەکان

کوژراوە باسی دەکات.))

## شەڕی بورس

دەڵێت: کاتێك سەعد لەشەڕی قادسیە ڕزگاری بوو، چەند ڕۆژ بۆ کۆتایی شەوال، زوهرە کوڕی حەویەی لەگەڵ پێشەنگی سوپاکەی بەرەو زەبانە ڕەوانە کرد و دواتر عەبدوڵلە کوڕی موتعیمی بەدوای ئەودا نارد، شورەحبیل کوڕی سمیتی بەدوای عەبدوڵلە و هاشم کوڕی عوتەبەی بەدوای ئەواندا ڕەوانە کرد. هاشمی وەك جێگری خۆی دەستنیشان کردبوو و پێگەکەی خالید کوڕی عەرەفتەی بەو سپارد. خالیدی وەك فەرماندەی دواوەی سوپاکەی دەستینشان و خۆی بەدوای ئەوان ملی ڕێگەی گرتەبەر. هەموو موسوڵمانەکان سوار و بارقورس بوون چوونکە خواوەند هەموو کەل و پەل وسیلاحی ئوردووگای فارسەکانی بەوان بەخشیبوو.

زوهرە بەڕێکەوت و لەکوفە جێگیر بوو. کوفە بەمانای ڕیخەڵان و دەشتی سووربارە و تێکەڵ و پێکەڵە، عەبدوڵلە و شورەحبیل لەوێ دابەزین و زوهرە ڕووی کردە مەداین و کاتێك گەیشتە بورس ڕووبەڕووی بەسبەهری و سوپاکەی بوویەوە و شکستی پێهێنان. بەسبەهری بەرەو بابل هەڵات کەپاشماوەی شەڕکەرانی قادسیە و پاشماوەی سەرکردەکانی فارسی وەك نەخەیرجان و مێهرانی ڕازی و هورموزان و کەسانی دیکە لەوێ کۆببوونەوە. بەسبەهری بەبریندارى گەیشتە بابل و لەئازاری برینەکەی گیانی ئەسپەردە کرد.

کوڕی ڕوفەیل دەڵێت: زوهرە لەشەڕی بورس بەسبەهری بریندار کرد و کەوتە ناو ڕووبارەکە و دوای ئەوەی گەیشتە بابل، لەئازاری برینەکەی مرد. کاتێك بەسبەهری شکستی خوارد، بەستام دیداری بورس هات و لەگەڵ زوهرە پەیمانی بەست و

چەندین پردی بۆ هەڵبەست و هەواڵی بۆ سەرکردەکانی فارس لەبابل ڕەوانە کرد.

## شەڕی بابل

دەڵێت: کاتێك بەستام زوهرەی ئاگادار کردەوە کەپاشماوەی شەڕکەرانی قادسیە لەبابل کۆبوونەتەوە، لەشوێنەکەی خۆی مایەوە و سەعدی لەم ڕووداوە ئاگادار کردەوە. کاتێك سەعد گەیشتە لای هاشم کوڕی عوتبە کەهاوەڵانی لەکوفە نیشتەجێ ببوون، هەواڵەکەی زوهرەی پێگەیشت کەپارسەکان لەبابل لەدەوری فیروزان کۆبوونەتەوە. ئەو، عەبدوللەی وەك پێشەنگ ڕەوانە کرد و شورەحبیل و هاشمی بەدوای ئەودا نارد. دواتر لەگەڵ سوپاکەی بەڕێکەوت و کاتێك گەیشتە بورس، زوهرەی لەپێشەوە نارد و عەبدوللە و شورەحبیل و هاشمی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد و خۆی بەدوای ئەوان ملی ڕێگەی گرتەبەر و لەبابل لەبەرابەر فیروزان ئوردوویان لێدا. هاوەڵانی فیروزان وتبوویان: پێش ئەوەی بڵاوەی لێبکەین، هاوشێوەی سوپایەکی یەکگرتوو لەگەڵیان دەجەنگین.

لەبابل زاری شەڕیان هەڵدا و پارسەکان لەکەمترین ماوەدا شکستیان خوارد. هەرکام ڕێگەی خۆیان گرتەبەر و تەنیا دەیانەویست لەیەك جیاببنەوە.

هورموزان ڕووی کردە ئەهواز و بەسەر ئەو ناوچە و مێهرەگانی قەزەق زاڵ بوو. فیروزان لەگەڵ ئەو ڕۆشت و کاتێك گەیشتە نەهاوەند، گەنجەکانی خوسرەوی هەڵگرت و دەستی بەسەر ئەو ویلایەتەدا گرت. نەخەیرجان و مێهرانی رازی دەیانویست بەرگری لەمەداین بکەن، لەبەهرسیر لەدیجلە پەڕینەوە و پردەکەیان وێران کرد.

سەعد چەند ڕۆژێك لەبابل مایەوە و ئاگادار بوویەوە نەخەیرجان، شەهریاری لەگەڵ سوپایەك لەکوسی داناوە. زوهرەی وەك پێشەنگ و دواتر سوپاکەی بەدوای ئەودا ڕەوانە کرد. زوهرە ڕۆشت و دوای ئەوەی لەسورا، فیومان و فەرخانی کوشت، لەکوسی لەبەرابەر شەهریار ئوردووی لێدا.

کوڕی روفەیل دەڵێت: سەعد لەقادسیەوە زوهرەی ڕەوانە کرد. چەندین جەنگی یەك لەدوای یەك ئەنجامدا و ڕووبەڕووی هەردەستەیەك بوویەوە، شکستی پێهێنان و

شوێنیان کەوت و بەهەر کەسێك گەیشتن، خوێنیان ڕشت. کاتێك زوهرەی وەك پێشەنگ لەبابلەوە ڕەوانە کرد، زوهرە دوای ئەوەی لەسەرات پەڕییەوە، بوکەیر کوڕی عەبدوللە لەیسی و کەسیر کوڕی شەهابی سەعدی نارد و هێرشیان کردە سەر پاشماوەی خەڵکان کەفیومان و فەرخان یەکیان میشانی و ئەوی دیکەیان ئەهوازی لەناویاندا دەبینران. لەنزیك سورا، بوکەیر، فەرخانی کوشت و کەسیر فیومانی کوشت. زوهرە بەرێکەوت و لەسورا گوزەری کرد ولەو ناوچەیە دابەزی. هاشم پەیوەستی بوو و سەعدیش پێیان گەیشتەوە. دووبارە زوهرەی ڕەوانە کرد کەهێرشی کردە سەر ئەو پارسانەی لەنێوان دەیر و کوسی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو کۆببوونەوە.

دەڵێت: نەخەیرجان و مێهران، شەهریاریان وەك سەرکردەی سوپاکەی خۆیان دەستینشان و خۆیان ڕوویان لەمەداین کرد. شەهریار لەنێوان دێر و کوسی جێگیر و کاتێك لەدەوروبەری کوسی لەنێوان سوپاکەی شەهریار و پێشەنگی سوپای عەرەبەکان جەنگ داگیرسا، شەهریار هاتە ناو گۆڕەپان و داوای بەهێزترین شەڕکەری سوپای عەرەبەکانی کرد.

زوهرە وتی: دەمویست ڕووبەڕووی تۆ ببمەوە بەڵام ئێستا کەوتەکەی تۆم بیست، کۆیلەیەك بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی تۆ دەنێرم، ئەگەر بمێنیتەوە هیوادارم بتکوژێت و ئەگەر هەڵبێیت لەدەستی کۆیلەیەك هەڵاتوویت.

دەڵێت: بەڵام فێڵی لەشەهریار کرد و باوکی نەباتە نائل کوڕی جەعشەمی ئەعرەجی کەیەکێك لەبوێرەکانی سوپای فارس بوو، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو نارد. هەردووکیان ڕم بەدەست و هەردووکیان چوارشانە و پاڵەوان، شەهریار هاوشێوەی وشتر و کاتێك نائیلی بینی، ڕمەکەی فڕێدا تا شەڕی دەستەویەخەی لەگەڵ بکات. نائیلیش ڕمەکەی خۆی فڕێدا و شمشێریان دەرکێشا. شەڕیان دەستپێکرد و هەردووکیان لەچوارپێکەیان کەوتنە خوار. شەهریار کەوتە سەر نائیل، هاوشێوەی بینایەکی گەورە و بەڕانی خۆی زەختی لەقورگی دەکرد، خەنجەری دەرکێشا و سەرقاڵی کردنەوەی قوپچەکانی زرێکەی بوو. نائیل گازی لەپەنجەی گرت و ئێسقانەکەی شکاند. شەهریار سست و ئەمجارە نائیل کەوتە سەر

سکی شەهریار. خەنجەری دەرکێشا و زرێکەی کردەوە و چەند جارێك خەنجەری لەکەلەکەی دا. شەهریار مرد و نائیل ئەسپ و سیلاحەکانی ئەوی هەڵگرت.

سوپاکەی شەهریار شکستیان خوارد و بڵاوەیان لێکرد. زوهرە لەکوسی مایەوە تا سەعد هات و نائلی بردە لای. سەعد پێی وت: ئەی نائیل برۆ تەوق و جل و بەرگەکانی شەهریار لەبەرکە و سوار ئەسپەکەی ببە. هەموو کەرەستەکانی شەهریاری بەنائیل بەخشی.

نائیل ڕۆشت و جل و بەرگەکانی لەبەر کرد و سوار لەسەر ئەسپەکەی شەهریار هاتە لای سەعد. سەعد وتی: تەوقەکانی ئەو دەربێنە مەگەر ئەوەی لەکاتی جەنگدا بیت. ئەو یەکەم کەس لەموسوڵمانان بوو لەعێراق تەوقی هەڵگرت.

سەعید دەڵێت: سەعد چەند ڕۆژێك لەکوسی مایەوە و ڕۆشتە ئەو شوێنی ئیبراهیمی پێغەمبەر(د.خ)، لەوێ دانیشتبوو، لای ئەو کەسانەی بانگەشەیان بۆ دینی ئیبراهیم دەکرد، دابەزی و ڕۆشتە ئەوماڵەی ئیبراهیمی پێغەمبەر(د.خ) تیایدا زیندانی کرابوو. شوێنەکەی بینی و سڵاواتی بۆ پێغەمبەر(د.خ) و ئیبراهیمی پێغەمبەر(د.خ) و هەموو پێغەمبەران نارد و ئایەی و تلك الايام نداولها بين الناسي خوێندەوە.

## ڕووداوی بەهرسیر کەبەوتەی سەیف لەزیحەججەی ساڵی پانزەیەم ڕوویدا

کوڕی روفەیل دەڵێت: سەعد زوهرەی بۆ بەهرسیر ڕەوانە کرد، لەساباط، شێرزاد بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی و بەڵێنی دانی جەزیە بەموسوڵمانان، ڕۆشتە لای. ئەوی بۆ لای سەعد ڕەوانە کرد.

هاسم هات و سەعد بەدوای ئەو بەرێکەوت. زوهرە لەدەوروبەری سیاچاڵەکانی ساباط مایەوە تا ئەو کاتەی سەعد پەیوەستی بوو و ئەمە لەکاتی گەڕانەوەی مەقرەت ڕوویدا کەیەکێك بوو لەپاڵەوانەکانی خوسرەو. کەسێکی نزیکی خوسرەو و لەناو هەموو پاڵەوانەکانی سیاچاڵ ئەوی هەڵبژاردبوو. سوپاکەی خوسرەوی توران لەوێ بوون و هەموو ڕۆژێك سوێندیان دەخوارد کەتا ئێمە زیندووین، پاشایەتی فارسەکان هیچ کات لەناو ناچێت.

کاتێک سەعد گەیشت، مەقرەت هێرشی کردە سەر موسوڵمانەکان و هاشم ڕووبەرووی بوویەوە و خوێنی ڕشت و شمشێرەکەی ئەوی بەمەتن ناو برد. سەعد سەری هاشمی ماچ کرد و هاشم قاچی سەعد. سەعد هاشمی بۆ بەهرسیر ڕەوانە کرد و لەنزیک سیاچاڵەکان دابەزی و ئەم ئایەی خوێندەوە:

((اولم تكونوا اقسمتم من قبل ما لكم من زوال.

واتاکەی: مەگەر ئێوە نەبوون پێشتر سوێندتان دەخوارد، هیچ کات لەناو ناچن.))

کاتێک بەشێک لەشەو تێپەڕی کرد، هاشم بەرێکەوت و پەیوەستی موسوڵمانانی بەهرسیر بوو.

کاتێک سوپایەک دەگەیشتە بەهرسیر موسوڵمانان هەڵدەستانە سەرپێ و تەکبیریان دەوت. ئەم شێوەیە بەردەوام بوو تا ئەوەی دووایین موسوڵمانان کەهاوڕێی سەعد بوون، گەیشتن و سەعد و موسوڵمانان بۆ ماوەی دوو مانگ لەبەهرسیر مانەوە و لەمانگی سێیەم ئەو ناوچەیان بەجێهێشت.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ موسوڵمانان حەجی کرد. کارگوزاری ئەو لەمەککە عەتاب کوڕی ئەسید، لەتایف یەعلی کوڕی ئومەییە، لەیەمامە و بەحرەین عوسمان کوڕی ئەبی عاس، لەعەممان حوزەیفە کوڕی موحسین، لەویلایەتی شام باوکی عوبەیدەی جەراح، لەکوفە وسەرزەمینەکانی دەورووبەری سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و سەرپەرەستی دامەزراوەی دادی کوفە، باوکی فەروە بوو. کارگوزاری سەرزەمینی بەسرە و سەرزەمینەکانی دەورووبەری موغەیرە کوڕی شوعبە بوو.

## ساڵی شانزەیەمی کۆچ دەستپێکرد

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو شاری بەهرسیر و دەستیان بەسەر مەداینیدا گرت و یەزدگێرد کوڕی شەهریار لەمەداین هەڵات.

## ڕۆشتنی موسوڵمانان بۆ شاری بەهرسیر

موهەلیب دەڵێت: کاتێك سەعد لەبەهرسیر نیشتەجێ بوو، سوپاکەی بەملاولادا دەنارد و لەنێوان فورات کەخەڵکەکەی پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ موسوڵمانان بەستبوو تا سنورەکانی دیجلە هێرشیان دەکردە سەر خەڵکان و سەد هەزار کەس لەوەرزێرەکانیان گرت و رایانگرتن. کاتێك ئەوانیان بژارد، هەر موسوڵمانەوە و وەرزێرێکی بەردەکەوت چوونکە هەموو ئەو شەڕکەرانەی لەبەهرسیر نیشتەجێ ببوون، سوار و سەعد خەندەکی بەدەوری ئەواندا لێدا.

شێرزاد دێداری سابات وتی: ئەوان شوێنکەوتەی فارسەکانن و بۆ شەڕی ئێوە نەهاتوون، ئازادیان بکەن تا بۆچوونی ئێوە سەبارەت بەوان ئاشکرا ببێت. سەعد ناوی ئەوانی نووسی و هەموویانی تەسلیمی شێرزاد کرد کەپێی وتن: بۆ گوندەکانی خۆتان بگەڕێنەوە.

سەعد نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و لەوەی لەنێوان قادسیە و بەهرسیر ڕوویدا، ئاگاداری کردەوە، نووسی: گەیشتینە بەهرسیر و کەس ڕووبەڕوومان نەبوویەوە بەڵام سوپاکەم ڕەوانە کرد و وەرزێرەکانم لەگوند و دارستانەکان کۆکردەوە، بۆچوونی خۆت سەبارەت بەم کارە بنێرە.

عومەر کوڕی خەتاب وەڵامی دایەوە: ئەو وەرزێرانەی پەیوەستی ئێوە دەبن، ئەگەر نیشتەجێ بن و دژی ئێوە هاوکاری دوژمنیان نەکردبێت، ئەمانیان هەیە، هەرکەس هەڵاتووە و گرتووتانە، لای خۆتان بیهێڵنەوە.

کاتێك نامەکەی عومەر کوڕی خەتاب بەسەعد گەیشت، ئەوانی ئازاد کرد.

وەرزێرەکان نامەیان بۆ سەعد نووسی و پێشنیاریان کرد بگەڕێنەوە و باوەڕ

بێنن یا جەزیە بدەن و لەپەنای موسوڵماناندا بن. ئەوان رازی بوون بەوەی جەزیە بدەن و گەڕانەوە بەڵام ئەو کەسانەی لەبنەماڵەی خوسرەو بوون یا لەگەڵ ئەوان ڕۆشتبوون، نەگەڕانەوە. لەرۆژئاوای دیجلە تا سەرزەمینی عەرەب هەموو خەڵکانی سواد ئەمانیان پێبەخشرا و لەزاڵبوونی ئیسلام دڵخۆش بوون و باجیان دەدا.

موسوڵمانان دوو مانگ لەبەهرسیر مانەوە. بەبەردهاوێژەکان شارەکەیان وێران و دەبابەیان بەکار دەبرد. بەهەموو کەرەستەکانی شەڕ رووبەڕوویان بوونەوە.

میقدام کوڕی شورەیحی حارسی دەڵێت: کاتێک موسوڵمانان هاتنە بەهرسیر، لەوێ، خەندەك و پاسەوان و کەرەستەی جەنگی لێبوو، بەمەنجەنیق و بەردهاوێژ ئەوانیان لەناو برد، سەعد داوای لەشێرزاد کرد بەردهاوێژ دروست بکات. بیست بەردهاوێژی لەبەرابەر بەهرسیر جێگیر و بەمشێوەیە دوژمنی سەرقاڵ کرد.

کوڕی روفەیل دەڵێت: کاتێك سەعد لەبەهرسیر دابەزی، عەرەبەکان لەوێ ژمارەیان فراوان و عەجەمەکان لەناو قەڵاکاندا خۆیان حەشاردابوو. هەندێ کات عەجەمەکان دەهاتنەدەر و لەنزیك بینای موسوڵمانان لای دیجلە، رووبەڕوویان دەبوونەوە، بەڵام کەس بۆ جەنگی ئەوان پێشڕەوی نەدەکرد. دوایین جار کە موسوڵمانان لەگەڵ پیادە و تیرهاوێژەکانی خۆیان هاتن، بۆ شەڕ خۆیان ئامادە و پەیمانیان بەست خۆڕاگری بکەن. بەڵام کاتێك موسوڵمانان رووبەڕوویان بوونەوە، خۆڕاگرییان نەکرد و پشتیان کردە گۆڕەپانی جەنگ.

زوهرە کوڕی حەویە زرێیەکی دڕاوی لەبەردا بوو، پێیان وت باشترە ئەو دڕاوییە چاك بکەیتەوە.

وتی: بۆچی؟

وتیان: دەترسین لەوێوە زیانت پێ بگات.

وتی: رێزی من لای خوا گەورەتر لەوەیە تیری فارسەکان لەناو ئەو هەموو شەڕکەرەوە بێت و لەم دڕاوییەوە زیان لەمن بدات.

ئەو، یەکەم کەس لە موسوڵمانان بوو ئەو رۆژە تیری بەرکەوت.

وتیان: تیرەکە لەجەستەی دەربێنن.

وتی: نا، ئەو کارە مەکەن چوونکە تا ئەو تیرە لەجەستەم دابێت، گیانم لەبەردایە،

ئەگەری هەیە بتوانم زیان لەدوژمن بدەم.

ئەمەی وت و هێرشی کردە سەر دوژمن و بەشمشێرەکەی خۆی شەهربەرازی لەخەڵکانی ئیستەخر کوشت. فارسەکان دەوریان گرت و تۆڵەی خۆیان سەندەوە بەڵام دواتر پاشەکشێیان کرد.

عایشە دایکی باوەڕداران دەڵێت: کاتێک خواوەند لەقادسیە سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و ڕۆستەم و هاوەڵانی کوژران و سوپاکەیان هەڵات و بڵاوەی لێکرد، موسوڵمانان تا مەداین شوێنیان کەوتن. سوپای فارسەکان دووبارە بڵاوەی لێکرد و پەنایان بۆ کێوەکان برد، سوارکارەکانیان بڵاوەیان لێکرد بەڵام دەستەیەکیان کەوەفاداری پاشا بوون، لەدەوری مانەوە.

ئەنس کوڕی حەلیس دەڵێت: ئەو کاتەی دوای شکستی فارسەکان گەمارۆمان خستبووە سەر بەهرسیر، نێردراوێك هاتە لای ئێمە و وتی: پاشا دەڵێت دەخوازن پەیمانی ئاشتی ببەستن بەو مەرجەی ئەمبەری دیجلە و کوێستانەکان لەژێر دەستی ئێمەدا بێت و ئەو بەری دیجلە و کوێستانەکان بۆ ئێوە بێت؟ هێشتا تێر نەبوون خواوەند هیچ کات تێرتان نەکات.

دەڵێت: خەڵکانی باوکی مەفزەر، ئەسوەد کوڕی قوتبەیان پێش خست، خواوەند وتارێکی هێنایە سەرزمانی ئەو کەنەیزانی چییە و ئێمەیش نەمانزانی. نێردراو گەڕایەوە و بینیمان فارسەکان بەرەو مەداین دەڕۆن. وتم: ئەی باوکی مەفزەر، چیت وت؟

وتی: سوێند بەوخوایەی محەممەدی بەراستی ڕەوانە فەرموو، نازانم چی بوو، جگە لەوەی لەحاڵەتی خۆمدا بووم و هیوادارم شتێکم وتبێت، ڕەزامەندی خواوەندی بەدواوە بێت. خەڵك بەردەوام پرسیاریان لێدەکرد تا ئەوەی سەعد هاتە لای ئێمە و وتی: ئەی باوکی مەزەر چیت وت چوونکە سوێند بەخوا ئەوان هەڵدێن.

باوکی مەزەر ئەوە بەئێمەی وتبوو، سەعدیشی لێ ئاگادار کردەوە.

سەعد جاڕی جەنگیدا و هێرشی برد. بەردهاوێژەکانی ئێمە کەوتەکار بەڵام هیچ کەس لەشارەکەوە دەرنەکەوت، کەس نەهاتە لای ئێمە جگە لەیەك کەس کەداوای ئەمانی کرد و پێمان بەخشی، وتی: کەس لەشارەکەدا نەماوەتەوە، بۆ ناڕۆنە ناو شارەکە؟

موسوڵمانان بەدیوارەکاندا هەڵگەڕان و دەستمان بەسەر شارەکەدا گرت. هیچی لێ نەبوو و کەس بەجێنەمابوو جگە لەو کەسانەی لەدەرەوەی شارەکە ئەسیرمان کردن. لەوان و لەو پیاوەمان پرسی خەڵکان بۆ هەڵاتن؟

وتیان: پاشا کەسێکی بۆ لای ئێوە نارد و پێشنیاری ئاشتی پێدان بەڵام ئێوە وەڵامتان دایەوە کەئاشتی لەنێوان ئێمە سەقامگیر نابێت تا ئەوکاتەی هەنگوینی ئەفریدین بەئەترەجی کوسی بخۆین.

پاشا کاتێك ئەمەی بیست، وتی: ئەی هاوار، فریشتەکان لەسەر زمانی ئەوان قسە دەکەن و بەنوێنەرایەتی عەرەبەکان وەڵامی ئێمە دەدەنەوە، ئەگەر ئەوە نەدەبوو، ئەمە ئەو قسەیە نەبوو لەزاری ئەو پیاوە بێتەدەر. دواتر روویان لەشارێکی دوورتر کرد.

سەعید دەڵێت: کاتێك موسوڵمانان و سەعد ڕۆشتنە ناو بەهرسیر، سەعد خەڵکانی ئەوێی نیشتەجێ و سوپاکەی لەوێ ڕۆشت و دەیویست بیەڕێتەوە بەڵام بۆیان دەرکەوت فارسەکان کەشتییەکانی نێوان هورها و تکریت بردووە. کاتێك موسوڵمانان لەتاریکی شەو ڕۆشتنە ناو بەهرسیر، رووناکییەك دەرکەوت و زەرار کوڕی خەتاب وتی: اللە اکبر ئەمە سپیەتی خوسرەوە کەخوا و پێغەمبەر(د.خ) بەڵێنیان داوە. تەکبیریان بوویەوە تا ئەوەی بەیانی داهات.

تەڵحە دەڵێت: ئەم پێشهاتە ئەو شەوە روویدا کەڕۆشتنە ناو بەهرسیر.

باوکی مالك، حەبیب کوڕی سەهبان دەڵێت: رووماں کردە مەداین یانی بەهرسیر کەشارێکی نزیکتر بوو. گەمارۆمان خستە سەر خەڵکان و پاشاکان تا ئەو جێگەی ناچار بوون سەگ و پشیلەکانیان بخۆن.

دەڵێت: نەڕۆشتنە ناو شارەکە تا ئەوەی کەسێك هاواری کرد سوێند بەخوا کەس لەناو شارەکەدا نییە و کاتێك ڕۆشتنە ناو شارەکە، کەس لەناو شارەکەدا نەبوو.

## باس سەبارەت بەمەداینی دوورتر و شوێنەکەی کەسرا

سەیف دەڵێت: ڕووداوی مەداینی دوور لەسەفەریساڵی شانزەیەم ڕوویدا.

دەڵێت: کاتێك سەعد لەبەهرسیر، شاری نزیك، دابەزی، بەدوای کەشتیدا دەگەڕا تا خەڵکان بەرەو شاری دوورتر ببات بەلاّم کەشتییان دەستنەکەوت و بۆیان دەرکەوت فارسەکان کەشتییەکانیان بردووە. چەند ڕۆژێك لەسەفەر لەبەهرسیر مانەوە و دەیانویست بپەڕنەوە بەلاّم سەعد بۆ پاراستنی موسوڵمانان ڕێگەی ئەم کارەی لێدەگرتن تا ئەوەی چەند کەسێك لەکافرەکان هاتن و ڕێگەیەکیان نیشاندا کەدەیانتوانی لێی بپەڕنەوە و بەناو دڵی دۆڵێکدا دەڕۆشت بەلاّم سەعد ڕازی نەبوو و بەپێی چاوەڕوانییەکان ئاو بەرز بوویەوە.

سەعد لەخەودا بینی سوارەکانی موسوڵمان لەڕێگەکەیاندا و پەڕینەوە و بەشێوەیەکی مۆجیزە ئاسا ڕزگاریان بوو. سەعد بۆ هێنانەدی خەوەکەی بڕیاریدا لەو ڕێگەیە بپەڕێتەوە چوونکە ئەو ساڵە کەش و هەوای هاوین لەبار بوو.

سەعد خەڵکانی کۆکردەوە، سوپاسی خوای کرد و وتی: دوژمنی ئێوە بەهۆی ئەم ڕووبارەوە لەدەستی ئێوە پارێزراوە و بەبوونی ئەم ڕووبارە ئێوە دەستتان بەدوژمن ناگات، بەلاّم ئەوان هەر کات بیانەوێت دەستیان بەئێوە دەگات و لەکەشتییەکانی خۆیانەوە تیربارانتان دەکەن. ئێستا لەپشت سەری ئێوە هیچ شتێك بوونی نییە ببێتە هۆکاری ترس و نیگەرانی ئێوە چوونکە شەڕکەران مەترسی هێرشی دوژمنیان نەهێشتووە و ڕێگاکانی دوژمنیان بەستووە و لەوەڕگاکانیان وێران کردووە. بۆچوونی من ئەوەیە پێش ئەوەی دنیا پێی ئێوە ببەستێتەوە، لەڕێگەی خوادا جیهاد بکەن، من دەمەوێت لەڕووبارەکە بپەڕمەوە و هێرش بکەمە سەر دوژمن.

هەمووان وتیان: خواوەند بەخششەکانی خۆی بەتۆ و ئێمە ببەخشێت، ئەو کارە بکە.

سەعد فەرمانی بەڕێکەوتنیدا و وتی: کێ پێش دەکەوێت تا پارێزگاری لەکەناری ڕووبارەکە بکات بۆ ئەوەی کاتێك موسوڵمانان دەگەن، فارسەکان نەبنە ڕێگر لەهاتنەدەرەوەیان لەڕووبارەکە.

عاسم کوڕی عەمرۆ کەپیاوێکی بوێر بوو، ئامادەیی خۆی نیشاندا و دوای ئەو

شەششسەد کەس لەخەڵکان خوازیاری ئەنجامدانی ئەو کارە بوون. سەعد عاسمی وەك سەرکردەی ئەوان دەستنیشان و بەڕێکەوتن. لەکەنارەکانی دیجلە وەستان و عاسم وتی: کێ لەگەڵ من دێت تا کەناری رووبارەکە لەدوژمن بپارێزین و پارێزگاری لەئێوە بکەین تا دەپەڕنەوە.

شەست کەس ئامادەی خۆیان نیشاندا. ئەسەم کوڕی وەلاد و شورەحبیل و کەسانی دیکە لەناویاندا دەبینران. ئەوانی کردە دوو دەستە وسوار ئەسپە نێر و مێچکەکانی کردن چوونکە بەو شێوەیە مەلە کردنی ئەسپەکان ئاسانترە. ئەوان لەرووباری دیجلەیاندا و شەششسەد کەسەکەی دیکە شوێنیان کەوتن. لەناو شەست کەسەکە، ئەسەم تیم و کەلج و باوکی مەفزەر و شورەحبیل و حیجلی عێجلی و مالك کوڕی کەعبی هەمەدانی لەگەڵ نەوجەوانێك لەمناڵەکانی حارس کوڕی کەعب، زووتر لەهەمووان بەرێگەکەدا ڕۆشتن.

کاتێك عەجەمەکان ئەوانیان بینی، دەستەیەکیان بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو دەستەی سەعد ڕەوانەی کردبوون، نارد، لەدیجلەیاندا و بەمەلە کردن لەوان نزیك کەوتنەوە. عاسمیان بینی لەگەڵ پێشەنگەکان لەکەنارەکان نزیك ببوویەوە.

عاسم وتی: ڕمەکان، ڕمەکان بەرز بکەنەوە و چاویان بکەنە نیشانە.

شەڕیان دەستپێکرد و شمشێر وەشاندن کەوتەکار، موسوڵمانان چاوی ئەوانیان کردە نیشانە، فارسەکان بۆ کەنارەکان هەڵاتن و موسوڵمانان سوار لەسەر ئەسپ شوێنیان کەوتن. فارسەکان نەیاندەتوانی خۆڕاگری بکەن. موسوڵمانان لەکەنارەکان پێیان گەیشتنەوە و هەمووی ئەوانیان کوشت. ئەوانەی رزگاریان بوو، رووت و قووت بوون و موسوڵمانان شوێنیان کەوتن تا ئەوەی بەتەواوی لەکەناری رووبارەکە دوور کەوتنەوە. دواتر ئەو دەستە شەششسەد کەسییە بێ ماتڵ بوون پەیوەستی شەست کەسەکەی دیکە بوون. کاتێك سەعد عاسمی لەکەنارەکە بینی کەپارێزگاری لێدەکرد، رێگەی بەخەڵکاندا لەئاوەکە بپەڕنەوە و وتی:

((بڵێن: نستعين بالله و نتوكل عليه حسبنا الله و نعم الوكيل – لا حول و لا قوة الا بالله العلي العظيم.))

بەشی زۆری سوپاکە بەدوای یەك ڕۆشتنە ناو ئاوەکە. دیجلە کەفاوی و ڕەش

بوو. کەسان پێکەوە مەلە و قەسەیان لەگەڵ یەك دەکرد وەك بڵێی بەسەر زەوییەکی پان و بەریندا دەپەڕنەوە. فارسەکانیان بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو ناکاوگیر کرد و هێرشیان کردنە سەر و دەستبەجێ کەل و پەلی ئەوانیان تالآن کرد.

موسوڵمانان لەسەفەری ساڵی شانزەی کۆچ ڕۆشتنە ناو شارەکە و سامانی خەزێنەکانی خوسرەو کەپاشماوەکەی سێ هەزار هەزار درەمی کۆکراوە لەلایەن شیر و پێشینیانی ئەو بوو، تالآنیان کرد.

عەبدوللە کوڕی ئەبی تەییبە دەڵێت: کاتێك سەعد لەکەنارەکانی دیجلە بوو، یەکێك لەکافرەکان هاتە لای و وتی: بۆ لێرە ماویتەوە، ئەگەر سێ ڕۆژ بوگزەرێت، یەزدگێرد هەموو سامانەکانی مەداین کۆدەکاتەوە و لەگەڵ خۆی دەیبات. بۆ هاندانی ئەو ئەم وتەی هێنایە سەرزمان و خەڵکانی بۆ ڕۆشتن ناچار کرد.

کوڕی عوسمانی نەهدی سەبارەت بەقسەکانی سەعد و هاندانی ئەو بۆ بەرێکەوتنی خەڵکان گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە و دەڵێت: دیجلەمان پڕکرد لەئەسپ و چوارپێ تا ئەو جێگەی ئاو لەکەنارەکان نەدەبینرا و ئەسپەکانمان کەئاو لەیالْ و کلکیان دەچۆڕی و دەیانحیلاند، ئێمەیان بۆ لای فارسەکان دەبرد، فارسەکان کاتێك ئەمەیان بینی، هەلآتن و بیریان لەهیچ شتێکی دیکە نەکردەوە، ڕۆشتین تا گەیشتینە کۆشکی سپی کەدەستەیەك لەوێ سەنگەریان گرتبوو. یەکیان لەسەرەوە قسەی لەگەڵ ئێمە کرد و ئێمە پێشنیارمان پێکردن و وتمان: سێ پێشنیارمان هەیە، یەکیان هەڵبژێرن.

وتیان: چییە؟

وتمان: یەکەم ئەوەی باوەڕ بێنن و ئەگەر باوەڕ بێنن، ئەرك و لێپرسراویەتی ئێوە هاوشێوەی ئێمەیە و ئەگەر باوەڕ ناهێنن، جەزیە بدەن و ئەگەر ناخوازن دەجەنگین تا ئەو کاتەی خواوەند لەنێوان ئێمە و ئێوە داوەری دەکات.

بێژەری وتەکە وەلآمی دایەوە: پێویستمان بەپێشنیاری یەکەم و کۆتایی نییە و بەپێشنیاری دووەم رازی دەبین.

عەتییە گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە و دەڵێت: نێردراو سەلمان بوو.

کوڕی روفەیل دەڵێت: کاتێك فارسەکان لەناو ئاوەکەدا شکستیان خوارد و بۆ کەنارەکان هەلآتن و لەکەنارەکانیش دوور کەوتنەوە، هەموو کەل و پەلەکان و

سامانیان تالآن کرا، مەگەر ئەوەی پێشتر دووریان خستبوویەوە. لەخەزێنەکانی خوسرەو سێ هەزار هەزار هەزار کۆکرابوویەوە، نیوەیان بەرۆستەمدا بوو و نیوەکەی دیکە لەخەزێنەکان هەڵگیرا بوون.

ئەبوبەکر کوڕی حەفس کوڕی عەمرۆ دەڵێت: ئەو رۆژەی هێشتا موسوڵمانان لەئاوەکەیان نەدابوو و پارێزەران بۆ گرتنی کەنارەکان شەڕیان دەکرد، سەعد وەستابوو و سەیری دەکردن، وتی: سوێند بەخوا دەستەی خەرسە یانی دەستەکەی قەعقاع کوڕی عەمرۆ و حەمال کوڕی مالك و رەبیل کوڕی عەمرۆ دەیتوانی هاوشێوەی ئەم دەستەیە لەگەڵ دوژمن بجەنگێت و شکستیان پێ بێنێت. دەستەی عاسم دەستەی ئەهوال و دەستەی ئەهوالی کەهونەری شەڕ کردنی ئەوانی لەناو ئاودا بینیبوو، بەخەرسە شوبهاند.

دەڵێت: دوای رووداوە بچووکەکان کەهەندێ جار لەبەرژەوەندی و هەندێ جار لەزیانی ئەواندا بوو، هاواریان بەرز کردەوە و رۆشتن تا پەیوەستی دەستەی پێشڕەو بوون و کاتێك هەموو شەڕکەرانی دەستەی ئەهوال لەکەنارەکان جێگیر بوون، سەعد و موسوڵمانان لەئاوەکەیاندا. سەلمانی فارسی لەئاوەکە لەگەڵ سەعد بوو. سەعد دەیوت: ((حسبنا الله و نعم الوكيل سوێند بەخوا، هاوکاری هاورێکەی خۆی دەکات و سەرکەوتن بەدینەکەی دەبەخشێت و دوژمن لەناو دەبات بەو مەرجەی هیچ سەرکێشێك لەناو سوپاکەدا نەبێت کەچاکەکان بسڕێتەوە.))

سەلمان پێی وت: ئیسلام تازە دەرکەوتووە و دەریاکان ملکەچی بوون بەهەمان شێوە کەدەشتەکان ملکەچیان بوون، سوێند بەو خوایەی گیانی سەلمان لەدەستی ئەودایە، دەستە دەستە پشت دەکەنە ئیسلام بەهەمان شێوە کەدەستە دەستە باوەڕ بەئیسلام دێنن.

موسوڵمانان ناو ئاوەکەیان پڕ کرد بەشێوەیەك ئاو لەکەنارەکان نەدەبینرا. لەئاوەکەدا زیاتر لەدەشت قسەیان دەکرد تا ئەو کاتەی لەئاوەکە رۆشتنەدەر. بەهەمان شێوە کەسەلمان دەڵێت: هیچیان لەدەست نەدا و کەس لەموسوڵمانەکان لەناو ئاوەکەدا نەخنکا.

باوکی عوسمانی نەهدی دەڵێت: هەمووان تەندروست لەئاوەکە پەڕینەوە تەنیا

یەکێك لەخەڵکانی بارق بەناوی غەرقەدە لەپشتی ئەسپە موو سورەکەی خۆی کەوتەخوار، دەڵێی هێشتا ئەسپەکە دەبینم کەئاو لەیاڵی دەچۆڕا. قەعقاع کوڕی عەمرۆ جڵەوی ئەسپەکەی خۆی راکێشا و بەرەو لای ئەو ڕۆشت و دەستی گرت و ئەوی لەئاوەکە هێنایەدەر.

دەڵێت: پیاوی بارقی کەسێکی دلێر بوو، وتی: ئەی قەقعاع خوشکان ناتوانن کوڕێکی وەك تۆ بێننە دنیا. ئەم قسەی بۆیە هێنایە سەرزمان چوونکە قەقعاع لەگەڵ تایەفەی بارق پەیوەندی خزمایەتی هەبوو.

سەعید وتی: ئەو رۆژە لەناو ئاوەکە موسوڵمانان هیچیان لەدەست نەچوو جگە لەکاسەیەك کەئاو بردی و ئەو کەسەی لەگەڵ خاوەنی کاسەکە مەلەی دەکرد، وتی: قەدەری خوایی بوو و کاسەکە ڕۆشت.

خاوەن کاسەکە وتی: دڵنیام خواوەند لەناو ئەم هەموو خەڵکە کاسەکەی من نابات.

دەڵێت: کاتێك پەڕینەوە، یەکێك لەوانەی پارێزگاری لەکەنارەکان دەکرد، کاتێك لەگەڵ یەکەم دەستەی موسوڵمانان دەرکەوتن، ڕۆشتەخوار و کاسەکەی کەشەپۆل و با هێنابوویە کەنارەکان، بەرمەکەی خۆی گرتەوە و هێنای بۆ ناو ئوردووگا. خاوەنی کاسەکە ناسییەوە و لێی وەرگرت و بەهاورێکەی خۆی وت: مەگەر پێم نەوتی.

هاورێکەی ئەو یەکێك لەموالییەکانی قورەیش بوو لەتایەفەی عەنز بەناوی مالك کوڕی عەمرۆ و ئەو کەسەی کەوتە ناو ئاوەکە، عامر کوڕی مالك بوو.

عومەیری سائیدی دەڵێت: کاتێك سەعد و موسوڵمانان لەدیجلەیاندا، هەرکەسێك هاورێیەکی لەگەڵدا بوو. سەلمان هاورێی سەعد و پێکەوە لەئاوەکە رێگەیان دەبڕی. سەعد وتی: ئەمە قەدەری خواوەندی بەهێزی فرەزانە. ئاو ئەوانی بەرز دەکردەوە و هیچ ئەسپێك لەشوێنەکەی خۆی نەیدەتوانی ئارام بگرێت، کاتێك هیلاك دەبوو، سەری بەرز دەکردەوە و ئارامی دەگرت. لەمەدا ین هیچ شتێك لەمە سەرسورهێنەرتر نەبوو. ئەمە زۆری ئاو و ئەو رۆژەیان بە رۆژی (جرمەکان) ناو برد.

سەعید دەڵێت: ئەو رۆژەی لەدیجلە پەڕینەوە، بەرۆژی جرمەکان ناویان بردن، هەرکەس بێزار دەبوو، جرمێك دەردەکەوت و لەسەری ئارامی دەگرت.

قەیس کوڕی ئەبی حازم دەڵێت: لەدیجلە پەڕینەوە و کاتێك گەیشتینە قولایی،

سوار لەناو ئاوەکە بەشێوەیەك بوو ئاو نەدەگەیشتە ناوقەدی ئەسپەکەی.

باوکی مالك، حەبیب کوڕی سەهبان دەڵێت: کاتێك سەعد ڕۆشتە شاری نزیك، فارسەکان پردەکانیان وێران کرد و کەشتییەکانیان لەگەڵ خۆیان برد. موسوڵمانان وتیان: بۆ سەیری ئاوەکە دەکەن، کەسێك لەئاوەکەیدا و هەمووان خۆیان خستە ناو ئاوەکە، نەکەس خنکا و نەهیچمان لەدەست چوو، تەنیا یەکێك لەموسوڵمانان کاسەکەی کەوتە ناو ئاوەکە، من کاسەکەم بینی کەبەسەر ئاوەکەدا دەڕۆشت.

تەڵحە دەڵێت: پارێزەرانی فارس لەکەنارەکان دەجەنگان تا ئەوەی کەسێك هات و وتی: بۆ خۆتان بەکوشتن دەدەن سوێند بەخوا کەس لەمەداین نەماوەتەوە.

سەعید دەڵێت: کاتێك فارسەکان لەمەبەستی موسوڵمانان ئاگادار بوونەوە، کەسیان نارد تا ڕێگە لەپەڕینەوەی ئەوان بگرێت بەڵام موسوڵمانان پەلاماریاندان و فارسەکان هەڵاتن. دوای گرتنی بەهرسیر، یەزدگێرد کەسانی خۆی بۆ حیلوان نارد و دواتر خۆی مەبەستی ڕۆشتن بۆ حیلوانی کرد و پەیوەستی کەسانی خۆی بوو. مێهران رازی و نەخەیرجانی کەئۆدەداری خەزێنەکانی نەهرەوان بوو، لەشوێنەکەی خۆی بەجێهێشت و هەموو کەل و پەلە گرانباییەکانی لەگەڵ خۆی برد. بەو جۆرەیش لەخەزێنەکان بەرادەیەك دەفر و ڕۆن و دیارییان بەجێهێشت کەکەس بایەکەی نەدەزانی. هەموو ئەو مانگا و مەڕومالاَت و خواردنەوەی لەکاتی گەمارۆکە کۆیان کردبوویەوە، بەجێیان هێشت.

دەڵێت: یەکەم دەستەی ڕۆشتنە ناو مەداین، دەستەی ئەهوال بوون. دوای ئەوە دەستەی خەرسا ڕۆشتنە ناو شارەکە و بەناو کۆڵانەکاندا دەسووڕانەوە بێ ئەوەی کەس ببینن. کەس لەشارەکەدا نەبوو جگە لەوکەسانەی لەبەردەرگای کۆشکی سپیدا وەستابوون. گەمارۆیان خستنە سەر و پێشنیاریان پێکردن کەرازی بوون بۆ ئەوەی جەزیە بدەن. خەڵکانی مەداینیش بەم مەرجە گەڕانەوە جگە لەبنەماڵەی خوسرەو و ئەو کەسانەی ڕۆشتبوون و پەیمان نامەکە ئەوانی نەدەگرتەوە.

دەڵێت: سەعد لەکۆشکی سپی جێگیر و زوهرەی لەگەڵ پێشەنگەکانی سوپاکەی بۆ نەهرەوان ڕەوانە کرد. زوهرە بەرێکەوت و گەیشتە نەهرەوان. لەقۆڵەکانی دیکەوە سوپاییەکانی بۆ شوێنکەوتنی فارسەکان ڕەوانە کرد.

باوکی مالك، حەبیب کوڕی سەهبان دەڵێت: کاتێك لەجەنگی مەداین موسوڵمانان لەدیجلە دەپەڕینەوە، فارسەکان سەیریان دەکردن و دەیانوت: دیوان هات. بەیەکیان دەوت: سوێند بەخوا لەگەڵ مرۆڤەکان ناجەنگن، شەڕ لەگەڵ جنۆکەکان دەکەن.

باوکی بەختەری دەڵێت: پێشەنگی موسوڵمانان سەلمانی فارسی و موسوڵمانان ئەویان بۆ گەیاندنی بانگەوازی ئیسلام بەگوێی خەڵکان دەستنیشان کردبوو.

دەڵێت: پێیان وتبوو پێشنیاری ئیسلام بەخەڵکانی بەهرسیر بکات. لەبەردەم دەرگای کۆشکی سپی سێ جار پێشنیاری بەفارسەکان کرد. پێشنیارەکەی بەو شێوەبوو کەدەیوت: ڕەچەڵەکی من لەئێوەیە و دڵم بۆتان دەسووتێت. پێشنیاری سێ کارتان پێدەکەم و لەبەرژەوەندی ئەودایە. یا باوەڕ بێنن و ببنە برای ئێمە و ئەرك و لێپرسراویەتی ئێوە هاوشێوەی ئێمە بێت یا جەزیە بدەن وگەرنە بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دەجەنگین چوونکە خواوەند ناباوەڕانی خۆش ناوێت.

دەڵێت: لەرۆژی سێیەم لەبەهرسیر، هیچ وەلامێکیان دەست نەکەوت و موسوڵمانان جەنگیان دەستپێکرد. بەلام لەمەداین دوای رۆژی سێیەم، خەڵکانی کۆشکی سپی رازی بوون و هاتنەدەر و سەعد لەناو کۆشکەکە جێگیر بوو. ئەیوانی کردە نوێژگە و وێنە گەچییەکانی وەك خۆی هێشتەوە.

سەماکی هەجیمی دەڵێت: لەکاتی رووخانی بەهرسیر شا کەسانی خۆی بۆ حیلوان نارد و کاتێك موسوڵمانان لەئاوەکە پەڕینەوە، فارسەکان هەلاتن و سوپاکەیان لەکەنارەکان ڕێگر بوون لەپەڕینەوە موسوڵمانان و ئەسپەکان. شەڕێکی قورس روویدا تا ئەوەی کەسێك هاواری کرد و وتی: بۆچی خۆتان بەکوشتن دەدەن سوێند بەخوا کەس لەمەداین نەماوەتەوە و فارسەکان هەلاتوون. ئەسپەکان لەدیجلە پەڕینەوە و سەعد لەگەڵ پاشماوەی سوپاکە گوزەری کرد.

موهەلیب دەڵێت: پێشەنگەکانی موسوڵمانان گەیشتنە کۆتایی سوپای فارسەکان و یەکێك لەموسوڵمانان بەناوی سەقیف لەتایەفەی مناڵەکانی عودەی کوڕی شەریف یەکێك لەفارسەکانی گرت کە بەرێگەیەکدا دەڕۆشت تا پارێزگاری لەهاوەلانی خۆی بکات. فارسەکە ئەسپەکەی خۆی غاردا تا هێرش بکاتە سەر پیاوی سەقەفی بەلام ئەسپەکەی پێشڕەوی نەکرد. دواتر ویستی سوار لەسەر ئەسپەکەی هەڵبێت بەلام ئەسپەکەی فەرمانی نەبرد تا پیاوی موسوڵمان پێی گەیشتەوە و کوشتی و کەل

وپەلەکانی هەڵگرت.

باوکی عەمرۆ دەڵێت: ئەو ڕۆژە یەکێك لەشاسوارەکانی عەجەم لەمەداین لەناوچەی جازر بوو، پێیان وت: عەرەبەکان هاتن و فارسەکان هەلاتن بەلام گرنگی بەوتەی کەسان نەدا چوونکە باوەڕی بەخۆی بوو. بەرێکەوت و ڕۆشتە ناو ماڵی بەکرێگیراوەکانی خۆی کەجل و بەرگەکانیان دەگواستەوە.

وتی: چی دەکەن؟

وتیان: زەردەواڵە ئێمەی لەماڵەکەمان دەرکردووە و بەسەر ماڵی ئێمەدا زاڵ بووە.

شاسواری فارس زەردەواڵەکانی کردە نیشانە و لەناوی بردن. دواتر لەهێرشی عەرەبەکان ئاگادار بوویەوە، هەستا وفەرمانیدا ئەسپەکەی بۆ زین بکەن بەلام قایشی زینەکەی قرتا، بەخێرایی بەستییەوە و سواری بوو و بەرێکەوت. لەشوێنێك وەستا، یەکێك لەموسوڵمانەکان لای ئەو تێپەڕی، بەشمشێر لێیدا و وتی: بگرە من کوڕی موخاریقم، ئەوی کوشت بێ ئەوەی گرنگی پێ بدات.

سەعید کوڕی مەرزبان گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە ودەڵێت: ناوی بکوژە فارسەکە کوڕی موخاریق کوڕی شەهابە.

باوکی عەمرۆ دەڵێت: یەکێك لە موسوڵمانان پیاوێکی فارسی بینی کەدەستەیەکی لەگەڵدا بوو و سەرکۆنەی یەکیان دەکرد و دەیانوت: لەچی هەلاتین؟

یەکیان بەوەی دیکەی وت: گۆییەك بدە بەمن. هاویشتی و نیشانەکەی پێکا و کاتێك ئەمەی بینی گەڕایەوە، هاورێکانیشی گەڕانەوە. ئەو لەپێشیانەوە بوو و ڕووبەرووی پیاوی موسوڵمان بوونەوە، پیاوی عەرەب سەری شکاند و وتی: من بەرد شکێن لەدایك بووم. فارسەکان هەلاتن.

دەڵێت: کاتێك سەعد ڕۆشتە ناو مەداین و شارەکەی بەچۆڵ بینی، گەیشتە ئەیوانی کەسرا و ئەم ئایەی خوێندەوە:

((کم ترکوا من جنات و عیون و زروع و مقام کریم. و نعمة کانوا فیها فا کهین. کذلك و اورثناها قوما آخرین.

واتاکەی: چەندە باخ و سەرچاوە و کێڵگەی کشت و کاڵی و شوێنی باش و نیعمەتی فراوان کەکەڵکیان لێ دەبینی و بەجێیان هێشت، بەمشێوەیە ئێمە

بەدەستەیەکی دیکەمان بەخشی.

لەوێ نوێژی سەرکەوتنی خوێند. ئەم نوێژە بەجەماعەت ناخوێندرێت، بێ پچڕان هەشت رەکعەتی خوێند و ئەیوانی کردە نوێژگە، چەندین دیمەنی گەچی لەپیاو وئەسپ لەو شوێنەدا دەبینرا، سەعد و موسوڵمانان ئەمەیان بەناپەسەند و ناخۆش دەزانی.

دەڵێت: ئەو رۆژەی سەعد ڕۆشتە ناو مەداین، نوێژی تەواوی خوێند چوونکە دەیویست بمێنێتەوە و یەکەم جار لەعێراق نوێژی هەینی خوێندرا، لەمەداین بوو لەمانگی سەفەری ساڵی شانزەیەم.

## ئەوەی لەتاڵانییەکانی مەداین بەدەست هات

سەعید دەڵێت: سەعد لەئەیوانی کەسرا نیشتەجێ و فەرمانی بەزوهرەدا تا نەهرەوان پێشرەوی بکات. لەچەندین قۆلی دیکەوە سوپای بۆ نەهرەوان ڕەوانە کرد. شوێن هەڵاتووان کەوتن و تاڵانییەکانیان کۆکردەوە. سەعد دوای سێ ڕۆژ ڕۆشتە ناو کۆشکەکە و عەمرۆ کوڕی عەمرۆ کوڕی موقرین بۆ تۆمار کردنی تاڵانییەکان راسپارد و فەرمانی پێدا ئەوەی لەناو کۆشك و ئەیوان و ماڵەکەندا کۆی بکاتەوە و ئەوەی شەڕکەرانی موسوڵمان دەیهێنن، تۆماریان بکات.

خەڵکانی مەداین لەکاتی شکستی فارسەکان دەستیان بەتاڵان کردنی کەل و پەل و سامانەکان کرد و هەڵاتن. بەڵام ئەوەی لەئوردووگاکەی مێهران لەنەهرەوان فڕاندبوویان، تەنانەت یەك گلۆڵە بەنیان بۆ دەرنەچوو. موسوڵمانان لەکاتی شوێنکەوتنی ئەوان هەموو ئەو تاڵانییانەیان لێسەندنەوە و بەلێپرسراوی تۆمار کردنیان سپارد. یەکەم شت کەتۆماریان کرد و کۆکرایەوە، سامانی ناو کۆشکی سپی و ماڵەکانی دیکەی خوسرەو و ماڵەکانی مەداین بوو.

حەبیب کوڕی سەهبان دەڵێت: کاتێك ڕۆشتینە ناو مەداین، ڕۆشتینە ناو قەڵایەکی تورکی کەپڕ بوو لەو سەوەتانەی مۆری سوربییان پێوە بوو، گومانمان کرد خواردنەوە بەڵام لێوانلێو بوو لەزێر و زیو و لەناو موسوڵمانان دابەش کرا.

دەڵێت: کەسێکم بینی بەملاولادا دەڕۆشت و دەیوت: کێ سپی دەدات و زەرد

وەربگرێت. برێکی زۆر کافورمان دەستکەوت و گومانمان کرد خوێیە، تێکەڵ بەهەویرمان کرد بەڵام هەستمان بەڕەگی تاڵی ناو نانەکە کرد.

روفەیل کوڕی مەیسور دەڵێت: زوهرە لەگەڵ پێشەنگەکان تا پردی نەهرەوان شوێن هەڵاتووان کەوت. فارسەکان لەوێ بوون. لەسەر پردەکە قەرەباڵغی دروست بوو، ئێسترێك کەوتە ناو ئاوەکە و بەخێرایی سەرقاڵی هێنانە دەرەوەی بوون. زوهرە وتی: سوێند دەخۆم ئەم ئێسترەیان بەلاوە گرنگە چوونکە لەم کاتەدا هەستیارەدا سەرقاڵی هێنانە دەرەوەی ئەون و لەبەرابەر شمشێرەکان خۆڕاگری دەکەن. بۆیان دەرکەوت کەرەستەکانی کەسرا لەجل و بەرگ و شمشێر و زرێی جەواهیر نیشان و شتی دیکە، باری ئێسترەکە بوو.

زوهرە دابەزی و کاتێك پاشەکشێی بەفارسەکان کرد، فەرمانی بەهاوەڵانی خۆیدا و ئێسترەکەیان لەئاوەکە دەرهێنا. پەیوەستی تاڵانییەکانیان کرد بێ ئەوەی بزانن چییە؟

کەلح دەڵێت: یەکێك بووم لەوکەسانەی شوێن هەڵاتووان کەوتین. دوو وڵاخارم بینی تیربارانی موسوڵمانانیان دەکرد و جگە لەدوو تیر هیچیان پێ نەمابوو. رووبەروویان بوومەوە، کۆبوونەوە و یەکیان بەوەی دیکەی وت: یا تۆ تیر بهاوێژە و من پارێزگاریت لێدەکەم یا پارێزگاریم لێ بکە بۆ ئەوەی تیر بهاوم. پارێزگاریان لەیەك کرد و تیرەکانیان هاویشت.

هێرشم کردنە سەر و هەردووکیانم کوشت. دوو ئێسترەکەم پێش خۆم خست بێ ئەوەی بزانم بارەکەیان چییە، گەیشتمە لای لێپرسراوی تۆمار کردنی تاڵانییەکان. وتی: چاوەڕێ بە بزانم چیت هێناوە، بارەکانم داگرت یەکیان سنوقێك بوو و تاجەکەی خوسرەوی تیا بوو و ئەوی دیکەیان جل و بەرگەکانی لەدیبای بەزێڕچنراوی جەواهیر نیشان.

موهەلیب دەڵێت: قەعقاع کوڕی عەمرۆ شوێن هەڵاتووان کەوت، رووبەرووی پیاوی فارس بوویەوە کەپارێزگاری لەفارسەکان دەکرد. جەنگان و ئەوی کوشت، کوژراوەکە ئەسپێکی پێ بوو کە دوو سنووقی لەسەر چەندین گوێنی و لەیەکیان پێنج شمشێر و لەوەی دیکەیان شەش شمشێر دەبینرا، سنوقەکان چەند زرێیەکی

تیابوو، زرێکەی خوسرەو وزرێی سەر بەپۆششی دەست و پێی و زرێی هێرقل و زرێی خاقان و زرێی داهر و زرێی بەهرامی چوبین و زرێی سیاوەخش و زرێی نەعمان و هەموو ئەو زرێیانە فارسەکان لەشەڕ لەگەڵ دوژمنەکانیان بەدەستیان هێنابوو، لەناو سنووقەکاندا دەبینرا.

زرێکەی نەعمان و بەهرام لەو کاتەی هەڵاتبوون و دژایەتی خوسرەویان دەکرد، بەجێمابوو. لەیەکێك لەگوێنییەکان، شمشێرەکەی خوسرەو و هورموز و قوباد و فیروز و شمشێرەکانی دیکە وەك شمشێرەکەی هێرقل و خاقان و داهر و بەهرام و سیاوەخش و نەعمان دەبینرا. هەموویان بردە لای سەعد.

سەعد وتی: یەکێك لەشمشێرەکان هەڵبژێرە. ئەو، شمشێرەکەی هێرقلی هەڵبژارد، سەعد زرێکەی بەهرامیشی پێبەخشی و ئەوانی دیکەی بەدەستەی خەرسە بەخشی، بەڵام شمشێرەکەی نەعمان و خوسرەوی هێشتەوە و بۆ مەدینەی نارد تا عەرەبەکان ببینن و ببیستن چوونکە ئەو دوو پیاوەیان دەناسی. دوو شمشێرەکەیان لەگەڵ تاج و جل و بەرگەکانی خوسرەو لەناو پێنج یەکی تالآنییەکان دانا و بۆ سەروەری باوەڕدارانیان نارد. بۆ ئەم مەبەستە بوو کەخالید کوڕی سەعید لەشەڕی هەڵگەڕاوەکان شمشێری سەمسامەی لەعەمرۆ کوڕی مەعدیکەریب وەرگرت و عەرەبەکان ئەمەیان بەنەنگ دەزانی.

عیسمە کوڕی حارسی زەببی دەڵێت: یەکێك بووم لەو کەسانەی شوێن هەڵاتووان کەوتین. لەرێگەیەکدا دەڕۆشتم، پیاوێك کەرێکی پێبوو، کاتێك منی بینی، کەرەکەی پێش خۆی خست و گەیشتە پیاوێکی دیکە، ئەویش کەرێکی پێبوو، گەشتنە جۆگەیەك، پردەکەیان وێران کردبوو، مانەوە تا پێیان گەیشتم، لەیەك جیابوونەوە و یەکیان تیری بۆ هاویشتم، هێرشم کردە سەر و خوێنم ڕشت و ئەوی تریان هەڵات. کەرەکانم پێش خۆم خست و بردمە شوێنی تۆمار کردنی تالآنییەکان، دوو سنووق بوو، یەکیان ئەسپێکی زێرین و زینەکەی زیو بوو، سینەبەند و کلك بەند و زینەکەی، یاقووتی زەمورود نیشان بوو. هەوساری ئەسپەکەیش بەهەمان شێوە،، لەگەڵ سوارەیەك لەزیوی جەواهیر نیشان. لەسنوقەکەی دیکە، وشترێکی زیو دەبینرا، هەموو شتەکانی لەزیو و سوارەیەك لەزێری جەواهیر نیشان سواری بوو، خوسرەو ئەوانی دەخستە سەر دوو ستوونی هەڵگرتنی تاجەکەی.

باوکی عەبدەی عەنبەری دەڵێت: کاتێك موسوڵمانان لەمەداین دابەزین و تاڵانییە تۆمارکراوەکان کۆکرایەوە، کەسێك هات و سنووقێکی لەگەڵ خۆی هێنا، تەسلیمی لێپرسراوی تۆمار کردنی کرد و ئەو هاوەڵانی وتیان: هەرگیز شتی لەو شێوەمان نەبینوە، ئەو شتانەی لەبەردەم ئێمەدایە، هاوشێوە و هاوتایان نییە.

وتیان: ئایا هیچت لێ هەڵگرتووە؟

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لەترسی خواوەند نەدەبوو، تەسلیمی ئێوەم نەدەکرد. زانیان پیاوێکی باوەڕدارە و پرسییان: کێیت؟

وتی: ناوی خۆم نابەم بۆ ئەوەی وەسفم بکەن، بەکەسانی دیکەیش ناڵێم، خواوەند دەپەرەستم و بەپاداشتەکانی ئەو دڵخۆشم. کەسێکیان بەشوێن ئەودا نارد وبۆیان دەرکەوت عامر کوڕی عەبد قەیسە.

سەعید دەڵێت: سەعد دەیوت: سوپاکەم ئەمینە و ئەگەر ڕێزی جەنگاوەرانی بەدر نەدەبوو، لەگەڵ بوونی لەپێشی ئەوان دەستەیەکیان دەستیان بۆ سەر تاڵانییەکان درێژ کرد بەڵام ئەم سوپایە ئەو کارەیان لێنەبینرا و نەبیسترا.

جابر کوڕی عەبدوللە دەڵێت: سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە، کەسم لەجەنگاوەرانی قادسیە نەبینی دنیا و ئاخیرەتی پێکەوە بوێت، سێ کەسمان تۆمەتبار کرد بەڵام ئەمانەت و خواپەرەستی ئەوانمان بۆ دەرکەوت: توڵەیحە کوڕی خوەیلد و عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب و قەیس کوڕی مەکشوح.

قەیسی عیجلی دەڵێت: کاتێك شمشێر و پشتینە زێڕینەکەی خوسرەویان بردە لای عومەر کوڕی خەتاب، وتی: ئەو کەسانەی ئەمانەیان تەسلیم کردووە، کەسانێکی باوەڕدار بوون.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: تۆ خۆپارێزیت، ژێردەستەکانیش چاو لەتۆ دەکەن.

شەعبی دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب کاتێك سیلاحەکەی خوسرەوی بینی، وتی: ئەو کەسانەی ئەمەیان تەسلیم کردووە، باوەڕداری ڕاستەقینە بوون.

## دابەش کردنی تالأنییەکانی مەداین لەناو جەنگاوەران کەبەوتەی سەیف شەست هەزار کەس بوون

موهەلیب دەڵێت: کاتێك سەعد لەمەداین دابەزی و کەسی بەدوای هەڵاتووانـدا نارد، موسوڵمانان تا نەهرەوان پێشڕەوییان کرد و گەڕانەوە. نابـاوەڕان روویـان لەحیلوان کرد. سەعد تالأنییەکانی دوای جیا کردنەوەی پێنج یەك لەناو شەڕکەران دابەش کرد. هەر سوارەیەك دوانزە هەزاری بەرکەوت، هەمووان سوار و هیچ پیادەیەك لەناو سوپاکەدا نەدەبینرا. لەمەداین ئەسپی فراوان دەبینرا.

شەعبی دەڵێت: سەعد لەپێنج یەك بەکەسانی تێکۆشەری بەخشی بەلأم زێدەڕۆیی نەکرد.

هەروەها دەڵێت: سەعد ماڵەکانی مەداینی لەناو موسوڵمانان دابەش کرد و تیایدا نیشتەجێ بوون. لێپرسراوی تۆمار کردن عەمرۆ کوڕی عەمرۆ مەزنی و لێپرسراوی دابەش کردنی تالأنییەکان سەلمان کوڕی رەبیعە. گرتنی مەداین لەسەفەری ساڵی شانزەیەم روویدا.

دەڵێت: کاتێك سەعد ڕۆشتە ناو مەداین، نوێژی تەواوی خوێند و بەڕۆژو بوو. فەرمانیدا ئەیوانی کەسرا بکەنە نوێژگەی رۆژانی جەژن و مینبەرێکی لەوێ دروست کرد و نوێژی خوێند. دیمەنەکان دەستکاری نەکرابوون. نوێژی هەینی خوێند و بۆ جەژنی رەمەزان وتیان: روو بکەنە سارا چوونکە سونەتی دوو نوێژی جەژن بەو شێوەیە.

سەعد وتی: لێرە نوێژ بخوێنن.

دەڵێت: سەعد لەوێ نوێژی خوێند و وتی: دەرەوەی گوندەکان و ناو گوندەکان وەك یەکە.

دەڵێت: سەعد لەمەداین دابەزی و ماڵەکانی لەناو موسوڵمانان دابەش کرد، ژن و منالّی موسوڵمانانی لەو مالأنەدا نیشتەجێ کرد کەکەرەستەکانی ژیانیان تیا دەبینرا. لەمەداین مانەوە تا ئەو کاتەی لەجەنگی جەلەولا و تکریت و موسڵ رزگاریان بوو. دواتر روویان کردە کوفە.

سەعید دەڵێت: سەعد پێنج یەکی کۆکردەوە و ئەوەی دەیویست، بەهۆیەوە

سەرســوڕمان لای ســەروەری بــاوەڕداران دروســت بكــات (وەك جــل و بــەرگ و شمشێرەكانی خوسرەو و شتەكانی دیكە) لەناو پێنج یەكدا جێگەی كردەوە لەگەڵ ئەو شتانەی عەرەبەكان حەزیان بەبینینی دەكرد. لەپێنج یەك بەشی تێكۆشەرانیدا و دوای دابەش كردن و هەڵگرتنی پێنج یەك، فەرشەكە مایەوە چوونكە دابەش كردنی ئەگەری نەبوو. بەموسوڵمانانی وت: رازین لەچواریەكی خۆمان خۆش بین و ئەم فەرشە بۆ لای سەروەری باوەڕداران بنێرین تا بەو شێوەی دەخوازێت بیبەخشێت چوونكە دابەش كردنی بۆ ئێمە ئەگەری نییە و لای ئێمە ناگرینگ بەڵام بۆ خەڵكانی مەدینە گرنگ و سەرنج راكێشە.

وتیان: بەڵێ، ئەو كارە بكە.

سەعد فەرشەكەی رەوانە كرد. فەرشەكە شەست زەراع لەشەست زەراع بوو. یەك پارچە، بەئەندازەی جەریبێك كەرێگەكانی تیا نەخشێنرا بوو و ئاوەكان وەك جۆگە و رووبارەكانی تیا دەبینرا، مروارید لەناو فەرشەكە دەدرەوشایەوە و كەنارەكانی فەرشەكە وەك كێڵگەی كشتوكاڵی و سەوزەڵان بەرچاو دەكەوت.

كاتێك فەرشەكەیان بردە لای عومەر كوڕی خەتاب، پێنج یەكی لەناو موسوڵمانان دابەش كرد و وتی: لەپێنج یەكەكان بەو جەنگاوەرانی ئامادە بوون یا لەنێوان بەدەست هێنانی دوو پێنج یەك، تێكۆشاون دەبێت ببەخشین و گومانم نییە لەپێنج یەك شتێكی ئەوتۆیان بەخشیبێت. پێنج یەكی دابەش كرد و وتی: سەبارەت بەم فەرشە بۆچوونتان چییە؟

هەمووان وتیان: ئەم كارەیان بەتۆ سپاردووە، بۆچوونی تۆ چییە؟

عەلی كوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بەوشێوەیە كەدەڵێن، بەڵام ئەگەر ئەم كارە دوابخرێت، بەیانی كەسانێك بەبیانوی ناڕەوا بۆ بەدەست هێنانی كاری ناڕەوا ئەنجام دەدەن.

عومەر كوڕی خەتاب وتی: بۆچوونەكەت پەسەندە. لەت لەتی كرد و بە موسوڵمانانی بەخشی.

عەبدولمەلیك كوڕی عومەیر دەڵێت: موسوڵمانان لەجەنگی مەداین بەهاری كەسرایان گرت. قورس بوو و نەیانتوانی لەگەڵ خۆیان ببەن، بۆ زستان دروستیان

کردبوو چوونکە لەو وەرزەدا گوڵ و سەوزە نابینرێت، کاتێ دەیانویست شەراب بخۆنەوە، لەوێ دادەنیشتن وەك بڵێی لەناو باخێکی رازاوە دانیشتوون. فەرشێك بوو شەست لەشەست، ئەرزەکەی لەزێر و بەنگین رازێنرابوویەوە، میوەکەی جەواهیری هەوریشم و گەڵاکانی لەهەوریشم و ئاوی زێر بوو. عەرەبەکان پێیان دەوت قطف.

دەڵێت: کاتێك سەعد تالآنییەکانی دابەش کرد، فەرشەکە مایەوە چوونکە دابەش کردنی ئەگەری نەبوو. موسوڵمانانی کۆکردەوە و وتی: خواوەند دەستی ئێوەی پڕ کرد، دابەش کردنی ئەم فەرشە کارێکی دژوارە و کەس توانای کڕینی نییە، بۆچوونی من ئەوەیە ئەم فەرشتە بۆ لای سەروەری باوەڕداران بنێرین تا بەدڵخوازی خۆی بیبەخشێت. ئەو کارەیان کرد.

دەڵێت: کاتێك لەمەدینە فەرشەکەیان بردە لای عومەر کوڕی خەتاب، خەوێکی بینی و موسوڵمانانی کۆکردەوە، سوپاسی خوای کرد و سەبارەت بەفەرشەکە داوای بۆچوونی ئەوانی کرد و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە. دەستەیەکیان وتیان هەڵیگرێت، هەرکەسەو بۆچوونێکی بوو، عەلی کوڕی ئەبی تالیب بێدەنگی عومەر کوڕی خەتابی بینی، هەستا و وتی: بۆ زانستی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت و دڵنیایی خۆت دەکەیتە گومان؟ لەدنیا زیاتر لەوەت نییە بیبەخشیت و هەڵیگریت یا لەبەری بکەیت و لەتی بکەیت یا بیخۆیت و گرنگی پێنەدەیت.

وتی: بۆچوونەکەت پەسەندە، فەرشەکەی لەت لەت و لەناو موسوڵمانان دابەشی کرد. لەتێکی بەعەلی کوڕی ئەبی تالیب گەیشت، بەبیست هەزار فرۆشتی و لەبەشەکانی دیکەی گرنگتر و باشتر نەبوو.

سەعید دەڵێت: ئەو کەسەی پێنج یەکی بۆ مەدینە برد، بەشیر کوڕی خەسایسیە و ئەو کەسەی هەواڵی سەرکەوتنی بەمەدینە گەیاند، حولەیس کوڕی فلآنی ئەسەدی بوو. لێپرسراوی تۆمار کردنی تالآنییەکان، عەمرۆ و لێپرسراوی دابەش کردن، سەلمان بوو.

دەڵێت: کاتێك فەرشەکەیان دابەش کرد، موسوڵمانان سەبارەت بەلەپێشی شەڕکەرانی قادسیە قسەیان دەکرد. عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەوان کەسانی دیار و نموونەی عەرەبن چوونکە هەم دیندارن و هەم رێزدار، جەنگاوەرانی شەڕەکانی پێشوون و جەنگاوەرانی شەڕی قادسیە.

دەڵێت: کاتێك زێر و زیو و جل و بەرگە جۆراوجۆرەکانی خوسرەویان بردە لای عومەر کوڕی خەتاب، وتی: موحەلیم بانگ بکەن.

موحەلیم بەهێزترین عەرەبی مەدینە بوو. تاجەکەی خوسرەویان برد و ستوونێکی دارینیان پێوە هەڵواسی، گەردنبەند و جل و بەرگەکانی ئەویان لەبەر کرد بۆ ئەوەی خەڵکان ببینن، عومەر کوڕی خەتاب سەیری کرد و خەڵکانیش بەهەمان شێوە، لەکاروبار و زێر و زیوەکانی دنیا، شتی سەیریان بینی.

موحەلیم دەستەیەکی دیکە لەجلەکانی خوسرەوی پۆشی و بەهەمان شێوە بووە هۆی سەرسوڕمانی خەڵکان. دواتر سیلاحەکەی خوسرەویان پێدا و شمشێرەکەی بەخۆیەوە هەڵواسی، سەیریان کرد. شمشێر و سیلاحەکەی هەڵگرت و وتی: سوێند بەخوا ئەو کەسانەی ئەم کەل و پەلانەیان تەسلیم کردووە، کەسانێکی باوەڕدار بوون.

عومەر کوڕی خەتاب شمشێرەکەی خوسرەوی بەموحەلیمدا و وتی: هەر موسوڵمانێك فریوی دنیا بخوات، ئەحمەق و نەزانە، مەغرووری دنیا هەرچی بەدەست بێنێت کەمتر لەمە یا هاوشێوەی ئەمەیە. کەسی موسوڵمان لەکەل و پەلەکانی خوسرەو کەهیچ سوودێکی پێنەگەیاند و زیانی لێندات، چ کەڵکێك دەتوانێت وەربگرێت؟ خوسرەو بەبوونی ئەم کەرەستانە، بیری ئەو دنیا نەکەوتەوە و بۆ هاوسەری ژنەکەی یا هاوسەری کچەکەی یا ژنی کوڕەکەی خۆی پاشەکەوتی کرد و هیچی بۆ خۆی نەنارد، ئەوەی پیاو لەپێشەوە ڕەوانەی دەکات و زیادەکانی بۆ ئەو مەبەستە خەرج دەکات، سوودی پێدەگەیینێت و گەرنە وەك میرات بۆ ئەو سێ کەسە دەمێنێتەوە، چەند نەزانە ئەو کەسەی میرات بۆ ئەوان کۆبکاتەوە یا بۆ دوژمنێکی ماڵوێرانکەر.

نافع کوڕی جوبەیر دەڵێت: کاتێك پێنج یەکەکان گەیشتە مەدینە، عومەر کوڕی خەتاب جل و بەرگ و سیلاحەکانی خوسرەو شمشێرەکەی نەعمان کوڕی مونزەری بینی، وتی: ئەو کەسانەی ئەمانەیان تەسلیم کردووە، باوەڕداری ڕاستەقینە بوون، ڕەچەڵەکی نەعمان دەگەیشتە کێ؟

جوبەیر وتی: عەرەبەکان ڕەچەڵەکی ئەو بۆ تیرەکانی قنس دەگەڕێننەوە و

لەمناڵەکانی عەجەم کوڕی قنس بوو.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: شمشێرەکە هەڵبگرە، شمشێرەکەی بەو بەخشی. خەڵکان کەعەجەمیان نەدەناسی ئەویان بەمناڵی لەخم ناو برد.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب، سەعد کوڕی مالکی وەك پێشنوێژ و سەرکردەی جەنگی سنووری ژێر دەسەڵاتی خۆی دەستنیشان و خەراجی ئاوخۆرەکانی فوراتی بەنەعمان و سوەید کوڕەکانی عەمرۆ کوڕی موقرین سپارد و خەراجی ئاوخۆرەکانی دیجلەی بە نەعمان سپارد. ئەوان پردەکانیان هەڵبەست. دواتر خۆیان لەو کارە کێشایەوە و حوزەیفە کوڕی ئەسید و جابر کوڕی عەمرۆ جێگەی ئەوانیان گرتەوە و دوای ئەوان حوزەیفە کوڕی یەمان و عوسمان کوڕی حەنیف.

تەبەری دەڵێت: وەك لەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاق و سەیفدا هاتووە، شەڕی جەلەولا لەم ساڵە، یانی ساڵی شانزەیەم ڕوویدا.

## جەنگی جەلەولا

قەیس کوڕی ئەبی حازم دەڵێت: کاتێك لەمەداین نیشتەجێ بووین و تاڵانییەکانمان دابەش کرد و پێنج یەکمان بۆ مەدینە نارد، ئاگادار بووینەوە کەمێهران لەجەلەولا ئوردووی لێداوەو بەدەوری سوپاکەی خەندەکی هەڵکەندووە و خەڵکانی موسڵیش لەتکریت کۆبوونەتەوە.

باوکی تەیبەی بوجلی گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە و دەڵێت: سەعد ئەم هەواڵەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی. عومەر کوڕی خەتاب وەڵامی دایەوە: هاشم کوڕی عوتبە لەگەڵ دوانزە هەزار کەس بۆ جەلەولا ڕەوانە بکە و پێشەنگی سوپاکەی بەقەعقاع کوڕی عەمرۆ و باڵی ڕاست بەسەعر کوڕی مالك و باڵی چەپ بەعەمرۆ کوڕی مالك کوڕی عوتبە بسپێرە و عەمرۆ کوڕی جوهەنی وەك فەرماندەی کۆتایی سوپاکە دەستنیشان بکە.

موهەلیب دەڵێت: هەروەها عومەر نامەی بۆ سەعد نووسی: ئەگەر خواوەند، دوو سوپاکەی، سوپای مێهران و سوپای ئینتاقی، لەناو برد، قەعقاع ڕەوانە بکە تا لەنێوان سواد و کێوەکان لەسنووری سوادی ئێوە، جێگیر ببێت.

دەڵێت: داستانی سوپاکەی جەلەولا بەم شێوەیە: کاتێك عەجەمەکان لەمەداین هەلاتن و گەیشتنە جەلەولا کەرێگەی خەڵکانی ئازەربایەجان و باب و خەڵکی کێوەکان و فارس لەیەك جیا دەکرایەوە، سەرکۆنەی یەکیان کرد و وتیان: ئەگەر بلاوەی لێبکەن، هیچ کات کۆنابنەوە. ئێرە ئەو شوێنەیە ئێمە لەیەك جیا دەکاتەوە، با دژی عەرەبەکان یەکبگرین و شەڕیان لەگەڵ بکەین، ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بێنین بەمەبەستی خۆمان گەیشتووین و ئەگەر پێچەوانەکەی بوو، هەوڵی خۆمانداوە و پاساوی شیاومان هەیە.

خەندەکیان لێدا و لەدەوری مێهرانی رازی کۆبوونەوە.

یەزدگێرد گەیشتە حیلوان و لەوێ دابەزی. پیاوانی ڕەوانە و سامانی خستە بەردەستیان. شەڕکەران لەپەنای خەندەکەکە مانەوە. دەوروبەری خەندەکەکە جگە لەرێگەکان، دڕکی دارینیان بلاو کردبوویەوە.

شەعبی دەڵێت: ئەبوبەکری راستگۆ، تا مردنی خۆی داوای هاوکاری هەڵگەڕاوەکانی نەکرد، عومەر کوڕی خەتاب کەڵکی لەهێزی ئەوان وەرگرت بەلام هیچ کام لەوانی نەدەکردە سەرکردەی دە کەس زیاترو تا ئەو کاتەی لەناو موسوڵمانان پیاوی شیاو دەبینرا، سەرکردایەتی بەوان دەسپارد و دوای ئەوان بەشوێنکەوتەکان. ئەوانەی لەکاتی هەڵگەڕانەوە، شۆڕشیان کردبوو هیوایان بەسەرکردایەتی نەبوو تا ئەو کاتەی ئیسلام بلاو و سنوورەکانی فراوان بوون.

سەعد دەڵێت: لەسەفەری ساڵی شانزەیەم، هاشم کوڕی عوتبە لەگەڵ دوانزە هەزار کەس و لەناو ئەوان سەرکردەی موهاجیر و ئەنسارەکان و گەورەکانی عەرەب لەهەڵگەڕاوەکان، بەرێکەوت و بەچوار ڕۆژ لەمەداینەوە گەیشتە جەلەولا و گەمارۆی خستە سەر فارسەکان. فارسەکان کاتیان بەسەر دەبرد و هەرکاتێك دەیانخواست لەخەندەکەکەیان دەهاتنەدەر. موسوڵمانان لەجەلەولا هەشتا جار هێرشیان کردە سەر فارسەکان و بەردەوام سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا. فارسەکان لەدڕکە دارینەکان کەڵکیان نەگرت و دڕکی ئاسنینیان بەکار برد.

بەتان کوڕی بوشر دەڵێت: کاتێك هاشم لەجەلەولا لەبەرابەر مێهران ئوردووی لێدا و فارسەکانی لەناو خەندەکەیان گەمارۆدا، ئەوان بەسەرگەردانی و پەرێشانی

ڕووبەڕووی موسوڵمانان دەبوونەوە. هاشم لەگەڵ شەڕکەران قسەی کرد و وتی: ئەمە مەنزڵگەیەکە و چەندین مەنزڵگەی بەدواوە دێت. سەعد بەردەوام سوارەکانی بۆ هاوکاری ئەو دەنارد. سەرئەنجام فارسەکان بۆ شەڕی موسوڵمانان ئامادە و لەخەندەکەکە هاتنەدەر. هاشم لەگەڵ موسوڵمانان پەیڤی و وتی: پیاوانە لەرێگەی خوادا تێبکۆشن تا پاداشتی تەواوتان پێببەخشێت، بۆ خوا جیهاد بکەن.

لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوە، فارسەکان پیاوانە جەنگان بەڵام خواوەند بایەکی ڕەوانە فەرموو و هەموو شوێنێکی تاریك کرد و هیچ ڕێگە چارەیەك جگە لەبەجێهێشتنی گۆڕەپانی جەنگ نەمایەوە. سوارەکانی فارس کەوتنە ناو خەندەکەکە و بەناچاری لای خەندەکەکە ڕێگەیان دروست کرد بۆ ئەوەی سوارەکان بتوانن بپەڕنەوە و بەمشێوەیە دیوار و سەنگەرەکەی خۆیان لەناو برد. موسوڵمانان ئاگادار بوونەوە و وتیان: جارێکی دیکە هێرشیان دەکەینە سەر یا سەرکەوتن بەدەست دەهێنین، یا دەکوژرێین.

کاتێ موسوڵمانان هێرشیان برد فارسەکان هاتنەدەر و بەدەوری خەندەکەکە درکی ئاسنیان بلاو کردەوە تا ئەسپەکان نەتوانن بڕۆنە ئەو جێگەیانە. ڕێگەیەکیان بۆ هاتنە ناوەوەی عەرەبەکان هێشتەوە. موسوڵمانان لەو ڕێگەوە ڕۆشتنە ناو سوپای فارسەکان و جەنگێك دەستیپێکرد پێشتر هاوشێوەی نەبینرابوو مەگەر لە الیلە الهریر، بەڵام ئەم شەڕە خێراتر کۆتایی هات.

قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەشوێنی هێرش کردنی خۆی گەیشتە شوێنی ڕۆشتنە ناو خەندەکەکە و ئەو شوێنەی گرت و فەرمانیدا جاڕ بدەن: ئەی موسوڵمانان، سەرکردەی ئێوە ڕۆشتۆتە ناو خەندەکی فارسەکان و دەستی بەسەردا گرتووە، لەدەوری کۆببنەوە و ڕێگە مەدەن ئەو فارسانە لەنێوان ئێوە و سەرکردەکەتان جێگیرن، بگەڕێنەوە بۆ ناو خەندەکەکە.

قەعقاع ئەمەی وت بۆ ئەوەی موسوڵمانان دڵگەرم بکات. ئەوان هێرشیان برد و گومانیان نەبوو کەهاشم لەناو خەندەکەکەیە. لەبەرابەر هێرشی ئەوان خۆڕاگری نەکرا تا گەیشتنە بەر دەرگای خەندەکەکە. قەعقاع کوڕی عەمرۆ ئەوێی گرتبوو. ناباوەڕان لەراست و چەپی خەندەکەکە هەڵاتن و خۆیان گیرۆدەی ئەو بەڵایە بوون کە بۆ موسوڵمانانیان دانابوو. ئەسپەکانیان شەل و ناچار بەپێ هەڵاتن. موسوڵمانان

شوێنیان کەوتن و جگە لەدەستەیەکی کەم کەس رزگاری نەبوو. خواوەند لەو رۆژەدا نزیکەی سەد هەزار کەس لەوانی کوشت و کوژراوەکان گۆڕەپانی شەڕیان ڕەش کرد. لەبەر ئەمە بەجەلەولا ناویان برد چوونکە لەبەر کوژراوی زۆر دەستەکان داپۆشرابوون کەدەرخەری گەورەیی جەنگەکە بوو.

عوبەیدالله کوڕی مەحفیز لەباوکی دەگێڕێتەوە: من لەناو یەکەمین دەستەی سوپادا بووم کەڕۆشتینە ناو سابات و سیاچاڵەکەی و یەکێك لەیەکەمین کەسان بووم کە لەدیجلە پەڕیمەوە و ڕۆشتینە ناو مەداین. لەوێ پەیکەرێکم دەست کەوت کەئەگەر بەسەر هەموو منداڵەکانی بەکر کوڕی وائیل دابەش دەکرا، بێ نیاز دەبوون. پەیکەرەکە جەواهیر نیشان و تسلیم بەلێپرسراوی کۆکردنەوەی تالانییەکانم کرد. دوای مانەوە لەمەداین ئاگادار کراینەوە عەجەمەکان لەجەلەولا سوپایەکی گەورەیان بۆ لەناو بردنی ئێمە کۆکردۆتەوە و ژن و منداڵەکانی خۆیان بۆ کێوەکان ناردووە.

سەعد، عەمرۆ کوڕی مالکی بۆ جەنگی ئەوان ڕەوانە کرد. سوپای موسوڵمانان لەجەلەولا لەدوانزە هەزار کەس پێکدەهات. فەرماندەی پێشەنگەکان قەعقاع کوڕی عەمرۆ و سەرکردەکانی سوپا و شاسوارەکان ئامادە بوون. کاتێك سوپاکەکە گەیشتە بابلی مێهرود، دێداری ئەو ناوچە لەگەڵ عەمرۆ پەیمانی ئاشتی بەست بەو مەرجەی یەك جەریب زەوی بەدرەم داپۆشێت، ئەو کارەی کرد و پەیمانی ئاشتی واژۆ کرا. عەمرۆ لەوێ ڕۆشت و خۆی گەیاندە جەلەولا. بینی فارسەکان خەندەکیان لێداوە و لەپشت خەندەکەکە سەنگەریان گرتووە، سامانی خۆیانیان هێشتۆتەوە و بەئاگر سوێندیان خواردووە، پشت نەکەنە گۆڕەپانی جەنگ وتا دوا هەناسە بجەنگن.

دەڵێت: موسوڵمانان لەنزیك ئەوان دابەزین. هەموو رۆژێك لەحیلوانەوە هێزی پشتیوان بۆ فارسەکان دەهات و پاشا، هەموو خەڵکانی کێوەکان کەبۆهاوکاری کردنی ئەو دەهاتن، بۆ جەلەولا دەنارد. موسوڵمانان داوای هاوکارییان لەسەعد کرد و دووسەد سوارکاری بۆ هاوکاری ئەوان نارد، دوای ئەو دووسەد سوارە دووسەد سواری دیکە.

کاتێك فارسەکان هەستیان کرد هێزی پشتیوان بۆ موسوڵمانان دەگات، شەڕیان دەستپێکرد. سەرکردەی سوارەکانی موسوڵمان تولەیحە کوڕی فلان لەتایەفەی

منالەکانی عەبدئەلدار بوو، سەرکردەی سوارەکانی فارس خەرزاد کوڕی خەرهورموز. شەڕێکی قورس دەستییێکرد، موسوڵمانان هاوشێوەی ئەو جەنگەیان نەبینیبوو، هەموو تیرەکان هاویێژران، ڕمەکان شکان و پشتیان بەشمشێر وتەورزینەکانیان بەست.

لەسەرەتای رۆژ تا کاتی نیمەڕۆ جەنگ بەمشێوەیە بەردەوام بوو، لەکاتی نوێژ، خەڵکان بەئیشارە نوێژیان خوێند و لەنێوان دوو نوێژ، دەستەیەك لەفارسەکان پاشەکشێیان کرد، دەستەیەکی دیکە هاتن و جێگەی ئەوانیان گرتەوە.

قەعقاع کوڕی عەمرۆ رووی کردە موسوڵمانان و وتی: ئایا لەمە ترساون؟

وتیان: بەڵێ، ئێمە هیلاك و شەکەت و ئەوان حەساوە، لەمەترسی ناتەوانی هەیە مەگەر ئەوەی جەنگ دوا کەوێت.

قەعقاع وتی: ئێمە هێرش دەبەین و دەجەنگین و دەستیان لێ هەڵناگرین تا ئەو کاتەی خواوەند لەنێوان ئێمە داوەری بکات، پێکەوە هێرشیان بکەنەسەر و شەڕیان لەگەڵ بکەن، کەس لەئێوە کەمتەرخەمی لەخۆی نیشان نەدات.

ئەمەی وت و هێرشی برد. فارسەکان پاشەکشێیان کرد. قەعقاع تا دەروازەی خەندەکەکە نەوەستایەوە. لەم کاتە دا شەو داهات. فارسەکان بەچەپ و راستتدا دەڕۆشتن. تولەیحە و قەیس کوڕی مەکشوح و عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب و حیجر کوڕی عودەی لەگەڵ هێزی پشتیوان هاتبوون، کاتێك هاتن بەهۆی تاریك بوونی هەوا، دەستیان لەشەڕ هەڵگرت، بەلاَم جارچی قەعقاع جاڕیدا: ئێوە دەست لەجەنگ هەڵدەگرن بەلاَم سەرکردەکەتان لەناو خەندەکەکەدایە. فارسەکان هەلاَتن و عەرەبەکان هێرشیان برد.

دەڵێت: من دەڕۆمە ناو خەندەکەکە و دەچمە ناو خێوەتێك کەجل و بەرگ و کەل و پەلی تیایە، پەردەی خێوەتەکە لادەدەم و ژنێك دەبینم هاوشێوەی غەزاڵ و بەجوانی هەتاو، خۆی و جل و بەرگەکانیم گرت، بەلاَم بۆ ئازاد کردنی ئەو هەوڵی زۆرمدا و توانیم ئازادی بکەم و چەندین منالم لەو هێنایە دنیا.

حیماد کوڕی فلانی بەرجەمی دەڵێت: ئەو رۆژە خاریجە کوڕی سەڵت وشترێکی دەستکەوت لەزێر یا زیوی مروارید و یاقووت نیشان هاوشێوەی بەچکە بزن و کاتێك لەسەر زەوی دایان دەنا، پیاوێك لەزێر دەردەکەوت. وشتر و پیاوەکەی هێنا و

تەسلیمی لێپرسراوی کۆکردنەوەی تالانییەکانی کرد.

عوقبە کوڕی موکەرەم دەڵێت: هاشم، قەعقاع کوڕی عەمرۆی بەدوای هەڵاتووانـدا ڕەوانە کرد. ئەو تا خانەقین شوێنیان کەوت. کاتێك یەزدگێرد لەشکستی سوپاکەی ئاگادار بوویەوە، لەحیلوانەوە ڕووی کردە کێوەکان. قەعقاع ڕۆشتە حیلوان و لەبەر ئەوەی عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ سەعد نووسیبوو ئەگەر خواوەند شکستی بەدوو سوپاکەی مێهران و سوپای ئینتاق هێنا، قەعقاع ڕەوانە بکە تا لەنێوان سواد و کێوەکان لەسنووری سوادی ئێوە جێگیر ببێت، ئەوی ڕەوانە کرد. قەعقاع لەگەڵ سوپایەك لەتێکەڵەی هۆزەکان لەحیلوان جێگیر و تا ئەو کاتەی موسوڵمانان لەمەداینەوە ڕوویان کردە کوفە، لەوێ مایەوە. کاتێك سەعد لەمەداینەوە ڕووی کردە کوفە، قەعقاع پەیوەستی بوو و قوبادی عەجەمی خوراسانی وەك فەرمانـدەی سنوورەکە دەستنیشان و تالانییەکانی بەسەر ئەو کەسانەی ئامادە بوون و ئەوانەی لەمەداین مابوونەوە، دابەش کرد.

دەڵێت: لەمبارەوە بۆچوونیان وەك یەك بوو و کاتێك هەواڵی سەرکەوتنی جەلەولا و نیشتەجێ بوونی قەعقاعیان لەحیلوان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی، داوای مۆڵەتیان لێکرد تا شوێن فارسەکان بکەون، بەڵام عومەر کوڕی خەتاب ڕازی نەبوو، وتی: حەزم دەکرد لەنێوان سواد و کێوەکان لەمپەرێکی بەهێز دەبوو تا نەتوانن هێرش بکەنە سەر ئێمە و ئێمەیش ڕوو نەکەینە ئەو ناوچەیە. لەو گوندانە ئێمە تەنیا سوادمان بەسە، تەندروستی موسوڵمانان لای ئێمە باشتر و پەسەندترە لەبەدەست هێنانی تالانی.

دەڵێت: کاتێك هاشم قەعقاعی بەدوای هەڵاتووانـدا نارد، لەخانەقین بەمێهران گەیشتەوە و کوشتی. بەفیروزان گەیشتەوە کە لەئەسپەکەی هاتەخوار و پەنای بۆ تەپۆڵکەکان برد و ئەسپەکەی بەجێهێشت.

قەعقاع چەندین کەسی ئەسیر و ڕەوانەی هاشمی کردن. ئەوانیان وەك تالانی لەقەڵەمدا. ئەسیرەکان بوونە هاوسەری موسوڵمانان و منداڵیان هێنایە دنیا. ئەم دیلانە بۆ جەلەولا دەگەڕێننەوە و بەدیلەکانی جەلەولا ناویان دەبردن. یەکیان دایکی شەعبی و بوو بەهاوسەری یەکێك لەمناڵەکانی عەبەس و منالی بۆ هێنایە دنیا،

کاتێك پیاوی عەبەسی مرد، شەراحبیل ئەوی کردە هاوسەر و عامری هێنایە دنیا و لەناو منالەکانی عەبەس گەورە بوو.

موهەلیب دەڵێت: سوارەکان لەکاتی دابەش کردنی تالآنییەکان نۆهەزار نۆهەزاریان بەرکەوت حەوت چوارپێ. هاشم پێنج یەکی بردە لای سەعد.

شەعبی دەڵێت: خواوەند هەموو کەرەستە و چوارپێی ناو ئوردووگای فارسەکانی وەك تالآنی بە موسوڵمانان بەخشی چوونکە فارسەکان نەیانتوانی هیچ لەسامانی خۆیان دەرباز بکەن. دابەش کردنی تالآنییەکان لەئەستۆی سەلمان کوڕی رەبیعە و تۆماری کردنی تالآنییەکان لەئەستۆی ئەودا بوو. لەبەر ئەمە عەرەبەکان بەسەلمان (خێل) ناوی دەبەن چوونکە ئەسپەکانی دابەش دەکرد و لەدابەش کردنی کەرەستەکانی دیکە کەمتەرخەمی لەخۆی نیشان دەدا. ئەسپە ڕەسەنەکان بەبۆچوونی ئەو سێ جۆر بوون. بەشی سوار لەتالآنییەکانی جەلەولا هاوشێوەی بەشیان لەمەداین بوو.

دەڵێت: ئەوەی لەجەلەولا دابەش کرا، سی هەزار بوو و پێنج یەك، شەش هەزار هەزار.

سەعید دەڵێت: سەعد لەپێنج یەکی جەلەولا بەشی سوارە تێکۆشەرەکانی مەداینیدا و زێر و زیو و دەفر و جل و بەرگەکانی بەقوزاعی کوڕی عەمرۆ دوئەلی و دیلەکانی بەباوکی مەفرەز ئەسوەد، ڕەوانە کرد.

محەممەد کوڕی عەمرۆ دەڵێت: پێنج یەکی بەقوزاعی و باوکی مەفرەز و حسێبەکانی بەزیاد کوڕی ئەبی سوفیان ڕەوانە کرد. ئەو بوو بۆخەڵکانی دەنووسی و تۆماری دەکرد و کاتێك گەیشتنە لای عومەر کوڕی خەتاب، زیاد سەبارەت بەوەی هێنابوویان، قسەی کرد.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: دەتوانی ئەوەی ئێستا باست کرد لەناو موسوڵمانان باسی بکەیت.

وتی: سوێند بەخوا لەسەر زەوی کەس لەتۆ زیاتر لای من ڕێزدار نییە، چۆن ناتوانم لای ئەوان باسی بکەم. سەبارەت بەتالآنییەکان و کارەکانیان لەگەڵ خەڵکان قسەی کرد و داوای مۆڵەتیان کرد لەدیاری فارسەکان پێشڕەوی بکەن. سەرومری باوەڕداران وتی: سوێند بەخوا وتاردەرێکی بەتوانایە. هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم

ناوەڕۆکە:

((سوپاکەی ئێمە بەکردەوەکانی خۆیان

زمانی ئێمەیان کردەوە.))

باوکی سەلمە دەڵێت: کاتێك پێنج یەکی جەلەولایان بردە لای عومەر، وتی: سوێند بەخوا لەژێر سەقفێکدا نامێنێتەوە تا ئەو کاتەی دابەشی دەکەم.

شەوانە عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و عەبدوللە کوڕی ئەرقەم لەناو مزگەوتەکە پاسەوانیاندا و بەرەبەیان عومەر و موسوڵمانان هاتن، عومەر سەرپۆشەکانی لەسەر تالآنییەکان لابرد و کاتێك یاقوت و زەموروود و جەواهیرەکانی بینی، دەستی بەگریان کرد.

عەبدولرەحمان وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران! بۆ دەگرییت؟ سوێند بەخوا پێویست دەکات سوپاسی خواوەند بکەین.

وتی: سوێند بەخوا بۆ ئەوە ناگریم، بەلآم خواوەند ئەم شتانە بەخەڵکانێك نابەخشێت مەگەر ئەوەی رژدی ببەن و دوژمنایەتی یەك بکەن و کاتێك رژدی بەیەك ببەن، دوژمنی و ئاژاوە سەرهەڵدەدات.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب لەدابەش کردنی تالآنییەکانی جەلەولا کێشەی بۆ دروست بوو، دواتر گەیشتە ئەو ئەنجامەی خواوەند ئەمەی پێبەخشیون و پێویستە لەناو هەژاراندا دابەشی بکات. پێنج یەکی جەلەولای بەراوێژ کردن لەگەڵ موسوڵمانان، وەك پێنج یەکی قادسیە لەناو خەڵکانی مەدینە دابەش کرد.

عەمرۆ دەڵێت: سەعد خەڵکانی ئەوبەر مەداینی کۆکردەوە و وتی بیانژمێرین. ئەو کارەیان کرد و سەد و سی و چەند هەزار کەس بوون. موسوڵمانان سی و چەند هەزار خێزان بوون و کاتێك بینی هەرکام لەموسوڵمانان سێ کەسیان بەردەکەوێت، لەمبارەوە نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی. وەڵامی بۆ هاتەوە، وەرزێرەکان بۆ سەر ژیانی خۆیان بگەڕێنەوە مەگەر ئەوانەی دژی تۆ جەنگاون یا پەنایان بۆ دوژمن بردووە، بەوشێوەیە مامڵەیان لەگەڵ بکە کەپێشتر لەگەڵ وەرزێرەکان دەتکرد و کاتێك سەبارەت بەدەستەیەك فەرمانێکم دەرکرد، لەگەڵ کەسانی هاوشێوەی ئەوان بەو شێوەیە مامڵە بکەن.

سەعد سەبارەت بەو کەسانەی وەرزێر نەبوون، نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی و وەڵامی بۆ هاتەوە، ئەوان تا ئەو کاتەی تاڵانییەکان دابەش نەکراوە، لەدەستی خۆتاندایە، ئەو جەنگاوەرانەی زەوییەکانی خۆیان بەجێهێشتووە، زەوییەکانیان تایبەتە بەئێوە، ئەگەر بەپێشنیاری ئێوە رازی و گەڕانەوە و جەزیەیاندا و پێش دابەش کردنی تاڵانییەکان ئەو کارەتان کرد، دەبنە ئەهلی زەممە، ئەگەر پێشنیاری گەڕانەوەتان پێنەکردن، تاڵانییە و حەڵاڵە بۆ ئێوە.

دەڵێت: شەڕکەرانی جەلەولا زیاتر لەهەمووان بوونە خاوەنی زەوی چوونکە تاڵانییەکانی ئەوسەری نەهرەوان تایبەت بوو بەوان و لەتاڵانییەکانی پێشوویش، شەریك بوون.

بەمشێوەیە وەرزێرەکانیان وەك خۆیان هێشتەوە جگە لەوانەی نەگەڕانەوە. لەسەر وەرزێرەکان و هەموو ئەو کەسانەی گەڕانەوە، خەراجیان دانا. سامانی بنەماڵەی خوسرەو و ئەوکەسانەی لەگەڵ ئەوان ڕۆشتبوون، دەستی بەسەردا گیرا و وەك تاڵانی لەناو موسوڵمانان دابەش کرا، فرۆشتنی زەوییەکانی نێوان کێوەکان تا کێوەکانی عەرەبیان بەیەکسان یانی تەنیا بۆ تاڵانی وەرگرەکان بەڕەوا زانی و موسوڵمانان دابەشیان نەکرد چوونکە دابەش کردنی ئەگەری نەبوو. دارستان و زۆنکاوەکان و ئاتەشکەدەکان و ڕێگەکانی هاتوچۆ و سامانەکانی خوسرەو و ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەو ڕۆشتبوون و سامانی کوژراوەکان و ئاشەکان، لەناو ئەو دەستە لەتاڵانییەکاندا بوون کەدابەش کردنیان ئەگەری نەبوو.

دواتر، دەستەیەك لەهەژارەکان داوای دابەش کردنی ئەو زەوییانەیان لەفەرمانڕەوای ویلایەتەکان کرد بەڵام زۆرینە ڕێگر و پشتیان بەبۆچوونی ئەوان دەبەست و دەیانوت: ئەگەر ترسی ئاژاوە و دوو بەرەکی نەدەبوو، ئەو کارەمان دەکرد. ئەگەر لەسەر ئەم داواکارییە، هاوڕا دەبوون، دابەش دەکرا.

ماهان دەڵێت: هیچ کەس لەخەڵکانی سواد ڕێزیان لەپەیمانەکەی نێوان خۆیان و شەڕکەرانی پێش قادسیە نەگرت مەگەر چەند گوندێکی بچوك کەبەجەنگ دەستیان بەسەردا گیرابوو. هەمووان جگە لەم چەند گوندە پەیمانەکەی خۆیان شکاند و کاتێك پێشنیاری گەڕانەوەیان پێکرا، گەڕانەوە و جەزیەیاندا و هاتنە ژێر چەتری پەنای موسوڵمانان جگە لەبنەماڵەی خوسرەو و ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەوان ڕۆشتبوون.

زەوییەکانی نێوان حیلوان تا عێراق دەستی بەسەردا گیرا و عومەر لەهەموو گوندەکان بەسواد بەسەندەی کرد.

دەڵێت: سەبارەت بەزەوییە دەست بەسەردا گیراوەکان، نامەیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی تا زەوییە دەست بەسەردا گیراوەکان لەناو موسوڵمانان دابەش بکات: چواریەکی بۆ سوپاکە و پێنج یەکی بۆ ئەو موسوڵمانانەی شیاون بۆ وەرگرتنی، ئەگەر ویستیان دەتوانن لەویٚ نیشتەجیٚ بن و زەوییەکە تایبەتە بەوان.

دەڵێت: کاتێك ئەم کارەی بەتالآنی وەرگرەکان سپارد، بەباشیان زانی لەدیاری عەجەم بڵاوە نەبنەوە و بەهەمان شێوە وەك خۆی هێشتیانەوە و بەکەسێکیان دەسپارد کەلای هەمووان بڕواپێکراو بوو. ساڵانە داهاتەکەیان بەش دەکرد. ئەم کارەیان تەنیا بەسەرکردەی خەڵکان دەسپارد. لەمەداین بەمشێوە بوو، دواتر کاتێك گەڕانەوە بۆ کوفە، درێژەیان بەمشێوەیەدا.

باوکی تەییبە دەڵێت: پێکەوە بن چوونکە ئەگەر ئەو کارە نەکەن بەپێشکەوتنی کارەکان گرفتار کێشە و ئاژاوە دەبن، ئەوەی لەئەستۆی مندا بوو، ئەنجاممدا. خواوەندا تۆ بەشایەت دەگرم، شایەتی من بە.؟

وەلید کوڕی عەبدوللە لەباوکی دەگێڕێتەوە: وەرزێرەکان ڕێگەکان و پردەکان و ڕێنومایی چۆنیەتی کشتوکاڵ کردنیان دەکرد و بەئەندازەی توانای خۆیان جەزیەیان دەدا و سەر قاڵی ئاوەدان کردنەوە بوون. ڕێنومایی و میوانداری کردنی موهاجیرەکان لەئەستۆی ئەواندا بوو. میوانداری تالآنی وەرگرە تایبەتەکان وەك میرات بۆ کەسان دەمایەوە.

ماهان دەڵێت: گرتنی جەلەولا لەکۆتاییەکانی زی قەعدەی ساڵی شانزەیەم روویدا و لەقادسیە تا جەلەولا نۆ مانگی خایاند.

عەمرۆ دەڵێت: ڕێکخستنی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەهلی زەممە بەمشێوە بوو کەئەگەر لەبەرژەوەندی دوژمن خیانەتیان لەموسوڵمانان دەکرد، چیتر لەلایەن موسوڵمانانەوە پشتیوانییان لێنەدەکرا و ئەگەر جوێنیان بەموسوڵمانان دەدا، سزایان دەبینی و ئەگەر هاوشێوەی موسوڵمان شەڕیان بکردایە و بکوژرانایە، پشتیوانی ئەوان لەئەستۆی عومەر کوڕی خەتابدایە و عومەر لەبەرابەر پەیمان

دارەكان بۆ ویرانی سوپاكە هیچ پەیمان و بەڵێنێكی نییە.

ماهان دەڵێت: لەجەلەولا خەڵكانی ڕەی لەهەموو خەڵكانی دیكە بەدبەختر بوون چوونكە پارێزگاری كردن لەفارسەكان لەئەستۆی ئەواندا بوو. شەڕكەرانی ڕەی لەشەڕی جەلەولا لەناوچوون.

عەمرۆ دەڵێت: كاتێك جەنگاوەرانی جەلەولا بۆ مەداین گەڕانەوە و لەشوێنەكانی خۆیان جێگەیان گرت. سواد لەپەنای موسوڵمانانندا بوو جگە لەبنەماڵەی خوسرەو و ئەو كەسانەی لەگەڵ ئەو مابوونەوە.

دەڵێت: كاتێك فارسەكان وتاری عومەر كوڕی خەتاب و بۆچوونی ئەویان سەبارەت بەسواد و ئەولای سواد زانی، وتیان: ئێمەیش بەمە ڕازین، دانیشتووانی هیچ گوندێك ڕازی نابن بەوەی كەسێك دەست بەسەر گوندەكانیاندا بگرێت.

ئیبراهیم كوڕی یەزید دەڵێت: فرۆشتنی زەوییەكانی نێوان حیلوان و قادسیە كەدەستی بەسەردا گیراوە، ڕەوا نییە چوونكە تایبەتە بەتالانی وەرگرەكان.

موغەیرە كوڕی شیبل دەڵێت: جەریر لەزەوییە دەست بەسەر گیراوەكانی سواد لەكەناری فوراتی كرییەوە و كاتێك ڕۆشتە لای سەروەری باوەڕداران و ئاگاداری كردەوە، ئەم مامڵەی پەسەند نەكرد و ئەوی لەكڕینی زەوییەك كەلەنێوان خاوەنەكانی دابەش نەكرابوو، دوور خستەوە.

محەممەد كوڕی قەیس دەڵێت: بەشەعبیم وت: سواد بەجەنگ دەستی بەسەردا گیرا؟

وتی: بەڵێ، هەموو سەرزەمینەكە، جگە لەچەندین قەڵا كەدەستەیەكیان بەجەنگ و دەستەیەكیان بەئاشتی دەستیان بەسەردا گیرا.

وتم: ئایا خەڵكانی سواد پێش ئەوەی هەڵبێن، جەزیەیان دەدا؟

وتی: نە، بەڵام كاتێك پێشنیاری گەڕانەوەیان پێكرا و گەڕانەوە و باجیان دا، زەممی بوون.

حەبیب كوڕی ئەبی سابت دەڵێت: هیچ كام لەخەڵكانی سواد پەیمانی نەبوو مەگەر منداڵەكانی سەلوبا و خەڵكانی حیرە و بەشێك لەگوندەكانی فورات، ئەوان خیانەتیان كرد و دوای خیانەتەكەیان پێشنیاری دانی جەزیەیان پێكردن.

سەعید دەڵێت: عومەر كوڕی خەتاب نامەی بۆ سەعد نووسی: ئەگەر خواوەند

لەجەلەولا سەرکەوتنی بەئێوە بەخشی، قەعقاع کوڕی عەمرۆ بەشوێن فارسەکاندا ڕەوانە بکە تا لەحیلوان جێگیر ببێت و پارێزەری موسوڵمانان بێت تا خواوەند سوادتان بۆ بپارێزێت. قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەگەڵ سوپایەك لەشەڕکەرە بەربڵاوەکانی هۆزەکان و عەجەمەکان تا خانەقین شوێن فارسەکان کەوت و چەندین کەسی ئەسیر و پیاوە شەڕکەرەکانی کوشت، مێهران کوژرا و فیروزان رزگاری بوو.

کاتێك یەزدگێرد لەشکستی سوپاکەی جەلەولا و کوژرانی مێهران ئاگادار بوویەوە، لەحیلوان بەمەبەستی ڕۆشتن بۆ ڕەی بەرێکەوت و لەحیلوان سوپایەکی بەسەرکردایەتی خوسرەو شەنوم بەجێهێشت.

دەڵێت: قەعقاع پێشڕەوی کرد تا گەیشتە قەسری شیرین کە لەیەك فەرسەخی حیلوانە و خوسرەو شەنوم بەمەبەستی ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو بەرێکەوت و زەینەبی، فەرماندار حیلوانی لەپێشەوە نارد. قەعقاع ڕووبەڕووی بوویەوە و شەڕیان دەسپێکرد و زەینەبی کوژرا و عومەیرە کوڕی تارق و عەبدوللە، هەرکام دەیانوت بەدەستی ئەو کوژراوە. قەعقاع ساز و بەرگی ئەوی لەناو ئەواندا دابەش کرد و عومەیرە ئەمەی بەهۆکاری ریسوایی خۆی دەزانی.

دەڵێت: خوسرەو شەنوم هەڵات و موسوڵمانان بەسەر حیلواندا زاڵبوون و قەعقاع عەجەمەکانی لەوێ دابەزاند و قوبادی کردە سەرکردەی ئەوان. قەعقاع پێشنیاری گەڕانەوەی بەخەڵکان کرد. گەڕانەوە و بەڵێنیاندا جەزیە بدەن. ئەو لێپرسراوی سنور و جەزیە بوو تا ئەو کاتەی سەعد لەمەداین گەڕایەوە بۆ کوفە و قەعقاع پەیوەستی بوو. قەعقاع، قوبادی وەك فەرمانڕەوای سنوورەکە دەستنیشان کرد کەبەڕەچەڵەك خوراسانی بوو.

بەوتەی سەیف، گرتنی تکریت لەم ساڵەدا یانی ساڵی شانزەیەم لەمانگی جومادی ڕوویدا.

## گرتنی تکریت

وەلید کوڕی عەبدوللە دەڵێت:سەعد سەبارەت بەکۆبوونەوەی خەڵکانی موسڵ لەسەر ئینتاق و هاتنی ئەو بۆ تکریت و لێدانی خەندەك لەو ناوچەیە بۆ پارێزگاری

کـردن لەسـەرزەمینەکەیان و هـەروەها سـەبارەت بەکۆبوونـەوەی سـوپاکەی جەلـەولا لەدەوری مێهران نامەیان نووسیبوو.

عومـەر سـەبارەت بەجەلـەولا فەرمانـەکانی خـۆی نووسـی کەپێشتر باسمـان کـرد. سەبارەت بەتکریت و کۆبوونەوەی دانیشتووانی موسڵ لەدەروی ئینتـاق نووسـی کە عەبدوللە کوڕی موتعیم بـۆ رووبەروو بوونـەوەی ئینتـاق ڕەوانە بکە وڕێبعی کـوڕی ئەفکـەلی عـەنزی وەك فەرمانـدەی پێشەنگی سـوپاکە و بـاڵی راسـت و بـاڵی چـەپی بـەحارس کـوڕی حـسانی زوهـەلی و بـاڵی راسـت بـەفورات کـوڕی حـەییانی عێجلـی بسپێرە، هـانی کـوڕی قـەیس فەرمانـدەی دواوەی سـوپاکە و سـەرکردەی سـوارەکان عەرەفجە کوڕی هەرسیمە بێت.

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی موتعیم لەگەڵ پێنج هەزار کەس لەمەداینەوە بەرێکـەوت و لەچوار رۆژدا گەیشتە تکریـت و لەبەرابـەر ئینتـاق دابـەزی کەرۆمییـەکان و تایەفـەی ئـەیاد و تەغلـەب و نـەمر و شـەهارجە هاورێیـەتیان دەکـرد. خەنـدەکیان بـەدەوری خۆیان لێدا بوو. عەبدوللە بۆ ماوەی چل رۆژ گەمارۆی خستنە سەر و بیست و چوار چوار رووبەرووی یەکبوونەوە. گەورەیی و هێزی ئـەوان وتوانـای بـەرگری کردنیـان لەسوپاکەی جەلەولا کەمتر بوو. عەبدوللە کوڕی مـەتعیم چەندین کەسـی راسپارد تـا پێشنیار بەعەرەبـەکان بکـەن دژی رۆمییـەکان هاوکـاری موسـوڵمانان بکـەن چـوونکە هیچ شتێکیان لەو نەدەشاردەوە.

دەڵێـت: کاتێـك رۆمییـەکان بینیـان هـەرجار کەرووبـەروو بوونـەوە روودەدات، لـەزیانی ئەواندایـە و لەهـەموو هێرشـەکان شکـست دەخـۆن، سـەرکردەکانی خۆیـان بەجێهێشت و کاڵاکانی خۆیان بردە ناو کەشتییەکان. سیخوڕەکانی تەغلـەب و ئەیاد عەبدوللە کوڕی موتعیمیان ئاگادار کردەوە و داوای پەیمانی ئاشتییان بۆ عەرەبـەکان کرد و وتیان بەپێشنیاری موسوڵمانان رازی دەبن. عەبدوللە کەسـی نـارد و پەیامیـدا: ئەگـەر راسـت دەکـەن شـایەتومـان و بـاوەڕ بەخـواوەنـد و پێغـەمبەرەکەی بێنن. دواتـر لەبۆچوونی خۆتان ئاگادارمان بکەنەوە.

سیخوڕەکان ڕۆشتن و هەواڵی موسوڵمان بوونی ئەوانیان بۆ عەبدوللـە گەڕاندەوە. عەبدوللـە ئـەوانی گەڕاندەوە و وتـی: کاتێـك دەنگـی تـەکبیری ئێمـەتان بیـست، بزانن هێـرش دەکەینـە سـەر رێگـەکانی نزیـك تـا لـەوێوە رووبـەروی نابـاوەڕان ببینـەوە،

ئێوەیش ڕێگەکانی نزیك دیجلە بگرن و تەکبیر بڵێن، هەرکەسێکتان گرت، بیکوژن.

دەڵێت: نێردراوان ڕۆشتن و بڕیاریاندا. کاتێك عەبدوللە و موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر ڕێگەکانی نزیك خۆیان و تەکبیریان هێنایە سەرزمان، خەڵکانی تەغلەب و ئەیاد و نەمریش تەکبیریان هێنایە سەرزمان و ڕێگەکانیان گرت. ناباوەڕان گومانیان کرد موسوڵمانان لەپشتەوە و لەلای دیجلەوە هێرشیان هێناوە، لەبەر ئەمە ڕوویان کردە ئەو ڕێگەیانەی موسوڵمانان بۆسەیان دانابوو. شمشێرەکان کەوتنەکار. شمشێری موسوڵمانان لەپێش ئەوان و شمشێری ڕێبعییەکان کەهەمان شەو موسوڵمان ببوون، لەپشتەوە. لەشەڕکەرانی ناو خەندەکەکە کەس ڕزگاری نەبوو جگە لەخەڵکانی تەغلەب و ئەیاد و نەمر کەباوەڕیان هێنا.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب فەرمانی بەسەعددا بوو ئەگەر شکستیان خوارد، عەبدوللە کوڕی موتعیم و ئەفکەل کوڕی عەنزی بۆ حەسنین ڕەوانە بکە. سەعد، عەبدوللە و کوڕی ئەفکەلی بۆ حەسنین نارد و ڕێگەی بەست و وتی: بەخێرایی بڕۆ تا هەواڵەکە پێش تۆ نەگات، تا نیوەی ڕۆژ ئەسپ غاربدە و شەوانە ڕێگە بڕە. خەڵکانی تەغلەب و ئەیاد و نەمر هاوڕێیەتیان دەکرد، عوتبە کوڕی وەعل یەکێك لەمناڵەکانی سەعد کوڕی حەشەم و زوئەلقەرت و باوکی وەداعە کوڕی ئەبی کەرب و کوڕی زی ئەلسەنینە قوتەیل ئەلکەلاب و کوڕی حەجیری ئەیادی و بیشر کوڕی ئەبی حوت پێکەوە سەرکردەی خەڵکان بوون و پێش ئەوەی هەواڵی بەرێکەوتنیان بگات، گەیشتنە حەسنین. کاتێك لەو سەرزەمینە نزیك بوونەوە، عوتبە کوڕی وەعلیان بۆ پێشەوە نارد کەباسی سەرکەوتن و تالآنی و گەڕانەوەی کرد. دوای ئەو، زوئەلقەرت گەیشت، دوای ئەو زو ئەلسەنینە و دوای ئەو کوڕی حەجیر و دوای ئەو بیشر و لەسەر دەروازەکان وەستان و ڕێگەکانیان گرت. شاسوارەکانی سوپا لەگەڵ ڕێبعی کوڕی ئەفکەل هاتن و هێرشیان کردە سەر حەسنین و گەمارۆیان خستەسەر. پێشنیاری ئاشتییان بەخەڵکان کرد، هەرکەس ڕازی بوو مایەوە و هەرکەس ڕازی نەبوو، هەڵات. کاتێك عەبدوللە کوڕی موتعیم گەیشت، ئەوانەی هەڵاتبوون، پێشنیاری گەڕانەوەیان پێکرا و پەیمانی ئاشتی خەڵکانی پشتڕاست کردەوە. هەڵاتووان گەڕانەوە و هەمووان شادمان بوون و لەلایەن موسوڵمانانەوە پشتیوانیان

لێدەکرا.

دەڵێت: لەتکریت لەکاتی دابەش کردنی تالآنییەکان، هەر سوارەیەك سێ هەزار درەمی بەرکەوت و پیادەکان هەزار درهەم. پێنج یەکیان بەفورات کوڕی حەیان و هەواڵی سەرکەوتنیان بەحارس کوڕی غەسان ڕەوانە کرد. کاروباری جەنگ لەئەستۆی ڕێبعی کوڕی ئەفکەل و کاروباری تایبەت بەخەراج لەئەستۆی عەرەفجە کوڕی هەرسیمەدا بوو.

گرتنی ماسەبزان لەم ساڵەدا، یانی ساڵی شانزەیەم ڕوویدا.

## گرتنی ماسەبزان

سەعد دەڵێت: کاتێك هاشم کوڕی عوتەبە لەجەلەولا بۆ مەداین گەڕایەوە، سەعد ئاگادار بوویەوە کەئازین کوڕی هورموز دەستەیەکی کۆکردۆتەوە و ڕووی کردۆتە دەشت. ئەم هەواڵەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی.

سەروەری باوەڕداران وەڵامی دایەوە: زەرار کوڕی خەتاب لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە بکە، کوڕی هوزەیلی ئەسەدی فەرماندەی پێشەنگەکان و باڵەکانی سوپای بە عەبدوللە کوڕی وەهبی راسبی موالی بوجەیلە و موزاریب کوڕی فلآنی عیجلی بسپێرە، زەرار کوڕی خەتاب لەتایەفەی مناڵەکانی موحاریب لەگەڵ سوپاکە بەرێکەوت و کوڕی هوزەیلی لەپێشەوە نارد تا گەیشتە دەشتی ماسەبزان و لەناوچەیەك کەپێیان دەوت هەندف، ڕووبەڕووی یەکبوونەوە و شەڕیان دەستپێکرد. موسوڵمانان هێرشیان کردە سەر ناباوەڕان و زەرار کوڕی خەتاب سەلەم کوڕی هورموزانی گرت و ئەسیری کرد. سوپاکەی شکستی خوارد. ئەوی هێنایە پێش و کوشتی. دواتر شوێن هەلآتووان کەوت و گەیشتە سیروان. ماسەبزان بەجەنگ دەستی بەسەردا گیرا و خەڵکەکەی بەرەو کوێستانەکان هەلآتن. پێشنیاری گەڕانەوەی پێکردن و گەڕانەوە. لەو ناوچەیە مایەوە تا سەعد گەڕایەوە بۆ کوفە و کەسی بەدوای ئەودا نارد. زەرار بەرەو کوفە بەرێکەوت و کوڕی هوزەیلی لەماسەبزان وەك جێگری خۆی دانا. ماسەبەزان یەکێك لەسنورەکانی کوفە بوو. هەروەها لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەجەب جەنگی قرقیسیا ڕوویدا.

## جەنگی قرقیسیا

سەعید دەڵێت: کاتێك هاشم کوڕی عوتبە لەجەلەولا گەڕایەوە بۆ مەداین، دەستەیەك لەخەڵکانی جەزیرە کۆبببوونەوە و دژی خەڵکانی حمس هاوکاری هێرقلیان دەکرد و سوپایەکیان بۆ سەر خەڵکانی هیت نارد. سەعد ئەم هەواڵەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی. سەروەری باوەڕداران وەڵامی دایەوە: عەمرۆ کوڕی مالك کوڕی عوتبە لەگەڵ سوپایەك بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەوان رەوانە بکە، حارس کوڕی یەزیدی عامری وەك پێشەنگی سوپاکە و باڵەکانی سوپا بەرێبعی کوڕی عامر و مالك کوڕی حەبیب بسپێرە.

دەڵێت: عەمرۆ کوڕی مالك لەگەڵ سوپایەك بەرو هیت بەرێکەوت و حارس کوڕی یەزیدی لەپێشەوە نارد کە لەبەرابەر شەڕکەرانی هیت دابەزی. ئەوان، خەندەکیان لێدابوو. کاتێك عەمرۆ بینی خەڵکان لەپشت خەندەکەکەوە سەنگەریان گرتووە، زانی ئەم شەڕە دەخایەنێت، خێوەتەکانی وەك خۆی هێشتەوە و خالید کوڕی یەزیدی بۆ گەمارۆ خستنە سەر ئەو خەڵکە راسپارد و لەگەڵ نیوەی سوپاکەی بەرێکەوت تا بەشێویەکی لەناکاو بۆ قرقیسیا بگەڕێتەوە. ئەو ناوچەیە بەجەنگ دەستی بەسەرداگیرا و خەڵکەکەی بەدانی باج رازی بوون.

عەمرۆ نامەی بۆ حارس کوڕی یەزید نووسی: ئەگەر رازی بوون، دەستبەرداریان ببە تا بێنەدەر و لەبەرابەر خەندەکەکەی ئەوان خەندەکێك لێبدە تا رێگەکانی ئەوان لەنزیك تۆوە بێت تا ئەوکاتەی فەرمانەکانی خۆمان دەنێرین و کاتێك خەڵکان رازی بوون، سوپاکە بۆ لای عەمرۆ گەڕایەوە و عەجەمەکان پەیوەستی سەرزەمینەکانی خۆیان بوون.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب، باوکی میحجەنی سەقەفی بۆ بازع دوورخستەوە.

دەڵێت: هەروەها لەم ساڵەدا، کوڕی عومەر، سەفییە کچی باوکی عوبەیدی وەك هاوسەر هەڵبژارد.

دەڵێت: لەم ساڵەدا لەموحەڕەم، ماریە کەنیزەکەی پێغەمبەر(د.خ)، دایکی ئیبراهیم، کۆچی دوایی کرد. عومەر کوڕی خەتاب نوێژی لەسەر خوێند و لەبەقیع بەخاکی سپارد.

دەڵێت: لەم ساڵەدا لەمانگی رەبیع الاول، بناغەی مێژوویان داڕشت.

کوڕی موسەییب دەڵێت: یەکەم کەس مێژووی نووسیەوە، عومەر کوڕی خەتاب بوو. ئەمکارە دوای تێپەڕینی دووساڵ و نیوە بەسەر ڕۆژگاری خەلافەتی ئەو ئەنجامدرا کە ساڵی شانزەیەمی کۆچە. ئەم کارەی بەراوێژ کردن لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب خەڵکانی کۆکردەوە و وتی: مێژوو لەچ ڕۆژێکەوە دەست پێبکەین؟

عەلی وتی: لەو ڕۆژەوەی پێغەمبەر(د.خ) کۆچی کرد و سەرزەمینی نابـاوەڕانی بەجێهێشت.

عومەر کوڕی خەتاب ئەو کارەی کرد.

کوڕی عەباس دەڵێت: مێژوو لەو ساڵەوە بوو پێغەمبەر(د.خ) رووی کردە مەدینە و لەو ساڵەدا عەبدوللە کوڕی زوبەیر چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

هەروەها لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد و بەوتەی واقدی، زەید کوڕی سابتی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا.

لەم ساڵەدا کارگوزاری سەروەری باوەڕداران لەمەککە، عەتاب کوڕی ئەسید بوو.

کارگوزاری تاییف عوسمان کوڕی ئەبی عاس بوو.

کارگوزاری یەمەن یەعلی کوڕی ئومەییە بوو.

کارگوزاری یەمامە و بەحرەین عەلا کوڕی حەرزەمی بوو.

کارگوزاری عەمان حوزەیفە کوڕی موحسین بوو.

کارگوزاری شام، باوکی عوبەیدەی جەراح بوو.

کارگوزاری کوفە، سەعد کوڕی ئەبی وەقاس بوو.

لێپرسراوی دادی کوفە، باوکی قورە بوو.

کارگوزاری بەسرە و سەرزەمینەکانی دەوروبەری، موغەیرە کوڕی شوعبە بوو.

لێپرسراوی جەنگی موسڵ، ڕێبعی کوڕی ئەفکەل بوو.

لێپرسراوی خەراجی ئەوێ بەوتەیەك عەرەفجە کوڕی هەرسیمە و بەوتەیەکی دیکە عوتبە کوڕی فەرقەد و بەوتەیەك لێپرسراویەتی جەنگ و خەراج لەئەستۆی عەبدوللە کوڕی موتعیمدا بوو.

کارگوزاری جەزیە عەیاز کوڕی غەنەمی ئەشعەری بوو.

## ساڵ حەفدەیەم دەستی پێکرد

بەوتەی سەیف کوڕی عەمرۆ لەم ساڵەدا بناغەی شاری کوفە دارێژرا و سەعد لەگەڵ موسوڵمانان بۆ ئەو شارە کۆچیان کرد.

## کۆچ کردنی موسوڵمانان لەمەداینەوە بۆ کوفە

و هۆکاری بناغە دارشتنی ئەو شارە بەپێی گێرانەوەی سەیف

دەڵێت: کاتێك جەلەولا و حیلوان دەستی بەسەردا گیرا و قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەحیلوان جێگیر و تکریت و حەسنین دەستی بەسەردا گیرا و عەبدوللە کوڕی موتعیم و ڕێبعی کوڕی ئەفکەل لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان لەحەسنین جێگیر بوون، نێردراوان عومەر کوڕی خەتابیان لەم پێشهاتانە ئاگادار کردەوە. سەروەری باوەڕداران کاتێ ئەوانی بینی، وتی: سوێند بەخوا بارودۆخی ئێوە وەك سەرەتا نییە، نێردراوانی قادسیە و مەداین کاتێك دەهاتن، وەك خۆیان مابوونەوە، بەڵام ئێوە زەرد هەڵگەڕاون، هۆکارەکەی چییە؟

وتیان: ئەو دیارە بۆ ئێمە سازگار نییە.

عومەر پێداویستییەکانی ئەوانی دابین و بەخێرایی ئەوانی گەڕاندەوە.

دەڵێت: عوتبە کوڕی وەعل و زوئەلقەرت و کوڕی زی ئەلسەنینە و کوڕی حەجیر و بیشر، لەناو نێردراوەکانی عەبدوللە کوڕی موتعیم دەبینران. ویستیان سەبارەت بەخەڵکانی مناڵەکانی تەغلەب پەیمان لەگەڵ سەروەری باوەڕداران ببەستن. عومەر بەمشێوەیە پەیمانی لەگەڵ بەستن هەرکەس لەوان باوەر بێنێت، ئەرك و لێپرسراویەتی هاوشێوەی موسوڵمانانی لەسەر شانە و هەرکەس باوەڕ نەهێنێت، دەبێت جەزیە بدات.

وتیان: بەمشێوەیە هەڵدێن و بڵاوەی لێدەکەن و دەچنە ریزی عەجەمەکان، باشتر وایە زەکات بدەن.

وتی: نە، جگە لەجەزیەدان هیچ ڕێگەیەکی دیکە نییە.

وتیان: جەزیەی ئەوان هاوشێوەی خێر و خێرات دیاری بکە تا لەداهاتی خۆیان

بیدەن.

عومەر کوڕی خەتاب ئەو کارەی کرد بەو مەرجەی زادەی باوکە موسوڵمانەکان نەکەنە مەسیحی.

وتیان: رازین.

تەغلەبییەکان و ئەو دەستە لەخەڵکانی نەمر و ئەیاد کەشوێنکەوتەی ئەوان بوون، لەمەداین ڕۆشتنە لای سەعد و دوای ئەوە لەکوفە نیشتەجێ بوون و دەستەیەکیان موسوڵمان و دەستەیەکیان بەپێی ئەو پەیمانەی عومەر کوڕی خەتاب بەوانی دابوو، لەسەرزەمینی خۆیان مابوونەوە.

شەعبی دەڵێت: حوزەیفە نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی: ورگی عەرەبەکان ئاوساوە و بازوویان شل بووە و ڕەنگیان گۆڕاوە، لەو کاتەدا حوزەیفە هاوڕێی سەعد بوو.

تەڵحە دەڵێت: سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ سەعد نووسی: ئاگادارم بکەرەوە بۆ ڕەنگ و گۆشتی عەرەبەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە؟

سەعد نووسی: لەڕ بوونی عەرەبەکان و گۆڕینی ڕەنگی ئەوان بەهۆی ناسازگاری مەداین و دیجلەوەیە.

عومەر نووسی: سەرزەمینێك سازگارە بۆ عەرەبەکان کەسازگار بێت بۆ وشترەکانیان. سەلمان و حوزەیفە بۆ دۆزینەوە ناوچەیەکی شیاوی دەشتی – دەریایی ڕەوانە بکە کە لەنێوان من نە ڕووبارێك بێت نەپردێك.

سەلمان و حوزەیفە لێکۆڵەرانی سوپاکە بوون. عومەر هەریەك لەکارەکانی سوپای بەکەسێك سپاردبوو. سەعد ئەوانی راسپارد. سەلمان بەمەبەستی ئەنبار بەرێکەوت و لەرۆژئاوای فورات گوزەری کرد بەڵام هیچ شوێنێکی پەسەند نەکرد تا گەیشتە کوفە، حوزەیفە لەرۆژهەڵاتی فوراتەوە بەرێکەوت و هیچ شوێنێکی پەسەند نەکرد تا گەیشتە کوفە کەریخەڵان و پێیان دەوت سەهلە. هەرشوێنێك کەریخ و زیخ بەمشێوەیە تێکەڵ بووبێت، پێی دەڵێن کوفە. سێ دێر لەوێ دەبینرا: دێری خەرقە و دێری دایکی عەمرۆ و دێری سلسیلە و لەنێوان ئەوان ماڵەکانی نەبین. شوێنەکەیان پەسەند کرد و دابەزین. نوێژیان خوێند و وتیان: خوای پەروەردگاری ئاسمان و ئەوەی سێبەری ئاسمان دەیگرێتەوە و زەوی و ئەوەی لەناو زەویدایە و با و ئەوەی

بڵاوی دەکاتەوە و ئەستێرەکان و ئەوەی دێتەخوار و دەریاکان و ئەوەی ڕەوانی دەکات و شەیتانەکان و ئەوەی گومڕایان دەکات و ماڵەکانی نەبینراو و ئەوەی دەیانشارێتەوە، ئەم کوفەیە بۆ ئێمە پیرۆز و موبارەك بکە و بیکەرە مەنزڵگەی ئێمە. هەواڵەکەیان بۆ سەعد نووسی.

حوسەین کوڕی عەبدولرەحمان دەڵێت: کاتێك فارسەکان لەجەنگی جەلەولا شکستیان خوارد، سەعد خەڵکانی کۆکردەوە و کاتێك عەمار هات، خەڵکانی بەرەو مەداین برد بەڵام ئەو شوێنەیان بەسازگار نەزانی. سەروەری باوەڕداران وتی: ئایا ئەو شوێنە بۆ وشترەکان سازگارە؟

وتیان: نە، مێشوولەی هەیە.

سەروەری باوەڕداران وتی: ئەو شوێنەی بۆ وشترەکان سازگار نەبێت، بۆ عەرەبەکان سازگار نییە.

دەڵێت: عەمار لەگەڵ موسوڵمانان بەرێکەوت و لەکوفە دابەزی.

یەسر کوڕی سور دەڵێت: کاتێك لەمەداین نیشتەجێ بووین، موسوڵمانان ئەو سەرزەمینەیان بەخۆش نەدەزانی چوونکە تەپ و تۆز و مێشوولە ئازاری دەدان. عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ سەعد نووسی: کەسانێك بنێرە تا شوێنێکی دەشتی دەریایی بدۆزنەوە چوونکە دیارێك بۆ عەرەبەکان سازگارە کە بۆ وشتر و بزن سازگار بێت. لەو کەسانەی لەوێ ئامادە بوون سەبارەت بەناوچەیەك کەم ئەم تایبەتمەندییانەی هەبێت، پرسیاری کرد. سەرکردەکانی عەرەب ئەوانەی عێراقییان بینیبوو، باسی زەبانەیان کرد. – شوێنی کوفەیان بەزەبانە ناو دەبرد—کە لەنێوان نەهرەین تا سەرچاوەی مناڵەکانی حەدا بوو. عەرەبەکان دەیانوت: دەشتی زەبان خۆی لەناو گوندەکەدا نەغرۆ کردووە.

ئەوەی لەنزیك فورات بوو پێیان دەوت مەلتات (یانی کەنار) و ئەوەی لەنزیگ گڵ بوو، پێیان دەوت نەجاف، (یانی شوێنی بەرز). عومەر نامەی بۆ سەعد نووسی و سەبارەت بەو کارە فەرمانی خۆی دەرکرد.

سەعید دەڵێت: کاتێك سەلمان و حوزەیفە ڕۆشتنە لای سەعد و سەبارەت بەکوفە هەواڵیان بۆ هێنا و نامەکەی سەروەری باوەڕداران بەدەستی سەعد گەیشت، سەعد

نامەی بۆ قەعقاع کوڕی عەمرۆ نووسی: قوباد و ئەو عەجەمانەی پەیوەستی ئێوە بوون، لەجەلەولا بەجێبێڵە. قەعقاع ئەو کارەی کرد و لەگەڵ سوپاکەی خۆی پەیوەستی سەعد بوو.

هەروەها نامەی بۆ عەبدوللە کوڕی موتعیم نووسی: موسلیم کوڕی عەبدوللە کە لەرۆژگاری قادسیە ئەسیر کراوە، لەگەڵ ئەو دەستە لەسوارکارەکانی فارس کە بەپێشنیارەکانی ئێوە رازی بوون یا هاوڕێی ئێوەن، لەموسڵ بەجێبێڵە. عەبدوللە ئەو کارەی کرد و لەگەڵ سوپاکەی پەیوەستی سەعد بوو.

سەعد و موسوڵمانان لەمەداین هاتنەدەر و لەموحەرەمی ساڵی حەفدەیەم لەکوفە ئوردوویان لێدا. لەجەنگی مەداین تا ڕۆشتن بۆ کوفە یەك ساڵ و دوو مانگی خایاند و لەکاتی خەلافەتی عومەر تا بناغە دارشتنی شاری کوفە، سێ ساڵ و هەشت مانگ. کوفە لەساڵی چوارەمی خەلافەتی ئەو، لەموحەرەمی ساڵی حەفەدەی کۆچ، بناغەی دارێژرا.

دەڵێت: لەموحرەمی ئەم ساڵە لەمەداین، پێش کۆچ، مانگانەی خەڵکانیاندا و لەبەهرسیر لەموحەرەمی ساڵی شانزەی کۆچ، مانگانەی خەڵکانیاندا. خەڵکی بەسرە دوای ئەوەی سێ جار شوێنیان گۆڕی، لەموحەرەمی ساڵی حەفەدەیەم لەشوێنی ئێستایان نیشتەجێ بوون. ئەم کارە لەماوەی یەك مانگدا ئەنجامدرا.

واقدی دەڵێت: لەقاسم کوڕی مەعنم بیست کەخەڵکان لەکۆتاییەکانی ساڵی حەفدەیەمی کۆچ لەکوفە دابەزین.

دەڵێت: کوڕی ئەبی رەقاد لەباوکی دەگێڕایەوە کەکوفە لەساڵی هەژدەیەم بوو بەمەنزڵگەی موسوڵمانان.

سەعید دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بۆ سەعد کوڕی مالك و عوتەبە کوڕی غەزوان نامەی نووسی تا لەگەڵ موسوڵمانان لەبەهرا لەباشترینی سەرزەمینەکان بەهار بەسەر ببەن و فەرمانیدا لەبەهاری هەر ساڵێك هاوکارییەکان بەخەڵکان بدەن و مانگانە لەموحرەمی ساڵەکان و تالآنی لەکاتی ئاوابوونی هۆنراوەیەك کەدانەوێڵە بەدەست دێت. بەمپێیە خەڵکان پێش ئەوەی لەکوفە نیشتەجێ بن، دووجار مانگانەی خۆیان وەرگرت.

مەغروور یەکێك لەمناڵەکانی ئەسەد دەڵێت: کاتێك سەعد لەکوفە جێگیر بوو،

نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی: لەکوفەیەك جێگیر بووم کە لەنێوان حیرە و فوراتە و دەشتێکە و دەریایەك و ئاڵفی باش دەڕوێت. لەمەداین موسوڵمانانم سەرپشك کرد و هەرکەس ئارەزوومەندی مانەوە لەو شارەی کرد، مایەوە، ئەو شارەم کردۆتە پادگانێك و دەستەیەك لەعەرەبەکان لەهۆزە بەربڵاوەکان لەوێ ماونەتەوە کەزۆربەیان لەمناڵەکانی عەبەسن.

سەعید دەڵێت: کاتێك خەڵکانی کوفە لەکوفە نیشتەجێ بوون و خەڵکانی بەسرە لەبەسرە ئارامیان گرت، ئەوەی لەدەستیان دابوو، بەدەستیان هێنایەوە. خەڵکانی کوفە داویان کرد مۆڵەتیان پێبدرێتماڵەکانیان لەقامیش دروست بکەن و خەڵکانی بەسرەیش داوای هەمان مۆڵەتیان کرد.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئوردووگا بۆ جەنگ و بۆ ئێوە باشترە، بەڵام نامەوێت دژایەتیتان بکەم، قامیش چییە؟

وتیان: روەکێکە ئاوی بەرکەوتووە و بۆتە قامیش.

وتی: خۆتان دەزانن.

خەڵکی دوو شارەکە ماڵەکانیان لەقامیش دروست کرد.

دوای ئەوەی لەبەسرە و کوفە رووداوی ئاگر کەوتنەوە روویدا. ئاگرەکەی کوفە گەورەتر و مەترسیدارتر بوو. هەشتا سایەوان سووتا و یەك چڵ قامیشی نەمایەوە. ئەم رووداوە لەمانگی شەوال روویدا و خەڵکان بەردەوام بیریان دەکردەوە.

سەعد کەسانێکی لەوان بۆ لای سەروەری باوەڕداران نارد تا داوای مۆڵەت بکەن بۆ ئەوەی بەخشت ماڵەکانیان بینا بکەن چوونکە هیچ کارێکیان بێ مۆڵەتی ئەو نەدەکرد. کاتێك هەواڵی ئاگرکەوتنەوە و زیانەکانیان باس کرد، وتی: مۆڵەتتان هەیە بەڵام کەس زیاتر لەسێ ژوور دروست نەکات و لەمکارەدا زێدەڕۆیی نەکەن. پشت مەکەنە سونەتەکان تا پاشایەتی پشتتان تێ نەکات.

نێردراوان بۆ کوفە گەڕانەوە و عومەر کوڕی خەتاب بۆ عوتەبە و خەڵکانی نووسی و فەرمانیدا باوکی هەیاج شوێنی خەڵکانی کوفە دیاری و باوکی جەربا عاسم کوڕی دولف شوێنی خەڵکانی بەسرە دەستنیشان بکات.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب فەرمانی بەنێردراوان و خەڵکاندا هیچ بینایەك زیاد

لەئەندازە بەرز نەکەنەوە.

وتیان: ئەندازە چییە؟

وتی: ئەوەی ئێوە لەزێدەڕۆیی نزیك بکاتەوە و لەرێگەی راستی و دادپەروەری دوورتان بخاتەوە.

دەڵێت: کاتێك بڕیاریاندا بناغەی شاری کوفە دابرێژن، سەعد، باوکی هەیاجی بانگ کرد و نامەکەی سەروەری باوەڕدارانی سەبارەت بەرێگەکان و چۆنیەتی کارەکان بۆ ئەو خوێندەوە، فەرمانیدابوو: رێگەگەورەکان چل زەراع و رێگە ناگرنگەکان سی زەراع و رێگە نێوەنجییەکان بیست زەراع و کۆڵانەکان حەوت زەراع بێت و دەبێت لەمە کەمتر نەبێت. پارچەکانی بەشەست زەراع دیاری کردبوو جگە لەپارچە زەویی منالەکانی زەببە.

خەڵکانی شارەزا سەرقاڵی پێوانی زەوی بوون و کاتێك کۆتاییان بەپێوانی ناوچەیەك دەهێنا، باوکی هەیاج لەناو خەڵکان دابەشی دەکرد.

یەکەم بینا لەکوفە خەتکێشی کرا و بناغەکەی دارێژرا، مزگەوتی کوفە بوو و لەشوێنی بازاری سابون فرۆش و خورما فرۆشەکان دروستیان کرد. تیرهاوێژێکی بەهێز لەناو مزگەوتەکەدا وەستا و تیرێکی بۆ لای راست هاویشت و وتی: هەرکەس دەخوازێت لەو لای شوێنی کەوتنە خوارەوەی تیرەکە بینای خۆی دروست بکات. بۆ رووبەروو و پشت سەری خۆی تیری هاویشت و قسەکەی دووبارە کردەوە. مزگەوت لەناو چوار سوچێکدا بوو. چوارسووچەکە بۆ کۆکردنەوەی خەڵکان ورێگرتن لەقەرەباڵغی بوو. هەموو مزگەوتەکان بەمشێوە بوون جگە مسجد الحرام چوونکە بۆ رێز گرتن لەو مزگەوتە، مزگەوتەکانیان هاوشێوەی ئەو دروست نەدەکرد. رەواقی مزگەوتەکە دووسەد زەراع و لەسەر ستوونە مەرمەڕەکانی خوسرەوان بینا کرابوو. ژێر تاقی مزگەوتەکە هاوشێوەی کەنیسەی رۆمییەکان بوو. بەدەوری مزگەوتەکە خەندەکێکیان لێدا بۆ ئەوەی کەس بینای لێ دروست نەکات.

لەتەنیشت مزگەوتەکە، ماڵێکیان بۆ سەعد دروست کرد کەئێستا کۆشکی کوفەیە. رێگەیەکی ژێر زەمینی بەدرێژایی دووسەد زەراع لەوێوە دەگەیشتە مزگەوتەکە. خەزێنەکانیان لەوێ دانا. بیناکەی بەدەستی روزبە لەخشتی بینای خوسرەوەکان لەحیرە دروست کرا. پشتی مزگەوتەکە پێنج رێگەی گەورەیان دانا و

رووەو قیبلە چوار ڕێگە و لای ڕۆژهەڵات سێ ڕێگە و لای ڕۆژئاوا سێ ڕێگەی دیکە.

هۆزی سەلیم و سەقیفیان لەپشت مزگەوتەکە و لەبەردەم دوو ڕێگە گەورەکە نیشتەجێ کرد. هەمەدان لای ڕێگەیەکی دیکە و بوجەیلە لەسەر ڕێگەیەکی دیکە و تیم و تەغلەب لەسەر دووایین ڕێگە نیشتەجێ بوون.

لەسەر ڕێگەی رووەو قیبلە، منالەکانی ئەسەد جێگیر بوون، لەنێوان منالەکانی ئەسەد و نەخەع ڕێگەیەکی دیکە بوو، لەنێوان نەخەع و کێندە ڕێگەیەك و لەنێوان کێندە و ئەزدیش ڕێگەیەك. لەڕۆژهەلاتی مزگەوتەك، ئەنسار و مەزینە لەسەر یەك ڕێگە جێگیر کران تایەفەی تەمیم و موحارب لەسەر ڕێگەیەك و ئەسەد و عارم لەسەر ڕێگەیەك. لەڕۆژئاوای مزگەوتەکە، بەجالە و بوجەیلەیان لەسەر ڕێگەیەك جێگیر و جەدیلە و دەستەیەکی بەربلاویان لەسەر ڕێگەیەکی دیکە و جوهەینە و دەستەیەکی بەربلاوی دیکەیان لەسەر ڕێگەیەکی دیکە.

ئەوان دراوسێی مزگەوتەکە و خەڵکانی دیکە لەنێوان ئەوان و پشت سەری ئەوان جێگیر کران. شوێنەکان بەپێی پشکەکان دابەش کرا. ئەمە شارێگەکان و ڕێگەکانی دیکەیان بەرابەر بەوان دروست کرد کەسەرئەنجام پەیوەستی شارێگەکان دەبوونەوە. ڕێگەکانی دیکە بەدرێژای ئەوان بەلام پانییەکەیان کەمتر و شوێنەکەیان نزمتر بوو.

گەرەکەکان لەنێوان ڕێگاکاندا بوون. ئەم ڕێگایانەیان لەدەرەوەی مزگەوتەکە دروست کرد. شەڕکەرانی قادسیە و پێش جەنگی قادسیەیان لەدە دەستەدا، تێا جێ کردەوە.

بۆ سوپای سنوورەکان و موسڵ شوێنێکیان پاشەکەوت کرد تا لەوێ جێگیر بن و کاتێك پاشماوەکانی چینی یەکەم و دووەم هاتن و ژمارەیان فراوان بوو، گەڕەکەکان بۆ خەڵکان بچوك و ئەو کەسانەی منالْ و شوێنکەوتەی فراوانیان بوو، گەڕەکەکانی خۆیان بەجێهێشت و ڕۆشتنە لای ئەو کەسانەی ژمارەیان فراوان نەبوو.

دەڵێت: حەوشی مزگەوتەکە لەڕۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب وەك خۆی مایەوە و هۆزەکان چاوی تەماحیان تێنەدەبڕی، جگە لەمزگەوت و کۆشکەکە هیچ بینایەکی دیکەی لێ نەبوو. بازارەکانیش بناغە و سنووڕێکی دیاریکراویان نەبوو. عومەر وتبووی: بازارەکان هاوشێوەی مزگەوتەکانە، هەرکەس زووتر بگاتە نشینگەیەك،

تایبەتە بەخۆی تا زووتر بگاتە ماڵەکەی خۆی یا لەفرۆشتن رزگاری بێت.

بۆ پاشماوەکان شوێنێکی حەسانەوەیان دیاری کردبوو، هەرکەس دەهات، لەوێ نیشتەجێ دەبوو تا ئەو کاتەی دەڕۆشتنە لای باوکی هەیاج و شوێنێکیان بەئارەزووی خۆیان بۆ دیاری دەکرا. ئەو شوێنە، هەنووکە مەنزڵگەی مناڵەکانی بەکایە.

دەڵێت: سەعد لەو پانتاییەی بۆ کۆشکەکە دیاری کرابوو، ئەو شوێنەی ئێستا لەنزیك مزگەوتی کوفەیە، کۆشکێکی بەرز کردەوە و بناغەکەی بەپتەوی داڕشت. خەزێنەکانی لەوێ دانا و لەلایەکی خۆی مەنزڵی گرت. تونێلێکیان بۆ خەزێنەکان لێدا و بەشێك لەسامانەکەیان دزی.

سەعد ئەم رووداوەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و لەشوێنی خەزێنەکان کە لەپشت ماڵەکەی خۆی بوو، ئاگاداری کردەوە.

وەڵامی دایەوە: شوێنی مزگەوتەکە بگۆڕە بەشێوەیەك لەتەنیشت ماڵەکە بێت و ماڵەکە رووبەرووی دروست کرابێت چوونکە شەو ورۆژ خەڵکانێك لەمزگەوت بوونیان دەبێت پارێزگاری لەسامانەکەی خۆیان بکەن.

سەعد شوێنی مزگەوتەکەی گۆڕی و ویستی بناغەکەی دابرێژێت. وەرزێرێك لەخەڵکانی هەمەدان بەناوی روزبە کوڕی بوزرگمهێر وتی: مزگەوتەکە دروست دەکەم و کۆشکێکیش، هەردووکیان پەیوەستی یەك دەکەم بەجۆرێك وەك یەك بینا بەرچاو بکەوێت.

نەخشەی کۆشکی کوفەی کێشا و بەهەمان پانتایی بێ ئەوەی دەستکاری بکات، لەخشتی کۆشکی خوسرەوەکان لەحیرە، دروستی کرد و مزگەوتەکەی لەبەرابەر خەزێنەکانی کۆشکەکە بەرز کردەوە کەتا کۆتایی کۆشکەکە درێژ دەبوویەوە. لای راستی رووی لەقیبلە و لای راستی خەزێنەکان تا کۆتایی گۆڕەپانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب درێژ دەبوویەوە. قیبلەی مزگەوتەکە رووی لەگۆڕەپان و لای راستی کۆشکەکە بوو.

بینای کۆشکەکە لەسەر ستوونە مەرمەڕینەکان کەخوسرەو لەکەنیسەکان بەکاری دەبرد، بەرز کرایەوە. بەو شێوە بوو تا لەرۆژگاری معاویە کوڕی ئەبوسوفیان، بەدەستی زیاد بەو شێوەی ئێستای دروست کرا.

کاتێـك زیـاد ویـستی مزگەوتەکـە دروسـت بکـات، چـەند کەسـێك لەوەسـتاکانی ڕۆژگاری جاهلییەتی بانگ کرد و لەشوێن و پانتایی مزگەوتەکە ئاگاداری کردنەوە و وتی: سەبارەت بەبەرزاییەکەی شتێکم دەوێت نەتوانم وەسفی بکەم.

یەکێك لەوەستاکان کەوەستای بیناکانی خوسرەویش بوو، وتـی: ئەم کـارە بـەو ستوونانە دەکرێـت کـەدەبێت لـەکێوەکانی ئـەهوازەوە بیـانهێنین و بەسـورب و شیشە ئاسـنینەکان پڕیـان بکەینـەوە و سـێ زەراع لـەئاسمان بـەرزی بکەیتـەوە، دواتـر سەقفێکی بۆ دروست بکەیت بۆ ئەوەی بەهێزتر و تۆکمەتر بێت.

زیاد وتی: مەبەستی منیش ئەوە بوو بەڵام نەمدەتوانی بیهێنمە سەرزمان.

سەعد درگای کۆشکەکەی بەست، بازارەکـان لەشـوێنی خۆیانـدا بـوون. قـەرەباڵغی بازارەکان ڕێگر بوو لەگفتوگۆی سەعد. کاتێك کۆشکەکەی بینا کرد، خەڵکان چەندین تۆمەتیان بۆ سەعد هەڵبەست کەنەیهێنابووە سەرزمان. وتیان: سەعد وتوویەتی: ئەم دەنگە دەنگانە بێدەنگ بکەن.

ئەم هەواڵە بەگوێی عومەر کوڕی خـەتاب گەیشت و بیستی کۆشکەکە بەکۆشکی سـەعد نـاو دەبـەن. محەممـەد کوڕی موسلیمەی ڕەوانـەی کوفـە کـرد و وتـی: بـڕۆ نـاو کۆشکەکە و بیسووتێنە و بەهمان شێوەی کەڕۆشتوویت، بگەڕێرەوە.

محەممەد کوڕی موسلیمە بەرێکەوت و ڕۆشتە ناو کوفە. کەمێك چیلکە و چـەوێڵی کڕی و درگاکەی سووتاند. کاتێك سەعدیان ئاگادار کردەوە، وتـی: ئەم پیاوەیـان بۆ ئەو کـارە ناردووە. کەسـی نـارد تـا بزانێـت کێیە؟. بۆیان دەرکەوت محەممـەد کـوڕی موسـلیمەیە و کەسـی نـارد تـا بڕواتـە نـاو کۆشـکەکە، بـەڵام نەڕۆشـت. سـەعد خـۆی ڕۆشـتە لای و ویـستی لەگەڵی دانیـشێت بەڵام ڕازی نـەبوو. ویـستی پـارەی پێبـدات، بەڵام وەرینەگرت. نامەکەی عومەر کوڕی خەتابی تەسلیمی سەعد کرد، نووسیبووی: بیستوومە کۆشـکێکت دروسـت کـردووە و بەکۆشـکی سـەعد نـاوی دەبـەن و لـەنێوان خـۆت و موسـوڵمانان دەرگـات دروسـت کـردووە، ئەمـە کۆشـکی تـۆ نییـە، کۆشـکی جنۆکەکانـە. لـەماڵێکی نزیـك خەزێنـەکان نیشتەجێ ببە و دەرگـای ئـەو ماڵـە دابخـە. بەڵام دەرگا بۆ کۆشکەکە دامەنێ تا خەڵکان بەئاسانی بتوانن بڕۆنە ناوی.

سـەعد سـوێندی خـوارد، ئـەو تۆمەتـەی هەڵیانبەسـتووە، ناڕەوایـە و وتـەی لـەو

شێوەی نەهێناوەتە سەرزمان.

محەممەد کوڕی موسلیمە هەمان سات گەڕایەوە و کاتێك لەمەدینە نزیك کەوتەوە، توێشووی ڕێگەی کۆتایی هات و پێستی داری دەخوارد. کاتێك گەیشتە لای عومەر کوڕی خەتاب، نەخۆش کەوتبوو، سەروەری باوەڕدارانی لەهەموو شتەکان ئاگادار کردەوە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: بۆ خەرجیت لەسەعد وەرنەگرت؟

وتی: ئەگەر دەتویست وەریبگرم، دەبوا لەنامەکەت باسی بکەیت یا مۆڵەتی ئەو کارەت پێدەدام.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: بیرمەند کەسێکە کاتێك فەرمانی سەبارەت بەشتێك پێنەدراوە، دوورئەندێشانە کردەوەکانی ئەنجام بدات، یا وتەیەك بێنێتە سەرزمان.

محەممەد کوڕی موسلیمە سەروەری باوەڕدارانی لەسوێند و وتەکانی سەعد ئاگادار کردەوە. عومەر کوڕی خەتاب وتەکانی سەعدی پشتڕاست کردەوە و وتی: ئەو لەو کەسەی تۆمەتی بۆ هەڵبەستووە و ئەوەی هەواڵەکانی ئەوی بۆهێنام، ڕاستگۆترە.

محەممەد ئازاد کراوەی ئیسحاق کوڕی تەڵحە دەڵێت: من لەمزگەوتی گەورە پێش ئەوەی زیاد دروستی بکات، دادەنیشتم، لەوێوە دێری هندو دەروازەی پردم دەبینی.

شەعبی دەڵێت: هەرکەس لەمزگەوتەکە دادەنیشت، لەوێوە دەروازەی پردەکەی دەبینی.

باوکی کەسیر دەڵێت: روزبە کوڕی بوزرگمێهر کوڕی ساسان لەدانیشتووانی هەمەدان بوو. فەرمانڕەوای یەکێك لەسنوورەکانی ڕۆم و سیلاحی زۆری خستە بەردەستی ئەوان. خوسرەوەکان ئاگاداریان کردەوە و ڕۆشتە لای ڕۆمییەکان تا ئەو کاتەی سەعد کوڕی مالك هات و کۆشك و مزگەوتەکەی بۆ دروست کرد. بەودا نامەیەکی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و لەبارودۆخی ئەو ئاگاداری کردەوە. روزبە باوەڕی هێنا و عومەر کوڕی خەتاب مانگانەی بۆ دیاری کرد و بەخششی پێدا و ئەوی لەگەڵ مەکارییان گەڕاندەوە.

دەڵێت: لەو ڕۆژگارەدا مەکارییەکان لەدەستەی عیبادییەکان بوون و کاتێك گەیشتنە ئەو شوێنەی پێی دەڵێن گۆڕی عیبادی، مرد و گۆڕی ئەویان هەڵکەند.

دواتر چاوەڕێ بوون تا کەسێك لای ئەوان گوزەر بکات و ئەو بکەنە شایەتی مەرگی ئەو، دەستەیەك لەبەدەوییەکان لەوێ گوزەریان کرد، گۆڕی روزبەیان لای ڕێگەکە هەڵکەندبوو. ئەویان نیشانی بەدەوییەکاندا بۆ ئەوەی تاوانی مەرگی ئەو لەسەر شانی خۆیان لابەرن. ئەوانیان کردە شایەتی خۆیان و بەهۆی ئامادە بوونی مەکارییەکان وتیان، گۆڕی عیبادی و بەناوی گۆڕی عیبادی ناوبانگی دەرکرد.

باوکی کەسیر دەڵێت: سوێند بەخوا روزبە باوکی من بوو، وتیان: ناتەوێت ئەوە بەخەڵکان رابگەیێنێت؟ وتی: نە.

سەعید دەڵێت: دەستەیەك لەدەستە دە کەسییەکان لەدەستەکانی دیکە فراوانتر بوو و سەعد بۆ رێکخستنی ئەوان نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و وەڵامی بۆ هاتەوە: ئەو کارە بکە.

دەڵێت: سەعد دەستەیەك لەڕەچەڵەك ناسان و بیرمەندانی عەرەب و لەناو ئەوان سەعید کوڕی نەمران و مەشعەلە کوڕی نەعیمی بانگ کرد و دەستەکانی بۆ حەوت دابەش و بوون بەحەوت دەستە: کەنانە و موالییەکانیان لەحەبەشییەکان و کەسانی دیکە و جەدیلە کەتیرەی مناڵەکانی عەمرۆ کوڕی قەیسی عەیلان، بوونە بەیەك دەستە. هۆزی قوزاعە کەتیرەی غەسان کوڕی شام لەوان بوو لەگەڵ بوجەیلە و خەسعەم و کێندە وحەزەرمەوت و ئەزد، یەك دەستە. مەزحەج و حەمیر و هەمەدان و موالییەکانیان بوون بەیەك دەستە، تەمیم و هۆزەکانی دیکەی رەباب و هەوازین یەك دەستە. تایەفەی ئەسەد و غەتەفان و موحاریب و نەمر و رەبیعە و تەغلەب، یەك دەستە، ئەیاد و عەك و عەبدقەیس و خەڵکانی هیجر و عەجەمەکان یەك دەستە. لەرۆژگاری عومەر و عوسمان و عەلی و زۆربەی رۆژگاری معاویە ئەم دەستانە وەك خۆیان مانەوە تا ئەوەی زیاد ئەوانی بۆ چواردەستە گۆڕی.

## ڕێکخستنی کەسەکان بەشێوازێکی تازە

ئەم دەستانەیان لەسەر بنەمای سەد هەزار درەم ڕێکخست، هەردەستەیەك لەجەنگاوەرانی قادسیە، چل و سێ پیاو و چل و سێ ژن و پەنجا نانخۆر، یەك هەزار درەم. هەردەستەیەك لەشەڕکەرانی پێشوو، بیست پیاو هەرکام سێ هەزار، بیست ژن و دەستەیەك نانخۆری سەد درەمی، سەد هەزار درەم، دەستەی پاشماوەی چینی یەکەم، شەست پیاو و شەست ژن و چل نانخۆر کەپیاوەکانیان هەزار و پێنسەدی بوون، سەد هەزار درەم و بەمشێوەیە.

عوقەبە کوڕی حارس دەڵێت: یەکسەد سەردەستەم دەناسی، خەڵکانی بەسرەیش بەمشێویە. مانگانەیان بەسەرانی حەوت دەستەکە و ئاڵادارەکان دەدا و ئەوان بەسەردەستەکان و کەسانی بڕواپێکراو کە لەماڵەکان تەسلیمی موسوڵمانانیان دەکرد.

## سەرکەوتنەکانی مەداین، پێش کوفە

سەعید دەڵێت: سەکەوتنەکانی مەداین، سواد و حیلوان و ماسەبەزان و قرقیسیا بوو. کوفە چوار سنووری بوو: حیلوان کە لەسەر دەستی قەعقاع کوڕی عەمرۆ دەستی بەسەردا گیرا، ماسەبزان کەکارگوزارەکەی زەرار کوڕی خەتابی فەهری بوو، قرقیسیا کەکارگوزارەکەی عەمرۆ کوڕی مالك یا عەمرۆ کوڕی عوتەبە بوو و موسڵ کەکارگوزارەکەی عەبدوڵلە کوڕی موتعیم بوو. بەمشێوە بوو و پێش ئەوەی سەعد شاری کوفە بنیات بنێت، موسوڵمانان هێشتا لەمەداین ژیانیان بەسەر دەبرد. کارگوزارانی سنوورەکان پەیوەستی کوفە بوون و جێگریان بۆ خۆیان دانا تا کاروباری سنوورەکان ڕێکبخەن: جێگری قەعقاع لەحیلوان، قوباد کوڕی عەبدوڵلە، جێگری عەبدوڵلە لەموسڵ، موسلیم کوڕی عەبدوڵلە، جێگری زەرار رافیع کوڕی عەبدوڵلە و جێگری عەمرۆ، عەشنەق کوڕی عەبدوڵلە بوو.

عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ کارگوزارانی سنوورەکان نووسی تا هاوکاری لەسوارچاکەکانی فارسی وەربگرن و جەزیەیان لەسەر هەڵگرن. ئەوکارەیان کرد.

کاتێك نەخشەی کوفە کێشرا و خەڵکانی موسوڵمان مۆڵەتی دروست کردنی

بینایـان پێـدرا، موسـوڵمانان دەرگاکـانی خۆیـان لەمەداینـەوە بـۆ کوفـە بـرد و بـۆ بیناکانیان لەکوفە کەڵکیان لێوەرگرت و لەکوفە نیشتەجێ بوون. سنوورەکانیان ئەم شوێنانە و لەگوندەکان جگە لەمانە هیچی دیکە لەژێر دەستی موسوڵماناندا نەبوو.

عامر دەڵێت: کوفە و گوندەکانی و سنوورەکانی حیلوان و موسڵ و ماسەبزان و قرقیسیا بوو.

لەگێڕانـەوەی موسا کـوڕی عیسای هەمـەدانی ئامـاژەی پێـدراوە: عومـەر کـوڕی خەتاب ڕێگەی نەدان بڕۆنە ناو سەرزەمینەکانی دیکە و پێشڕەوی بکەن.

سەعد دەڵێت: دوای بناغە داڕشتنی شاری کوفە، سەعد کوڕی مالك بۆ ماوەی سێ ساڵ و نیو کارگوزاری ئەو سەرزەمینە بوو جگە لەو ماوەی لەمەداین ژیانی بەسەر برد. سەعد لەماسەبزان و حیلوان و قرقیسیا و موسڵ، کارگوزارەکانی خۆی دانابوو.

دەڵێـت: عوتەبـە کـوڕی غـەزوان کـارگوزاری بەسـرە بـوو، مـرد، سـەعد هێـشتا کارگوزاری کوفە بوو. عومەر کوڕی خەتاب باوکی سەبرەی لەجێگەی عوتەبە کوڕی غەزوان دانا، دواتر باوکی سەبرەی لەسەر کار لابرد و موغەیرەی لەجێگەی ئەودانا، دواتـر موغەیرەیـشی لەسـەر کـار لابـرد و بـاوکی موسـای ئەشعەری وەك کـارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد.

## پێشهاتەکانی حمس و فەرمانڕەوای ڕۆم

### کەمەبەستی هێرش کردنە سەر موسوڵمانانی کرد

لـەم ساڵەدا ڕۆمییـەکان بەمەبەسـتی جـەنگان لەگـەڵ بـاوکی عوبەیـدەی جـەراح و موسـوڵمانانی نیشتەجێی حمـس، بەرێکـەوتن و دەیانویـست بجـەنگن. بەسـەرهاتی موسـوڵمانان وەك لەگێڕانـەوەی سـەعید ئامـاژەی پێـدراوە، بەمـشێوەیە: یەکـەم جـار کـوڕی عومــەر کــوڕی خــەتاب مۆڵەتیـدا سـوپاکەی نیـشتەجێی کوفـە ڕوو بکەنـە ناوچـەیەکی دیکـە، لـەوێوە سەرچـاوەی گـرت کەڕۆمییـەکان نامـەیان بـۆ خـەڵکانی جـەزیرە نووسـی و مەبەسـتی هێـرش کردنـە سـەر بـاوکی عوبەیـدە و موسـوڵمانانی حمسیان کرد. باوکی عوبەیـدە شـەڕکەرانی خـۆی کـۆکردەوە و لـەحمس ئوردوویـان

لێدا. خالید لەقینەسرینەوە هات و هاوشێوەی سەرکردەکانی دیکە پەیوەستی بوو. باوکی عوبەیدە راوێژی لەگەڵ کردن بۆ ئەوەی بزانێت، بجەنگن، یا سەنگەر بگرن تا ئەو کاتەی هێزی پشتیوان دەگات.

خالید بۆچوونی وابوو دەبێت بجەنگن، کەسانی دیکە دەیانوت سەنگەر بگرن و نامە بۆ عومەر کوڕی خەتاب بنووسن، باوکی عوبەیدە بەبۆچوونەکەی خالید رازی نەبوو و بۆچوونی سەرکردەکانی دیکەی بەکار برد. نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی کەرۆمییەکان دەیانەوێت هێرشی بکەنەسەر و سوپاییەکانی شام رێگەی رووبەروو بوونەوەیان لێگرتووە.

عومەر کوڕی خەتاب لەهەر شارێك لەزیادەی سامانی موسوڵمانان، بەئەندازەی توانایی ئەسپی راگرتبوو تا ئەگەر رووداوێکی لەناکاو رووبدات، ئامادە بن، چوار هەزار ئەسپ لەکوفە بوو. کاتێك سەروەری باوەڕداران لەمەبەستی رۆمییەکان ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ سەعد کوڕی مالك نووسی: کاتێك نامەکەی من بەدەستی تۆ دەگات، خەڵکانی موسوڵمان لەگەڵ قەعقاع کوڕی عەمرۆ بۆ حمس ڕەوانە بکە چوونکە رۆمییەکان گەمارۆیان خستۆتە سەر باوکی عوبەیدە، هەموو هەوڵی خۆت بخەگەر.

هەروەها نامەی بۆ سەعد نووسی: سوهەیل کوڕی عودەی لەگەڵ سوپایەك بۆ جەزیرە ڕەوانە بکە و دەبێت تا ڕقە پێشڕەوی بکات چوونکە خەڵکانی جەزیرە بوون رۆمییەکانیان دژی موسوڵمانانی حمس هانداوە و خەڵکانی قرقیسیا پێشەنگی ئەوان بوون. عەبدوڵلە کوڕی عەتەبان بۆ نەسیبین ڕەوانە بکە چوونکە هاودەستی خەڵکانی قرقیسیان و لەڕەقە و نەسیبینەوە روو بکەنە حەڕان و ڕەها، وەلید کوڕی عوقەبە لەگەڵ عەرەبەکانی جەزیرە یانی هۆزی رەبیعە و تەنوخ بنێرە، عەیازیش ڕەوانە بکە، ئەگەر جەنگ روویدا، عەیاز کوڕی غەنەم سەرکردەی هەمووانە.

دەڵێت: عەیاز لەخەڵکانی عێراق و هاوڕێ لەگەڵ سوپاکەی خالید بۆ هاوکاری سوپای شام ڕۆشتبوو و هەروەها لەو عێراقییانە بوو لەشامەوە بۆ هاوکاری کردنی سوپاکەی قادسیە گەڕانەوە و هاتوچۆی باوکی عوبەیدەی دەکرد.

دەڵێت: هەمان رۆژی گەیشتنی نامەکە، قەعقاع لەگەڵ چوار هەزار کەس بەرەو حمس بەرێکەوت، عەیاز کوڕی غەنەم لەگەڵ سەرکردەکانی لێپرسراوی کاروباری

جەزیرە لەکەنارەکان و دوور لەکەنارەکان ڕێگەی جەزیرەیان گرتەبەر.

سوهەیل رووی کردە ڕەقە، عومەر کوڕی خەتاب لەمەدینەوە بەمەبەستی هاوکاری کردنی باوکی عوبەیدە بەرێکەوت و دەیویست خۆی بگەیێنیتە حمس و تا جابیە پێشڕەوی کرد.

دەڵێت: کاتێك خەڵکانی جەزیرە ڕۆمییەکانیان دژی موسوڵمانانی نیشتەجێی حمس هاندەدا و هاوکاریان دەکردن و پەیوەستیان ببوون، لەوتەی دانیشتووانی جەزیرە بۆیان دەرکەوت سوپایەکی گەورە لەکوفەوە بەرێکەوتووە و نەیاندەزانی روو لەکوفە دەکات یا حمس، بەمەبەستی گەڕانەوە بۆ سەرزەمینی خۆیان و پەیوەست بوون بەکەسەکانیان بلاوەیان لێکرد و ڕۆمییەکانیان بەتەنیا جێهێشت.

کاتێك ئەم دەستەیە بلاوەیان لێکرد، بۆچوونی باوکی عوبەیدە گۆڕا وسەبارەت بەجەنگ، راوێژی لەگەڵ خالید کرد.

خالید وتی بجەنگێت و خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین. قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەگەڵ سوپاکەی کوفە لەسێیەم ڕۆژی جەنگەکە گەیشت، عومەر کوڕی خەتابیش لەجابیە دابەزیبوو. هەواڵی سەرکەوتن وئەوەی هێزی پشتیوان لەڕۆژی سێیەم گەیشتووە، بۆ عومەر کوڕی خەتابییان نووسی تا فەرمانی خۆی لەو بارەوە دەربکات.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران نووسی ئەوان شەریکی تالآنییەکانن، خواوەند پاداشتی چاکەی خەڵکانی کوفە بداتەوە چوونکە سنوورەکانی خۆیان دەپارێزان و هاوکاری سنوورەکانی دیکە دەکەن.

رەجـا کوڕی حەیوە دەڵێت: هێرقل لەدەریاوە هێرشی کردە سەر حمس، موسوڵمانان لەناو پادگانەکانی خۆیان بوون، عەلقەمە کوڕی مەجەزەز و عەلقەمە کوڕی حەکیم لەرمەلە وْ عەسقەلان و شوێنەکانی دیکە بوون، یەزید و شورەحبیلیش ئەو کارەیان کردبوو. هێرقل داوای هاوکاری لەخەڵکانی جەزیرە کرد و خەڵکانی حمسی هاندا کەوەلآمیان دایەوە: ئێمە پەیمانمان بەستووە و دەترسین ئەگەر دژایەتییان بکەین، هاوکاریمان نەکرێت.

ئەو لەگەڵ دەستەیەکی فراوان لەڕۆمییەکان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ باوکی

عوبەیدە بەرێکەوت. باوکی عوبەیدە داوای هاوکاری لەخالید کرد. خالید لەگەڵ هەموو شەڕکەرانی خۆی بۆ هاوکاری کردنی باوکی عوبەیدە هات و کەسی بەجێنەهێشت. دوای ئەو خەڵکانی قنسرین ناباوەڕ بوون و شوێن هێرقل کەوتن. زۆربەی ئەوکەسانەی لەوێ بوون تەنووخییەکانی شارەکان بوون و بەشێوەیەك بوو هەرکام لەسەرکردەکانی موسوڵمانان ویلایەتەکەی بەسوپاکەی خۆی دەپاراست.

هێرقل لەحمس نزیك کەوتەوە و ئوردووی لێدا و کەسانی بۆ حمس نارد. موسوڵمانان بڕیاریاندا خەندەك لێبدەن و نامە بۆ عومەر کوڕی خەتاب بنووسن جگە لەخالید کەپێداگری لەسەر جەنگ دەکرد.

لەدەوروبەری حمس خەندەکیان لێدا و نامەیان بۆ عومەر نووسی و داوای هێزی هاوکارییان کرد. ڕۆمییەکان و هێزە پشتیوانەکانیان هاتن و لەبەرابەر حمس دابەزین و گەمارۆیان خستە سەر موسوڵمانان. لەجەزیرەوە سی هەزار کەس بۆ هاوکاری ڕۆمییەکان هاتبوو جگە لەهاوکارییەکانی قنسرین و تەنوخ و شوێنەکانی دیکە.

بارودۆخی موسوڵمانان دژوار بوو. نامەکە کاتێك بەدەستی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت کەخۆی بۆ حەج ئامادە دەکرد. نامەی بۆ سەعد نووسی کەگەمارۆیان خستۆتە سەر باوکی عوبەیدە، موسوڵمانان بۆ جەزیرە ڕەوانە بکە تا ڕێگر بن لەهاوکاری کردنی خەڵکانی جەزیرە بۆ ڕۆمییەکان.

دەڵێت: قەعقاع کوڕی عەمرۆ بۆ هاوکاری باوکی عوبەیدە بەرێکەوت و سوارەکانی ڕەقە و حەران و نەسیبینیش بەهەمان شێوە. کاتێك گەیشتنە جەزیرە ئەو دەستە لەخەڵکانی جەزیرە کە لەگەڵ ڕۆمییەکان لەحسم بوون ئاگادار بوونەوە و گەڕانەوە بۆ سەرزەمینی خۆیان و خێراتر لە موسوڵمانان گەیشتن. سەنگەریان گرت و موسوڵمانان لەبەرابەر ئەوان جێگیر بوون.

دەڵێت: قەعقاع لەحمس نزیك کەوتەوە، خەڵکانی تەنوخ کەسیان بۆ لای خالید نارد و ئاگاداریان کردەوە.

خالید پەیامیدا: ئەگەر فەرمانبەری کەسێکی دیکە نەدەبووم لەزۆری و کەمی ئێوە و ئەوەی بمێننەوە یا بڕۆن، نەدەترسام، ئەگەر ڕاست دەکەن ئێوەیش هاوشێوەی خەڵکانی جەزیرە بڕۆن.

ئەوان لەگەڵ تەنوخییەکانی دیکە قسەیان کرد و ڕازی بوون. پەیامیان بۆ خالید

نارد، بۆچوونەکەی تۆ پەسەندە، ئەگەر دەخوازی دەڕۆین و ئەگەر دەخۆازی بۆ لای ئێمە وەرە و پاشەکشێ بەرۆمییەکان دەکەین.

خالید وتی: بمێننەوە و کاتێك هێرشمان کرد، پاشەکشێ بەرۆمییەکان بکەن.

موسولمانان بەباوکی عوبەیدەیان وت: خەڵکانی جەزیرە بڵاو بوونەتەوە و خەڵکانی قنسرین پەشیمانن و لەگەڵ موسولمانان هەلاتوون چوونکە ئەوانیش عەرەبن، با هێرش بکەینە سەر دوژمن.

خالید بێدەنگ بوو.

باوکی عوبەیدە وتی: ئەی خالید بۆ بێدەنگیت؟

وتی: بۆچوونی من دەزانی و گرنگیت پێنەدا.

وتی: هەنووکە قسە بکە و بۆچوونەکەی تۆ بەکار دەبەم.

وتی: فەرمانی جەنگ بە موسولمانان بدە چوونکە خواوەند ژمارەی ناباوەڕانی کەم کردەوە، ئەوان بۆ هاوکاری ئێوە دەجەنگن بەلام ئێمە لەو کاتەوەی باوەڕمان هێناوە، بەهاوکاری سەرکەوتن دەجەنگین، لەزۆری ئەوان مەترسە.

عەلقەمە کوڕی نەزر دەڵێت: باوکی عوبەیدە موسولمانانی کۆکردەوە، سوپاسی خوای کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، ئەمە ئەو رۆژەیە، رۆژەکانی بەدواوە دێت و هەرکەس لەئێوە بمێنێتەوە، پێگە وڕێزی تایبەتی پێدەبڕێت و هەرکەس بکوژرێت، شەهیدە، پشت بەخوا ببەستن و ئەگەر کەسێك کەمتر لەکوفر گوناحێکی ئەنجام داوە، نەبێتە هۆی بێزاری ئەو لەمەرگ، تۆبە بکەن و ڕێگەی شەهید بوون بگرنەبەر، شایەتی دەدەم و ئێستا کاتی درۆ کردن نییە، چوونکە لە پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: هەرکەس بمرێت و باوەڕی بەتاقانەیی خواوەند هەبێت، دەڕواتە بەهەشت.

دەڵێت: وەك بڵێی کەسان لەزیندان رزگاریان بووە، باوکی عوبەیدە ئەوانی بۆ گۆڕەپانی جەنگ برد. باڵی راست بەخالید و باڵی چەپ بەعەباس بوو. باوکی عوبەیدە لەدڵی سوپاکە مایەوە. مەعاز کوڕی جەبەلی لەدەروازەی شارەکەدا دانابوو. ئازایانە جەنگان.

لەم کاتەدا قەعقاع بەخێرایی لەگەڵ سەد کەس گەیشت، خەڵکانی قنسرین و

رۆمییەکان هەلاتن و دلی سوپاکە و بالی راستی موسولمانان تێکەل بەسوپای رۆمییەکان بوو. یەکێك لەبالەکانی سوپاکەیان تێکشابوو. هێزی پشتیوان بەردەوام دەگەیشت و کەس نەمایەوە. بالی چەپی دوژمن لەناوچوو. دوایین کەسی ئەوان لەمەرج ئەلدیباج کوژرا. سیلاحەکانیان شکاند و بارەکانیان فرێدا بۆ ئەوەی سووك بن کەکوژران و گیانیان سپارد.

دەلێت: کاتێك موسولمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، باوکی عوبەیدە موسولمانانی کۆکردەوە و وتی: لەدوژمن بێ ئاگامەبن و لەپێگە بەرزەکان خۆتان دوور مەخەنەوە، چوونکە ئەگەر دەمزانی کەسێك لەئێمە دەمێنێتەوە، ئەو حەدیسەم نەدەهێنایە سەرزمان.

دوایین دەستەی سوپای کوفە لەرۆژی سێیەم پەیوەستی سوپاکەی باوکی عوبەیدە بوو.

شەعبی دەلێت: باوکی عوبەیدە داوای هاوکاری لەعومەر کوڕی خەتاب کرد چوونکە رۆمییەکان بۆ رووبەروو بوونەوەی هاتبوون. عەرەبە مەسیحییەکانیش هاورێیەتی ئەوانیان دەکرد. عومەر کوڕی خەتاب بەرێکەوت و نامەی بۆ خەلکان نووسی: چوار هەزار کەس لەوان بەرێکەوت، هەموویان سواری ئێستر بوون و ئەسپەکانیان بەدوای خۆیاندا رادەکێشا. رۆژی سێیەم دوای جەنگەکە پەیوەستی سوپاکەی باوکی عوبەیدە بوون. باوکی عوبەیدە سەبارەت بەوان نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی کە لەجابیە دابەزیبوو. وەلامی دایەوە: لەتالانییەکان شەریکن، ئەوان بۆ هاوکاری ئێوە هاتن و دوژمن بلاوەی لێکرد.

ماهان دەلێت: سەروەری باوەڕداران چوار هەزار ئەسپیان بۆ پێشهاتە لەناکاوەکان راگرتبوو و کاتی زستان ئەوانی لەبەرابەر کۆشکی کوفە و لای چەپ رادەگرت. بۆیە تا ئێستا ئەو شوێنە بەتەویلە ناو دەبەن. لەکاتی بەهار ئەوانی لەنێوان فورات و مالەکانی کوفە لەنزیك دێری عاقول رادەگرت و عەجەمەکان بەئاخوڕی شاهجان ناوی دەبەن یانی لەوەڕگای ئەمیرەکان. لێپرسراوی ئەسپەکان سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی و چەند کەسێك لەخەلکانی کوفە بوون کەخزمەتی ئەسپەکانیان دەکرد. بەم ژمارەیە ئەسپیان لەبەسرەیش راگرتبوو کەجەزۆ کوڕی معاویە لێپرسراوی خزمەت کردنیان بوو. لەهەر هەشت شارەکە بەمشێوە بوو و

ئەگەر پێشهاتێك رووی دەدا، دەستەیەك سوار ئەسپەكان دەبوون و لەپێشەوە دەڕۆشتن تا خەڵكانی دیكە خۆیان ئامادە دەكرد.

## لەم ساڵەدا جەزیرە دەستی بەسەردا گیرا

ئەمە بەپێی گێڕانەوەی سەیفە، بەڵام كوڕی ئیسحاق دەڵێت: جەزیرە لەساڵی نۆزدەیەم دەستی بەسەردا گیرا. گێڕانەوەی گرتنی جەزیرە بەم شێوەیە: سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ سەعد كوڕی مالك نووسی: ئێستا كەخواوەند شام و عێراقی بۆ موسوڵمانان ئاوەلا كرد، سوپایەك بۆ جەزیرە ڕەوانە بكە و یەكێك لەم سێ كەسە، خالید كوڕی عەرەفتە یا هاشم كوڕی عوتەبە و یا عەیاز كوڕی غەنەم بكەرە سەركردەیان.

كاتێك نامەكەی عومەر كوڕی خەتاب بەدەستی سەعد گەیشت، وتی: سەروەری باوەڕداران بۆیە ناوی عەیاز كوڕی غەنەمی لەكۆتاییدا هێناوە، چوونكە دەخوازێت ئەو بكەمە سەركردە، ئەوی كردە سەركردەی خەڵكان.

ئەوی لەگەڵ سوپایەك ڕەوانە كرد، باوكی موسای ئەشعەری لەگەڵ ئەودا نارد لەگەڵ كوڕەكەی عومەر كە نۆساڵ و هیچ كارێكی لەئەستۆدا نەبوو. عوسمان كوڕی ئەبی عاسی سەقەفی نارد و ئەمە لەساڵی نۆزدەیەم روویدا.

دەڵێت: عەیاز بەرەو جەزیرە بەرێكەوت و لەگەڵ سوپاكەی لەبەرابەر رەها ئوردووی لێدا. خەڵكانی ئەو ناوچەیە پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ بەست و بەدانی جەزیە رازی بوون. حەڕانیش دوای ڕەها پەیمانی ئاشتی بەست و خەڵكەكەی بەدانی جەزیە بەڵێندار بوون. باوكی موسای ئەشعەری بۆ نەسیبین نارد، عومەر كوڕی سەعدی لەگەڵ دەستەیەك بۆ راس ئەلعەین نارد تا ئاگای لەدواوەی موسوڵمانان بێت و خۆی لەگەڵ سوپاكەی رووی كردە دارا و دەستی بەسەردا گرت.

باوكی موسا لەساڵی نۆزدەیەم دەستی بەسەر نەسیبیندا گرت.

دەڵێت: سەعد عوسمان كوڕی ئەبی عاسی بۆ غەزای چوارەمی ئەرمەنییە ڕەوانە كرد و لەوێ جەنگا و لەكاتی جەنگەكە سەفوان كوڕی موعەتەلی سولەمی كوژرا. خەڵكانی ئەو ناوچەیە لەگەڵ عوسمان كوڕی ئەبی عاس پەیمانی ئاشتییان بەست و

بەدانی جەزیە رازی بوون، هەر ماڵێك یەك دینار. دوای ئەوە قیسارییەی فەلەستین دەستی بەسەردا گیرا و هێرقل هەڵات.

بەڵام گێڕانەوەی سەیف بەمشێوەیە، دەڵێت: عەیاز کوڕی غەنەم، بەدوای قەعقاع کوڕی عەمرۆ بەرێکەوت و ئەمە لەکاتێکدا بوو سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ سەعد نووسیبوو قەعقاع لەگەڵ چوار هەزار لەسوپاکەی بۆ هاوکاری باوکی عوبەیدە ڕەوانە بکات کە لەحمس و لەلایەن رۆمییەکانەوە گەمارۆی خرابوویە سەر. سەرکردەکانی دیکە بەرێکەوتن و لەکەنارەکان و رێگەکانی دوور لەکەنارەکان رێگەی جەزیرەیان گرتەبەر. سوهەیل کوڕی عودەی لەگەڵ سوپاکەی لەرێگەی کەنارەکانەوە تا ڕەقە پێشڕەوی کرد. خەڵکانی جەزیرە کاتێك لەبەرێکەوتنی سوپاکەی کوفە ئاگادار بوونەوە، بۆ ویلایەتەکەی خۆیان گەڕانەوە. سوهەیل لەبەرابەر ئەوان ئوردووی لێدا و گەمارۆی خستنەسەر تا ئەوەی بەپەیمانی ئاشتی رازی بوون چوونکە بەیەکیان وتبوو: ئێوە کە لەنێوان خەڵکانی عێراق و شامن لەبەرچی لەگەڵ ئەوان و ئەمان بۆ جەنگ، ماونەتەوە؟.

کەسیان بۆ لای عەیاز نارد کەئوردووگاکەی لەناوچەی ناوەڕاستی جەزیرە بوو. موسوڵمانان بۆچوونیان وابوو بەداوای ئاشتی ئەوان رازی ببێت. پەیمانی لەگەڵ بەستن.

عودەی کوڕی سوهەیل بەفەرمانی عەیاز کەسەرکردەی جەنگ بوو، پەیمانی بەست و ئەوەی بەجەنگ دەستی بەسەردا گیرابوو تایبەت بە موسوڵمانان و خەڵکەکەی بەدانی جەزیە رازی بوون.

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی عوتەبانیش ڕۆشت و گەیشتە موسڵ و لەرێگەی بەڵدەوە رێگەی نەسیبینی گرتەبەر. خەڵکەکەی داوای ئاشتییان کرد چوونکە هاوشێوەی خەڵکانی ڕەقە ترسابوون و هاوشێوەی ئەوان پەیمانی ئاشتییان مۆر کرد.

دەڵێت: وەلید کوڕی عوقبەیش بەرێکەوت تا گەیشتە شوێنی مناڵەکانی تەغلەب و عەرەبەکانی جەزیرە و هەمووان بە موسوڵمان و کافرەوە هاورێیەتیان کرد جگە لە مناڵەکانی ئەیاد کوڕی نزار کەکۆچیان کرد و روویان کردە سەرزەمینی رۆم. وەلید ئەم رووداوەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و کاتێك خەڵکانی ڕەقە و نەسیبین ملکەچی خۆیان نیشاندا، عەیاز و سوهەیل و عەبدوللەی پەیوەستی ئەو کرد و

لەگەڵ سوپاکەی ڕێگەی حەڕانی گرتەبەر و تا حەڕان دەستی بەسەر هەموو ناوچەکانداگرت. کاتێك گەیشتە حەڕان، خەڵکەکەی بەدانی جەزیە ڕازی بوون و ئەم، ڕازی بوو.

دەڵێت: دوای ئەوە عەیاز، سوهەیل و عەبدوڵڵەی بۆ ڕەها نارد کەخەڵکەکەی بەدانی جەزیە ڕازی بوون. بەمشێوەیە جەزیرە لەهەموو ویلایەتەکان ئاسانتر دەستی بەسەردا گیرا و ئەمە بۆ ئەو موسوڵمانانەی لەو ناوچانە نیشتەجێ بوون، وەك سووکایەتی بوو.

دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب گەیشتە جابیە و سوپاکەی حمس کۆتایی بەجەنگەکە هێنا، حەبیب کوڕی موسلیمەی بۆ هاوکاری عەیاز ڕەوانە کرد. کاتێك عومەر کوڕی خەتاب جابیەی بەجێهێشت، باوکی عوبەیدە نامەی بۆ نووسی و داوای کرد عەیاز کوڕی غەنەم پەیوەستی ئەو بکات چوونکە خالیدی بۆ مەدینە بردبوو. عومەر کوڕی خەتاب، عەیازی بۆ لای ئەو نارد و سوهەیل کوڕی عودەی و عەبدوڵڵە کوڕی عەبدوڵڵەی بۆ کوفە نارد تا بەرەو ڕۆژهەڵات بڕۆن و حەبیب کوڕی موسلیمەی وەك کارگوزاری عەجەمەکانی جەزیرە و کاروباری جەنگی ئەو ناوچەیە هەڵبژارد و وەلید کوڕی عوقبەی کردە کارگوزاری عەرەبەکانی جەزیرە و سەرقاڵی کارەکانی خۆیان بوون.

دەڵێت: کاتێك نامەکەی وەلید بە سەروەری باوەڕداران گەیشت، نامەی بۆ پاشای ڕۆم نووسی: بیستوومە یەکێك لەهۆزەکانی عەرەب سەرزەمینی ئێمەی بەجێهێشتووە و ڕووی کردۆتە دیاری تۆ، یا ئەوان دەردەکەیت، یا هەموو مەسیحییەکان سەرزەمینەکەمان بۆ دیاری تۆ ڕەوانە دەکەین. پاشای ڕۆم ئەوانی دەرکرد، چوار هەزار کەس لەوان لەگەڵ باوکی عودەی کوڕی زیاد گەڕانەوە و ئەوانیتر لەناو ویلایەتەکانی ڕۆم، نزیك شام و جەزیرە بڵاوەیان لێکرد و هەموو ئەیادییەکانی دیاری تەغلەب ڕەچەڵەکیان بۆ ئەم چوار هەزار کەسە دەگەڕێتەوە.

دەڵێت: وەلید کوڕی عوقبە دەیویست منداڵەکانی تەغلەب باوەڕ بەئیسلام بێنن، بەڵام وتیان کەسانێك بەنوێنەرایەتی خەڵکەکەیان پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ سەعد مۆر کردووە، ئێوە دەزانن و ئەوان، بەڵام ئەوانەی پەیمانیان نەبەستووە، دژی ئەوان

هیچ پاساوێکت بەدەستەوە نییە.

وەلید سەبارەت بەوان نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی. وەڵامی بۆ هاتەوە: ئەمە تایبەتە بەدوورگەی عەرەب کەهەموو دانیشتووانەکەی دەبێت باوەڕ بەئیسلام بێنن، ئازادیان بکە بەو مەرجەی ئەو مناڵانەی دێنە دنیا، نەکەنە مەسیحی و هەرکەس ویستی باوەڕ بەئیسلام بێنێت، ڕێگەی لێنەگرن. وەلید رازی بوو بەوەی منالەکان نەکەنە شوێنکەوتەی ئاینی مەسیحی و ئەوکەسەی دەخوازێت باوەڕ بەئیسلام بێنێت، گرفتاری کێشە نەبێت. دەستەیەکیان رازی و تەسلیم بوون. دەستەیەکی دیکەیان وتیان: جەزیە دەدەین. بەوشێوەی لەگەڵ عیبادییەکان و تەنوخییەکان مامڵەی کردبوو، لەگەڵ ئەوان هەڵس و کەوتی کرد.

باوکی سەیفی تەغلەبی دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ نێردراوەکانی تەغلەب پەیمانی بەستبوو هیچ منالێك نەکەنە مەسیحی و ئەم مەرجە لەسەر نێردراوان فەرز دەکرا. لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب تەغلەبییەکان وتیان: جەزیەتان نەوێت تا کۆچ بکەن و بڕۆن، زەکاتی ئەوان دوو بەرابەر بکەن و وەك جەزیە لەقەڵەمی بدەن چوونکە بەباس کردنی جەزیە تووڕە دەبن، مەرجیان لەگەڵ ببەستن بۆ ئەوەی هیچ یەك لەمنالەکان نەکەنە شوێنکەوتەی ئاینی مەسیحی.

دەڵێت: نێردراوانی خەڵکەکە ڕۆشتنە لای عومەر کوڕی خەتاب، وەلیدیش سەرکردەکان و باوەڕدارە مەسیحییەکانی نارد. عومەر کوڕی خەتاب پێی وتن: جەزیە بدەن.

وتیان: ئێمە بۆ دیاری خۆمان بگەڕێنەرەوە، چوونکە ئەگەر جەزیە لەسەر ئێمە دابنێیت، ڕوودەکەینە دیاری ڕۆم، سوێند بەخوا ئێمە لەناو عەرەبەکان ڕیسوا دەکەیت.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: خۆتان خۆتانتان ڕیسوا کردووە و لەگەڵ ئەو دەستە لەعەرەبەکان کەلەدەوری ئێمەن و دژایەتیمان دەکەن، هاوتان، سوێند بەخوا دەبێت بەریسوایی جەزیە بدەن، ئەگەر ڕووبکەنە دیاری ڕۆم، نامە بۆ پاشاکەیان دەنووسم ئەو کاتە دەبنە ئەسیری من.

وتیان: شتێك لەئێمە وەربگرە بێ ئەوەی ناوی جەزیەی لێ بنێیت.

وتی: ئێمە بەجەزیە ناوی دەبەین و خۆتان بەچی ناوی دەبەن، کەیفی خۆتانە.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، مەگەر سەعد زەکاتی دوو بەرابەر لەوان وەرنەگرتووە؟

وتی: بۆ نا، بۆچوونەکەی عەلی پەسەند کرد و لەجیاتی جەزیە زەکاتی لێوەرگرتن و نێردراوان گەڕانەوە.

خەڵکانی تەغلەب گەردنکێش و یاخی و بەردەوام لەگەڵ وەلید دەجەنگان. وەلید مەبەستی لەناو بردنی ئەوانی کرد. عومەر کوڕی خەتاب ئاگادار بوویەوە و ترسا کێشە و ئاژاوە بۆ وەلید دروست بکەن و وەلید نەتوانێت خۆڕاگری بکات و هێرش بکاتە سەریان. ئەوی لابرد و فورات کوڕی حەیان و هیند کوڕی عەمرۆ جومەلی لەجێگەی وەلید دانا.

دەڵێت: وەلید ڕۆشت و سەد وشتری خۆی بەحورەیس کوڕی نەعمانی کەنانی تەغلەبی سپارد بەڵام دوای ڕۆشتنی وەلید، خیانەتی لێکرد.

دەڵێت: گرتنی جەزیرە لەزیحەججەی ساڵی حەفەدەیەم ڕوویدا.

لەم ساڵەدا یانی ساڵی حەفدەیەم، عومەر کوڕی خەتاب بەمەبەستی شام مەدینەی بەجێهێشت و بەوتەی کوڕی ئیسحاق و واقدی تا سورغ ڕۆشت.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب لەساڵی حەفدەیەم مەبەستی ڕۆشتن بۆ جەنگی شامی کرد و کاتێك گەیشتە سورغ، سەرانی سوپاکە لەدەوری کۆبوونەوە و وتیان: ویلایەتەکە تاعوونی تیا بڵاو بۆتەوە. ئەو لەگەڵ موسوڵمانان بۆ مەدینە گەڕایەوە.

عەبدوللە کوڕی عەباس دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب مەدینەی بەجێهێشت، موهاجیر و ئەنسارەکان هاوڕێیەتیان دەکرد. هەموو کەسان هاتبوون و کاتێك گەیشتە سورغ، سەرکردەی سوپاکان، باوکی عوبەیدەی جەراح و یەزید کوڕی ئەبی سوفیان و شورەحبیل کوڕی حەسەنە ڕۆشتنە لای و وتیان: ویلایەتەکە تاعوونی تیا بڵاو بۆتەوە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: یەکەم موهاجیرەکان لای من کۆبکەرەوە.

دەڵێت: کاتێك ئەوانم کۆکردەوە، ڕاوێژی لەگەڵ کردن بەڵام بۆچوونەکانیان جیاواز بوو: دەستەیەکیان وتیان: بەمەبەستی بەدەستی هێنانی پاداشتی خوایی بۆ

ئەم سەفەرە هاتوویت، ڕەوا نییە بەهۆی ئەو زیانەی بڵاو بۆتەوە، لەسەفەرەکەت پاشگەز ببیتەوە.

دەستەیەکی دیکە وتیان: بەڵایە و لەناوچوون و نابێت بڕۆیت.

کاتێك ئەوان دژایەتی یەکیان کرد، وتی: بڕۆن. وتی: ئەو ئەنسارییانەی لەگەڵ من بۆ ئەم سەرزەمینە هاتوون، کۆبکەرەوە.

دەڵێت: کاتێك ئەوانم کۆکردەوە، راوێژی لەگەڵ کردن و ئەوانیش هاوشێوەی موهاجیرەکان بوون. وەك بڵێی وتەکانی یەکیان بیستبوو و هاوشێوەی ئەوان قسەیان کرد، بەوانیشی وت بڕۆن.

دواتر وتی: ئەو قوڕەیشیانەی دوای گرتنی مەککە کۆچیان کردووە، کۆبکەرەوە.

کاتێك ئەوانم کۆکردەوە، راوێژی لەگەڵ کردن. ئەوان بۆچوونیان وەك یەك بوو، وتیان: لەگەڵ موسوڵمانان بگەڕێرەوە، چوونکە ئەمە بەڵایە و لەناوچوون.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب پێی وتم: کوڕی عەباس! لەناو خەڵکان جاڕ بدە و بڵێ: سەروەری باوەڕداران دەڵێت: من بەرەبەیان سوار دەبم و دەڕۆم، ئێوەیش سوار بن.

دەڵێت: بەرەبەیانان عومەر کوڕی خەتاب سوار بوو و خەڵکانیش سەرکەوتن و کاتێك لەدەوری ئەو کۆبوونەوە، وتی: ئەی خەڵکینە، من دەگەڕێمەوە، ئێوەیش بگەڕێنەوە.

باوکی عوبەیدەی جەڕاح وتی: لەقەدەری خوایی رادەکەن؟

وتی: بەڵێ، لەقەدەری خوا بۆ قەدەری خوا ڕادەکەم. ئەگەر کەسێك بڕواتە دۆڵێك کەدوو رێگەی هەیە و یەکیان سەرسەوزو ئەوی دیکەیان وشك، ئەو کەسەی لەرێگە وشکەکە ئاژەڵەکانی دەلەوەڕێنێت، بەقەدەری خوایی ئەو کارە دەکات و ئەو کەسەیشی لەرێگە سەرسەوزەکە دەیانلەوەڕێنێت، بەقەدەری خوایی ئەو کارە دەکات.

وتی: ئەی باوکی عوبەیدە، باشتر بوو کەسێك جگە لەتۆ ئەم قسەی دەهێنایە سەرزمان. ئەوی لەناو خەڵکان بردە دەر تا بەشێوەیەکی نهێنی قسەی لەگەڵ بکات.

دەڵێت: لەم کاتەدا عەبدولرەحمان کوڕی عەوف هات. ئەو دواکەوتبوو و لەناو کۆڕی شەوانەی سەروەری باوەڕداران و کەسانی دیکە ئامادە نەبوو، وتی: دەنگ و

باس چییە؟

کاتێك ئاگاداریان کردەوە، وتی: لەمبارەوە حەدیسێکی پێغەمبەرم لایە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: تۆ کەسێکی ئەمین و راستگۆیت، حەدیسەکە چییە؟

وتی: بیسم پێغەمبەر(د.خ) دەیفەرموو، کاتێك بیستان لەسەرزەمینێك تاعوون بڵاو بۆتەوە، روو مەکەنە ئەو سەرزەمینە و ئەگەر تاعوون هات و لەو سەرزەمینە بوون، تەنیا بۆ رزگار بوون لەتاعوون ئەو سەرزەمینە بەجێمەهێڵن، یانی تەنیا بەمەبەستی هەڵاتن ئەو سەرزەمینە بەجێمەهێڵن.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: سوپاس بۆ خوا، بەرێکەون. خۆی بەرێکەوت.

سالم کوڕی عەبدوللە دەڵێت: عومەر بەهۆی حەدیسەکەی عەبدولرەحمان کوڕی عەوف لەگەڵ خەڵکان گەڕایەوە و لەکاتی گەڕانەوەی عومەر، سەرکردەکانی سوپا، بۆ شوێنی کارەکانی خۆیان گەڕانەوە.

بەڵام گێڕانەوەی سەیف بەمشێوەیە، دەڵێت: لەشام و میسر و عێراق تاعوون بڵاو بوویەوە و لەشامدا مایەوە. لەموحەڕەم و سەفەر لەهەموو شارەکان خەڵکان مردن و تاعوون نەما جگە لەشام.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بەرێکەوت و کاتێك لەشام نزیك کەوتەوە، بیستی تاعوون پەرەی سەندووە.

ئەسحابەکان وتیان: پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی، کاتێك لەدیارێك تاعوون بڵاوبۆتەوە، روو مەکەنە ئەو سەرزەمینە و کاتێك لەسەرزەمینێك تاعوون بڵاو بۆتەوە، ئەگەر لەناو ئەو سەرزەمینەدان، بەجێیبێڵن.

عومەر کوڕی خەتاب گەڕایەوە و کاتێك تاعوون کۆتایی پێهات، نامەیان بۆ نووسی و لەوەی بەجێمابوو، ئاگاداریان کردەوە. ئەو، لەجومادی الاخری ساڵی حەفدەیەم خەڵکانی کۆکردەوە و سەبارەت بەکاروباری ویلایەتەکان راوێژی لەگەڵ کردن و وتی: بڕیارمداوە بەناو ویلایەتەکاندا بگەڕێم و لێکۆڵینەوە لەکاروباری موسوڵمانان بکەم، بۆچوونی ئێوە چییە؟

دەڵێت: کەعب الاخبار لەناو خەڵکان ئامادە و ئەو لەهەمان ساڵدا باوەڕی بەئیسلام هێنابوو، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دەتەوێت لەکام ویلایەتەوە

دەست پێبکەیت؟

وتی: لەعێراق.

وتی: ئەو کارە مەکە چوونکە شەڕ دە بەشە و خێر دەبەش. بەشێکی خێر لەرۆژهەڵاتە و نۆ بەشی لەرۆژئاوا و یەك بەشی شەڕ لەرۆئاوایە و نۆ بەشی لەرۆژهەڵات، شاخی شەیتان لەوێیە لەگەڵ هەر جۆرە نەخۆشییەکی سەخت.

ئەسبەح دەڵێت: عەلی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، کوفە کۆچی دوای کۆچە و بەرزترین پێگەی ئیسلام، رۆژێك دێت هەموو باوەڕداران روودەکەنە ئەو شارە یا تامەزرۆی ڕۆشتن بۆ ئەو شارە دەبن،، سوێند بەخوا بەهۆی خەڵکانەوە ئەو سەرکەوتنە روودەدات بەهەمان شێوە کە بەهۆی بەردەوە بۆ خەڵکانی لووت سەرکەوتن بەدەست هات.

قاسم کوڕی ئەبی ئیمامە دەڵێت: عوسمان وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، رۆژئاوا سەرزەمینی شەڕە، شەڕیان بۆ دەبەش دابەش کردووە، بەشێکی لەناو هەموو خەڵکاندایە و نۆبەشەکەی لەناو ئەوان.

باوکی ماجید دەڵێت: سەروەری باوەڕداران وتی: کوفە ڕمی خواوەندە و گەورەترین پێگەی ئیسلام و بڕبڕەی پشتی عەرەب کەسنورەکانی عەرەب دەپارێزن و هاوکاری بۆ شارەکان دەنێرن، بەڵام میراتەکانی خەڵکانی عەمواس بەرەو فێرۆیی دەڕوات، لەوێوە دەست پێدەکەم.

رەبیع کوڕی نەعمان دەڵێت: سەروەری باوەڕداران وتی: میراتی خەڵکانی شام بەرەو فیرۆیی دەڕوات، لەوێوە دەستپێدەکەم و میراتەکان دابەش و ئەوەی مەبەستمە، بەئەنجامی دەگەیێنم، دواتر دەگەڕێمەوە و بەناو ویلایەتەکاندا دەسوورێمەوە و لەفەرمانەکانی خۆم ئاگاداریان دەکەمەوە.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب چوارجار رووی کردە شام، دووجار لەساڵی شانزەیەم و دوو جار لەساڵی حەفدەیەم. لەسەفەری یەکەمی ساڵی حەفدەیەم ڕۆشتە ناو شام.

محەممەد کوڕی موسلیم دەڵێت: پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: ڕژدییان بۆ دەبەش دابەش کردووە، نۆی لەناو ڕەشەکاندایە و یەك بەشی لەناو خەڵکانی دیکە، شەرمیان بۆ دەبەش دابەش کردووە، نۆی لەناو ژناندایە و یەك بەشی لەناو کەسانی

دیکە، بەخیلییان بۆ دەبەش دابەش کردووە، نۆی لەناو عەرەبەکاندایە و یەك بەشی لەناو خەڵکانی دیکە، لەخۆبایی بوونیان بۆ دەبەش دابەش کردووە، نۆی لەناو ڕۆمییەکاندایە و یەك بەشی لەناو کەسانی دیکە.

## جیاوازی سەبارەت بەتاعوونی عەمواس کە لەچ ساڵێکدا ڕوویدا

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەساڵی هەژدەیەم تاعوونی عەمواس ڕوویدا و خەڵکان لەناوچوون، باوکی عوبەیدەی جەڕاح سەرکردەی موسوڵمانان مرد، هەروەها مەعاز کوڕی جەبەل و یەزید کوڕی ئەبی سوفیان و حارس کوڕی هوشام و سوهەیل کوڕی عەمرۆ و عوتەبە کوڕی سوهەیل و سەرکردەکانی دیکەی خەڵك.

باوکی مەعشەریش دەڵێت: تاعوونی عەمواس لەساڵی هەژدەیەم ڕوویدا.

تارق کوڕی شەهابی بیجلی دەڵێت: ڕۆشتمە لای باوکی موسا بۆ ئەوەی قسە بکەم، لەماڵەکەی خۆی لەکوفە دانیشتبوو، کاتێك دانیشتم، وتی: دەتوانن زوتر بڕۆن چوونکە کەسێك لەم ماڵە گیرۆدەی ئەو نەخۆشییە بووە، دەتوانن خۆتان لەم گوندە بەدوور بگرن وروو بکەنە ویلایەتەکانی دیکە تا ئەم تاعوونە نامێنێت، ئێستا پێتان دەڵێم کام یەك لەبەشەکانی خۆپاراستن لەوەبا، ناپەسەندە: ئەوەی کەسێك بڕوات و گومان بکات، ئەگەر دەمایەوە، دەمرد، یا ئەوەی بمێنێتەوە و نەڕوات و گومان بکات، ئەگەر دەڕۆشت، گرفتاری تاعوون نەدەبوو. ئەگەر پیاوی موسوڵمان بەمشێوەیە بیر نەکاتەوە، دەتوانێت شوێنەکە بەجێبێڵێت و خۆی لەتاعوون دوور بخاتەوە. لەساڵی تاعوونی عەمواس لەگەڵ باوکی عوبەیدەی جەراح بووم و کاتێك نەخۆشییەکەی پەرەی سەند و سەروەری باوەڕداران ئاگادار بوویەوە، نامەی بۆ باوکی عوبەیدەی جەراح نووسی شام بەجێبێڵێت، نووسیبووی: سڵاو لەتۆ، نیازم بەتۆیە و دەمەوێت ڕووبەڕوو پێتی بڵێم، فەرمانت پێدەدەم هەر کات نامەکەت خوێندەوە، دەستبەجێ بۆ لای من بەڕێکەویت.

دەڵێت: باوکی عوبەیدە زانی سەروەری باوەڕداران دەیەوێت ئەو لەتاعوونەکە دوور بخاتەوە، وتی: خواوەند سەروەری باوەڕداران ببەخشێت.

وەڵامی دایەوە: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەستم بەنیازەکەی تۆ کرد، من

لەگەڵ سوپای موسوڵمانانم و خۆم لەوان دوور ناخەمەوە و نامەوێت لێیان دوور بم تا خواوەند فەرمان و قەدەری خۆی سەبارەت بەمن و ئەوان ڕەوانە دەکات. ئەی سەروەری باوەڕداران، من لەفەرمانەکەی خۆت ببەخشە چوونکە دەخوازم لێرە بمێنمەوە.

دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب نامەکەی ئەوی خوێندەوە، گریا. وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، مەگەر باوکی عوبەیدە مردووە؟

وتی: نە، بەلاّم پێم وابێت خۆی وا دەڵێت.

دواتر بۆ باوکی عوبەیدەی نووسی: سلاّو لەتۆ، تۆ موسوڵمانانت لەشوێنێکی نزم نیشتەجێ کردووە، ئەوان بۆ سەرزەمینێکی بەرز ببە.

دەڵێت: کاتێك نامەی سەروەری باوەڕداران بەباوکی عوبەیدە گەیشت، منی بانگ کرد و وتی: ئەی باوکی موسا، فەرمانی سەروەری باوەڕداران بەمشێوەیە، بەدوای شوێنێکی بەرز بگەڕێ تا موسوڵمانان بەدوای تۆدا بنێرم.

دەڵێت: گەڕامەوە بۆ ماڵەکەی خۆم تا سەفەرەکەم دەستپێبکەم بەلاّم هاوسەرەکەم گرفتاری نەخۆشییەکە ببوو. گەڕامەوە بۆ لای باوکی عوبەیدە و وتم: سوێند بەخوا لەماڵەکەی من پێشهاتێك ڕوویداوە.

وتی: ئەگەری هەیە هاوسەرەکەت گرفتاری نەخۆشییەکە بوو بێت؟

وتم: بەڵێ.

وتی: فەرمانیدا وشترەکەی بۆ بێنن و کاتێك ویستی سوار بێت، تاعوونی گرت و وتی: سوێند بەخوا گرفتار بووم. دواتر لەگەڵ موسوڵمانان تا جابیە ڕۆشت و تاعوون لەناو خەڵکان نەما.

شەهر کوڕی حەوەشبی ئەشعەری دەڵێت: کاتێك نەخۆشییەکە پەرەی سەند، باوکی عوبەیدە قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، ئەم نەخۆشییە، بەخششی پەروەردگارە و ویست و خواستی پێغەمبەرەکەتان و هۆکاری مەرگی خواپەرەستانی پێشوو بووە، باوکی عوبەیدە داوا لەخوا دەکات، بەشی خۆی لەم نەخۆشییە پێ ببەخشێت. دوای ئەوە تاعوونی گرت و مرد. مەعاز کوڕی جەبەل جێگەی ئەوی گرتەوە.

دەڵێت: دوای مەرگی ئەو مەعاز کوڕی جەبەل قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە،

ئەم نەخۆشییە بەزەیی پەروەردگارە و خواست و ویستی پێغەمبەر(د.خ) و هۆکاری مەرگی خواپەرەستانی پێشوو، مەعاز داوا لەخوا دەکات، بەشی بنەماڵەکەی لەم نەخۆشییە بدات. کوڕەکەی عەبدولرەحمان، تاعوونی گرت و مرد، دوای ئەوە قسەی کرد و بۆ خۆی داوا کرد، تاعوون کەوتە بەری دەستی. بینیم سەیری دەکرد و دواتر پشت دەستی خۆی ماچ کرد و وتی: حەز ناکەم جگە لەتۆ هیچ شتێکم لەم دنیایە هەبێت.

دەڵێت: کاتێك مرد، عەمرۆ کوڕی عاس جێگەی گرتەوە، لەناو خەڵکان قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، ئەم نەخۆشییە کاتێك بێت وەك ئاگر بڵێسە دەسەنێت، پەنا بۆ کوێستانەکان ببە ن.

باوکی واسلەی دوئەلی وتی: ناڕاستت وت، سوێند بەخوا هاودەمی پێغەمبەر بووم و تۆ لەم کەرەی من خراپتریت.

وتی: سوێند بەخوا وەڵامت نادەمەوە و لێرە نامێنینەوە. دواتر بەرێکەوت و خەڵکان شوێنیکەوتن و بڵاوەیان لێکرد. خواوەند تاعوونی لەسەر ئەوان هەڵگرت.

دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب لەکارەکەی عەمرۆ کوڕی عاس ئاگادار بوویەوە، سوێند بەخوا بەناپەسەندی نەزانی.

عەبدوللە کوڕی زەیدی جورەمی، باوکی قەلابە، دەڵێت: ئەم وتەیە لەوتاری باوکی عوبەیدەی جەڕاح و مەعاز کوڕی جەبەل بەمن گەیشت کەئەم نەخۆشییە بەزەیی و بەخششی پەروەردگار و مەبەست و خواستی پێغەمبەر و هۆکاری مەرگی خواپەرەستانی پێشووە و دەموت: چۆن پێغەمبەر(د.خ) داوای ئەم نەخۆشییەی بۆ ئۆمەتەکەی خۆی کردووە تا ئەوەی یەکێك لەباوەڕداران کە لەپێغەمبەری بیستبوو، وتی: جبەرئیل هاتە لای و پرسی: لەناوچوونی ئۆمەتەکەی تۆ بە تانەیە یا تاعوون؟.

پێغەمبەر(د.خ) بەردەوام دەیفەرموو: خواوەندا بەتاعوون. زانیم باوکی عوبەیدە و مەعاز مەبەستیان لەو فەرموودەیە بووە.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك هەواڵی مردنی باوکی عوبەیدە و یەزید کوڕی ئەبی سوفیان بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت، معاویە کوڕی ئەبی سوفیان وەك سەرکردە و خەراجی دیمەشق دەستنیشان و شورەحبیل کوڕی حەسەنەی وەك

سەرکردە و لێپرسراوی خەراجی ئەردەن دانا.

بەگومانی سەیف، تاعوونی عەمواس لەساڵی حەفدەیەم روویدا.

باوکی عوسمان دەڵێت: ئەم تاعوونە، یانی تاعوونی عەمواس، بەرادەیەك کوشەندە بوو کەکەس هاوشێوەی نەبینیبوو و بەهۆیەوە دوژمن چاوی تەماحی بڕییە موسوڵمانان و موسوڵمانان ترسان چوونکە تاعوونەکە کەسانێکی زۆری کوشت و بۆ ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا. چەند مانگێکی خایاند و خەڵکان لەبەردەوام بوونی سەریان سوڕمابوو.

باوکی سەعید دەڵێت: لەبەسرە بەهۆی تاعوونەوە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان مردن، یەکێك لەمناڵەکانی غەنەم بەکۆیلە عەجەمەکەی خۆی وت تاقانە مناڵەکەی سوار کەرێك بکات و بەرەو سەفوات بڕوات تا خۆی پەیوەستیان دەبێت. کۆیلەکە لەکۆتاییەکانی شەو بەرێکەوت وپیاوەکە، ماوەیەك دوای ئەو، ملی رێگەی گرتەبەر. نزیك سەفوان لەمناڵ و کۆیلەکەی نزیك کەوتەوە. کۆیلەکە هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((خواوەند کەرێکیش پشتگوێ ناخات

تەنانەت مناڵێکی هەلآتووی کەم تەمەن

هەندێ کات مەرگ پێش کەسان رێگە دەبڕێت))..

پیاوەکە کەوتە گومان و کاتێك لێیان نزیك کەوتەوە، خۆیان بوون، بەکۆیلەکەی خۆی وت: هاوار لەتۆ، ئەوە چیت دەوت؟

کۆیلەکە وتی: نازانم.

وتی: بگەڕێرەوە.

ئەمەی وت و لەگەڵ مناڵەکەی خۆی گەڕایەوە و زانی کۆیلەکە ئایەت و نیشانەیەکی بینیوە و بیستووە.

دەڵێت: کەسێك دەیویست روو بکاتە سەرزەمینێك کەتاعوون لەو سەرزەمینە بلآو ببوویەوە، بەلآم دووای بەرێکەوتن گومانی لا دروست بوو و کۆیلە عەجەمییەکەی هۆنراوەیەکی بەم ناورەۆکە دەخوێندەوە:

((ئەی کەخەمباری، خەم مەخۆ

ئەگەر قەدەربێت تا بگریت

تا، دەگریت.))

لەم ساڵەدا یانی ساڵی حەفدەیەم، عومەر کوڕی خەتاب بۆ دوایین جار رووی کردە شام و بەوتەی سەیف، چیتر رووینەکردە ئەو سەرزەمینە.

پێشتر ئاماژەمان بەگێڕانەوەی کوڕی ئیسحاقدا.

## سەفەرەکەی سەروەری باوەڕداران

و ئەوەی بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان ئەنجامیدا

باوکی حارسە دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بەرێکەوت و عەلی کوڕی ئەبی تالبی کردە جێگری خۆی لەمەدینە. ئەسحابەکانی لەگەڵ خۆی برد و بەخێرایی بەرێکەوتن. لەرێگەی ئیلەوە گوزەری کرد و کاتێك لەوێ نزیك کەوتەوە، رێگەی ون کرد، کۆیلەکەی بەدوایەوە بوو. دابەزی و ژەهراوی دەردا، گەڕایەوە و سوار وشتری کۆیلەکەی بوو، وشترەکەی خۆی دا بەکۆیلەکەی. کاتێك پێشەنگەکان کۆیلەکەیان بینی، وتیان: سەروەری باوەڕداران لەکوێیە؟

وتی: لەبەردەم ئێوەدا.

لەم قسەی مەبەستی خۆی بوو بەڵام ئەوان ئەویان بەجێهێشت، ئەو ڕۆشت تا گەیشتە ئیلە و دابەزی و بەپێشوازیکەرانیان وت: سەروەری باوەڕداران ڕۆشتە ناو ئیلە و لەوێ دابەزی.

ئەوان گەڕانەوە بۆ لای.

هوشام کوڕی عوروە لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك سەروەری باوەڕداران لەگەڵ موهاجیرو ئەنسارەکان ڕۆشتە ئیلە، کراسەکەی خۆی کە لەرێگەدا دڕابوو، دای بەئەسقوف و وتی: ئەمە بشۆ و پینەی بکە.

دەڵێت: ئەسقۆف کراسەکەی برد و پینەی کرد و کراسێکی هاوشێوەی ئەوەی دووری و هێنای. سەروەری باوەڕداران وتی: ئەمە چییە؟

ئەسقوف وتی: ئەمە کراسەکەی تۆیە، شۆردم و پینەم کرد، بەڵام ئەمە کراسێکە پێشکەشی تۆی دەکەم.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران سەیری کرد و دەستی لێدا، بەڵام کراسەکەی خۆی

پۆشی و ئەوی گەڕاندەوە و وتی: ئەمە باشتر عەرەق لەخۆ دەگرێت.

رافیع کوڕی عومەر دەڵێت: لەجابیە بیستم عەباس بەعومەر کوڕی خەتابی وت: چوار کار هەیە هەرکەس ئەنجامی بدات، دادپەروەری ئەنجامداوە: ئەمانەت لەماڵ و یەکسانی لەدابەش کردن و ئەمەکدار بوون بەبەڵێنەکان و خۆ دوور خستنەوە لەعەیب و ئیراد، خۆت و کەسانت بەپاك و خاوێنی رابگرە.

باوکی حارسە دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب مانگانەکانی دابەش و گەرمەسێر وکوێستانی دیاری کرد. مەرز و سنوور و پادگانەکانی شام بەهێز و تۆکمە کرد و لەوێ ڕۆشت. لەهەموو ویلایەتێك ئەم کارانەی کرد. عەبدوللە کوڕی قەیسی وەك فەرمانڕەوای کەنارەکان دەستنیشان و شورەحبیلی لەسەر کار لابرد و معاویەی خستە جێگەی ئەو. باوکی عوبەیدەی کردە سەرکردە و خالیدی خستە ژێر دەست و فەرمانی ئەو. شورەحبیل پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەبەر نارازی بوون، منت لەسەر کار لابرد؟

وتی: نە، تۆ بەوشێوە بوویت کەدەخوازم، بەڵام پیاوێکی بەهێزترم دەویست.

وتی: فەرمانی تۆیە، بەڵام هۆکارەکەی بەخەڵکان بڵێ تا نەبێتە هۆی ناوزڕانی من.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران لەناو خەڵکان قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە سوێند بەخوا لەبەر نارازی بوونم لەشوەرحبیل ئەوم لەسەر کار لانەبرد، بەڵکو بەدوای پیاوێکی بەهێزتر دەگەڕام.

عەمرۆ کوڕی عەبەسەی کردە لێپرسراوی ئەنبارەکان و هەموو شتێکی دیاری و دواتر ماڵئاوایی لەخەڵکان کرد.

عودەی کوڕی سوهەیل دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب لەکارەکانی خۆی تەواو بوو، میراتەکانی دابەش و بەشی میراتەکانی بەرابەر بەیەك دیاری و تەسلیمی کەسانی زیندووی کرد.

شەعبی دەڵێت: حارس کوڕی هوشام لەگەڵ حەفتا کەس لەبنەماڵەکەی بەرەو شام ڕۆشتبوو. زیاتر لەچوار کەسیان لەو ناوچەیە نەگەڕایەوە و موهاجیر کوڕی خالید کوڕی وەلید، هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە هۆنییەوە:

((هەرکەس لەشام نیشتەجێ ببێت

لەوێ ئارام دەگرێت

شام ئەگەر ئێمە لەناو نەبات، خەمبار دەبێت

بیست سوار لەمناڵەکانی ڕیتەی لەناو برد

کەسمێڵیان کورت نەکردبوویەوە

لەکوڕە ئامۆزاکانیشیان

بەم ئەندازەیە خەڵکانی لەناو برد

و ئەمە هۆکاری سەرسوڕمانی خەڵکانە

مەرگیان بەهۆی تانە و تاعوونەوە بوو

و ئەمە قەدەر و چارەنووس بۆ ئێمەی دیاری کرد))

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب لەزیحەججە لەشامەوە بۆ مەدینە گەڕایەوە و لەکاتی گەڕانەوە، وتارێکی خوێندەوە، سوپاسی خوای کرد و وتی:

(( منیان کردۆتە سەروەری ئێوە، بەخواستی خوا بەڵێنەکانی خۆم سەبارەت بەئێوە بەسەر برد، بەخواستی خوا سەبارەت بە تاڵانی و ماڵەکانی ئێوە، دادپەروەریم ئەنجامدا و کاروبارەکانی ئێوەم ڕێکخست، سوپاکەمان ئامادە و تەیار، سنوورەکانمان دیاری و ئێوەمان نیشتەجێ کرد بەئەندازەی تاڵانییەکان و داهاتی جەنگەکانی شام، خۆشگوزەرانیمان بەئێوە بەخشی، مانگانەمان بۆ دیاری کردن، هاوکاریمان کردن، هەرکەس شتێك دەزانێت کەدەبێت ئەنجام بدرێت، ئێمەی لێ ئاگادار بکاتەوە، ان شاء الله ئەنجامی دەدەین لا حول و لا قوە الا بالله.))

کاتی نوێژ هات، خەڵکان وتیان: چی دەبێت ئەگەر بەبیلال بڵێیت، بانگ بدات.

عومەر کوڕی خەتاب پێی وت بانگ بدات، لەکاتی بانگەکەی بیلال هەموو ئەوکەسانەی چاویان بە پێغەمبەر(د.خ) کەوتبوو، دەستیان بەگریان کرد بەڕادەیەك ریشیان تەڕ بوو. ئەوانەی پێغەمبەریان نەبینیبوو، لەگریانی ئەسحابەکان و بیرکردنەوەی پێغەمبەر(د.خ) دەستیان بەگریان کرد.

باوکی حارسە دەڵێت: خالید کارگوزاری قنسرین بوو تا ڕۆشتە جەنگێك و تاڵانی زۆری دەستکەوت و بەشەکەی خۆیشی دابەش کرد.

باوکی موجالید گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە بەم زیادە کەدەڵێت: خالید ڕۆشتە ناو حەمام و جەستەی خۆی بەکولاوی زەعفەرانی تێکەڵ بەشەراب شۆرد.

سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ نووسی: بیستوومە بەشەراب خۆت شۆردووە، خواوەند رووالەت و ناخی شەرابی حەرام کردووە بەهەمان شێوەکە روالەت و ناخی گوناحی حەرام کردووە، خۆ شۆرین بەشەراب هاوشێوەی خواردنەوەی حەرامەو دەبێت کەس خۆی بەشەراب نەشوات، چوونکە گلاوە، ئەگەر ئەو کارەتان کردووە، چیتر دووبارەی نەکەنەوە.

خالید نووسی: ئێمە شەرابەکەمان گۆڕی و بووە کەرەستەی خۆ شۆڕین، چیتر شەراب نەبوو.

سەروەری باوەڕداران نووسی: بەگومانم بنەماڵەی موغەیرە زیانی توند و تیژییان لەگەڵدایە، هیوادارم خواوەند بەمشێوەیە نەیانمرێنێت. بەسەرهاتەکە بەمە کۆتایی هات.

هەروەها لەم ساڵەدا یانی لەساڵی حەفدەیەم بەوتەی سەیف، خالید کوڕی وەلید و عەیاز کوڕی غەنەم هێرشیان کردە سەرسەرزەمینی رۆمییەکان.

دەڵێت: لەساڵی حەفدەیەم، خالید و عەیاز کوڕی غەنەم روویان کردە سەرزەمینی رۆمییەکان و سامانی زۆریان دەستکەوت، ئەوان لەجابییەوە ڕۆشتبوون. کاتێک سەروەری باوەڕداران بۆ مەدینە گەڕایەوە، باوکی عوبەیدە کارگوزاری حمس و خالید فەرمانەکانی ئەوی ئەنجام دەدا و کارگوزاری قنسرین بوو. کارگوزاری دیمەشق یەزید کوڕی ئەبی سوفیان و کارگوزاری ئەردەن، معاویە و کارگوزاری فەلەستین عەلقەمە کوڕی مەجزەز بوو. لێپرسراوی ئەنبارەکان عەمرۆ کوڕی عەبەسە و کارگوزاری کەنارەکان عەبدوللە کوڕی قەیس و بۆ هەر ناوچەیەك کارگوزارێکی دانابوو. پادگانەکانی شام و میسر و عێراق بەهەمان شێوەی ساڵی حەفدەیەم رێکخرانەوە و تا ئێستا وەك خۆی ماوەتەوە و هیچ نەتەوەیەکی دیکە پادگانێکی تازەی بنیات نەنا مەگەر ئەوەی کەسانێك کافر بن و هێرشیان بکەنەسەر و بەناچاری بناغەی پادگانێك دارێژن.

باوکی حارسە دەڵێت: کاتێك خالید گەڕایەوە و خەڵکان ئاگادار بوونەوە لەم سەفەرەی تالانی زۆری دەستکەوتووە، خەڵکانێکی زۆر داوای بەخششیان لێکرد. ئەشعەس کوڕی قەیس یەکێك بوو لەو کەسانەی داوای بەخششی لەخالید کرد و دەهەزار پێ بەخشی.

دەڵێت: ئەم کارانە لەعومەر کوڕی خەتاب شاراوە نەبوو. لەعێراقەوە بۆیان نووسیبوو چ کەسانێك ڕۆشتوون و لەشامەوە بۆیان نووسی چ کەسانێك بەخششیان وەرگرتووە.

عومەر نێردراوی بانگ کرد و نامەیەکی بۆ باوکی عوبەیدە نووسی خالید بگرێت و دەستارەکەی سەری لەگەردنی بپێچێت و کلاوەکەی لەسەر لاببەرێت تا بڵێت بەخششەکەی ئەشعەسی لەچی داوە لەماڵی خۆی یا لەو تالانییانە بەدەستی هێناوە؟ ئەگەر وتی لەتالانییەکانە، دانی بەخیانەتەکەی خۆی ناوە و ئەگەر لەماڵی خۆی بەخشیوە، زێدەڕۆیی کردوە. بەهەرحال ئەو لەسەر کارەکەی لابەرە و سنوورەکەی ئەو پەیوەستی سنووری فەرمانڕەوای خۆت بکە.

باوکی عوبەیدە نامەی بۆ خالید نووسی تا بڕواتە لای. دواتر خەڵکانی کۆکردەوە و نێردراو هەستا و وتی: ئەی خالید، ئایا لەسامانی خۆت دەهەزار درەمت بەخشیوە یا لەتاڵانییەکان؟

خالید وەڵامی نەدایەوە تا ئەوەی وتەکانی دووبارە کردەوە. باوکی عوبەیدە بێدەنگ بوو و هیچی نەدەوت.

بیلال هەستا و وتی: سەروەری باوەڕداران ئەم فەرمانەی سەبارەت بەتۆ دەرکردووە، کلاوەکەی لەسەر لابرد و بەدەستارەکەی گەردنی بەست و وتی: دەڵێی چی، لەماڵی خۆت یا لەتالانییەکان؟

وتی: لەسامانی خۆم.

بیلال ئازادی کرد و کلاوەکەی بۆ گەڕاندەوە و بەدەستی خۆی دەستارەکەی کردەوە و وتی: فەرمانەی خەلیفەکانی خۆمان ئەنجام دەدەین و ڕێز و خزمەتی گەورەکانی خۆمان دەکەین.

دەڵێت: خالید سەریسوڕمابوو و نەیدەزانی لەسەر کار لابراوە یانە؟ باوکی عوبەیدەیش ئاگاداری نەکردەوە ودوای ئەوەی سەروەری باوەڕداران ماوەیەك چاوەڕوان بوو و خالید نەگەیشتە مەدینە، هەستی بەپێشهاتەکان کرد و نامەی بۆ خالید نووسی تا بگەڕێتەوە بۆ مەدینە.

خالید ڕۆشتە لای باوکی عوبەیدە و وتی: خوا بتبەخشێت، مەبەستت لەم کارە

چی بوو، بۆ ئەو شتەی حەزم دەکرد بیزانم، لەمنت شاردەوە.

باوکی عوبەیدە وتی: سوێند بەخوا نەمدەویست نیگەرانت بکەم، هیچ چارەیەکەم نەبوو چونکە دەمزانی ئەم هەواڵە تۆ نیگەران دەکات.

دەڵێت: خالید گەڕایەوە بۆ قنسرین و لەگەڵ خەڵکانی ئەو ناوچەیە قسەی کرد و ماڵئاوایی لێکردن. باروبنەی بەست و رووی کردە حمس و لەوێیش، ماڵئاوایی کرد. دواتر بەرەو مەدینە بەرێکەوت و گەیشتە لای عومەر کوڕی خەتاب و گلەیی لێکرد و وتی: لای موسوڵمانان گلەییم لەتۆ کرد، سوێند بەخوا ئەی سەروەری باوەڕداران، کارێکی باشت لەگەڵ من نەکرد.

سەروەری باوەڕداران وتی: ئەم سامانە لەکوێوە بەدەست هاتووە؟

وتی: لەتالانییەکان و بەشی خۆم، هەرچی زیاتر لەشەست هەزار بوو بۆ تۆ،

عومەر کوڕی خەتاب سامانەکەی ئەوی هەڵگرتەوە و بیست هەزار درەم خێری کرد و بەبیت المالی سپارد. وتی: ئەی خالید، سوێند بەخوا لای من هەم رێزداریت هەم خۆشەویست، دوای ئەمە سەبارەت بەهیچ شتێك گلەیی لەمن ناکەیت.

عودەی کوڕی سوهەیل دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ ویلایەتەکان نووسی کەخالید کوڕی وەلیدم لەبەر سەرپێچی کردنی فەرمانەکان یا خیانەت لەسەر کار لانەبردووە، بەڵام خەڵکان شەیدای ئەو بوون و دەترسام پشت بەو ببەستن، ویستم بزانن ئافرێنەر خواوەندە و لەفیتنە و ئاژاوە دووریان بخەمەوە..

ساڵم دەڵێت: کاتێك خالید ڕۆشتە لای عومەر کوڕی خەتاب، عومەر هۆنراوەیەکی وەك نمونە خوێندەوە کەناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

(( کارێکت کرد کەس هاوشێوەی ئەوەی نەکرد

بەڵام هەرچی خەڵکان دەیکەن، کاری خوایە))

سزایدا و دواتر بۆی گەڕاندەوە و نامەی بۆ ویلایەتەکان نووسی و ئەوی بەبێ گوناح ناساند.

بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا، یانی ساڵی حەفدەیەم، عومەر کوڕی خەتاب حەجی عەمرە و مسجد الحرامی دروست کرد. پانتاییەکەی زیاد و بۆ ماوەی بیست شەو لەمەککە مایەوە و ماڵی ئەوکەسانەی نەیانویست خانووەکانیان بفرۆشن، وێرانی کرد و بەهاکەی لەبیت المالدا.

عەمرەی عومەر کوڕی خەتاب لەمانگی ڕەجەب و زەید کوڕی سابتی وەك جێگری خۆی لەمەدینە ناساند.

دەڵێت: لەم سەفەرەیدا، عومەر کوڕی خەتاب فەرمانیدا نیشانەکانی حەرەم تازە بکەنەوە و مەخریمە کوڕی نەوفل و ئەزهەر کوڕی عەبدعەوف وخوەیتب کوڕی عەبدولعوزا و سەعید کوڕی یەربووعی بۆ ئەم کارە ڕاسپارد.

کەسیر کوڕی عەبدوڵلەی موزنی لەباوەگەورێی دەگێڕێتەوە: لەساڵی حەفەدەیەم لەسەفەری عەمرە لەگەڵ سەروەری باوەڕداران بووم، لەرێگە خەڵکان قسەیان لەگەڵ کرد بۆ ئەوەی لەرێگەی نێوان مەککە و مەدینە چەندین مەنزڵ دروست بکات چوونکە پێشتر هیچ بینایەك لەو رێگەیەدا بوونی نەبوو. عومەر مۆڵەتی ئەو کارەیدا و بەو مەرجەی کوڕی سەبیل بۆ سێبەر و ئاو پێش بخەن.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب، دایکی کولسوم کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و کچی فاتیمەی کچی پێغەمبەری وەك هاوسەر هەڵبژارد و لەزیقەعدە ئەوی بردە ماڵەکەی خۆی.

دەڵێت: لەم ساڵەدا لەمانگی ڕەبیع الاول، عومەر ویلایەتی بەسرەی بەباوکی موسا و فەرمانیدا موغەیرە بۆ لای ئەو بگەڕێنێتەوە و وەك لەگێڕانەوەی زوهریدا ئاماژەی پێدراوە، ئەبوبەکرە و شیبل کوڕی مەعبەدی بیجلی و نافیع کوڕی کەلدە دژی ئەو شایەتییاندا.

یەعقوب کوڕی عوقبە دەڵێت: موغەیرە بۆ لای دایکی جەمیل هاتوچۆی دەکرد کەژنێك لەمناڵەکانی هیلال بوو. مێردەکەی لەتایەفەی سەقیف و ناوی حەجاج کوڕی عوبەید و مردبوو. مەغەیرە دەڕۆشتە لای. خەڵکانی بەسرە ئاگادار بوونەوە و بەکارێکی قێزەونیان زانی. ڕۆژێك کەموغەیرە ڕۆشتە لای ئەو ژنە چەندین کەسیان ڕاسپارد و هەموو ئەو کەسانە، ڕۆشتن و پەردەکەیان بەرز کردەوە و موغەیرەیان بینی لەباوەشی ژنەکەدایە.

ئەبوبەکرە ڕۆشتە لای عومەر کوڕی خەتاب. پەردەیەك لەنێوانیاندا بوو، دەنگی بیست و وتی: ئەبوبەکرە.

وتی: بەڵێ.

وتی: بۆ شەڕ هاتوویت.

وتی: موغەیرە ناچاری کردووم. دواتر بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران باوکی موسای وەك کارگوزار نارد و فەرمانی پێدا موغەیرە بۆ مەدینە بگەڕێنێتەوە. موغەیرە کەنیزێکی پێشکەش بەباوکی موسا کرد و وتی: بۆتۆم پەسەند کردووە. باوکی موسا ئەوی بۆ مەدینە گەڕاندەوە.

مالك کوڕی ئەوس کوڕی عەدنان دەڵێت: لای عومەر کوڕی خەتاب دانیشتبووم کەموغەیرەیان هێنا. ئەو لەگەڵ ژنێك لەمناڵەکانی مورە پەیوەندی هاوسەرگیری بەستبوو.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران وتی: تۆ بێ خەیاڵیت و گیرۆدەی شەهوەتەکانی خۆت.

دەڵێت: بیستم سەبارەت بەو ژنە پرسیاری دەکرد.

موغەیرە وتی: ناوی رەمتایە، مێردەکەی لەتایەفەی سەقیفە و خۆی لەتایەفەی مناڵەکانی هیلال.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: هۆکاری کێشەی موغەیرە و باوکی ئەبوبەکرە کەدژی ئەو شایەتیدا، بەپێی گێڕانەوەی عەمرۆ بەو شێوە بوو کەموغەیرە و ئەبوبەکرە لاسایی یەکیان دەکردەوە و ئەبوبەکرە لەهەر بۆنەیەکدا شانازی بەخۆیەوە دەکرد. لەبەسرە دراوسێ و تەنیا یەك کۆڵان لەیەك دوور بوون. باڵەخانەکانیان بەرابەر بەیەك و دەلاقە و پەنجەرەکانیان بەرووی یەکدا دەکرایەوە.

دەڵێت: چەند کەسێك لەماڵەکەی ئەبوبەکرە کۆبوونەوە و گفتوگۆیان دەکرد. بایەك هەڵیکرد و پەنجەرەکەی کردەوە، ئەبوبەکرە هەستا تا بیبەستێت و موغەیرەی بینی کەلەنێوان ڕانەکانی ژنێك دانیشتووە، بەئامادە بووانی وت: هەستن و بڕوانن.

کاتێ: هەستان و سەیریان کرد، وتی: شایەت بن.

وتیان: ئەوە کێیە.

وتی: دایکی جەمیل کوڕی ئەفقەم.

دەڵێت: دایکی جەمیل لەتایەفەی مناڵەکانی عامر کوڕی سەعسەعە و هاودەمی موغەیرە بوو. دەڕۆشتە لای گەورە و سەرکردەکان و لەرۆژگاری ئەو، دەستەیەك لەژنان ئەو کارەیان دەکرد.

دەڵێت: ئێمە ڕانی ئەومان بینی بەڵام روخساری نا. کاتێك هەستا، گومانیان نەما و کاتێك موغەیرە ویستی پێشنوێژی بۆ خەڵکان بکات، ئەبوبەکرە ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت و وتی: پێشنوێژی بۆ ئێمە مەکە.

دەڵێت: بەسەرهاتەکەیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و نامەکان لەم نێوانەدا هاتوچۆی دەکرد. سەرئەنجام سەروەری باوەڕداران باوکی موسای بانگ کرد و وتی: ئەی باوکی موسا، تۆم کردە فەرمانڕەوا و ڕەوانەی سەرزەمینێکت دەکەم کەشەیتان لەوێ تۆوی بڵاو کردۆتەوە و جوجکەکان سەریان بەرز کردۆتەوە، بەپێی زانستی خۆت هەڵسو کەوت بکە مەگەر ئەوەی خواوەند بارودۆخ بگۆڕێت.

باوکی موسا وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، چەند کەسێك لەئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) لەموهاجیر و ئەنسارەکان بۆ هاوکاری من ڕەوانە بکە چوونکە ئەوان بۆ کاروباری ئەم خەڵکە هاوشێوەی خوێن و خواردن بێ خوێ، تامی نییە.

وتی: هەرکەست دەوێت، لەگەڵ خۆت ببە.

ئەو بیست و نۆ کەسی هەڵبژارد. ئەنس کوڕی مالك و عیمران کوڕی حەسین و هوشام کوڕی عامر لەناویاندا دەبینران.

باوکی موسا لەگەڵ ئەو دەستەیە بەرێکەوت و لەمورەبەدی بەسرە دابەزی و کاتێك موغەیرە لەهاتنی ئەو ئاگادار بوویەوە، وتی: سوێند بەخوا باوکی موسا بۆ بازرگانی یا سەردان نەهاتووە، بەڵکو هاوشێوەی فەرمانڕەوا هاتووە.

دەڵێت: سەرقاڵی ئەم قسانە بوون کەباوکی موسا هاتە ناو. نامەی سەروەری باوەڕدارانی تەسلیمی موغەیرە کرد کەکورتترین نامە بوو. چوار دێر بوو، لەسەر کار لایبردبوو، سەرکۆنەی کردبوو، هانیدابوو و فەرمانی پێدابوو بەخێرایی بەرێکەوێت. نووسیبووی:

((هەواڵێکی مەترسیدار لەتۆ بەمن گەیشتووە، باوکی موسام وەك فەرمانڕەوا نارد، کارەکەت بەو بسپێرە وبەخێرایی بەرێکەوە.))

بۆ خەڵکانی بەسرەی نووسی:

(( باوکی موسام وەك فەرمانڕەوای ئێوە ناردووە تا مافی ستەملێکراو لەستەمکار وەربگرێت و لەگەڵ ئێوە شەڕی دوژمنان و بەرگری لەدینەکەتان بکات و تالآنییەکان

لەناو ئێوەدا دابەش و ڕێگەکانتان بۆ ئەمن و ئارام بکات.))

موغەیرە کەنیزێکی لەموالییەکانی تاییف بەناوی عەقیلە بەباوکی موسا بەخشی و وتی: ئەوم بۆ تۆ پەسەند کرد. کەنیزێکی جوان ڕوخسار بوو.

موغـەیرە و ئەبوبـەکرە و نـافیع کـوڕی کەلـدە و شـیبل کـوڕی مەعبـەدی بیجلـی بەرێکەوتن و گەیشتنە مەدینە. سەروەری باوەڕداران ئەوان و موغەیرەی کۆکردەوە.

موغەیرە وتـی: لێیـان بپرسە منیـان چۆن بینیـوە. لەڕووبەڕوو یـا لەپشتە سەر؟ ژنەکەیان چۆن بینی و چۆن ناسییانەوە؟ ئەگەر ڕووبەڕووی مـن بـوو چۆن پـەردەم نـەبوو؟ ئەگـەر لەپـشت سـەرەوە سـەیریان کـردووە، بـەچ حـەقێك سـەیری نـاو مـاڵ و ژنەکەی من بۆ ئەوان ڕەوایە؟ سوێند بەخوا لەگەڵ ژنەکەی خۆم بووم کەهاوشێوەی ئەو ژنەیە.

عومـەر کـوڕی خـەتاب لەئەبوبـەکرە دەسـتی پێکـرد و دژی موغـەیرە شـایەتیدا کەئەوی لەنێوان ڕانەکانی دایکی جەمیل بینیوە.

وتی: ئەوانت چۆن بینی؟

وتی: لەپشتەوە.

وتی: چۆن سەری ئەوانت ناسییەوە؟

وتی: هەستامە سەرپێ.

شیبل کوڕی مەعبەدی بانگ کرد و ئەویش بەهەمان شێوە شایەتیدا.

پرسی: لەپشتەوە ئەوانت بینی یا لەڕووبەڕوو؟

وتی: لەپشتەسەر.

نافیعیش هاوشێوەی ئەبوبەکرە شایەتیدا. بەلاّم زیاد وەك ئەوان شایەتی نەدا و وتـی: ئـەوم بـینی لـەناو ڕانـی ژنێکـدا دانیـشتووە، دوو قاچـی خەنـە لێـدراوم بـینی دەلەرینەوە لەگەڵ دوو سمتی ڕووت، دەنگی ئاخو ئۆفیشم بیست.

پرسی: ئایا هاوشێوەی میل لەناو سورمەدان ئەوەت بینی؟

وتی: نە.؟

وتی: ئایا ژنەکە دەناسیت؟

وتی: نە، بەلاّم دەتوانم بیشوبهێنم؟

وتی: لەلایەك بوەستە.

دواتر فەرمانیدا داری حەدیان لەو سێ کەسەدا و ئەم ئایەی خوێندەوە:

((فان لم یأتو بالشهداء فاولئك عندالله هم الکاذبون.

واتاکەی: ئەگەر شایەتەکان نەهێنن ئەوان لای خواوەند درۆزنن.))

موغەیرە وتی: دڵی من لەم بەندانە فێنك بکەرەوە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: بێدەنگ بە خوا دەنگت ببڕێت، سوێند بەخوا ئەگەر شایەتییەکان چوار کەس دەبوو. بەدەستی خۆم بەردبارانم دەکردی.

بەوتەیەك لەم ساڵەدا. یانی ساڵی حەفدەیەم، سوق الاهواز و مونازر و نەهری تیری دەستی بەسەردا گیرا و بەوتەیەك ئەم پێشهاتانە لەساڵی شانزەیەمی کۆچ روویدا.

## گێڕانەوەی ئەم سەرکەوتنانە و ئەوەی

لەسەر دەستی کێ ئەنجامدرا

عەمرۆ دەڵێت: هورموزان یەکێك لەحەوت بنەماڵەکەی فارس و خەڵکەکەی گورگانی قەزەق بوون و ویلایەتی ئەهواز بوو، ئەم بنەماڵەیە جیاواز بوو لەخەڵکانی فارس و کاتێك لەرۆژی قادسیە فارسەکان شکستیان خوارد، بۆ لای خەڵکەکەی گەڕایەوە و بوو بەپاشای ئەوان و بەهاوکاری ئەوان شەڕی نەیارەکانی دەکرد.

دەڵێت: هورموزان لەمەنازر و رووباری تیری، لەدوو لاوە، هێرشی دەکردە سەر خەڵکانی میشان و دەشتی میشان. عوتبە کوڕی غەزوان داوای هاوکاری لەسەعد کرد و ئەو، نەعیم کوڕی موقرین و نەعیم کوڕی مەسعودی بۆ هاوکاری ئەو نارد و وتی لەسەرەوەی میشان و دەشتی میشانەوە بڕۆن تا لەنێوان ئەوان و رووباری تیری ببەنە لەمپەر.

عوتبە کوڕی غەزوانیش سەلما کوڕی قەیس و حەرەملە کوڕی مەریتە کەلەموهاجیرەکانی سەرەتا و لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) کۆچ و لەتایەفەی مناڵەکانی عەدەوییە کوڕی حەنزەلە بوون، ڕەوانە کرد و لەسەرزەمینی میشان و دەشتی میشان لەنێوان ئەوان و مەنازر سەنگەریانگرت. پێشنیاریان بەمناڵەکانی ئەلعەم کرد و غالبی وائلی و کەلیب کوڕی وائلی کەلیبی بێ ئاگادار کردنەوەی نەعیم و نەعیم

ڕۆشتنە لای سەلما و حەرەملە و وتیان: ئێوە لەعەشیرەی ئێمەن و ناتوانین ئێوە بەجێبێڵین. لەفلانە ڕۆژ هێرش بکەنە سەر هورموزان چوونکە یەك لەئێمە هێرش دەکاتە سەر مەنازر و ئەوی دیکەمان هێرش دەکاتە سەر ڕووباری تیری و جەنگاوەران دەکوژین. دواتر دەگەڕێینەوە بۆ لای ئێوە و بەخواستی خوا بەئاسانی دەستمان بەهورموزان دەگات.

گەڕانەوە، خۆیان ڕازی بوون و خەڵکەکەیشیان ڕازی بوون.

بەسەرهاتی (عمی)، مورە کوڕی مالك کوڕی حەنزەلە بەم شێوەیە: دەستەیەك لەخەڵکانی مەعەد لای ئەو و عەسیە کوڕی ئەمرۆ ئەلقەیس جێگیر و ئەویان بەشێوەیەکی لەناکاو کوێری کرد کەسەرکەوتنی فارسەکانی بەسەر ئوردووەکان نەبینی و بە(عم) ناویان برد و مناڵەکانی بە منالەکانی ئەلعەم ناویان دەرکرد.

دەڵێت: کاتێك، کاتی دیاریکراوی سەلما و حەرەملە و غالیب وکەلیب گەیشت، هورموزان لەنێوان دەلپ و ڕووباری تیریدا بوو. سەلما کوڕی قەیس سەرکردەی شەڕکەرانی بەسرە و نەعیم کوڕی موقرین سەرکردەی شەڕکەرانی کوفە بوو، جەنگیان دەستپێکرد. لەکاتی شەڕەکە لەلایەن غالیب و کەلیبەوە هێزی پشتیوانی هات و هورموزان ئاگادار بوویەوە کەدەستیان بەسەر مەنازر و ڕووباری تیریدا گرتووە. خواوەند هێزی ئەو و سوپاکەی تێکشکاند و موسوڵمانان ژمارەیەکی زۆر لەوانیان کوشت و تالانی زۆریان دەستکەوت و تا کەنارەکان دوجەیل شوێنیان کەوتن و دەستیان بەسەر هەموو ئەو سەرزەمینەنانەدا گرت و لەبەرابەر بازاری ئەهواز ئوردوویان لێدا.

هورموزان لەپردی بازاری ئەهواز پەڕییەوە و لەوێ جێگیر بوو. دوجەیل لەنێوان هورموزان و سەلما و حەرەملە و نەعیم و نەعیم و غالیب جیایی دروست دەکرد.

یەکێك لەمناڵەکانی عەبد قەیس بەناوی سەحار دەڵێت: چەندین کیسەی خورمام بردە لای هێرەم کوڕی حەییان کە لەنێوان دەلوس و دوجەیل بوو. زۆری حەز لەخورما دەکرد و بەشی زۆری توێشووی ئەو لەخورما پێکدەهات. بێ خورما ئۆقرەی لێدەبڕا و کاتێك توێشووەکەی کۆتایی دەهات، لەکاتی ڕۆشتن کیسەکانیان بۆ پڕ دەکرد و لەدەشت و کێوەکان و لەهەر ناوچەیەك خورمای دەخوارد و دەرخواردی خەڵکانی دەدا.

عەمرۆ دەڵێت: کاتێك ئەمە دەستەیە بۆ رووبەروو بوونەوەی هورموزان بەرێکەوتن و لەئەهواز لەبەرابەر ئەو، ئوردوویان لێدا، نەیدەتوانی بەرگری بکات و پێشنیاری ئاشتی هێنایە کایەوە. نامەیان بۆ عوتەبە نووسی و داوای بۆچوونی ئەویان کرد. هورموزانیش نامەی بۆ نووسی. عوتەبە سەبارەت بەهەموو ئەهواز و مێهرگانی قەزەق بەپەیمانی ئاشتی رازی بوو جگە لەرووباری تیری و مەنازر و ئەو بەشە لەبازاری ئەهواز کە موسوڵمانان دەستیان بەسەردا گرتبوو. وتی: ئەوەی بەدەستمان هێناوە، نابێت تەسلیمی بکەینەوە.

سەمل کوڕی قەیسی وەك فەرماندەی پادگانی مەنازر دانا و کاروبارەکان غالیب رایدەپەڕاند. حەرەملە وەك فەرماندەی رووباری تیری و کاروبارەکان کەلیب رایدەپەڕاند. ئەم دووانە هەردووکیان لەپادگانەکانی بەسرە بوون. تایەفەی منالەکانی ئەلعم کۆچیان کرد و لەبەسرە نیشتەجێ بوون.

دەڵێت: عوتەبە رووداوەکەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی و دەستەیەکی نارد. سەلما لەناویاندا دەبینرا، پێی وت یەکێك وەك جێگری خۆی دابنێت. حەرەملەیش لەناویاندا دەبینرا وهەموویان لەئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) بوون لەگەڵ غالیب و کەلیب. نێردراوانی بەسرەیش هاتبوون. عومەر کوڕی خەتاب وتی: پێویستییەکانی خۆتان باس بکەن.

هەموویان وتیان: سەبارەت بەخەڵکان فەرمانی خۆت بدە، ئێمە دەمانەوێت سەبارەت بەخۆمان قسە بکەین.

هەموویان بۆ خۆیان داوا کرد جگە لەئەحنەف کوڕی قەیس، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ بەو شێوەی باسیان کردوویت، دەبێت ئەوەی لەبەرەژەوەندی خەڵکانە و لەتۆ شاراوەیە، تۆی لێ ئاگادار بکەینەوە چوونکە خەلیفە شتە نەبینراوەکان بەچاوی کەسانی بڕواپێکراو دەبینێت و بەگوێی ئەوان دەبیستێت. ئێمە بەردەوام لەشوێنێك بۆ شوێنێك دەڕۆشتین تا ئەوەی گەڕاینەوە بۆ دەشت. براکانی ئێمە لەکوفە لەشوێنێك نیشتەجێ بوون کەسەرچاوەکان و باخە سەرسەوزەکان، هاوشێوەی تۆوی چاوی وشتر لێڵە، بەر دەگرن بەڵام لێیان کەم نابێتەوە، بەڵام خەڵکانی بەسرە لەسوێرەڵانێکی بێ بەرهەم و تەپوتۆزاوی وکەم ئاو

نیشتەجێ بوون. لایەکی بەسارا دەگات و لایەکی بەدەریایەکی سوێر کۆتایی دێت. شارەکەی ئێمە قەرەباڵغە و شوێنەکەمان تەنگ، ژمارەمان زۆر و سەران و سەرکردەکان لەناو ئێمەدا کەم، خەڵکان زۆر و تێکەڵ و پێکەڵ و کێڵگەکان بچوك، خواوەند فراوانی پێبەخشیوین و سنووری فەرمانڕەوایەتی موسوڵمانانی فراوان کردووە، تۆیش ئەی سەروەری باوەڕداران، فراوانیمان پێ ببەخشە و شوێنێکمان بۆ دیاری بکە تا لەوێ نیشتەجێ و ژیان بەسەر ببەین.

عومەر سەیری شوێنی مەنزڵەکانی ئەوانی کرد کەپێش وەستان لەحیجر لەوێ بوون، هەمووی ئەو زەوییانەی بەوان بەخشی و ئەمە لەزەوییەکانی خوسرەو بوو. بەمشێوەیە دیجلە و حیجر وەك تالانی لەقەڵەمدرا و دابەشیان کرد. سامان و زەوییەکانی بنەماڵەی خوسرەو لەسەرزەمینی بەسرە هاوشێوەی زەوییەکانی کوفە بوو، هەرکەسیان ویست، لەوێ نیشتەجێ و لەناوخۆیاندا دابەشیان کرد بەڵام تایبەت نەدەکرا بەکەسێك و پێنج یەکی داهاتەکەیان تەسلیمی خەلیفە دەکرد.

بەمشێوەیە زەوییەکانی بەسرە دوو بەش بوو، بەشێکی دابەش کرا و بەشێکی دیکە تایبەت بەسوپا و موسوڵمانان بوو. دوو هەزارییەکان کە لەشەڕی قادسیە بەشدار بوون و لەگەڵ عوتبە لەبەسرە مابوونەوە، پێنج هەزار بوون بەڵام لەکوفە ژمارەیان سی هەزار کەس و سەروەری باوەڕداران بەئەندازەی پێویست لەتێکۆشەرانی سوپای بەسرەی پەیوەستی دوو هەزارییەکان کرد و لەگەڵ دانیشتووانی کوفە بەرابەر بوون. هەموو ئامادە بووانی شەڕی ئەهواز پەیوەستی ئەوان بوون.

وتی: ئەم گەنجە سەروەری خەڵکانی بەسرەیە. سەبارەت بەو نامەی بۆ عوتبە نووسی تا گوێ لەبۆچوونەکانی بگرێت. سەلما و حەرەملە و غالیب و کەلیبی بۆ مەنازر و رووباری تیری نارد تا بۆ هەر پێشهاتێکی لەناکاو ئامادە بن و خەراجی ئەو ناوچانە کۆبکەنەوە.

عەمرۆ دەڵێت: لەم کاتەدا کەخەڵکانی بەسرە و جەزیە دەران، بەمشێوە بوون، لەنێوان هورموزان و غالیب و کەلیب، لەسنووری زەوییەکان جیاوازی و کێشە دروست بوو. سەلما و حەرەملە ڕۆشتنە ئەو ناوچانە تا لێکۆڵینەوە لەکارەکانیان بکەن. بۆیان دەرکەوت غالیب و کەلیب راست دەکەن و هیچ مافێکیان بۆ هورموزان

لەبەر چاو نەگرت و دەستی ئەویان لەو ناوچانە کورت کردەوە. هورموزان کافر و سنووری خۆی بەسەر موسوڵماناندا داخست و داوای هاوکاری لەکوردەکان کرد. بەمشێوەیە سوپاکەی فراوان بوو.

سەلما و حەرەملە و غالیب و کەلیب سەرکێشی و ستەم و کافر بوونی هورموزانیان بۆ عوتبە کوڕی غەزوان نووسی. ئەویش سەروەری باوەڕدارانی لەم پێشهاتە ئاگادار کردەوە

سەروەری باوەڕداران وەڵامی دایەوە و فەرمانەکانی خۆی دەرکرد و حێرقوس کوڕی زوهەیری سەعدی. هاوەڵی پێغەمبەری بۆ هاوکاری ئەوان نارد و سەرکردایەتی جەنگ و ئەو ناوچانەی دەستی بەسەردا دەگرێت، بەخۆی سپارد.

هورموزان لەگەڵ سوپاکەی هات. سەلما و حەرەملە و غالیب و کەلیبیش ڕۆشتن تا گەیشتنە پردی بازاری ئەهواز. کەسیان بۆ لای هورموزان نارد و پەیامیاندا: یا ئێوە بپەڕنەوە یا ئیمە دەپەڕینەوە.

وتیان: ئێوە بپەڕنەوە

موسوڵمانان لەپردەکە پەڕینەوە و لەسەر ئەو بەشەی پردەکە کەرووی لەبازاری ئەهواز بوو، شەڕیان کرد تا هورموزان شکستیان خوارد و مەبەستی ڕۆشتن بۆ رامهورموزی کرد و لەگوندی شەعر پردی ئەربەکی گرت و گەیشتە رامهورموز.

حێرقوس بازاری ئەهوازی گرت و لەوێ مایەوە لەجەبەل جێگیر بوو. دیاری شوشتەر تا بازاری ئەهواز لەسەر دەستی ئەو گیرا و جەزیە لەسەر خەڵکان دانرا. هەواڵی سەرکەوتنی موسوڵمانانی لەگەڵ پێنج یەك بۆ عومەر کوڕی خەتاب نارد و دەستەیەکی لەگەڵ نێردراوەکەدا نارد. عومەر کوڕی خەتاب سوپاسی خوای کرد و داوای بەخشش و فراوانی بۆ کرد.

بەوتە و گێڕانەوەی سەیف لەم ساڵەدا، یانی ساڵی حەفدەیەم، شوشتەر دەستی بەسەردا گیرا و بەوتەی کەسانی دیکە، گرتنی شوشتەر لەساڵی حەفدەیەم و بەوتەیەك لەساڵی نۆزدەیەم ڕوویدا.

## گرتنی شوشتەر

عـەمرۆ دەڵێـت: کاتێـك هورمـوزان لەجـەنگی بـازاری ئـەهواز شکـستی خـوارد و حێرقوس کوڕی زوهەیر ئەو سەرزەمینەی گرت، لەویَ مایەوەو بەفەرمانی سەروەری باوەڕداران جەزۆ کوڕی معاویەی بۆ رۆژهەڵات و شوێنکەوتنی هورموزان ڕەوانە کرد. عومەر فەرمانیدا بوو ئەگەر سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، جەزۆ بەدوای هەڵاتووانـدا بنێرێت و مەبەستەکەی سەرق بێت.

جەزۆ شوێن هورموزان کەوت کەدەیویست رووبکاتە رامهورموز. بەردەوام لـەوانی دەکوشت تـا گەیشتە گونـدی شـەغر. هورمـوزان زووتـر گەشـتبووە گوندەکـە و جـەزۆ رووی کردە دورەق یەکێك لەگوندەکانی شەغر بیَ ئەوەی رووبەروی بەرگری ببێتەوە.

دورەق شـاری سـەرق و خـەڵکانێك لـەو سـەزەمینە دەژیـان توانـای بـەرگری کـردن لەشـارەکەیان نـەبوو. بەئاسـانی دەسـتی بەسـەر شـارەکەدا گـرت و رووداوەکـەی بـۆ سەروەری باوەڕداران و عوتەبە نووسی و وتی: پێشنیاری گەڕانەوە و دانـی جـەزیـەی بەهەڵاتووان کردووە و رازی بوون.

سەروەری باوەڕداران بۆ جەزۆ کوڕی معاویە و حێرقوس کوڕی زوهـەیری نووسـی، ئـەوەی دەسـتیان بەسـەردا گرتـووە، بیپـارێزن و لەشـوێنەکانی خۆیـان بمێننـەوە تـا فەرمانەکانی دەگات. نامەیەکی هاوشێوەی بۆ عوتەبە نووسی وئەو کارەیان کرد.

جەزۆ بۆ کاری ئاوەدانی سنوورەکەی خۆی داوای مۆڵەتی لەعومـەر کـوڕی خـەتاب کرد و مۆڵەتی پێدرا. دارەکانی هەڵکەند و گۆڕستانەکانی ئاوەدان کردەوە.

دەڵێت: کاتێك هورموزان لەرامهورموز دابەزی و ئەهوازی لەدەستدا و موسوڵمانان ڕۆشـتنە نـاو شـارەکە و دەسـتیان بەسـەردا گـرت، داوای ئاشـتی کـرد و نامەیـەکی هاوشێوەی بۆ جەزۆ و حێرقوس نووسـی. حێرقـوس نامـەی بـۆ سـەروەری بـاوەڕداران نووسـی و عومـەر بـۆ ئـەو و عوتەبـە وەڵامـی نـاردەوە: سـەبارەت بـەوەی دەسـتیان بەسەردا گرتووە یانی راموهورموز و شوشـتەر و شـوش و جوندیشاپوور و بونیـان و مێهرگـانی قـەزەق پـەیمانی ئاشـتی لەگـەڵ ببەسـتن. هورمـوزان رازی بـوو. دوای ئـەوە سەرکردەکانی ئەهواز لەسنوورەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان مانەوە و هورموزان ڕێزی لەپـەیمانی ئاشـتییەکەی خـۆی گـرت. هاتوچـی ئـەوانی دەکـرد و لەلایـەن ئەوانـەوە

پشتیوانی لێدەکرا. ئەگەر لەلایەن کوردەکانەوە هێرشی دەکرایەسەر، هاوکاریی و بەرگرییان لێدەکرد.

عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ عوتەبە نووسی: دە کەس لەکەسانی شیاوی سوپای بەسرە بۆ مەدینە ڕەوانە بکە. ئەو، دەکەسی نارد. ئەحنەف یەکێك بوو لەوان و کاتێك گەیشتنە لای سەروەری باوەڕداران، پێی وت: تۆ بەراستگۆ و بەپیاو دەزانم، پێم بڵێ، ئایا ئەهلی زەممە بەهۆی ستەمکارییەوە دەڕۆن یا هۆکاری دیکە؟

وتی: بەهۆکارەکانی دیکە و موسوڵمانان بەو شێوەن کەتۆ دەخوازیت.

وتی: زۆر باشە، بگەڕێنەوە بۆ مەنزڵگەکانی خۆتان. نێردراوان گەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان و عومەر کوڕی خەتاب سەیری جل و بەرگەکانی ئەوانی کرد، دەستێك جلی بینی کەسووچێکی هاتبووەدەر، بۆنی کرد و وتی: ئەمە هی کێیە؟

ئەحنەف وتی: هی منە.

وتی: بەچەند کڕیوەتە؟

ئەحنەف بەهایەکی کەمی وت کەهەشت درەم یا شتێکی هاوشێوە بوو. لەبەهاکەی کەم کردەوە، (بەدوانزە درەم کڕیبووی.)

سەروەری باوەڕداران وتی: بۆ بەکەمتر لەوە بەسەندەت نەکرد و جیاوازییەکەت بەموسوڵمانێك نەبەخشی؟ دەستپێوە بگرن و زیادیەکان لەشوێنی پێویست خەرج بکەن تا گیان و سامانتان لەئارامشدا بێت، زێدەڕۆیی مەکەن چوونکە خواوەند زیان لەسامان و گیانتان دەدات، ئەگەر پیاوێك بخوازێت سەرقاڵی خۆی بێت، دەبێت توێشووی ئەو دنیا کۆبکاتەوە.

عومەر کوڕی خەتاب بۆ عوتەبەی نووسی: ستەم لەخەڵکان نەکەن، بترسن و خواپەرەست بن لەوەی بەهۆی خیانەت یا دەستدرێژی، ئەستێرەی بەختتان بەرەو کوژانەوە بڕوات. ئەوەی بەدەستتان هێناوە، بەهۆی هاوکاری خواوەندەوەیە و ئەو پەیمان و بەڵێنەی بەئێوەی داوە، سەبارەت بەرێز گرتن لەبەڵێن و پەیمانەکەی، فەرمانی بەئێوەدا. ئەمەکداری بەڵێنەکانتان بن تا هاوکار و پشتیوانی ئێوە بێت.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران ئاگادار بوویەوە حێرقوس لەکێوەکانی ئەهواز جێگیر بووە و کەسان دەڕۆنە لای، شوێنەکە سەختە و بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت

سەردانی بکات، ڕێگەیەکی پڕ ڕەنج و دەردەسەرییە، نامەی بۆ نووسی: بیستوومە لەشوێنێکی بەرز و هەڵدێر ماڵت کردووە و خەڵکان بەدژواری دەگەنە لای تۆ، بۆ موسوڵمانان و ئەهلی زەممە کارئاسانی بکە و باری سەرشانیان قورس مەکە، ئاگات لەکار و کردەوەکانی خۆت بێت تا پاداشتی ئەو دنیات پێ ببڕێت، سستی مەکە و کەسێکی شپرزە مەبە چوونکە هەم ئەم دنیات لەدەست دەچێت، هەم ئەو دنیا.

حێرقوس لەشەڕی سەفین حەروری بوو و لەگەڵ حەرورییەکان بەشداری جەنگی نەهرەوانی کرد.

لەم ساڵەدا، یانی ساڵی حەفدەیەم، بەپێی وتەو گێڕانەوەی سەیف، موسوڵمانان لەبەحرەینەوە هێرشیان کردە سەر سەرزەمینی فارس.

دەڵێت: موسوڵمانان لەبەسرە و سەرزەمینەکەی جێگیر بوون. سەرزەمینی بەسرە، گوندەکانی دەوروبەری بوو. لەئەهواز ئەو ناوچەی بەجەنگ دەستیان بەسەردا گرت، لەژێر دەستی موسوڵماناندا مایەوە و ئەویە بەئاشتی تەسلیم بوون، لەدەستی فارسەکاندا بووکە خەراجیان دەدا و کەس هێرشی نەدەکردە سەریان و لەلایەن موسوڵمانانەوە پشتیوانیان لێدەکرا. لایەنی ئاشتی هورموزان بوو. عومەر کوڕی خەتاب بەخەڵکانی بەسرەی وتبوو: ئێوە سواد و ئەهوازتان بەسە. چەندە خۆش بوو ئەگەر لەنێوان ئێمە و فارسەکان کێوێك لەئاگر جیایی دروست دەکرد تا ئێمە نەتوانین بەوان بگەین و ئەوانیش بەهەمان شێوە. هەروەها بەخەڵکانی کوفەی وت: چەندە خۆش بوو ئەگەر لەنێوان خەڵکانی کوفە و کێوەکان، کێوێك لەئاگر دووری لەنێوانیاندا دروست دەکرد بۆ ئەوەی هیچ کام نەتوانن هێرش بکەنە سەر ئەوی دیکە.

دەڵێت: عەلا کوڕی حەزرەمی لەڕۆژگاری ئەبوبەکر، کارگوزاری بەحرەین بوو. عومەر کوڕی خەتاب ئەوی لەسەر کار لابرد و قودامە کوڕی مەزعونی لەجێگەی ئەودانا. دوای ئەوە قودامەی لابرد و عەلای بۆ سەرکارەکەی گەڕاندەوە. عەلا بەهۆی کێشەیەك کەقەدەر هێنابوویە کایەوە، لەگەڵ سەعد کێبڕکێی دەکرد. لەسەردەمی هەڵگەڕانەوە نازناو و پێگەی عەلا لەسەعد بەرزتر بوویەوە.

کاتێك سەعد لەقادسیە سەرکەوتنی بەدەست هێنا و خوسرەوەکانی لەسەرزەمینەکەیان دەرپەڕاند و دەستی بەسەر ناوچەکانی نزیك سوادا گرت،

پێگەی بەرز بوویەوە چوونکە سەرکەوتنەکانی گرنگتر بوون.

عەلا دەیویست لەسەرزەمینی عەجەمەکان کارێك بکات و هیوادار بوو بۆ جارێکی دیکە ئەستێرەی بەختی بدرەوشێتەوە.

دەڵێت: عەلا گرنگی بەهیچ شتێك نەدا و هەستی بەلەپێشییەکانی خواپەرەستی نەکرد، ئەبوبەکر ئەوی کردبووە کارگوزاری خۆی و مۆڵەتی پێدابوو شەڕ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان بکات، عومەریش ئەوی وەك کارگوزار هەڵبژارد بەڵام ڕێگەی ڕۆشتن بۆ دەریای لێگرت و ئەو، گرنگی بەسەرپێچی کردن لەفەرمانەکان نەدا و نەیدەزانی دەرئەنجامەکانی چی دەبێت. پێشنیاری بەخەڵکانی بەحرەین کرد هێرش بکەنە سەر سەرزەمینی فارسەکان کە بەئاسانی رازی بوون. عەلا، ئەوانی بۆ چەندین سوپا دابەش کرد، یەکیان بەسەرکردایەتی جارود کوڕی موعلی، یەکێك بەسەرکردایەتی سوار کوڕی هومام و سوپایەکی دیکە بەسەرکردایەتی خولەید کوڕی مونزەری سەماوی کەسەرکردەی سەرکردەکانیش بوو. بێ مۆڵەت وەرگرتن لە سەروەری باوەڕداران، ئەوانی لەرێگەی دەریاوە برد.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران مۆڵەتی بەکەس نەدەدا بەمەبەستی جەنگان لەگەڵ دوژمنان، لەدەریا گوزەر بکەن و حەزی نەدەکرد سوپاکەی رووبەرووی مەترسی بکاتەوە. لەم کارەیدا لاسایی کردەوەکانی پێغەمبەر(د.خ) و خەلیفەی یەکەمی دەکرد چوونکە ئەو دووانە شەڕی دەریایان نەکرد.

دەڵێت: سوپاکەی عەلا لەبەحرەینەوە رووی کردە فارس و لەئیستەخر رووبەرووی فارسەکان بوویەوە کەسەرکردەکەیان هەربوز و لەدەوری ئەو کۆببوونەوە و جیاییان لەنێوان موسوڵمانان و کەشتییەکانیان دروست کرد.

خولەید لەناو خەڵکان قسەی کرد و وتی: کاتێك خواوەند مەبەستی ئەنجامدانی کارێك بکات، قەدەری خواوەند دەنێرێت، ئەی خەڵکینە، بەکاری خۆیان ئێوەیان بۆ جەنگ هاندا، ئێوەیش بۆ جەنگی ئەوان هاتوون، کەشتی و ئەم سەرزەمینە تایبەتە بەوکەسەی لەم شەڕەدا سەرکەوتن بەدەست بێنێت. پشت بەخۆڕاگری و نوێژەکانتان ببەستن.

خەڵکان بەبۆچوونەکەی رازی و نوێژی نیمەڕۆیان خوێند. دواتر هێرشیان برد و

لەناوچەیەك بەناوی تاووس جەنگێكی قورسیان دەستپێكرد. سوار كوڕی هومام هۆنراوەی دەخوێندەوە و باسی بوێرییەكانی خەڵكەكەی دەكرد و جەنگا تا كوژرا.

عەبدوللە كوڕی سوار و مونزەر كوڕی جارودیش جەنگان تا كوژران. خولەیدیش هۆنراوەی دەخوێندەوە و دەیوت:

(( ئەی خەڵكانی تەمیم هەمووتان دابەزن

چوونكە نزیكە سوپاكەی عومەر كوڕی خەتاب لەناو بچێت

هەمووتان دەزانن چی دەڵێم

دابەزن))

خەڵكان دابەزین و پیاوانە جەنگان. لەفارسەكان بەئەندازەیەك كوژرا پێشتر هیچ كات بەو ئەندازە كوژراویان نەدابوو.

ڕۆشتن و روویان كردە بەسرە بەڵام كەشتییەكانیان نوقم ببوو و گەڕانەوە لەرێگەی دەریاوە ئەگەری نەبوو. بۆیان دەركەوت شەهرەك رێگەی موسوڵمانانی بەستووە. لەشوێنەكەی خۆیان ئوردوویان لێدا و ئازایانە بەرگرییان كرد.

كاتێك سەروەری باوەڕداران لەكارەكەی عەلا ئاگادار بوویەوە كەسوپاكەی بۆ دەریا ناردووە، رووداوەكەی بەوشێوەی روویدا، پێشبینی كرد، توڕە بوو، نامەی نووسی و ئەوی لەسەر كار لابرد و هەڕەشەی لێكرد و فەرمانێكی پێدا كە بۆ ئەو لەهەمووان ناخۆشتر و ناپەسەندتر بوو چوونكە سەعدی كردە سەركردەی ئەو و نووسی: لەگەڵ هەموو سوپاكەت، پەیوەستی سەعد كوڕی ئەبی وەقاس ببە.

عەلا لەگەڵ سوپاكەی بۆ لای سەعد بەرێكەوت.

عومەر نامەی بۆ عوتەبە كوڕی غەزوان نووسی: عەلا كوڕی حەزرەمی سوپایەكی موسوڵمانی بۆ شەڕی فارسەكان برد و سەرپێچی فەرمانەكانی منی كرد. گومان دەكەم ئەم كارەی لەرێگەی خوادا ئەنجام نەداوە، دەترسم سەركەوتن بەدەست نەهێنن و لەناو بچن، كەسانێك بۆ هاوكاری ئەوان رەوانە بكە و پێش ئەوەی لەناو بچن، پەیوەستی خۆتیان بكە.

عوتەبە خەڵكانی كۆكردەوە و ئەوانی لەناوەرۆكی نامەكەی سەروەری باوەڕداران ئاگادار كردەوە. عاسم كوڕی عەمرۆ و عەرەفجە كوڕی هەرسیمە و حوزەیفە كوڕی موحسین و مەجزات كوڕی سور و نەخار كوڕی حارس و تەرجومان كوڕی فلان و

حەسین کوڕی ئەبی بەحر و ئەحنەف کوڕی قەیس و سەعد کوڕی ئەبی عەرجا و عەبدولرەحمان کوڕی سەهل و سەعسەعە کوڕی معاویە ئامادەیی خۆیان نیشاندا و لەگەڵ دوانزە هەزار کەس سوار لەسەر ئێستر بەرێکەوتن. ئەسپەکانیان بەدوای خۆیاندا رادەکێشا. سەرکردەی خەڵکان سەبرە کوڕی باوکی روهم لەتایەفەی مناڵەکانی مالك کوڕی حەسل بوو.

پادگانەکان لەئەهواز لەشوێنی خۆیاندا بوون و پارێزگاری لەخەڵکانی ناوچەکە و موسوڵمانان دەکرا.

باوکی سەبرە لەگەڵ سوپاکەی لەکەنارەکانەوە بەرێکەوت. کەس رووبەرووی نەبوویەوە تا ئەو جێگەی دوای جەنگی تاووس رێگەی موسوڵمانانیان بەستبوو و چاوی بەخولەید کەوت. خەڵکانی ئیستەخر شەڕیان لەگەڵ موسوڵمانان دەکرد لەگەڵ دەستەیەکی کەم لەکەسانی دیکە.

کاتێك رێگەی موسوڵمانانیان بەست و ئەوانیان خستە تەنگانەوە، داوای هاوکارییان لەفارسەکان کرد و لەهەر ویلایەتێکەوە ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکان هاتن و دوای جەنگی تاووس رووبەرووی باوکی سەبرە بوونەوە کەبۆ هاوکاری موسوڵمانان هاتبوو. سەرکردەی فارسەکان شەهرەك بوو. شەڕ روویدا و خواوەند سەرکەوتنی بە موسوڵمانان بەخشی و فارسەکان شکستیان خوارد. موسوڵمانان ژمارەیەکی زۆر لەوانیان کوشت.

لەم جەنگەدا تازە پێگەیشتووانی بەسرە لەتازە پێگەیشتووانی هەموو ویلایەتەکانی دیکە باشتر بوون و پێش خەڵکانی کوفە کەوتنەوە. سوپای موسوڵمانان لەگەڵ تالانییەکان گەڕانەوە چوونکە عوتبە فەرمانی پێدا بوون بێ ئەوەی لەرێگە بوەستن، بگەڕێنەوە. لەبەسرە پەیوەستی بوون.

خەڵکانی بەسرە گەڕانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان. ئەو دەستە لەخەڵکانی هیجر کەرزگاریان ببوو، لەناو هۆزەکانی خۆیان بڵاو بوونەوە و خەڵکانی عەبدقەیس روویان کردە بازاری بەحرەین.

کاتێك عوتبە دەستی بەسەر ئەهوازدا گرت و فارس ئارام بوویەوە، داوای مۆڵەتی حەجی لەعومەر کوڕی خەتاب کرد کەمۆڵەتی پێدا و دوای تەواو کردنی

حەجەکەی، داوای لێکرد ئەو لەکاروبارەکان ببەخشێت و کەسێکی دیکە بۆ ئەو کارە راسپێرێت بەڵام سەروەری باوەڕداران رازی نەبوو و جەختی کردەوە کەدەبێت بۆ سەرکارەکەی بگەڕێتەوە. ئەو لەخوا پاڕایەوە و لەکاتی گەڕانەوە لە نەخلە مرد و لەوێ بەخاک سپێردرا.

عومەر ئاگادار بوویەوە و ڕۆشتە سەر گۆڕەکەی و وتی: ئەگەر ئەجەل دیاریکراو نەدەبوو و بەفەرمانی پێنووس نەدەنووسرا، دەموت من تۆم کوشتووە. وەسفی کرد.

دەڵێت: بۆ عوتەبە لەناو موهاجیرەکان شوێنێك لەکوفە دەستنیشان نەکراو منداڵەکانی ماڵەکەی خۆیان لەفاختە کچی غەزوان بەمیرات بۆ مایەوە کەهاوسەری عوسمان کوڕی عەفان بوو. خوباب موالی ئەو، درێژەی بەرێچکە و شێوازی ئەودا و هیچ شوێنێکیان بۆ ئەویش لەبەر چاو نەگرت.

مەرگی عوتەبە سێ ساڵ و نیو دوای جیابوونەوەی لەسەعد لەمەداین روویدا.

باوکی سەبرە کوڕی روهم جێگەی عوتەبەی گرتەوە و لەگەڵ کارگوزارەکانی خۆی لەشوێنەکانی خۆیان مانەوە. پادگانەکانی ئەو لەرووباری تیری و مەنازر و بازاری ئەهواز و سەرق بوو. هورمەوزان لەرامهورموز ژیانی بەسەر دەبرد کەپەیمانی ئاشتییان لەگەڵ بەستبوو. لەسەر شارەکانی شوش و جوندیشاپوور و بونیان و مێهرەگانی قەزەق پەیمانی ئاشتی واژۆ کرا. ئەو سوپای عەلا کوڕی حەزرەمی لەرێگەی دەریاوە بردی، رزگاری بوو و گەڕانەوە بۆ بەسرە و ئەوانیان بەشەرکەرانی تاووس ناو دەبرد.

عومەر کوڕی خەتاب پاشماوەی ئەو ساڵە باوکی سەبرەی وەك کارگوزاری بەسرە هێشتەوە و لەساڵی دووەمی مەرگی عوتەبە، موغەیرە کوڕی شوعبەی وەك کارگوزاری بەسرە دەستنیشان کرد کەپاشماوەی ئەو ساڵە و ساڵی دواتر لەبەسرە مایەوە و کەس نەبووە ئەرك بۆی و ئاسوودە بوو و جگە لەو کێشەی لەنێوان ئەو و ئەبوبەکرە روویدا، پێشهاتێکی ئەوتۆ پێشنەهات.

دوای ئەو، سەروەری باوەڕداران، باوکی موسای کردە کارگوزاری بەسرە. دواتر ئەوی بۆ کوفە نارد و عومەر کوڕی سوراقەی کردە کارگوزاری بەسرە، دواتر عومەر کوڕی سوراقەی ناردە کوفە و باوکی موسای لەکوفەوە گەڕاندەوە بۆ بەسرە و جارێکی دیکە کاروبارەکانی ئەو شارەی گرتەدەست.

بەپێی گێڕانەوەی سەیف گرتنی رامهورموز و شوش و شوشتەر لەم ساڵە، یانی ساڵی حەفدەیەم روویدا. هورموزانیش لەم ساڵەدا ئەسیر کرا.

## گرتنی ئەو ویلایەتانە بە پێی گێڕانەوەی سەیف

دەڵێت: یەزدگێرد لەخەمی ئەوەی لەدەستیدا بوو، بەردەوام فارسەکانی هان دەدا.

دەڵێت: یەزدگێرد لەو کاتەدا لەمەرو و نامەی بۆ خەڵکانی فارس نووسی، ڕق و کینەی خۆی بیرخستنەوە و سەرکۆنەی کردن، ئەی خەڵکانی فارس، عەرەبەکان سواد و سنورەکانی دەوروبەر و ئەهوازیان لەدەستی ئێوە دەرهێنا، بەمەیش بەسەندەیان نەکرد و هاتنە ناو سەرزەمین و دیاری ئێوە.

خەڵکانی فارس کەوتنە جموجۆڵ و نامەیان بۆ خەڵکانی ئەهواز نووسی و بەڵێنی هاوکاری کردنی یەکتریاندا.

دەڵێت: حێرقوس کوڕی زوهەیر ئاگادار بوویەوە، جەزْ و سەلما و حەرەملە بەهۆی غالیب و کەلیب ئاگادار بوونەوە و سەلما و حەرەملە نامەیان بۆ سەروەری باوەڕداران و موسوڵمانانی بەسرە نووسی. نامەکەی سەلما زووتر لەنامەکەی حەرەملە گەیشت. عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ سەعد نووسی: سوپایەکی فراوان لەگەڵ نەعمان کوڕی موقرین بۆ ئەهواز ڕەوانە بکە بیٚ وەستان. سوەید کوڕی موقرین و عەبدوللە کوڕی زوئەلسەهمەین و جەریر کوڕی عەبدوللەی حەمیر و جەریر کوڕی عەبدوللەی بیجلیش بنێرە تا لەبەرابەر هورموزان ئوردوو لێبدەن و راستیی کارەکانی ئەویان بۆ دەرکەوێت. سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ باوکی موسا نووسی تا سوپایەك بۆ ئەهواز ڕەوانە بکات و سەهل کوڕی عودەی بکاتە سەرکردەیان. بەرائ کوڕی مالك و عاسم کوڕی عەمرۆ و مەجزات کوڕی سور و کەعب کوڕی سور و عەرەفجە کوڕی هەرسیمە و حوزەیفە کوڕی موحسین و عەبدولرەحمان کوڕی سەهل و حەسین کوڕی مەعقەدیش لەگەڵ ئەو ڕەوانە بکە و سەرکردەی هەموو سوپاکەی کوفە و بەسرە باوکی سەبرە بێت و هەرکەس پەیوەستی دەبێت، هاوکاری ئەو بکات.

دەڵێت: نەعمان کوڕی موقرین لەگەڵ خەڵکانی کوفە بەرێکەوت و لەقووڵایی سوادەوە ملی رێگەی گرتەبەرو لەبەرابەر میشان لەدیجلە گوزەری کرد و لەرێگەی

دەشتی ئـەهوازەوە بـۆ پێشەوە ڕۆشت. موسـوڵمانان سـوار ئێستر و ئەسپەکانیان بەدوای خۆیاندا رادەکێشا. گەیشتە رووباری تیری و پەڕییەوە و لەمەنازر و بازاری ئەهوازیش گوزەری کرد و حێرقوس و سەلما و حەرەملەی بەجێهێشت و رووبەرووی هورموزان ئوردووی لێدا.

دەڵێت: لەو کاتەدا هورموزان لـەرامهورموز و کاتێك لەبەرێکەوتنی نەعمان کوڕی مـوقرین ئاگـادار بوویـەوە، دەسـتی پێشخـست و هیـوادار بـوو تێکـی بـشکێنێت. هورمـوزان پـشتی بـەهاوکاری خـەڵکانی فـارس بەسـتبوو و یەکـەم دەسـتەی هێـزی پشتیوان گەیشتە شوشتەر. نەعمان و هورموزان لەئەربەك رووبەرووی یەکبوونەوە و شـەڕێکی قورسـیان دەسـتپێکرد. خواوەنـد شکـستی بەسـوپاکەی هورمـوزان هێنـا و رامهورموزی بەجێهێشت و رووی کردە شوشتەر. نەعمانیش لەئەربەکەوە رووی کردە رامهورمـوز. دواتـر رووی کـردە ئیـزە و تیرویـە بـۆ ئیـزە پـەیمانی ئاشـتی بەسـت و نەعمان رازی بوو. ئەوی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ رامهورموز و لەوێ مەنزڵی گرت.

دەڵێت: کاتێك سەروەری باوەڕداران بۆ سەعد و باوکی موسا و سوهەیل نامـەی نووسی و نەعمان و سەهل بەرێکەوتن، نەعمان لەگەڵ سوپاکەی کوفە پێش سـەهل و سوپاکەی بەسرە کەوتەوە هورموزانی تێکشکاند. دواتـر سـەهل و سـوپاکەی بەسـرە هاتن و لەبازاری ئەهواز نیشتەجێ بوون و دەیانویست بڕۆنە ناو رامهورموز.

لـەبازاری ئـەهواز لـەرووداني جەنگەکـە ئاگـادار بوونـەوە و لـەبازاری ئـەهوازەوە روویان کردە شوشـتەر و رێگـەی ئـەو شـارەیان گرتەبـەر. نـەعمانیش لـەرامهورموزەوە بەمەبەسـتی شوشـتەر بەرێکـەوت و سـەلما و حەرەملـە و حێرقـوس و زوهـەیریش بەرێکەوتن و هەموویان لەبەرابەر شوشتەر دابەزین.

نـەعمان سـەرکردەی خـەڵکانی کوفـە و خـەڵکانی بەسـرە لەیـەك کاتـدا چـەندین سـالاریان بـوو. هورمـوزان و سـوپاکەی، خـەڵکانی فـارس و کێوەکـان و ئـەهواز، لەخەندەکەکان بوون.

موسـوڵمانان رووداوەکـەیان بـۆ سـەروەری بـاوەڕداران نووسـی و بـاوکی سـەبرە داوای هاوکـاری لێکـرد و بـاوکی موسـای بـۆ هاوکـاری ئـەو نـارد و بەرێکـەوت. سەرکردەی سوپاکەی کوفە نـەعمان و سـەرکردەی سـوپاکەی بەسرە باوکی موسـا و باوکی سەبرە سەرکردەی هەردوو دەستەکە بوو.

بۆ ماوەی چەند مانگ گەمارۆیان خستە سەر هورموزان و سوپاکەی و کەسانێکی زۆریان لێ کوشتن. بەرا کوڕی مالك لەدەسپێکی گەمارۆکە تا ئەو کاتەی خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی، سەد شەڕکەری کوشت جگە لەوکەسانەی لەشوێنەکانی دیکە بەدەستی ئەو کوژران. مەجزا کوڕی سوریش بەم ژمارە لەفارسەکانی کوشت. کەعب کوڕی سور و باوکی تەمتەمەی بەهەمان ئەندازە. چەند کەسێکیش لەخەڵکانی بەسرە نزیکەی سەد کەسیان لەفارسەکان کوشت لەگەڵ چەند کەسێك لەخەڵکانی کوفە کەحەبیب کوڕی قورە و ڕێبعی کوڕی عامر و عامر کوڕی عەبد ئەسوەد لەناویاندا دەبینران. لەناو سەرکردەکانی سوپاکە کەسانێك لەو ژمارە زیاتریان کوشتبوو.

لەشەڕی شوشتەر، فارسەکان لەسەنگەرەکانی خۆیانەوە هەشتا جار هێرشیان کردە سەر عەرەبەکان. هەندێ کات شکستیان دەخوارد و هەندێ کات سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا. لەدووایین هێرش، جەنگەکە دژوار و موسوڵمانان بەبەرا یان وت: لەخوا بپاڕێرەوە تا شکستیان پێ بێنێت.

بەرا وتی: خواوەندا شکستیان بدە و پێگەی شەهید بوون بەمن ببەخشە.

دەڵێت: موسوڵمانان شکستیان بەدوژمن هێنا و بۆ خەندەکەکان پاشەکشێیان پێکردن. دواتر هێرشیان کردە سەر خەندەکەکان و بۆ ناو شارەکە پاشەکشێیان کرد. موسوڵمانان دوژمنیان لەناو شارەکە گەمارۆدا.

لەو کاتەی لەناو شارەکە دوژمن گەمارۆی لەسەر و شەڕ درێژەی کێشابوو، یەکێك ڕۆشتە لای نەعمان و داوای ئەمانی لێکرد بەو مەرجەی ڕێگەیەکیان نیشان بدات تا بتوانن بڕۆنە ناوشارەکە. تیرێکیان بۆ شوێنەکەی باوکی موسا هاویشت لەگەڵ نووسراوێك بەم ناوەڕۆکە: من بڕوام بەئێوە هەیە و ئەمانم دەوێت و لەبەرابەردا ڕێگەیەکتان نیشان دەدەم. لەوێوە وەرنە ناو شارەکە و گرتنی شارەکە لەئەستۆی خۆتاندایە.

دەڵێت: تیرێکیان هاویشت و ئەمانیان پێبەخشی. ئەو تیرێکی دیکەی هاویشت و وتی: لەو شوێنەی ئاو دێتەدەر، هێرش بێنن و دەتوانن دەست بەسەر شارەکەدا بگرن.

باوکی موسا موسوڵمانانی هاندا و عامر کوڕی عەبدقەیس و کەعب کوڕی سور و مەجزا کوڕی سور و حەسەکە کوڕی حەبتی و کەسانێکی زۆریتر ئامادەیی خۆیان نیشاندا و شەوانە ڕۆشتنە ئەو شوێنە.

دەڵێت: کاتێك ئەو پیاوە هات، نەعمانیش پێشنیاری بەسوپاکەی خۆی کرد و سوەید کوڕی مەسعەبە و وەرقە کوڕی حارس و بیشر کوڕی ڕەبیعەی خەسعەمی و نافیع کوڕی زەیدی حەمیری و عەبدوللە کوڕی بیشر هیلالی ئامادەیی خۆیان نیشاندا و لەگەڵ کەسانێکی زۆر ڕۆشتن و لەشوێنی ڕۆشتنە ناو ئاوەکە، چاویان بەخەڵکانی بەسرە کەوت. سوەید و عەبدوللە کوڕی بیشر ڕۆشتنە ناو و خەڵکانی کوفە و بەسرە، بەدوای ئەواندا بەرێکەوتن. کاتێك لەناو شارەکە کۆبوونەوە، تەکبیریان وت. موسوڵمانانیش کە لەدەرەوە ئامادە بوون، تەکبیریان وت و دەرگاکان کرانەوە و لەشارەکە جەنگیان دەستپێکرد. هەموو شەڕکەرانیان کوشت. هورموزان ڕووی کردە قەڵاکە و ئەو کەسانەی لەرێگەی ئاوەکەوە ڕۆشتبوون، دەوریان گرت و کاتێك ئەویان بینی، لەدەوری کۆبوونەوە، وتی: هەرچیتان دەوێت ئەنجامی بدەن، دەبینن من و ئێوە لەم شوێنە تەنگەدا گیرمان خواردووە، سەد تیر لەناو تیردانەکەمدایە و سوێند بەخوا تا دوایین تیر، کەس دەستی بەمن ناگات و تیرەکانی من هەڵە ناکات، ئێوە چ سوودێکتان پێ دەگات ئەگەر من سەد کەس لەئێوە بکوژم و بریندار بکەم، ئەوسا من ئەسیر بکەن.

وتیان: چیت دەوێت؟

وتی: دەمەوێت دەستم بخەمە دەستی ئێوە تا سەروەری باوەڕداران فەرمانی خۆی لەمبارەوە دەربکات و فەرمانەکانی خۆی سەبارەت بەمن بنێرێت.

وتیان: ڕازین.

هورموزان کەوانەکەی فڕێداو خۆی تەسلیم کرد. ئەویان بەستەوە. موسوڵمانان تالانییەکانیان دابەش کرد. هەر سوارەیەك سێ هەزاری پێبڕا و پیادەکان یەك هەزار.

دەڵێت: باوکی سەبرە داوای خاوەنی تیرەکەی کرد. ئەو و ئەو کەسەی پێشتر هاتبووە لای موسوڵمانان و ڕێگەکەی نیشاندابوون، هاتن و وتیان: ئەمانی ئێمە و ئەوکەسانەی لەگەڵ ئێمەدا بوون، لەدەستی کێدایە؟

وتیان: کێتان لەگەڵ بووە؟

وتیان: ئەوانەی لەکاتی هاتنی ئێوە، دەرگای ماڵەکەیان لەسەر خۆیان داخستووە. موسوڵمانان ئەمانیان پێبەخشی.

دەڵێت: ئەو شەوە ژمارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان کوژرا و مەجزا کوڕی سور و بەرا کوڕی مالك لەو کەسانە بوون کەبەدەستی هورموزان کوژران.

دەڵێت: باوکی سەبرە شوێن هەڵاتووانی شوشتەر کەوت کەدەیانویست بڕۆنە ناو شوش. نەعمان و باوکی موسای لەگەڵ خۆی برد. هورموزانیش هاوڕێیەتی دەکردن. کاتێك گەیشتنە شوش، گەمارۆیان خستە سەر شارەکە و رووداوەکەیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی.

سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ عەمرۆ کوڕی سوراقە نووسی تا بەرەو مەدینە بڕوات. نامەی بۆ باوکی موسا نووسی و ئەوی وەك کارگوزاری بەسرە دەستینشان کرد و ئەمە جاری سێیەم بوو ئەم کارەی بەو دەسپارد. عەمرۆی دوو جار وەك فەرمانڕەوای بەسرە دەستنیشان کردبوو. نامەی بۆ زەر کوڕی عەبدوڵلەی فەقیمی نووسی بەرەو جوندیشاپوور بەرێکەوێت و ئەو، بەرێکەوت و لەبەرابەر ئەو شارە دابەزی. باوکی موسا کەتا گەڕانەوەی وەڵامی سەروەری باوەڕداران لەوێ مابوویەوە، دوای گەیشتنی نامەی عومەر کوڕی خەتاب، بەرەو بەسرە بەرێکەوت.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران، ئەسوەد کوڕی رەبیعەی بەنازناوی موقتەریب کە لەمناڵەکانی رەبیعە کوڕی مالك بوو، وەك سەرکردەی سوپاکەی بەسرە دەستنیشان کرد. ئەسوەد و زەڕ چاویان بە پێغەمبەر(د.خ) کەوتبوو و لەریزی موهاجیرەکان لەقەڵەم دەدران. ئەسوەد بە پێغەمبەری وتبوو: هاتووم تا بەئاخاوتن لەگەڵ تۆ لەخوا نزیك ببمەوە. پێغەمبەر(د.خ) ئەوی بە(موقتەریب) ئەو کەسەی لەخوا نزیك دەبێتەوە، ناو برد.

زەیدیش، ڕۆشتە لای پێغەمبەر(د.خ) و وتی: پاشماوەی ئێمە لەناوچووە و برای زۆرمان هەیە، دۆعامان بۆ بکە.

پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: خواوەندا، مناڵەکانی زەید فراوان بکە، فراوان بوون.

دەڵێت: باوکی سەبرە دەستەیەکی بۆ لای سەروەری باوەڕداران نارد. ئەنس کوڕی مالك و ئەحنەف کوڕی قەیس لەناویاندا دەبینران. هورموزانی لەگەڵ ئەواندا

نارد کە لەگەڵ باوکی موسا روویان کردە بەسرە و لەوێوە بەمەبەستی ڕۆشتن بۆ مەدینــە، درێــژەیان بەســەفەرەکەیاندا. کاتێــك گەیــشتنە مەدینــە، هورموزانیــان بەدەستێك جل وبەرگی رازاوەی خۆی و تاجێکی یاقووت نیشان کەزێر و خشڵی پێوە هەڵواسرابوو بردە لای سەروەری باوەڕداران و موسوڵمانان تا ببیینن. ڕۆشتنە نـاو خــەڵکان و ویــستیان بڕۆنــە نـاو مـاڵی ســەروەری بـاوەڕداران، بـەڵام ئـەویان نەدۆزییەوە. کاتێك پرسیاری ئەویان کرد، وتیان: لەگەڵ دەستەیەك لەنێردراوەکانی کوفە لەمزگـەوت کۆبۆتـەوە. بـۆ بینـینی ئـەو رووبـان لەمزگـەوت کـرد بـەڵام لـەوێش نەیانبینی و کاتێك لەمزگەوت هاتنەدەر، لای چەندین منالی مەدینە کەسەرقاڵی گەمە کردن بوون، گوزەریان کـرد، وتیـان: بـۆ بەدوای سـەروەری بـاوەڕداران دەگـەڕێن؟ ئـەو لای راستی مزگەوتەکە خەوتووە و کڵاوەکەی خستۆتە ژێر سەر.

دەڵێـت: سـەروەری بـاوەڕداران لەگـەڵ نێردراوانــی کوفـە کۆبوویــەوە و کـڵاوی لەسەردا بوو. کاتێك کۆتاییان بەگفتوگۆکە هێنا و بەتـەنیا مایـەوە، کڵاوەکـەی لەسـەر لابرد و خستیە ژێر سەری و خەوت.

ڕۆشتن و خەڵکانیش بەدوایانەوە بوون. کاتێك سەروەری باوەڕدارانیان بینی، لای ئەو دانیشتن. لەمزگەوت، خەو و بێداری تەنیا بۆ عومـەر کـوڕی خـەتاب بـوو چوونکە قامچی بەدەستەوە بوو.

هورموزان وتی: عومەر کوا؟

وتیان: ئەمەیە.

نێردراوان ئیشارەیان بۆ خەڵکان کرد تا بێدەنگ بن.

هورموزان گوێی لەنێردراوەکان گرت و وتی: پاسەوان و پەردەدارەکانی لەکوێن؟

وتیان: پاسەوان و پەردەدار و دەبیر و دیوانی نییە.

وتی: دەبێت پێغەمبەر بێت.

وتیان: کاری پێغەمبەران ئەنجام دەدات.

خـەڵکان زۆریـان قسە کـرد و سـەروەری بـاوەڕداران بەدەنگەدەنگی ئـەوان لەخـەو هەستا و دانیشت. سەیری هورموزانی کرد و وتی: هورموزان؟

وتیان: بەڵێ.

عومـەر سـەیری جل و بەرگەکـەی کـرد و وتـی: لەجەهەننـەم پـەنا بـۆ خـوا دەبـەم و

داوای هاوکاری لەو دەکەم. دواتر وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەهۆی ئیسلامەوە کەسانی وەك تۆی ریسوا کرد. ئەی موسولمانان، پشت بەم دینە ببەستن و رێنومایییەکانی پێغەمبەرەکەتان بەکار ببەن، دنیا بەرەو لەخۆبایی بوونتان نەبات چوونکە فریودەرە.

نێردراوەکان وتیان: ئەمە پاشای ئەهوازە، قسەی لەگەڵ بکە.

عومەر وتی: تا ئەو کاتەی ئەم جل و بەرگە و زێر و زیوەی پێوە بێت، قسەی لەگەڵ ناکەم.

هورموزان جل و بەرگەکانی بەری داکەند جگە لەوەی خۆی پێ داپۆشی. جلێکی زبریان کردەبەری. سەروەری باوەڕداران وتی: هێی هورموزان. ئەنجامی خیانەت و بەڵێنەکانی خواوەندت چۆن بینی؟

وتی: ئەی عومەر، ئێمە و ئێوە گرفتاری جاهلییەت بووین، خواوەند ئێمە و ئێوەی بەخۆمان سپاردبوو و لەبەر ئەوەی نە لەگەڵ ئێمە بوو نە لەگەڵ ئێوە، بەسەرتاندا زاڵ بووین و ئێستا کەخوا لەگەڵتانە، بەسەرماندا زاڵ بوون.

سەروەری باوەڕداران وتی: لەرۆژگاری جاهلییەت بۆیە بەسەر ئێمەدا زاڵبوون چوونکە یەك دەستە و ئێمە پرژ و بلاو بووین. وتی: پاساوی تۆ چییە و بۆ پەیمانەکەی نێوان خۆت و موسولمانانت شکاند؟

وتی: دەترسم پێش ئەوەی باسی بکەم، بمکوژیت؟

وتی: لەوە مەترسە.

هورموزان داوای ئاوی کرد، لەکاسەیەکی ناشیریندا ئاویان بۆ هێنا و وتی: ئەگەر لەتینویەتی بمرم، ناتوانم لەو کاسەیە ئاو بخۆمەوە.

لەکاسەیەکی دیکە ئاویان بۆ هێنا، وەریگرت، دەستی دەلەرزی، وتی: دەترسم پێش ئەوەی بیخۆمەوە، بکوژرێم.

سەروەری باوەڕداران وتی: تا ئاوەکە نەخۆیتەوە، کارم پێت نییە.

هورموزان ئاوەکەی ڕشت.

عومەر کوری خەتاب وتی: دووبارە ئاوی بۆ بێنن، پەسەندی نەکرد بەتینویەتی بیکوژێت.

وتی: پێویستم بەئاو نییە و دەمویست بەهۆیەوە ئەمان لەتۆ وەربگرم.

وتی: دەتكوژم.

وتی: ئەمانت پێ بەخشیوم.

وتی: درۆ دەكەیت.

ئەنس وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ڕاست دەكات، ئەمانت پێ بەخشیوە.

عومەر وتی: ئەی ئەنس، هاوار لەتۆ، من بەبكوژی مەجزا و بەرا ئەمان دەدەم؟ سوێند بەخوا یا بەڵگەیەكی ڕوون دەهێنیتەوە یا سزای ئەو كارەت دەدەم.

وتی: پێت وت تا ئەو كاتەی پێم نەڵێیت، كارم پێت نییە و هەروەها وتت تا ئاوەكە نەخۆیتەوە، ناتكوژم.

كەسانی دەوروبەری سەروەری باوەڕداران وتەكانی ئەویان پشتڕاست كردەوە.

عومەر ڕووی كردە هورموزان و وتی: فریوتدام، سوێند بەخوا تەنیا لەموسوڵمانان فریو دەخۆم.

هورموزان باوەڕی بەئیسلام هێنا و عومەر، مانگانەی دوو هەزاری بۆ بڕییەوە و لەمەدینە نیشتەجێی كرد.

كوڕی عیسا دەڵێت: ئەو ڕۆژەی هورموزان هات، تا ئەو ڕۆژەی وەرگێڕەكە هات، موغەیرە كوڕی شوعبە كاری وەرگێڕەكەی ئەنجام دەدا چوونكە كەمێك لەفارسی تێدەگەیشت. عومەر كوڕی خەتاب بەموغەیرەی وت: بڵێ لەكام سەرزەمینیت؟

موغەیرە وتی: از كدام ارضیە (لەكام زەوییت؟)

هورموزان وتی: مێهرەگانی.

عومەر وتی: سەبارەت بەپاساوەكەی خۆت قسە بكە.

وتی: هاوشێوەی زیندوو قسە بكەم یا مردوو.

وتی: زیندوو.

وتی: ئەمانت پێدام.

عومەر وتی: فریوت دام و فەرمانی ئەو كەسەی لەجەنگ فریودرابێت، ئاشكرایە، سوێند بەخوا ئەمانت پێ نادەم تا ئەو كاتەی باوەڕ بەئیسلام دێنیت.

دەڵێت: هورموزان دڵنیا بوو ئەگەر باوەڕ نەهێنێت، دەكوژرێت و باوەڕی هێنا. سەروەری باوەڕداران مانگانەی دوو هەزاری بۆ دیاری كرد و لەمەدینە ماڵی پێدا.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بەموغەیرەی وت: فارسی نازانیت، هەرکەس لەئێوە فێری فارسی ببێت، گێژ دەبێت و کاتێك گێژ بێت، لەڕ دەبێت و کەسی فارسی عەرەبەکان تێکدەشکێنێت. زەید هات و قسەی لەگەڵ کرد و سەروەری باوەڕدارانی لەوتەکانی ئەو ئاگادار کردەوە و وتەکانی عومەر کوڕی خەتابی بۆ هورموزان وەردەگێڕایەوە.

حەسەن دەڵێت: عومەر بەنێردراوانی وت: ئێوەی موسوڵمان ئازاری ئەهلی زەممە دەدەن بۆیە ئەوان پەیمانەکانی خۆیان دەشکێنن.

وتیان: تەنیا چاکەکارییان لەگەڵ دەکەین.

وتی: کەواتە بۆ ڕێز لەپەیمانەکەیان ناگرن. بەلاّم لەوتەکانی هیچ کام لەوان ئەنجامێکی باشی دەستنەکەوت بۆ ئەوەی پشتی پێببەستێت جگە لەئەحنەف کەوتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، پێتی دەڵێم، ڕێگەی پێشڕەویت لەناو سەرزەمینی ئەوان لەئێمە گرتووە و فەرمانت پێداوین بەوەی لەژێر دەستماندایە، بەسەندە بکەین. پاشای فارسەکان زیندووە و لەناو ئەواندایە و تا ئەو کاتەی ئەو لەناو ئەواندا بێت، دژایەتی ئێمە دەکەن چوونکە هەرگیز دوو پاشا ناتوانن لەیەك شوێن کۆببنەوە و سازگار بن تا ئەوەی یەکیان ئەوی دیکە دەرپەڕێنێت. بەو شێوەی بینیومە، ئەوەی لەوان دەستمان کەوتووە بەهۆی ئەو بزوتنەوانەوەیە کەپاشاکەیان هانیان دەدات و ئەو کارە بەردەوام دەبێت تا مۆڵەتی پێشڕەوی لەدیاری فارسەکان بەموسوڵمانان بدەیت و پاشاکەیان لەناو ببەین و دەسەلاّتی لەهێزی خەڵکەکەی جیا بکەینەوە بەو هیوایەی فارسەکان ئارام بگرن.

سەروەری باوەڕداران وتی: سوێند بەخوا ڕاست دەکەیت.

دواتر پێداویستی نێردراوانی دابین کرد و گەڕایەوە.

دەڵێت: نامەیان بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی کەخەڵکانی نەهاوەند کۆبوونەتەوە و خەڵکانی مێهرگانی قەزەق و خەڵکی ویلایەتی ئەهواز لەسەر بۆچوون و داوای هورموزان یەکیان گرتووە. لەم کاتەدا سەروەری باوەڕداران مۆڵەتی پێشڕەوی بە موسوڵماناندا.

## گرتنی شوش

زاناکان سەبارەت بەشوش بۆچوونەکانیان جیاوازە. مەدائینی وەك لەگێڕانەوەی باوکی زەید ئامـاژەی پێـدراوە، دەڵێـت: کاتێـك هـەڵاتووانی جەلـەولا پەیوەسـتی یـەزدگێرد بـوون کـە لـەحیلوان ژیـانی بەسـەر دەبـرد، کەسـانی نزیـك و موبـدەکانی کۆکردەوە و وتـی: ئـەم خەڵکـە رووبـەرووی هـەر دەسـتەیەك دەبنـەوە، شکستیان پـێ دەهێنن، بۆچوونی ئێوە چییە؟

موبید وتی: بۆچوونی من ئەوەیە بڕۆیت و لەئیستەخر سەنگەر بگریت چوونکە ماڵی وڵاتەکەمانە. خەزێنەکانی وڵات بۆ ئەوێ ببە و سوپاییەکان ڕەوانە بکە.

یەزدگێرد بۆچوونەکەی پەسەند کرد و رووی کردە ئیسفەهان و سیای بانگ کرد و ئەوی لەگەڵ سێسەد کەس نارد کەحەفتایان لەگەورەکانی فارس بوون. فەرمانی پێدان لەهەر شارێك، ئەو کەسانەی دەخوازێت، هەڵیانبژێرێت.

دەڵێت: سیا ڕۆشت و یـەزدگێرد دوای ئـەوان بەرێکـەوت و لەئیستەخر دابـەزی. باوکی موسا گەمارۆی خستبووە سەر شوش. یەزدگێرد سوپایەکی بۆ شوش نارد و هورمـوزانی ڕەوانـەی شوشـتەر کـرد. سـیا لەکەلبانییـە دابـەزی. خـەڵکی شـوش لەجەنگی جەلەولا ئاگادار بوونـەوە و زانیـان یـەزدگێرد وەك کەسێکی هـەڵاتوو رووی کردۆتە ئیستەخر. داوای ئاشتییان لـەباوکی موسـای ئەشعەری کـرد و ئـەو، رازی و رووی کـردە رامهورموز. سیا لەکەلبانیـە و کاروبـاری موسـوڵمانان لەبـەر چـاوی ئـەو گەورە و مایـەوە تـا ئـەو کاتـەی بـاوکی موسـا رووی کردە شوشتەر. لـەم کاتـەدا سـیا شوێنەکەی گۆڕی و لەنێوان رامهورموز و شوشـتەر جێگیر بـوو تـا ئـەو کاتـەی عـەمار کوڕی یاسر هـات. سـیای ئـەو سـەرکردانەی لەئیسفەهانەوە هـاتبوون، کۆکردەوە و وتی: زانیوتانە ئێمە دەمانوت ئەم دەستە بەدبەخت و هـەژارە بەسـەر ئـەم وڵاتـەدا زاڵ دەبن و چوارپێکانیان لەئەیوانەکانی خوسرەو و کۆشکی پاشاکان پیسایی دەکـەن و ئەسپەکانیان بەدارەکان دەبەستنەوە، ئێستا وەك دەبینن زاڵ بوون و رووبەرووی هەر سوپایەك دەبنـەوە، شکستی پێـدێنن و روو دەکەنـە هـەر قەڵایـەك، دەسـتی بەسـەردا دەگرن. لێکۆڵینەوە لەبارودۆخی خۆتان بکەن.

وتیان: بۆچوونی ئێمە بۆچوونی تۆیە.

وتی: هەرکام لەئێوە لەگەڵ کەسانی نزیکی خۆتان کۆببنەوە، بۆچوونی من ئەوەیە باوەڕ بەدینەکەی ئەوان بێنین.

شیرویەی لەگەڵ دەکەس لەشاسوارەکانی فارس بۆ لای باوکی موسای ئەشعەری نارد تا بەچەندین مەرجی دیاریکراو باوەڕ بەئیسلام بێنن.

دەڵێت: شیرویە ڕۆشتە لای باوکی موسا و وتی: خوازیارین باوەڕ بەدینەکەی ئێوە بێنین بەو مەرجەی شان بەشانی ئێوە لەگەڵ عەجەمەکان بجەنگین و دژی عەرەبەکان نەجەنگین، ئەگەر لەگەڵ عەرەبەکان جەنگاین، ئەوان لەئێمە دوور بخەنەوە، لەهەر شوێنێك بمانەوێت، نیشتەجێ بین و بەئارەزووی خۆمان پەیوەستی یەکێك لەدەستەکانی ئێوە ببین، باشترین مانگانەمان بۆ دیاری بکەن و گەورەترین سەرکردەتان لەمبارەوە پەیمان بدات.

باوکی موسا وتی: بەوە رازی نابین، بەڵکو ئەرك و لێپرسراویەتی ئێوە هاوشێوەی ئێمە دەبێت.

وتیان: رازی نابین.

باوکی موسا نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی. وەڵامی بۆ هاتەوە: بەداواکانیان رازی ببە. باوکی موسا پەیمانی بۆ ئەوان نووسی و باوەڕیان بەئیسلام هێنا و شان بەشانی ئەو گەمارۆیان خستە سەر شوشتەر. بەڵام باوکی موسا شەڕ و گیان بەخشینی ئەوتۆی لەوان نەبینی و بەسیای وت: ئەی کوێر، تۆ و هاورێکانت بەو شێوەین کەئێمە بینیبوومان.

وتی: لەم کارەدا هاوشێوەی ئێوە نین. زانایی ئێمە هاوشێوەی زانایی ئێوە نییە و حەرەمەکانمان لای ئێوە نییە تا پارێزگارییان لێ بکەین، مانگانەی ئێمەتان وەك باشترین کەسانی خۆتان دیاری نەکردووە، ئێمە سیلاح و چوارپێمان هەیە و ئێوە نیتانە.

باوکی موسا لەمبارەوە نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی. وەڵامی دایەوە: بەئەندازەی هەوڵەکانیان مانگانەی باشتریان بۆ ببڕەوە، باشترین شتێك کەعەرەبێك وەریگرتووە. باوکی موسا بۆ سەد کەس لەوان مانگانەی دوو هەزار هەزاری دیاری کرد وشەش کەسیان دوو هەزار و پێنسەدیان وەرگرت کەبریتی بوون لەسیا و

خوسرەو بەنازناوی مەقلاس و شەهریار و شیرویە و شەهرویە و ئەفروزین.

شاعیر لەمبارەوە دەڵێت:

((کاتێك فاروق هەوڵەکانی ئەوانی بینی

و بۆ ئەو کارەی ئەنجامی دەدا، زانا بوو

مانگانەی دوو هەزاری بۆ ئەوان دیاری کرد

سێسەد کەس لەوان وەك عەك و عەمیر مانگانەیان وەردەگرت.))

دەڵێت: لەولاتی فارس گەمارۆیان خستە سەر قەلایەکی تۆکمە، سیا لەکۆتاییەکانی شەو بەجل و بەرگی عەجەمەکان ڕۆشت و خۆی لەبن دیواری قەلاکە حەشاردا و جل و بەرگەکانی خوێناوی کرد. بەرەبەیان خەڵکانی ناو قەلاکە پیاوێکی عەجەمیان بینی و گومانیان کرد کەسێك لەخۆیانەوە و بریندار بووە. دەرگای قەلاکەیان کردەوە و ئەویان بردە ژوور. سیا هەستا و شەڕی لەگەڵ کردن تا ئەوەی لەدەرگای قەلاکە دووری خستنەوە و هەلاتن. ئەو، بەتەنیا دەرگای قەلاکەی کردەوە و موسوڵمانان هاتنە ناو قەلاکە.

دەستەیەك دەڵێن: سیا ئەو کارەی لەشوشتەر کرد.

دەڵێت: گەمارۆیان خستبووە سەر قەلایەك، خوسرەو رووی کردە قەلاکە و یەکێك لەوان لەسەر دیواری قەلاکەوە دەرکەوت و قسەی لەگەڵ کرد. خوسرەو ئەوی بەتیر کوشت.

بەلام سەیف لەکوڕی عوسمان دەگێڕێتەوە: کاتێك باوکی سەبرە و سوپاکەی لەبەرابەر شوش دابەزین و موسوڵمانان گەمارۆیان خستەسەر شارەکە، سەرکردەی خەڵکانی شوش شەهریار برای هورموزان بوو. چەندین جار لەگەڵ ئەوان جەنگان و هەموو جارێك خەڵکانی شوش دەستدرێژییان دەکردە سەر موسوڵمانان. رۆژێك راهیب و قەشەکان لەسەرەوەی قەلاکان دەرکەوتن و وتیان: ئەی عەرەبەکان، وەك زاناکان و پێشینانی ئێمە وتوویانە، تەنیا دەجال دەست بەسەر شوشدا دەگرێت یا ئەو سوپایەی دەجال لەناو ئەواندا بێت. ئەگەر دەجال لەگەڵ ئێوەیە، شارەکە دەگرن و ئەگەر لەگەڵ ئێوە نییە، بۆ گەمارۆی ئێمە مەمێننەوە.

دواتر هەواڵیان بۆهات کەباوکی موسا بوو بەکارگوزاری بەسرە و موقتەریب لەجیاتی باوکی موسا سەرکردای سوپای خەڵکانی بەسرەی گرتەدەست کەلەشوش

بوون. عەجەمەکان لەنەهاوەند کۆببوونەوە، نەعمان بەسەرکردایەتی سوپاکەی کوفە و هاوکاری باوکی سەبرە، گەمارۆی خستبووە سەر شوش، زەڕ گەمارۆی خستبووە سەر خەڵکانی نەهاوەند.

بڕیاردرا خەڵکانی کوفە لەگەڵ حوزەیفە روو بکەنە نەهاوەند. نەعمانیش بۆ بەرێکەوتن خۆی ئامادە کرد. دواتر بیری لەوە کردەوە پێش ڕۆشتن بۆ نەهاوەند هێرش بکاتە سەر شوش. دووبارە راهیب و قەشەکان هاتن و لەسەرەوەی دیواری قەڵاکە لەگەڵ موسوڵمانان قسەیان کرد و وتیان: ئەی عەرەبەکان لێرە مەمێننەوە چوونکە جگە لەدەجال کەس دەست بەسەر ئەم شارەدا ناگرێت یا ئەو خەڵکەی دەجاڵیان لەگەڵدا بێت. هاواریان لە موسوڵمانان کرد و ئەوان تووڕە بوون.

دەڵێت: ساف کوڕی سەید لەگەڵ نەعمان و لەناو سوارەکانی ئەودا بوو. موسوڵمانان هەموویان روویان کردە ئەوان و وتیان: پێش ئەوەی لەیەك جیا ببینەوە، شەڕیان لەگەڵ دەکەین. چوونکە هێشتا باوکی موسا بەرێنەکەوتبوو.

ساف تووڕە هاتە بەردەروازەی شوش و بەشەق تێی هەڵدا و وتی: بەزار بکرێرەوە. زنجیرەکان قرتان و کێلونەکان شکان و دەرگاکان کرانەوە و موسوڵمانان ڕۆشتنە ناو شارەکە. عەجەمەکان تەسلیم بوون و هاواری ئاشتی، ئاشتییان بەرز کردەوە. موسوڵمانان دوای ئەوەی ڕۆشتنە ناو شارەکە، بەداواکەی ئەوان رازی بوون بەڵام ئەوەی پێش ئاشتی دەستیان کەوتبوو، لەناو خۆیاندا دابەشیان کرد. دواتر جیابوونەوە، نەعمان لەگەڵ خەڵکانی کوفە لەئەهوازەوە بەرێکەوت و لەماه دابەزی و باوکی سەبرە، موقتەریبی نارد و لەگەڵ زەڕ لەبەرابەر جوندیشاپوور دابەزی. نەعمان لەماه مایەوە تا خەڵکانی کوفە گەڕانەوە وئەوانی بەرەو نەهاوەند برد و کاتێك سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، ساف گەڕایەوە بۆ مەدینە و مایەوە. هەروەها زەڕ لەمەدینە مرد.

عەتییە لەیەکێك لەو کەسانەی لەگرتنی شوش بەشدار بوو، دەگێڕێتەوە: بەباوکی سەبرەیان وت: ئەمە پەیکەری دانیالی پێغەمبەرە لەم شارەدا.

باوکی سەبرە وتی: کارمان پێی چییە؟ پەیکەرەکەی لەدەستی خەڵکانی شوش هێشتەوە.

عەتییە دەڵێت: دانیاڵ لەدوای بەخت نەسر لەکەنارەکانی ئێران بوو و کاتێک سەردەمی مەرگی نزیک کەوتەوە و لەخەڵکانی دەوروبەری خۆی کەسی باوەڕداری نەبینی، نەیهێشت کتێبی خواوەند بەدەستی ناباوەڕان و کافرەکان بگات و تەسلیمی خواوەندی کرد و بەکوڕەکەی خۆی وت: بڕۆ کەنار دەریا و ئەم کتێبە بخەرە ناو دەریا.

دەڵێت: کتێبەکەی هەڵگرت بەلاّم دڵی نەهات، فڕیبدات، بەئەندازەی چوون و گەڕانەوە چاوەڕێی کرد و دواتر وتی: فڕمدا.

وتی: کاتێک فڕتدا، دەریا چی لێهات؟

وتی: هیچم نەبینی.

دانیاڵ تووڕە بوو، وتی: سوێند بەخوا فەرمانەکەی منت ئەنجام نەداوە.

کوڕەکە ڕۆشت و هاوشێوەی جاری یەکەم کتێبەکەی فڕنەدا، گەڕایەوە و وتی: فڕمدا.

وتی: کاتێک کتێبەکەت خستە ناو دەریا، دەریات چۆن بینی؟

وتی: شەپۆڵەکان بەرز بوونەوە و خرۆشا.

دانیاڵ تووڕە بوو، وتی: سوێند بەخوا ئەو کارەت نەکردووە.

جەختی لەکوڕەکەی کردەوە تا کتێبەکە بخاتە ناو دەریا.

کوڕەکەی ڕۆشتە کەنار دەریا و کتێبەکەی فڕدا. دەریا قەڵشتی برد و زەوی دەرکەوت و نوورێک هاتەدەر و کتێبەکە لەناو نوورەکەدا نوقم بوو. دواتر زەوی بەسترایەوە و ئاو گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی.

کاتێک جاری سێیەم کوڕەکە هاتەوە بۆ لای دانیاڵ، لەو پێشهاتە ئاگاداری کردەوە و وتی: هەنووکە قسەکەت ڕاستە.

دانیاڵ لەشوش مرد و خەڵکان لەپیرۆزی ئەو داوای بارانیان دەکرد. کاتێک موسوڵمانان دەستیان بەسەر شوشدا گرت، پەیکەرەکەیان بردە لای ئەوان بەلاّم تەسلیمی خەڵکانی شوشیان کردەوە و کاتێک باوکی سەبرە بەرەو جوندیشاپوور بەڕێکەوت، باوکی موسا لەشوش مایەوە و سەبارەت بەپەیکەرەکەی دانیاڵ نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی. عومەر کوڕی خەتاب فەرمانی ئەسپەردە کردنی ئەوی دەرکرد. موسوڵمانان کفنیان کرد و دواتر بەخاکیان سپارد.

باوکی موسا نامەی بۆ عومەر نووسی: ئەو ئەنگوستیلەی لەگەڵ پەیکەرەکدا بوو، بەئێمەیە.

عومەر نووسی: بیکە بەئەنگوستیلەی خۆت، نگینی ئەنگوستیلەکە نەخشی پیاوێك بوو لەنێوان دوو شێر.

لەم ساڵەدا، یانی ساڵی حەفدەیەم، موسوڵمانان لەگەڵ خەڵکانی جوندیشاپوور پەیمانی ئاشتییان بەست.

## کاری موسوڵمانان لەجوندیشاپور

موهەلیب دەڵێت: کاتێك باوکی سەبرە لەجەنگی شوش رزگاری بوو، لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت و لەبەرابەر جوندیشاپور ئوردووی لێدا. زەڕ کوڕی عەبدوللە گەمارۆی خستبووە سەر ئەو شارە. لەوێ مانەوە. بەرەبەیان و ئێواریّ دەجەنگان تا ئەوەی لەلایەن موسوڵمانانەوە ئەمان نامە فرێدرا بۆ ناو شارەکە.

لەگرتنی جوندیشاپور تا گرتنی نەهاوەند دوو مانگ بوو. لەناکاو موسوڵمانان بینیان دەروازەکانی شارەکە کرانەوە و خەڵکان هاتنەدەر و بازارەکان کرایەوە و خەڵکان کەوتنە جموجۆڵ. کەسیان نارد بۆ ئەوەی بزانن چی روویداوە؟

وتیان: ئێوە ئەمان نامەتان بۆ هاویشتین، ئێمەش رازی بووین و جەزیە دەدەین بەو مەرجەی پارێزگاریمان لیّ بکەن.

وتیان: ئێمە ئەو کارەمان نەکردووە.

وتیان: درۆ ناکەین.

موسوڵمانان پرسیاریان لەیەك کرد وبۆیان دەرکەوت کۆیلەیەك بەناوی موکەنەف کەرەچەڵەکی بۆ جوندیشاپوور دەگەڕایەوە، ئەو کارەی کردبوو.

وتیان: ئەو بەندەیە.

خەڵکی شارەکە وتیان: ئێمە بەندە و ئازادە ناناسین، ئەماننامەیەك بەدەستمان گەیشتووە و بەو پێیە ئێمە مامڵە لەگەڵ ئێوە دەکەین. رازی بووین وسەرپێچیمان نەکردووە، ئەگەر ئێوە دەخوازن، ناپیاوی لەخۆتان نیشان بدەن.

موسوڵمانان دەستیان لێهەڵگرتن و بەسەرهاتەکەیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب

نووسی. وەڵامی دانەوە: خواوەند ڕێز گرتن لەپەیمانی بەگەورە زانیوە، ڕێز لەپەیمان ناگرن تا ئەو کاتەی لەکاتی دوودڵییش ڕێز لەپەیمان بگرن. ڕێز لەئەمانننامەکە بگرن. موسوڵمانان لەویێ ڕۆشتن و ڕێزیان لە ئەمان نامەکە گرت.

عەمرۆ دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب لەساڵی حەفدەیەم مۆڵەتی بەموسوڵماناندا لەدیاری فارسەکان پێشڕەوی بکەن. بۆ ئەم فەرمانە بۆچوونەکەی ئەحنەف کوڕی قەیسی بەکار برد و هەستی بەگەورەیی وراستگۆیی ئەو کرد و سەرکردە و سوپاکانی نارد. بۆ خەڵکانی بەسرە چەندین کەسی وەك سەرکردە دەستنیشان و بۆ خەڵکانی کوفەیش بەهەمان شێوە و فەرمانی خۆی سەبارەت بەوان و بەمان ڕەوانە و لەساڵی هەژدەیەم بەرێکەوتن. بەباوکی موسای وت: لەبەسرە بڕوات و لەشوێنێك کەسنووری پارێزگاری بەسرە کۆتایی پێدێت، مەنزڵ بگرێت تا فەرمانەکانی بۆ ڕەوانە بکات.

ئالآی سەرکردەکانی بەسوهەیل کوڕی عودەی موالی مناڵەکانی عەبدئەشهەل ڕەوانە کرد. سوهەیل ئالآکانی هێنا، ئالآی خوراسانی تەسلیمی ئەحنەف کوڕی قەیس کرد، ئالآی ئەردەشێرخەر و شاپووری بەموجاشیع کوڕی مەسعودی سولەمیدا، ئالآی ئیستەخری بەعوسمان کوڕی ئەبی عاسی سەقەفی و ئالآی فسا و دارابگەردی بەساریە کوڕی زەنیمی کەنانی و ئالآی کرمان بەسوهەیل کوڕی عودەی بوو. ئالآی سیستانی بەعاسم کوڕی عەمرۆدا، یەکێك بوو لەئەسحابەکان. ئالآی مەکرانی بەعومەیر تەغلەبی سپارد. هەموویان لەساڵی حەفدەیەم بەرێکەوتن وئوردوویان لێدا بۆ ئەوەی ڕووبکەنە ئەو ویلایەتانە بەڵام جموجۆڵەکانیان سەری نەگرت تا ئەوەی ساڵی هەژدەیەم دەستی پێکرد.

عومەر کوڕی خەتاب لەخەڵکانی کوفە بۆ ئەم سەرکردانە هاوکاری ڕەوانە کرد: عەبدوللە کوڕی عوتەبانی بۆ هاوکاری سوهەیل کوڕی عودەی نارد، عەلقەمە کوڕی نەزر و عەبدوللە کوڕی ئەبی عەقیل و ڕێبعی کوڕی عامر و باوکی دایکی غەزالی بۆ هاوکاری ئەحنەف نارد، عەبدوللە کوڕی عومەیری ئەشجەعی بۆ هاوکاری عاسم کوڕی عەمرۆ و شەهاب کوڕی موخاریقی مازنی بۆ هاوکاری حەکەم کوڕی عەمرۆ نارد.

دەستەیەك وتوویانە: گرتنی شوش و رامهورموز و ڕەوانە کردنی هورموزان

لەشوشتەرەوە بۆ مەدینە لەساڵی بیستەم روویدا.

لەم ساڵە، یانی ساڵی حەفدەیەم، عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد، کارگوزاری ئەو لەمەککە عەتاب کوڕی ئەسید، لەیەمەن، یەعلی کوڕی ئومەییە، لەیەمامە وبەحرەین، عوسمان کوڕی ئەبی عاس، لەعەممان، حوزەیفە کوڕی موحسین، پێشتر ئاماژەمان بەکارگوزارانی شامدا. کارگوزاری کوفە باوکی موسای ئەشعەری. پیشتر باسمان کرد چ کاتێك لەسەر کار لابرا و چ کاتێك بۆ سەر کارەکەی گەڕایەوە. وەك وتوویانە دامەزراوەی دادی بەسرە لەئەستۆی باوکی مریەمی حەنەفیدا بوو. ئامارەمان بەناوی کارگوزاری جەزیرە و موسڵدا.

ساڵی هەژدەیەم دەستی پێکرد.

## ڕووداوەکانی ساڵی هەژدەیەم

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا، یانی ساڵی هەژدەیەم، وشکەساڵی و قاتوقڕییەکی دژوار ڕوویدا و بەساڵی ڕەمادەت ناوی دەرکرد یانی ساڵی لەناوچوون.

محەممەد کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ساڵی هەژدەیەم ساڵی ڕەمادەت یانی لەناوچوون بوو و ساڵی تاعوونی عەمواس کەخەڵکان فەوتان.

باوکی مەعشەر دەڵێت: ڕەمادەت لەساڵی هەژدەیەم ڕوویدا.

دەڵێت: تاعوونی عەمواسیش لەم ساڵەدا ڕوویدا.

باوکی حارسە دەڵێت: سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ باوکی عوبەیدە نووسی کەچەند کەسێك لە موسوڵمانان شەرابیان خواردووە و زەرار و باوکی جەندەل لەناو ئەواندان. لەوانمان پرسی و لێکدانەوەیان بۆ کارەکەی خۆیان کرد. وتیان: ئێمەیان سەرپشك کردووە و ئێمە یەکیانمان هەڵبژاردووە، ئایا تەواوی دەکەن؟. لەسەر ئێمە فەرزی نەکرد.

سەروەری باوەڕداران نووسی: ئەمە لای ئێمە و ئەوان ئاشکرایە کەئایا تەواوی دەکەن بەمانای ئەوەیە دەبێت تەواوی بکەن. خەڵکانی کۆکردەوە و بڕیاریاندا بەهۆی شەراب خواردنەوە هەشتا قامچییان لێ بدەن و بەکەسێکی فاسق بناسرێن. هەرکەسێك لێکدانەوە بۆ فەرموودەکانی خوا بکات، ئەو بەڵایەی بەسەردا دێت و ئەگەر لەسەر وتەکانی خۆی سوور بێت، دەکوژرێت.

عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ باوکی عوبەیدە نووسی: ئەوان بانگ بکە، ئەگەر گومانیان کرد شەراب حەڵاڵە، بیانکوژە و ئەگەر وتیان حەرامە هەشتا قامچییان لێبدە.

باوکی عوبەیدە بەئامادە بوونی چەندین کەس پرسیاری لەوان کرد و وتیان حەرامە. هەشتا قامچی لێدان و ئەوانەی شەرابیان خواردبوویەوە، لەکارەکەی خۆیان پەشیمان بوونەوە.

باوکی عوبەیدە وتی: ئەی خەڵکینە بەڵایەك بەسەر ئێوەدا دەبارێت. ساڵی

لەناوچوون هاتە پێش.

نافیع دەڵێت: کاتێك نامەی باوکی عوبەیدە سەبارەت بەزەرار و باوکی جەندەل بەدەستی سەروەری باوەڕداران گەیشت، وەڵامی بۆ ناردەوە و فەرمانیدا بەئامادە بوونی موسوڵمانان لێیان بپرسێت ئایا شەراب حەرامە یا حەڵاڵ؟ ئەگەر وتیان: حەرامە، هەشتا قامچییان لێبدات و تۆبەیان پێ بکات و ئەگەر وتیان: حەڵاڵە، بیانکوژێت.

دەڵێت: باوکی عوبەیدە پرسیاری لێکردن و وتیان حەرامە. هەشتا قامچی لێدان و شەرمەزار و خانەنشین بوون.

باوکی عوبەیدە نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی باوکی جەندەل پەرێشان بووە مەگەر خواوەند لەسەر دەستی تۆ بەزەیی بەودا بێتەوە. نامەی بۆ بنووسە و ئاگاداری بکەرەوە. سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ باوکی جەندەل نووسی:

لەعومەر بۆ باوکی جەندەل.

خواوەند ئەم گوناحە نابەخشێت ئەگەر شەریکی بۆ دابنێن و جگە لەوە لەهەموو گوناحەکانی دیکە خۆش دەبێت تۆبە بکە و سەری خۆت بەرز رابگرە و لەناو خەڵکان ئامادە بە، بێ هیوا مەبە چوونکە خواوەند دەفەرمێت:

((یا عبادی الذین اسرفوا علی انفسهم لا تقنطوا من رحمة الله ان الله یغفر الذنوب جمیعا انه هو الغفور الرحیم.

واتاکەی: ئەی بەندەکانی من کەسەبارەت بەخۆتان زێدەڕۆییتان کردووە، لەبەزەییەکانی خواوەند بێ هیوا مەبن چوون خواوەند گوناحەکان پێکەوە دەبەخشێت لەبەر ئەوەی بەخشەرە و مێهرەبانە.))

کاتێك باوکی عوبەیدە نامەکەی بۆ خوێندەوە، چیتر پەرێشانی نەما. نامەی هاوشێوەی بۆ کەسانی دیکەیش نووسی. عومەر کوڕی خەتاب بۆ خەلکانی نووسی: سەرقاڵی خواپەرەستی بن و هەرکەس شیاوە بۆ گۆڕان، بیگۆڕن بەڵام کەس ریسوا و سووك مەکەن چوونکە بەڵا لەناو ئێوەدا فراوان دەبێت.

عەتایش گێڕانەوەیەکی هاوشێوەی هەیە بەڵام ئاماژەی بەوە نەداوە کەعومەر نامەی بۆ خەڵکان نووسی بۆ ئەوەی یەکتر سووك و ریسوا نەکەن.

دەڵێت: ئەوان وتیان رۆمییەکان کەوتوونەتە خۆ، رێگە بدەن بۆ جەنگی ئەوان بڕۆین، ئەگەر خواوەند شەهید بوونمان پێ ببەخشێت، باشتر وگەرنە کارەکەمان بەدڵخوازی سەروەری باوەڕداران دەبێت.

دەڵێت: زەرار کوڕی ئەزوەر و دەستەیەکی دیکە کوژران و کەسانی دیکە مانەوە و قامچییان بەرکەوت.

باوکی زوهری قەشیری لەمبارەوە هۆنراوەیەکی هەیە بەم ناوەرۆکە:

(( مەگەر نازانی رۆژگار گەنج بۆ هەڵە ناچار دەکات

و توانای ئەوەی نییە پێشهاتەکان بگۆڕێت

براکانم مردن و خۆڕاگریم کرد و نەگریام

بەڵام ناتوانم یەك رۆژ لەبادە چاوبپۆشم

بەڵام سەروەری باوەڕداران بە لەناوچوون مەحکومی کرد

شەراب خوازەکان بەدەوریدا پەرێشانن.))

کەریب دەڵێت: لەرۆژگای خەلافەتی عومەر لەمەدینە و سەرزەمینەکانی دەوروبەری وشکەساڵی روویدا و کاتێك با هەڵیدەکرد، خۆڵێکی هاوشێوەی خۆڵەمێشی بڵاو دەکردەوە و بەساڵی رەمادە، (بڵاوبوونەوەی خۆڵەمێش) ناویان برد. سەروەری باوەڕداران سوێندی خوارد تا ئەو کاتەی باران نەبارێت رۆن و گۆشت نەخوات.

بەمشێوەیە بوو تا باران باری. مەشکەیەك رۆن و مەشکەیەك شیر هاتە ناو بازار. کۆیلەکەی عومەر بەچل دڕەم کڕی و گەڕایەوە و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، خواوەند کۆتایی بەسوێندەکەی تۆ هێنا و پاداشتێکی گەورەی پێبەخشی، مەشکەیەك شیر و مەشکەیەك رۆن هاتە بازار و بەچل دڕەم کڕیم.

وتی: گرانت کڕیوە، بیبەخشەرەوە چوونکە پەسەندی ناکەم زێدڕۆیانە شتێك بخۆم.

عومەر وتبووی: چۆن دەتوانم کێشە ژێر دەستە و مسکێنەکان چارەسەر بکەم ئەگەر ئەو بەڵای بەسەر ئەواندا دەبارێت، من نەگرێتەوە.

عەبدولرەحمان کوڕی کەعب دەڵێت: لەکۆتاییەکانی ساڵی حەفدەیەم و سەرەتای ساڵی هەژدەیەم، رەمادە یانی برسیەتی روویدا و خەڵکانی مەدینە و دەوروبەری

گرفتار بوون و لەناوی بردن تا ئەو جێگەی ئاژەڵە درەندەکانیش پەنایان بۆ مرۆڤەکان دەبرد. خەڵکان بزنیان سەردەبڕی و قێزیان لێدەکردەوە لەبەر ئەوەی لەڕ و بێ گۆشت بوو.

دەڵێت: خەڵکان بەمشێوەیە ژیانیان بەسەر دەبرد و خەڵکی ویلایەتەکان سەروەری باوەڕدارانیان پشتگوێ خستبووە تا بیلال کوڕی حارسی موزنی هات، داوای مۆڵەتی کرد و وتی: پێغەمبەر(د.خ) منی بۆ لای تۆ ناردووە، پێغەمبەر(د.خ) بەتۆ دەفەرمێت: تۆم بەهوشیار دەزانی، بەڵام بێ جووڵەیت، تۆ چیت بەسەر دێت؟

عومەر وتی: کەی ئەوت بینی؟

وتی: دوێ شەو.

سەروەری باوەڕداران ڕۆشتەدەر و خەڵکانی بۆ نوێژ کۆکردەوە. دوو ڕەکعەت نوێژی لەگەڵ خوێندن. هەستایە سەر پێ و وتی: ئەی خەڵکینە ئایا کارێك هەیە کەدەبوا بیکەم و نەمکردبێت.

وتیان: سوێند بەخوا، نە.

وتی: بیلال کوڕی حارسی موزنی وا دەڵێت.

وتیان: بیلال ڕاست دەکات داوای هاوکاری لەخواوەند و موسوڵمانان بکە.

عومەر چەندین کەسی نارد و داوای هاوکاری موسوڵمانانی کرد چوونکە مەدینەیان پشتگوێ خستبوو. وتی: الله اکبر، بەڵا گەیشتە ترۆپکی خۆی و نەما، کاتێك خەڵکێك مۆڵەتی هاوکاری وەرگرتنیان پێبدرێت، بەڵا نامێنێت. نامەی بۆ سالاری ویلایەتەکان نووسی تا فریای خەڵکانی مەدینە و دەوروبەری بکەون چوونکە گرفتاری بەڵا و سەختی بوون. خەڵکانی بۆ دۆعای باران بردەدەر. خۆی لەگەڵ عەباسی مامی پێغەمبەر(د.خ) بەپیادە ڕۆشت. وتارێکی کورتی خوێندەوە. نوێژی خوێند وکەوتە سەر ئەژنۆ و وتی: خواوەندا تۆ دەپەرەستین و داوای هاوکاری لەتۆ دەکەین. خواوەندا بمانبەخشە و بەخششەکانی خۆت بۆ خەڵکان بنێرە.

گەڕایەوە و هێشتا نەگەیشتبووە ماڵەکەی، چاڵاوەکان پڕبوون.

عاسم کوڕی عومەر کوڕی خەتاب دەڵێت: لەڕۆژگاری عومەر قاتوقڕی ڕوویدا.

چوارپێکان لەڕ و لاواز و دانیشتووانی ماڵێك لەسارانشینانی موزەینە بەهاورێکەی خۆیان وت: گرفتاری برسیەتی بووین، بزنێکمان بۆ سەر ببڕە.

وتی: بزن گۆشتی پێوە نییە.

پێداگرییان کرد تا بزنەکەی کوشت و پێستەکەی داماڵی و جگە لەئێسقانی سوور هیچیان نەبینی و هاواری کرد: ئەی هاوار بۆ محەممەد!

دەڵێت: لەخەودا بینی پێغەمبەر(د.خ) هات و فەرمووی: مژدەتان لێ بێت، قاتوقڕی نەما، بڕۆ لای عومەر کوڕی خەتاب، سڵاوی منی پێبگەیێنە چوونکە تۆ بەکەسێکی راستگۆ دەزانم و بڵێ: ئەی عومەر، وردبەرەوە، وشیار بە!.

پیاوی موزنی هات تا گەیشتە بەردەم ماڵەکەی عومەر، بەکۆیلەکەی وت: بۆ نێردراوی پێغەمبەری خوا داوای مۆڵەت بکە.

دەڵێت: کۆیلەکە ڕۆشتە لای عومەر و ئاگاداری کردەوە. عومەر ترسا و وتی: نیشانەکانی شێتیت لەودا نەبینی؟

وتی: نە.

وتی: با بێت.

کاتێك هات، پێشهاتەکەی بۆ باس کرد.

عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتەدەر و خەڵکانی کۆکردەوە و وتی: ئێوە سوێند دەدەم بەو خوایەی بۆ ئیسلام ڕێنوێنی کردوون، ئایا تا ئێستا کارێکی ناپەسەندتان لەمن بینیوە؟

وتیان: نە، چی ڕوویداوە؟

عومەر بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە کەتێگەیشتن، بەڵام عومەر هێشتا تێنەگەیشتبوو. وتیان: دەڵێت، بۆ بارینی باران کەمتەرخەمیت کردووە، ئێمە بۆ دۆعای باران ببە دەرەوەی شار.

عومەر خەڵکانی کۆکردەوە و وتارێکی کورتی بۆ خوێندن. دوو ڕەکعەت نوێژی خوێند، وتی: خواوەند هاوەڵانی ئێمە، ئێمەیان پشتگوێ خستووە و هێز و توانایی ئێمە بەرەو لەناوچوون دەڕوات، بێ هاوکاری و هێزی تۆ، هیچ دەسەڵاتێکمان نییە، تێراومان بکە و بەندەکانی خۆت لەم وشکەساڵی و بێ ئاوییە ڕزگار بکە.

عەبدولرەحمان کوڕی غەنەم دەڵێت: عومەر نامەی بۆ سەرانی ویلایەتەکان

نووسی و داوای کرد هاوکاری خەڵکانی مەدینە و دەوروبەری بکەن. یەکەم کەس گەیشتە مەدینە، باوکی عوبەیدەی جەراح بوو. چوار هەزار بار خواردنی پێبوو. سەروەری باوەڕداران دابەش کردنی لەنێوان خەڵکانی مەدینە و دەوروبەری بەخودی باوکی عوبەیدە سپارد و کاتێك لەکارەکەی تەواو بوو، ڕۆشتە لای عومەر و وتی: چوار هەزار درەمی پێبدەن.

باوکی عوبەیدە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، پێویستم پێی نییە، تەنیا مەبەستم بەدەست هێنانی پاداشتی خوایی بووە، تێکەڵ بەپاداشتی دونیای مەکە.

وتی: وەریبگرە، چوونکە داوات نەکردووە، زیان لەتۆ نادات.

بەڵام باوکی عوبەیدە رازی نەبوو.

دەڵێت: بیگرە، من کارێکی هاوشێوەی کارەکەی تۆم بۆ پێغەمبەر(د.خ) ئەنجامدا و ئەوەی پێ وتم کەبەتۆم وت و منیش ئەوەم وەڵام دایەوە کەتۆ وەڵامی منت دایەوە. بەڵام پارەکەی بەمندا.

باوکی عوبەیدە رازی بوو و بۆ شوێنی کارەکەی خۆی گەڕایەوە.

خەڵکان یەك لەدوای یەك هاتن و خەڵکانی حیجاز بێ نیاز بوون و باران باری.

دەڵێت: لەوەڵامی نامەی سەروەری باوەڕداران نامەی عەمرۆ کوڕی عاس هات کە لەکاتی هەڵبژاردنی پێغەمبەر(د.خ)، لەدەریای شام شوێنێکیان هەڵکەندبوو کەدەڕژایە ناو دەریای عەرەب، ڕۆمییەکان و قیبتییەکان ئەو ڕێگەیان بەستووە. ئەگەر دەخوازیت بەهای خواردەمەنی لەمەدینە لەگەڵ بەهای خواردن لەمیسر وەك یەك بێت، ڕووبارێکی لێ جیا دەکەمەوە و پردەکان هەڵدەبەستم.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: لەزووترین کات، ئەو کارە ئەنجام بدە.

خەڵکانی میسر بەعەمرۆیان وت: خەراجی تۆ بەئاسانی دەگاتە دەستی تۆ و سەروەری تۆ رازییە، ئەگەر ئەم کارە ئەنجام بدرێت، خەراجی میسر کەم دەکات.

عەمرۆ ئەم بابەتەی بۆ عومەر نووسی و بیری خستەوە کەئەم کارە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خەراج و وێران کردنی میسر. سەروەری باوەڕداران وتی: ئەو کارە بکە بێ ئەوەی پشتگوێی بخەیت، خواوەند میسر بۆ ئاوەدان کردنەوەی مەدینە لەناو ببات. عەمرۆ دەستی بەئەنجامدانی کارەکەی کرد کە لەقەلزەم بوو. بەهای کەل

وپەلەكان وەك بەهای كەل و پەلەكان لەمیسر بوو.

خەڵكانی مەدینە دوای ساڵی رەمادە، ساڵی هاوشێوەیان نەبینی تا ئەو كاتەی عوسمان كوڕی عەفان كوژرا و دەریاكان بەسەر ئەواندا داخران و ریسوا و گیرۆدەی قاتوقڕی بوون.

**ئەبوجەعفەر دەڵێت:** بەوتەی واقدی، ڕەق و ڕەها و حەران لەم ساڵەدا لەسەر دەستی عەیاز كوڕی غەنەم دەستیان بەسەر دا گیرا و هەروەها لەم ساڵەدا عەین ئەلوەردە بەدەستی عومەیر كوڕی سەعد گیرا. پێشتر ئاماژەمان بەبۆچوونە جیاوازەكان داوە. هەروەها بەوتەی واقدی عومەر لەمانگی زیحەججەی ئەم ساڵە، پێگەی ئیبراهیمی بۆ شوێنی ئێستای گواستەوە كەپێشتر بەكەعبەوە لكا بوو. دەڵێت: لەتاعوونی عەمواس بیست و پێنج هەزار كەس كوژران.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: دەستەیەك وتوویانە عومەر كوڕی خەتاب لەم ساڵەدا شورەیح كوڕی حارسی كێندی بۆ كاروباری دادوەری راسپارد. كارگوزارانی ویلایەتەكان هەمان كەسانی ساڵی پێشوو بوون.

ساڵی نۆزدەیەم دەستی پێكرد.

## ڕووداو و پێشهاتەکانی ساڵی نۆزدەیەم

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی باوکی مەعشەر گرتنی جەلەولا لەساڵی نۆزدەیەم و لەسەر دەستی سەعد ئەنجامدرا. واقدیش وتەکەی پشتڕاست دەکاتەوە.

بەوتەی کوڕی ئیسحاق گرتنی جەزیرەو ڕەها و حەران و ڕاس عەین و نەسیبین لەساڵی نۆزدەیەم بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: پێشتر ئاماژەمان بەبۆچوونە جیاوازەکاندا.

باوکی مەعشەر دەڵێت: گرتنی قیساریە لەم ساڵە، یانی ساڵی نۆزدەیەم ڕوویدا هەروەها گرتنی میسریش.

پێشتر ئاماژەمان بەگرتنی قیساریەدا. بەسەرهاتی چۆنیەتی گرتنی میسر کەبەوتەیەك لەساڵی بیستەم ڕوویدا، دواتر ئاماژەی پێدەدەین.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا، یانی ساڵی نۆزدەیەم، لەحەڕەی لەیلی ئاگر بڵێسەی سەند، عومەر ویستی لەگەڵ خەڵکان بڕوات، بەڵام دواتر وتی: خێر بکەن و ئاگرەکە دامرکایەوە.

هەروەها بەوتەی واقدی مەداین و جەلەولا لەم ساڵەدا دەستی بەسەردا گیرا. پێشتر ئاماژەمان بەبۆچوونە جیاوازەکاندا.

لەم ساڵەدا سەروەری باوەڕداران لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد. کارگوزار و داوەرەکان هەمان کەسانی ساڵی هەژدەیەم بوون.

ساڵی بیستەم دەستی پێکرد.

## جەنگەكانی ساڵی بیستەم و كارەكانی دیكە

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی كوڕی ئیسحاق، میسر لەساڵی بیستەم دەستی بەسەردا گیرا. باوكی مەعشەریش دەڵێت: میسر لەساڵی بیستەم دەستی بەسەردا گیرا و سەركردەی سوپای موسوڵمانان، عەمرۆ كوڕی عاس بوو.

بەوتەی باوكی مەعشەر، ئەسكەندەرییە لەساڵی بیست و پێنجەم دەستی بەسەردا گیرا. بەڵام بەوتەی واقدی گرتنی میسر و ئەسكەندەرییە لەساڵی بیستەم روویدا.

بەگومانی سەیف، میسر و ئەسكەندەرییە لەساڵی شانزەیەم دەستیان بەسەردا گیرا.

## گرتنی میسر و گرتنی ئەسكەندەرییە

ئەبوجەعفەر دەڵێت: جیاوازی مێژوونووسانمان سەبارەت بەگرتنی میسر و ئەسكەندرییە باس كرد. ئێستا چۆنیەتی گرتنی ئەو سەرزەمینانە باس دەكەین و ئەوەی لەسەر دەستی كێ ئەنجامدرا:

كوڕی ئیسحاق دەڵێت: كاتێك عومەر لەشام تەواو بوو، نامەی بۆ عەمرۆ كوڕی عاس نووسی تا لەگەڵ سوپاكەی بەرەو میسر بڕوات و ئەو، لەساڵی بیستەم دەستی بەسەر دەروازەی ئەلیوندا گرت.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: سەبارەت بەگرتنی ئەسكەندرییە بۆچوونەكان جیاوازن، دەستەیەك وتوویانە لەساڵی بیست و پێنجەم و ساڵی دووەمی خەلافەتی عوسمان كوڕی عەفان دەستی بەسەردا گیرا و كارگوزارەكەی عەمرۆ كوڕی عاس بوو.

یەكێك لەخەڵكانی میسر بەناوی قاسم كوڕی قیرمان لەزیاد كوڕی جەۆ ی زوبەیدی كە لەكاتی گرتنی میسر و ئەسكەندەرییە لەناو سوپاكەی عەمرۆ كوڕی عاسدا بوو، دەگێڕێتەوە: ئەسكەندرییە لەرۆژگاری خەلافەتی عومەر كوڕی خەتاب و لەساڵی بیست و یەك یا بیست و دوو دەستی بەسەردا گیرا.

دەڵێت: كاتێك دەروازەی ئەلیونمان گرت، لەو گوندانەی لەنێوان ئەو ناوچە و ئەسكەندەرییە بوو، یەك یەك گوزەرمان كرد تا گەیشتینە بەلهیب و پێیان دەوت گوندی رەنس. ئەسیرەكانی ئێمە گەیشتبوونە مەككە و مەدینە و یەمەن.

دەڵێت: کاتێک گەیشتینە بەلهیب، فەرمانڕەوای ئەسکەندەرییە کەسی بۆ لای عەمرۆ کوڕی عاس نارد کە: من بۆ ئەو خەڵکانەی بەبڕوای خۆم لەئێوەی عەرەب بێزراوتر بوون، یانی فارس و رۆمییەکان، جەزیەم دەدا، ئەگەر بخوازیت جەزیە بەتۆییش دەدەم، بەو مەرجەی هەموو ئەسیر و سەرزەمینانەی گرتووتانە، بیگەڕێننەوە.

دەڵێت: عەمرۆ پەیامی بۆ نارد: لەپشت سەری من سەروەرێکە و ناتوانم بێ فەرمانی ئەو هیچ کارێک بکەم، ئەگەر بخوازیت دەست لەجەنگ هەڵدەگرم و تۆیش بەهەمان شێوە تا لەپێشنیارەکەی تۆ ئاگاداری بکەمەوە، ئەگەر رازی بوو، منیش رازی دەبم و ئەگەر فەرمانەکەی جیاواز بوو، فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ دەکەم.

دەڵێت: وتی: رازیم.

عەمرۆ کوڕی عاس نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی.

دەڵێت: ئەو نامانەی دەیانووسی لەئێمەیان نەدەشاردەوە. عەمرۆ لەناو نامەکەیدا باسی پێشنیارەکانی فەرمانڕەوای ئەسکەندەرییە کرد. هێشتا پاشماوەی ئەسیرەکانی ئەوان لەدەستی ئێمەدا بوو. لەبەلهیب وەستاین و چاوەڕوانی نامەی عومەر کوڕی خەتابمان دەکرد. نامەکە هات و عەمرۆ خوێندییەوە:

(نامەی تۆمان بەدەست گەیشت کەنووسیوتە فەرمانڕەوای ئەسکەندەرییە پێشنیاری کردووە، جەزیە بدات، بەو مەرجەی ئەسیرەکانی سەرزەمینەکەی بگەڕێنیتەوە. سوێند بەگیانی خۆم، ئەو جەزیەی بەردەوام و بێ پچڕان بەدەستی ئێمەی موسوڵمان بگات لای من پەسەندتر لەو تالآنییانەیە بەخێرایی دابەش دەکرێت وەك ئەوەی بوونیان نەبێت. پێشنیار بەفەرمانڕەوای ئەسکەندەرییە بکە جەزیە بدات بەو مەرجەی ئەو ئەسیرانەی لەدەستی ئێوەدایە بۆ هەڵبژاردنی ئەوەی لەناو ئێوە بمێننەوە یا بگەڕێنەوە بۆ سەرزەمینەکەی خۆیان، ئازاد بن. هەرکەس ئیسلامی هەڵبژارد یەکێکە لەموسوڵمانان و ئەرك و لێپرسراویەتی هاوشێوەی ئێوەی لەسەر شانە و هەرکەس دینی خەڵکەکەی خۆی هەڵبژارد دەبێت وەك کەسانی دیکە جەزیە بدات. ئەو ئەسیرانەی لەسەرزەمینی عەرەب بڵاو بوونەتەوە و گەشتوونەتە مەککە و مەدینە، گەڕاندنەوەیان ئەگەری نییە و نامانەوێت سەبارەت بەوەی

ئەنجامی نادەین، پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ببەستین.

عەمرۆ کەسی نارد و فەرمانڕەوای ئەسکەندەرییە لەناوەرۆکی نامەی عومەر کوڕی خەتاب ئاگادار کردەوە. ئەو، رازی بوو.

دەڵێت: ئەسیرەکانمان کۆکردەوە، مەسیحییەکانیش کۆبوونەوە. یەکێك لەئەسیرەکانمان دەهێنا و لەنێوان هەڵبژاردنی ئیسلام و مەسیحییەت سەرپشکمان دەکردن. ئەگەر ئیسلامی هەڵدەبژارد، بەدەنگی بەرز تەکبیرمان دەوت، دواتر ئەومان پەیوەستی خۆمان دەکرد. ئەگەر مەسیحییەتی هەڵدەبژارد، مەسیحییەکان هاواریان دەکرد و ئەویان دەبردەوە بۆ لای خۆیان و ئێمە جەزیەمان لەسەر دادەنا و لەم کارەی خەمبار دەبووین وەك ئەوەی بڵێی کەسێکی ئێمەیە و پەیوەستی ئەوان بووە.

دەڵێت: بەمشێوە بوو تا ئەوەی کۆتایی بەم کارە هات، یەکێك لەو کەسانە باوکی مریەم عەبدوللە کوڕی عەبدولرەحمان بوو.

قاسم کوڕی قیزمان دەڵێت: ئەوم بینی کەسەردەستەی مناڵەکانی زوبەید بوو.

زیاد دەڵێت: پێشنیاری ئیسلام و مەسیحییەتمان خستەبەردەست. باوك و دایك و براکانی لەناو مەسیحییەکاندا بوون، ئیسلامی هەڵبژارد، ئەومان بۆ ناو خۆمان گەڕاندەوە، دایك و باوك و براکانی پەلاماریاندا و جل و بەرگەکانی بەریان دەڕاند. ئێستا سەردەستەی ئێمەیە.

دەڵێت: ئەسکەندەرییە کرایەوە و ڕۆشتینە ناو شارەکە و ئەم خۆڵدانەی ئێستا بوونی هەیە، لەکەناری ئەسکەندەرییەدا بوو. دەوروبەرەکەی بەرد و وەك خۆی ماوەتەوە. هەرکەس گومان دەکات لەئەسکەندەرییە و گوندەکانی دەوروبەری خەڵکان بەجەزیە رازی نەبوون و پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ واژۆ نەکرا، سوێند بەخوا درۆ دەکات.

قاسم کوڕی قیزمان دەڵێت: ئەم حەدیسە لەو سۆنگەوە هاتە ئاراوە کەپاشاکانی مناڵەکانی ئومەییە بۆ سەرکردەکانی میسریان دەنووسی: میسر بەجەنگ دەستی بەسەردا گیرا و ئەوان بەندەی ئێمەن، هەر چۆن بمانەوێت لەگەڵیان دەجووڵێینەوە و فەرمانەکانی خۆمان جێبەجێ دەکەین.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەگێڕانەوەی سەیف هاتووە: دوای ئەوەی عومەر لەگەڵ خەڵکانی ئیلیا پەیمانی ئاشتی بەست و چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە، عەمرۆ کوڕی

عاسی بۆ میسر نارد کەئەگەر خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین، سەرکردەی ئەو ناوچەیە بێت، باوکی عوبەیدەی بۆ رەمادە نارد و وتی: ئەگەر سەرکەوتنت بەدەست هێنا، بۆ شوێنەکەی خۆت بگەڕێرەوە.

عەبدە دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب گەڕایەوە بۆ مەدینە، عەمرۆ کوڕی عاس رووی کردە میسر و گەیشتە دەروازەی لیون. زوبەیریش بەدوای ئەودا ڕۆشت و لەوێ کۆبوونەوە. باوکی مریەم جاسلیقی میسر لەگەڵ ئەسقوف و خەڵکان رووبەرووی بوونەوە. مەقوقس ئەوانی بۆ پارێزگاری کردن لەولاتەکەی خۆی ناردبوو. کاتێك عەمرۆ لەوێ دابەزی، جەنگان.

عەمرۆ کەسی نارد کەپەلە مەکەن تا پێشنیارەکانی خۆمان بەئێوە رابگەیێنین و دواتر لێکۆڵینەوە لەپێشنیارەکانی ئێمە و بارودۆخی خۆتان بکەن. عەمرۆ کەسی نارد و وتی: من دێمە ناو دوو سوپاکە، باوکی مریەم و باکی مریام بۆ لای من بێن.

ئەوان رازی بوون وبڕوایان بەیەك کرد. عەمرۆ پێی وتن: ئێوە دوو راهیبی ئەم سەرزەمینەن، ببیستن خواوەند محەممەدی بەراستی هەڵبژاردو ڕەوانەی کرد. محەممەد فەرمانی بەئێمە کرد و فەرمانەکانی خۆی بێ کەم و کوڕی ئەنجامدا، دواتر گەڕایەوە بۆ لای خواوەند، ئەوەی لەئەستۆیدا بوو، ئەنجامیدا. یەکێك لەو شتانەی فەرمانی بەئێمەداوە، ئەوەیە پێشنیاری سێ کارتان پێبکەین. یەکەم ئەوەی ئێمە پێشنیاری ئیسلامتان پێدەکەین و هەرکەس باوەڕ بێنێت، یەکێکە لەئێمە و هەرکەس رازی نەبێت، پێشنیاری دانی جەزیەی پێدەکەین و پارێزگاری کردن لەو دەگرینە ئەستۆ، پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی ئێمە دەست بەسەر سەرزەمینی ئێوەدا دەگرین و بەهۆی خزمایەتی نێوان ئێمە و ئێوە، فەرمانی پێ کردووین بەشێوەیەکی شیاو مامڵە لەگەڵ ئێوە بکەین، بۆیە ئەگەر بەپێشنیارەکانی ئێمە رازی بن، دوو بەرابەر لەبەڵێنەکانی خۆمان رێز لەبەڵێن و پەیمانەکەی ئێوە دەگرین. یەکێك لەفەرمانەکانی سەروەری ئێمە ئەوەیە لەگەڵ قیبتییەکان چاکەکاری بکەین چوونکە پێغەمبەر(د.خ) پێشنیاری ئەو کارەی پێکردووین چوونکە خزمی ئەوانین.

وتیان: ئەمە خزمایەتییەکی دوورە و تەنیا پێغەمبەران رێزی دەگرن، ژنێکی بەناوبانگ و خاوەن پێگە بوو، کچی پاشاکەمان و لەخەڵکانی مەنف و پاشایەتی

تایبەت بوو بەبنەماڵی ئەوان، خەڵکانی عەین شەمس بەسەریاندا سەرکەوتن و خوێنیان ڕشتن و دەستیان بەسەر پاشایەتییەکەیدا گرت و کەوتنە دیاری غوربەت، ئەو کەوتە دەستی ئیبراهیمی پێغەمبەر(د.خ)، ئەمانمان پێ ببەخشە تا دەگەڕێینەوە بۆ لای تۆ.

عەمرۆ وتی: کەسێکی وەك من فریو ناخوات، سێ ڕۆژ مۆڵەتتان هەیە لەگەڵ خەڵکەکەی خۆتان قسە بکەن. دواتر جەنگ دەست پێدەکەین.

وتیان: ماوەکە زیاد بکە.

عەمرۆ یەك ڕۆژی دیکەی زیاد کرد.

بۆ لای مەقوقس گەڕانەوە کەدەیخواست ڕازی ببێت، بەڵام ئەرتەبوون ڕێگەی نەدا وەڵامی سازگار بداتەوە و وتی: دەبێت بجەنگێت.

دوو ڕاهیبەکە بەخەڵکانی میسریان وت: ئێمە هەوڵ دەدەین بەرگریتان لێ بکەین و ناگەڕێینەوە بۆ لای ئەوان. چوار ڕۆژمان لەبەردەستایە و هیوادارم هیچ کارەساتێك ڕوو نەدات و پارێزراو بن.

لەناکاو عەمرۆ و زوبەیر بەشێوەیەکی لەناکاو لەلایەن فەرقەبەوە هێرشیان کرایەسەر. بەڵام عەمرۆ ئامادە و ڕووبەڕووی بوویەوە کە لەگەڵ هاوەڵانی کوژران و کەسانی دیکەیان ئەسیر کرد. عەمرۆ و زوبەیر مەبەستی عەین شەمسیان کرد کەقیبتییەکان لەوێ کۆببوونەوە. عەمرۆ، ئەبرەهە سەباحی بۆ فەرما نارد و لەوێ دابەزی. عەوف کوڕی مالکی بۆ ئەسکەندەرییە نارد و هەرکام لەوان بەخەڵکی ئەو شارانەیان وت: ئەگەر بێنەدەر، پارێزراو دەبن.

وتیان: ڕازین. بەڵام چاوەڕوانی خەڵکانی عەین شەمسیان دەکرد و موسوڵمانان ئەو کەسانەیان دیل کرد کە لەنێوان ئەو دوو شارەدا بوون.

عەوف کوڕی مالك وتی: ئەی خەڵکی ئەسکەندەرییە، شارەکەی ئێوە چەند جوانە.

وتیان: ئەسکەندەر وتوویەتی: دەمەوێت شارێك دروست بکەم تەنیا پێویستی بەخوا بێت و لەخەڵکان بێ نیاز بێت.

ئەبرەهە بەخەڵکانی فەرمای وت: ئەی خەڵکی فەرما، شارەکەی ئێوە چەندە کۆنە.

وتیان: فەرما وتوویەتی: شارێك دورست دەکەم پێویستی بەخوا نەبێت و تەنیا

نیازمەندی خەڵکان و ئاوەدان کردنەوە بێت. ئەسکەندەر و فەرما دوو برا بوون.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی کوڕی کەلبی ئەم دووانە برا بوون و ئەسکەندەرییە و فەرما بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە. هەر ڕۆژە و لەفەرما شتێك وێران دەبێت و دیمەنەکەی کۆنتر دەبێت بەڵام ئاوەدانی ئەسکەندەرییە وەك خۆی ماوەتەوە. باوکی عوسمان دەڵێت: کاتێك عومەر لەعەین شەمس ڕووبەڕووی خەڵکان بوویەوە، پاشایەتی لەنێوان خەڵکانی قیبت و نۆبە هاوبش و زوبەیر هاوڕێی عەمرۆ بوو. خەڵکی میسر بەپاشاکانی خۆیان وت: لەگەڵ ئەو خەڵکەی کەسرا و قەیسەریان شکست داوە و بەسەر دیاری ئەواندا زاڵبوون، چی دەکەیت؟ پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ ببەستە و ڕووبەڕوویان مەبەرەوە و ئێمە بۆ جەنگی ئەوان ناچار مەکە. ئەمە لەڕۆژی چوارەم بوو، بەڵام پاشا گرنگی بەبۆچوونەکەی ئەوان نەدا.

هێرش دەستی پێکرد و جەنگ ڕوویدا. زوبەیر ڕۆشتە سەر دیواری قەڵاکە و کاتێك ئەویان بینی، دەرگایان بۆ عەمرۆ کردەوە و پێشنیاری ئاشتییان کرد کەرازی بوو. زوبەیر بەجەنگ ڕۆشتە ناو شارەکە و هاوڕێ لەگەڵ ئەوان ڕۆشتە لای عەمرۆ و دوای ئەوەی هەستیان بەلەناوچوونی خۆیان کرد، بەئاشتی رازی بوون. ئەوەی بەجەنگ دەستیان بەسەردا گرتبوو، لەناو پەیمان نامەکەدا جێگیر وبەدانی جەزیە رازی بوون. پەیمانی ئاشتی بەم شێوە بوو:

(( بەناوی خواوەندی بەخشندە و مێهرەبان

ئەمە ئەمان نامەیەکە عەمرۆ کوڕی عاس بەخەڵکانی میسری دەدات کەگیان و سامان و دین و کەنیسە و خاچ و دەشت و دەریاکانیان لەئەماندایە و هیچ شتێکی لێ کەم ناکرێتەوە و خەڵکانی نۆبە لەگەڵ ئەوان نیشتەجێ ناکرێن.

خەڵکانی میسر بەم پەیمانە رازین کاتێك فراوان بوونی ڕووبارەکانیان بەپەنجا هەزار بگات، دەبێت جەزیە بدەن. هەڵەی دز و چەتەکانیان لەئەستۆی خۆیاندایە. ئەگەر کەسانێك رازی نەبن بەئەندازەی ژمارەی ئەوان جەزیەیان لەسەر هەڵدەگیرێت و بەرابەر بەوان هیچ پەیمانێك لەسەر شانی ئێمە نییە، ئەگەر ڕووبارەکە کەم ببێت، لەو بڕە کەم دەکرێتەوە و بەو ئەندازەیە لێی هەڵدەگیرێت. هەرکەس لەڕۆمییەکان و خەڵکانی نۆبە بەم پەیمانی ئاشتییە رازی ببن، ئەرك و لێپرسراویەتی ئەوان

هاوشێوەی ئەوانە و هەرکەس رازی نەبێت و بخوازێت بڕوات، لەئەماندایە تا دەگاتە شوێنی مەبەستی خۆی یا لەسنووری ژێر دەسەلاتی ئێمە دەردەچێت. ئەوەی دەبێت بیدەن بەسێ جار لێیان وەردەگیرێت.

پەیمان و زەممەی خوا و زەممەی پێغەمبەر(د.خ) و زەممەی خەلیفە و زەممەی باوەڕداران، دەستەبەری ئەم نووسراوەیە. ئەو دەستە لەخەڵکانی نۆبە کەرازی دەبن، دەبێت بەو ئەندازەی دیاریکراوە، هاوکاری بکەن (شەڕکەر) و ئەو ئەندازەی دیاریکراوە، لەشەڕەکان دەبەخشرێت و رێگەی بازرگانی کردنیان لێ ناگیرێت.

زوبەیر و عەبدوللە و محەممەد شایەتی ئەم پەیمانەن. وەردان پەیمانەکەی نووسی و یەکێکە لەشایەتەکان.

هەموو خەڵکانی میسر بەپەیمانی ئاشتی رازی بوون و سوپاییەکان گەڕانەوە و عەمرۆ بناغەی شاری قەستاتی داڕشت و موسوڵمانان لەو شارە نیشتەجێ بوون.

باوکی مریەم و باوکی مریام هاتن و سەبارەت بەو کەسانەی دوای جەنگەکە ئەسیر کرابوون، لەگەڵ عەمرۆ قسەیان کرد.

عەمرۆ وتی: مەگەر بەڵێن و پەیمانیان هەیە؟ مەگەر داوای ئاشتیمان نەکرد و هەمان رۆژ هێرشتان کردە سەرمان؟ ئەمەی وت و ئەوانی لەخۆی دوور خستەوە و رۆشتن و دەیانوت: تا ئەو کاتەی ئێمە دەگەڕێینەوە، هەرچی بەدەست بێنن، بەڵێنی پارێزگاری کردنیتان داوە.

عەمرۆ وتی: ئێوە هێرشتان کردە سەر ئێمە و ئێمە دەبێت بەڵێنی پاراستنی بدەین؟

وتیان: بەڵێ.

بەڵام عەمرۆ ئەسیرەکانی بەسەر موسوڵماناندا دابەش کرد و بەمشێوەیە ئەسیرەکان لەسەرزەمینی عەرەب بڵاو بوونەوە. هەواڵی سەرکەوتن و پێنج یەکەی تالآنییەکان گەیشتە مەدینە و نێردراوان هاتن. عومەر پرسیاری زۆری لێکرد و ئاگاداریان کردەوە تا ئەوەی گەیشتنە سەر باسی جاسلیق و هاورێکەی ئەو.

سەروەری باوەڕداران وتی: پێم وابێت ئەوان راست دەکەن و ئێوە دووڕووی لەخۆتان نیشان دەدەن و وتەکانتان راست نییە. هەرکەس لەگەڵ ئێوە جەنگاوە، ئەمانی پێ مەبەخشن بەڵام ئەوانەی نەجەنگاون و سامان یا هەر شتێکی دیکەتان

لەخەڵکی ئەو گوندانە گرتووە، لەو پێنج رۆژەدا ئەمان دەیانگرێتەوە تا کۆتایی پێ بێت.

کەسی بۆ ئەم لاولا نارد تا ئەو ئەسیرانەی لەو پێنج رۆژەدا نەجەنگابوون، گەڕاندییەوە جگە لەوانەی دوای جەنگەکە هاتبوون، هەموویانی گەڕاندەوە بۆ میسر مەگەر ئەوانەی لەگەڵ موسوڵمانان جەنگابوون.

قیبتییەکان لەبەردەرگای عەمرۆدا بوون و ئاگادار بوویەوە کەوتوویانە: چەندە کۆنە پۆشن ئەم عەرەبانە؟ چەندە خۆیان ریسوا دەکەن؟ چۆن کەسانێکی وەك ئێمە تەسلیم ئەوان بوون؟

عەمرۆ ترسا لەوەی ئەم گومانە ببێتە هۆی هاندانی ئەوان بۆ رووبەروو بوونەوەی موسوڵمانان. فەرمانیدا وشترەکانیان کوشت و ئاو و خوێیان لێدا. فەرمانی بەسەرکردەی سوپاکەدا ئامادەبن و هاوەڵانی خۆیان ئاگادار بکەنەوە. دانیشت و رێگەی بەخەڵکانی میسریشدا. گۆشت و ئاوگۆشیتان هێنا و خستیانە بەردەم موسوڵمانان و عەرەب ئاسا خواردیان (گۆشتیان دەرفاند ودەیانخوارد) هەموویان عابایان لەبەردا بوو بێ ئەوەی سیلاح هەڵبگرن.

خەڵکانی میسر گەڕانەوە و تەماح و بوێرییان زیادی کرد. دواتر عەمرۆ پەیامی بۆ سەرکردەی سوپاکەی ناردو رۆژی دواتر لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان هاتن و فەرمانی پێدان بەجل وبەرگ و پۆششی خەڵکانی میسرەوە لەو دانیشتنەدا ئامادە بن. ئەو کارەیان کرد. رێگەی ئامادەبوونی بەخەڵکانی میسریشدا. میسرییەکان بارودۆخێکی جیاواز لەرۆژی پێشوویان بینی. چێشتلێنەران جۆرەکانی خواردنی میسرییان هێنا و عەرەبەکان هاوشێوەی ئەوان نانیان خوارد و وەك ئەوان دەجوولانەوە. میسرییەکان بلاوەیان لێکرد و بەگومان بوون و دەیانوت: فێڵیان لێکردین.

عەمرۆ بۆ جاری سێیەم پەیامی بۆ سەرکردەکانی سوپاکەی نارد تا بەیانی بەسیلاحەوە ئامادە بن. رێگەی ئامادەبوونی بەمیسرییەکانیشدا و سوپاکەی نیشاندان. دواتر وتی: زانیم کاتێك دەستپێوەگرتنی عەرەبەکان و نائامادەیی ئەوانتان بینی، خۆتان بەگەورە زانی و ترسام خۆتان بەکوشت بدەن. ویستم

بارودۆخی ئەوانتان نیشان بدەم کەچۆن لەسەرزەمینی خۆیان هەڵس وکەوت دەکەن، دواتر کردەوەکانی ئەوانم لەسەرزەمینی ئێوە نیشاندا و لەدووایین رۆژ ئەوانم لەکاتی ئامادە بوون بۆ جەنگ، بڕێوی ئەوان بەمشێوەیە بەلأم بەسەر ئێوەدا سەرکەوتن بەدەست دێنن. پێش ئەوەی خواردنی رۆژی دووەم لەسەرزەمینی ئێوە بەدەست بێنن، دەستیان بەسەر سەرزەمینەکەتاندا گرتووە. ویستم ئاگادار بن ئەوانەی رۆژی سێیەم بینیتان دەست لەرۆژێیەکانی سەرزەمینی ئێوە هەڵناگرن و بەبڕێوی رۆژی یەکەمیان بەسندە ناکەن.

میسرییەکان بلأوەیان لێکرد و دەیانوت: عەرەبەکان پیاوەکانی خۆیان بۆ سەرزەمینی ئێوە ناردووە.

کاتێك سەروەری باوەڕداران لەم رووداوە ئاگادار بوویەوە، بەکەسانی نزیکی خۆی وت: جەنگی ئەو نەرمە و توندوتیژی شەڕەکانی پێشووی پێوە دیار نییە، عەمرۆ پیاوێکی بەئەزموون و شارەزایە. فەرمانڕەوایەتی میسری بەو سپارد و لەوێ نیشتەجێ بوو.

عەمرۆ کوڕی شوعەیب دەڵێت: کاتێك لەنێوان عەمرۆ و مەقوقس لەعەین شەمس رووبەروو بوونەوە روویدا و دوو سوپاکە جەنگان، موسوڵمانان بەدەورانەوردا دەسووڕانەوە و عەمرۆ سەرکۆنەی دەکردن. یەکێك لەخەڵکانی یەمەن وتی: ئێمەیان لەبەرد و ئاسن نەئافراندووە.

عەمرۆ وتی: بێدەنگ بە چوونکە تۆ هاوشێوەی سەگیت.

ئەو پیاوەیش وتی: تۆیش سەرکردەی سەگەکانیت.

دەڵێت: جەنگ بەمشێوەیە بەردەوام بوو و عەمرۆ هاواری کرد هاوەلأنی پێغەمبەر(د.خ) لەکوێن؟ کەسانێك لەئەسحابەکان لەدەوری کۆبوونەوە.

عەمرۆ وتی: پێشڕەوی بکەن چوونکە خواوەند بەهۆی ئێوەوە سەرکەوتن بە موسوڵمانان دەبەخشێت. ئەوان، باوکی بەردە و باوکی بەرزە و کەسانی دیکە بوون و پێشڕەوییان کرد و خەڵکان بەدوای ئەوان هێرشیان کردە سەر دوژمن و سەرکەوتن روخساری خۆی نیشاندا. لەمانگی رەبیع الاوەلی ساڵی شانزەیەم میسر دەستی بەسەردا گیرا و پاشایەتی موسوڵمانان لەوێ سەقامگیر و موسوڵمانان بەسەر نەتەوە و ئۆمەتەکاندا زاڵ بوون. لەم کاتەدا خەڵکانی میسر لەدەوری ئەجەل و خەڵکانی

مەکران لەدەروی رابیل و داهر کۆببوونەوە و خەڵکانی سیستان لەدەوری پاشا وکەسەکانی و خەڵکی خوراسان و باب و نەتەوەکانی دیکە لەدەوری خاقان. عومەر دەستی ئەوانی بۆ دەستدرێژی کردن بۆ سەر موسوڵمانان کورت کردەوە چوونکە ئەگەر رێگەی پێدەدان، دەیانتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنن.

کوری لەهیعە دەڵێت: کاتێك موسوڵمانان دەستیان بەسەر میسردا گرت، بۆ جەنگی نۆبەی میسر بەرێکەوت و لەگەڵ ژمارەیەك برینداری زۆر گەڕانەوە کەچاویان لەدەست دابوو. ئەو خەڵکە تیرهاوێژی شارەزا و ئەوانیان بەتیرهاوێژەکانی چاو ناو دەبرد. کاتێك عەبدوللە کوری سەعد کوری ئەبی سەرح فەرمانڕەوایی میسری گرتەدەست کەلەلایەن کوری عەفانەوە ئەو ئەرکەی پێسپێردرا، لەگەڵ خەڵکانی نۆبە پەیمانی ئاشتی بەست بەو مەرجەیساڵانە لەخەڵکەکەی خۆیان ژمارەیەك جەنگاوەر بەموسوڵمانان ببەخشن و موسوڵمانان لەبەرابەردا ساڵانە بڕێکی دیاریکراو خواردەمەنی و جل وبەرگ بۆ ئەوان دابین بکەن.

دەڵێت: عوسمان کوری عەفان و خەلیفە و ئەمیرەکانی دوای ئەو، رێزیان لەم پەیمانە گرت و عومەر کوری عەبدولعەزیز، لەبەرژەوەندی موسوڵمانان، پەیمانەکەی پشتڕاست کردەوە.

سەیف دەڵێت: لەمانگی زیقەعدەی ساڵی شانزەیەم، عومەر کوری خەتاب لەسەر کەنارەکانی میسر چەندین پادگانی دروست کرد و هۆکارەکەی ئەوە بوو هێرقل لەرێگەی دەریاوە بۆ جەنگی میسر و شام دەهات و خۆی، هێرشی کردە سەر خەڵکانی حمس. لەم کاتەدا سێ ساڵ و شەش مانگ لەخەلافەتی عومەر کوری خەتاب تێپەڕیبوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا، یانی ساڵی بیستەم، باوکی بەحرییەی کەندی، عەبدوللە کوری قەیس، بۆ جەنگ لەسەرزەمینی رۆم بەرێکەوت. وەك دەڵێن: یەکەم کەس بوو رۆشتە ناو ئەو سەرزەمینە و بەوتەیەك یەکەم کەس لەموسوڵمانان کەرۆشتە ناو سەرزەمینی رۆم، مەیسەرە کوری مەسروقی عەبەسی بوو کەتەندروست و لەگەڵ تالآنییەکەی زۆر گەڕایەوە.

دەڵێت: بەوتەی واقدی لەم ساڵەدا، قودامە کوری مەزعون لەفەرمانڕەوایەتی

بەحرەین دوور خرایەوە و بەهۆی شەرابخۆرییەوە، قامچی لێدرا. هەروەها لەم ساڵەدا سەروەری باوەڕداران، باوکی هورەیرەی وەك كارگوزاری بەحرەین و یەمامە دەستنیشان كرد.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عومەر كوڕی خەتاب، فاتیمەی كچی وەلید و دایكی عەبدولرەحمان كوڕی حارسی وەك هاوسەری خۆی هەڵبژارد.

هەروەها لەم ساڵەدا، بیلال كوڕی رەباح، مرد و لەگۆڕستانی دیمەشق بەخاك سپێردرا.

لەم ساڵەدا عومەر كوڕی خەتاب، سەعدی لەكوفە لابرد چوونكە خەڵكانی كوفە سكالاّیان بەرز كردەوە و دەیانوت: بەباشی نوێژ ناخوێنێت.

لەم ساڵەدا سەروەری باوەڕداران، خەیبەری لەنێوان موسوڵمانان دابەش و جوولەكەكانی دەركرد. باوكی حەبیبەی بۆ فەدەك نارد كەنیوەی زەوی و نیوەی بەرهەمی بۆ ئەوان دیاری و رووی كردە وادی ئەلقورا و ئەو دیارەیشی دابەش كرد.

لەم ساڵەدا یانی ساڵی بیستەم، بەوتەی واقدی، سەروەری باوەڕداران دیوانەكانی رێكخست.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئاماژەمان بەبۆچوونە جیاوازەكان لەمبارەوەدا.

لەم ساڵەدا، عومەر كوڕی خەتاب، عەلقەمە كوڕی مەجزەزی مودەلیجی لەدەریاوە بۆ حەبەشە نارد و هۆكارەكەی ئەوە بوو خەڵكانی حەبەشە دەستدرێژییان كردە سەر سنوورەكانی ئیسلام و زیانیان لەموسوڵماناندا بوو. دواتر عومەر بڕیاریدا هیچ كات سوپا بۆ دەریا ڕەوانە نەكات.

بەلاّم بەوتەی باوكی مەعشەر جەنگی ڕەشەكان لەدەریا لەساڵی سی و یەك ئەنجامدرا.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا لەمانگی شەعبان، ئەسید كوڕی حەزیر مرد هەروەها زێنەب كچی جەحش كۆچیی دوایی كرد.

لەم ساڵەدا عومەر كوڕی خەتاب لەگەڵ خەڵكان حەجی كرد و كارگوزارەكانی لەسەر ویلایەتەكان هەمان كەسانی ساڵەكانی پێش بوون جگە لەوانەی ئاماژەمان بەلابردنیان كرد و كەسانی دیكەی لەجێگەی ئەوان دانا. داوەرەكان هەمان داوەرەكانی ساڵەكانی پێشوو بوون.

## ساڵی بیست و یەك دەستی پێکرد

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی کوڕی ئیسحاق جەنگی نەهاوەند لەم ساڵەدا روویدا. باوکی مەعشەر و واقدیش وتەکەیان پشتڕاستکردەوە. بەڵام بەوتەی سەیف کوڕی عەمرۆ جەنگی نەهاوەند لەساڵی هەژدەیەم و ساڵی شەشەمی خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب روویدا.

## جەنگی موسوڵمانان و فارسەکان لەنەهاوەند

سەرەتای بەسەرهاتەکە بەوشێوەیە کەکوڕی ئیسحاق دەڵێت: داستانی نەهاوەند بەمشێوەیە: نەعمان کوڕی موقرین کارگوزاری کەسکەر نامەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی و ئاگاداری کردەوە کەسەعد کوڕی ئەبی وەقاس منی وەك لێپرسراوی گرتنی خەراج دەستنیشان کردووە، بەڵام ئارەزوومەندی جیهادم.

عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ سەعد نووسی: ئەوت بۆ کۆکردنەوەی خەراج دەستنیشان کردووە و حەزی لەم کارە نییە و تامەزرۆی جیهادە، ئەو بۆ گرنگترین بەرەی جەنگ ڕەوانە بکە.

دەڵێت: عەجەمەکان لەنەهاوەند کۆببوونەوە و سەرکردەکەیان زونەلحاجەب بوو. عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ نەعمان کوڕی موقرین نووسی:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

لەبەندەی خوا، عومەر، سەروەری باوەڕداران

بۆ نەعمان کوڕی موقرین

سڵاو لەتۆ، سوپاسی خواوەند دەکەم کەخوایەك جگە لەو خوایەك نییە، بەڵام دواتر، ئاگادار بوومەوە دەستەیەکی فراوان لەعەجەمەکان لەشاری نەهاوەند دژی ئێوە کۆبوونەتەوە. کاتێك نامەکەی من بەدەستی تۆ بگات، بەفەرمانی خواوەند و هێزی خوا و هاوکاری خوا و ئەو موسوڵمانانەی لەگەڵ تۆن، هێرش بکە سەریان وئەوان بۆ شوێنێکی دژوار مەبە گرفتاری ئازار ببن و مافەکانیان لەبەرچاو بگرە تا کافر نەبن. ئەوان بۆ ناو دارستان و زۆنکاوەکان مەبە چوونکە یەك پیاوی موسوڵمانان لای من ئازیزترە لەسەد هەزار دینار.

دەڵێت: نەعمان بەرێکەوت و ئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) و لەناو ئەوان حوزەیفە کوڕی یەمان و عەبدوللە کوڕی عومەر کوڕی خەتاب و جەریر و کوڕی عەبدوللەی بیجلی و موغەیرە کوڕی شوعبە و عەمرۆ کوڕی مەعدیکەربی زوبەیدی و توڵەیحە کوڕی خوەیلدی ئەسەدی و قەیس کوڕی مەکشوحی موڕادی، هاوڕێیەتیان دەکرد. کاتێك لەگەڵ سوپاکەی خۆی بەرەو نەهاوەند بەرێکەوت، دڕکی ئاسنینیان لەرێگەی ئەواندا بڵاو کردەوە. ئەو سیخوڕەکانی نارد و بەرێکەوتن بێ ئەوەی ئاگایان لەدڕکەکان بێت. یەکیان ئەسپەکەی خۆی کەدڕك لەسمی چەقیبوو، بۆ پێشەوە دەبرد بەڵام ئەسپەکەی نەڕۆشت و دابەزی و دەستی ئەسپەکەی خۆی بینی کەدڕکی لەسمیدا بینی. گەڕایەوە و نەعمانی ئاگادار کردەوە. نەعمان بەخەڵکانی وت: بۆچوونی ئێوە چییە؟

وتیان: لێرەوە بۆ شوێنێکی دیکە بڕۆ تا گومان بکەن هەڵدێیت و شوێن تۆ بکەون.

نەعمان لەشوێنەکەی خۆی هاتەدەر و عەجەمەکان دڕکەکانیان کۆکردەوە و شوێنی کەوتن. نەعمان گەڕایەوە وئوردووی لێدا. دواتر دەستەکانی سوپاکەی خۆی رازاندەوە و قسەی بۆ خەڵکان کرد و وتی: ئەگەر کوژرام، حوزەیفە کوڕی یەمان سەرکردەی ئێوەیە و ئەگەر ئەو کوژرا، سەرکردەکەتان جەریر کوڕی عەبدوللەو ئەگەر جەریر کوڕی عەبدوللە کوژرا، قەیس کوڕی مەکشوح سەرکردەیە. موغەیرە کوڕی شوعبە ڕەنجا چوونکە ئەوی وەك جێگر دەستنیشان نەکرد، هاتە لای و وتی: چی دەکەیت؟

وتی: کاتێك نوێژی نیمەڕۆم خوێند، جەنگ دەستپێدەکەم چوونکە پێغەمبەر(د.خ) حەزی بەم کارە دەکرد.

موغەیرە وتی: ئەگەر لەجێگەی تۆ دەبووم، لەبەرەبەیان جەنگم دەستپێدەکرد.

نەعمان وتی: ئەگەری هەیە جەنگت لەبەرەبەیاندا دەست پێبکردایە و خواوەند رووی تۆی ڕەش نەدەکرد. ئەم قسەی لەبەر ئەوە وت چوونکە ئەو ڕۆژە هەینی بوو.

نەعمان وتی: بەخواستی خوا نوێژ دەخوێنین و دوای نوێژ، رووبەرووی دوژمن دەبینەوە.،

کاتێك دوو سوپاکە ریزیان بەست، نەعمان بە موسوڵمانانی وت: من سێ جار

تەکبیر دەڵێم: کاتێك تەکبیری یەکەمم وت، هەمووان قەیتانی پێپۆشەکەی توند و خۆی ئامادە بکات و بۆتەکبیری دووەم، جلەکانی خۆتان و بۆ هێرش ئامادە و لەتەکبیری سێیەم هێرشیان بکەنەسەر چوونکە هێرش دەبەن.

فارسەکان هاتن و خۆیان بەزنجیر بەستبوویەوە تا پشت نەکەنە گۆڕەپانی جەنگ. موسوڵمانان هێرشیان برد و جەنگیان دەستپێکرد. تیرێك بەر نەعمان کەوت و کوژرا و براکەی سوەید کوڕی موقرین ئەوی لەجل و بەرگەوە ئاڵاند تا ئەو کاتەی خواوەند سەرکەوتنی بە موسوڵمانان بەخشی، نەیهێشت موسوڵمانان لەکوژرانی ئەو ئاگادار ببنەوە. ئاڵاکەی بەحوزەیفە کوڕی یەمان سپارد کەزۆنەلحاجەبی کوشت و نەهاوەند دەستی بەسەردا گیرا. دوای ئەوە چیتر فارسەکان نەیانتوانی کۆببنەوە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بیستم عومەر کوڕی خەتاب، سائیب کوڕی ئەقرەع موالی سەقیف کەپیاوێکی شارەزا و ژمێریار بوو، ڕەوانەی کرد و وتی: پەیوەستی ئەو سوپایە ببە و بمێنەرەوە و ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی، تالآنییەکان لەناو ئەواندا دابەش بکە و پێنج یەکی خوا و پێنج یەکی پێغەمبەر(د.خ) ڕەوانە بکە و ئەگەر سوپای موسوڵمانان شکستی خوارد، ڕوو بکەنە سارا چوونکە ئەویَ باشترە.

سائیب دەڵێت: کاتێك خواوەند لەنەهاوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی، تالآنی زۆریان دەستکەوت و کاتێك سەرقاڵی دابەش کردنی تالآنییەکان بووم، کافرێك لەخەڵکانی ئەویَ هات و وتی: من بۆ گیانی کەسان و بنەماڵەکەم ئەمان دەدەیت تا گەنجەکانی نەخەیرجان کەگەنجی بنەماڵەی کەسرایە، بەتۆ نیشان بدەم تا ببێتە تالآنی موسوڵمانان و کەس شەریکتان نەبێت.

وتم: بەڵێ.

وتی: کەسێك لەگەڵ من ڕەوانە بکە تا شوێنی گەنجەکانی نیشان بدەم.

دەڵێت: کەسێکم لەگەڵ ئەو نارد و دوو سنوقی گەورەی هێنا. لێوانلێو بوو لەمرواری و یاقووت و زەموورد. کاتێك لەدابەش کردنی تالآنییەکان تەواو بووم، سنووقەکانم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ لای عومەر کوڕی خەتاب، وتی: سائیب چ هەواڵێکت پێیە؟

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەواڵی خۆش، خواوەند سەرکەوتنێکی گەورەی بەتۆ بەخشی و نەعمان کوڕی موقرین کوژرا.

وتی: انا لله و انا الیه راجعون. قوڕقوڕ دەستی بەگریان کرد و لەرینەوەی شانەکانی ئەوم دی.

کاتێك ئەمەم بینی، وتم: سوێند بەخوای ئەی سەروەری باوەڕداران، دوای ئەو کەسی ناسراو و بەناوبانگ نەکوژرا.

وتی: ئەوان موسوڵمانە ناتەوانەکان بوون، بەڵام ئەوانەی شەهید بوون، خۆیان و ڕەچەڵەکیان باش دەناسن، لەناسینی عومەر، کوڕی دایکی عومەر، چ سوودێك دەبەن.

هەستا بڕوات، وتم: سامانێکی گرانبایيم لایە و لەگەڵ خۆم هێناومە. لەدوو سنووقەکە ئاگادارم کردەوە.

وتی: بیانسپێرە بەبیت المال تا لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەین و خۆت بۆ ناو سوپاکە بگەڕێرەوە.

دەڵێت: سنووقەکانم تەسلیم کرد و بەخێرایی بۆ کوفە گەڕامەوە.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بەرەبەیانی ئەو شەوەی من بەرێکەوتم، کەسێکی بەدوای مندا نارد و کاتێك بەمن گەیشتەوە کەدەڕۆشتمە ناو کوفە، وشترەکەم خەواند و ئەو لەپشت سەری من وشترەکەی خەواند و وتی: بۆ لای سەروەری باوەڕداران بڕۆ چوونکە منی بەدوای تۆدا نارد و تا ئێرە بەدوای تۆ هاتووم.

وتم: هاوار لەتۆ، چی ڕوویداوە و منی بۆ چی دەوێت؟

وتم: سوێند بەخوا نازانم.

دەڵێت: لەگەڵ ئەو گەڕامەوە تا گەیشتینە لای سەروەری باوەڕداران، کاتێك منی بینی، وتی: لەدەست کوڕی دایکی سائیب چیم بەسەر دێت؟ کوڕی دایکی سائیب چ بەڵایەکم بەسەر دێنێت؟

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، چی ڕوویداوە؟

وتی: هاوار لەتۆ، ئەو شەوەی ڕۆشتیت، کاتێك خەوتم، فریشتەکان هاتن و منیان بۆ لای سنووقەکان برد و ئاگری لێ بەرز دەبوویەوە، بێ باوك بیانبە و بیانفرۆشە و بۆ ڕۆژی موسوڵمانان خەرجی بکە.

دەڵێت: دوو سنووقەکەم برد و لەمزگەوتی کوفە دامنان، بازرگانەکان هاتن و عەمرۆ کوڕی حورەیسی مەخزومی بەدوو هەزار هەزار لەمنی کڕی و بردی بۆ سەرزەمینی عەجەمەکان و بەچوار هەزار هەزار فرۆشتی و لەئێستادا دەوڵەمەندترین پیاوی کوفەیە.

زیاد کوڕی جوبەیر دەڵێت: باوکم دەیوت: عومەر کوڕی خەتاب کاتێك ئەمانی بەهورموزان بەخشی، پێی وت: پەندێکم فێر بکە.

هورموزان وتی: سنووری فارسەکان سەرێکی هەیە و دوو باڵ.

وتم: سەرەکەی لەکوێیە؟

وتی: لەنەهاوەندە کەبەنداری لێیە و شاسوارەکانی کەسرا و خەڵکانی ئیسفەهان هاورێیەتی دەکەن.

عومەر وتی: ئەی دوو باڵەکە؟

دەڵێت: هورموزان ناوی شوێنێکی برد کە لەبیرم کردووە، وتی: دوو باڵەکە بقرتێنە تا سەرەکە لەکار بکەوێت.

وتی: ئەی دوژمنی خوا، درۆت کرد، سەرەکە دەقرتێنم چوونکە کاتێك سەرەکە قرتا، دوو باڵەکە کاریگەریان نابێت.

دەڵێت: سەروەری باوەڕداران دەیویست خۆی بۆ شەڕی نەهاوەند بڕوات.

بەلاّم وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، خوت بۆ شەڕی فارسەکان مەڕۆ چوونکە ئەگەر بکوژرێیت، کاروباری موسوڵمانان دەشێوێت، سوپاکە ڕەوانە بکە.

عومەر کوڕی خەتاب خەڵکانی مەدینەی نارد. موهاجیر و ئەنسارەکان لەناویاندا دەبینران. عەبدوللە کوڕی عومەریشیان لەگەڵدا بوو، نامەی بۆ باوکی موسای ئەشعەری نووسی تا لەگەڵ خەڵکانی بەسرە بەرێکەوت و نامەی بۆ حوزەیفە کوڕی یەمان نوسی لەگەڵ خەڵکانی کوفە ملی ڕێگە بگرێتەبەر و لەنەهاوەند کۆببونەوە و نووسی کاتێك پەیوەستی یەك بوون، سەرکردەکەتان نەعمان کوڕی موقرینی موزنییە.

دەڵێت: کاتێك لەنەهاوەند کۆبوونەوە، بەندار کافرێکی ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی کەسێك لەموسوڵمانان بڕواتە لایان. موغەیرە کوڕی شوعبەیان نارد.

دەڵێت: دەڵێی هێشتا دەیبینم، پرچی درێژ و یەک چاوی بوو، ئەویان بۆ لای بەندار ڕەوانە و کاتێک گەڕایەوە، پرسیارمان لێکرد.

وتی: کاتێک بینیم لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کردبوو بۆ ئەوەی بەچ شێوەیەک پێشوازی لەمن بکەن، بەشکۆ و گەورەیی پاشایەتی یا بەسادەیی بۆ ئەوەی لەدەست کەوتنی تالانی بێ هیوای بن.

وتبوویان: بەرازاوەترین شێوە.

دەڵێت: خۆیان ئامادە کردبوو، کاتێک گەیشتمە لای ئەوان، بریقانەوەی نووکی ڕمەکان ورمەکان چاوی کوێر دەکرد. عەجەمەکان وەک شەیتان دەوری بەندداریان گرتبوو. ئەو، لەسەر تەختێکی زێر و تاجێی لەسەردا بوو.

دەڵێت: دەڕۆشتینە پێش و ڕێگەیان پێنەدەدام، هاوارم دەکرد، بەمشێوەیە لەگەڵ نێردراوەکان مامڵە ناکەن.

وتیان: تۆ سەگێک زیاتر نیت.

وتم: خوا نەکات، من لەناو خەڵکەکەی خۆم پێگە و ڕێزی تایبەتیم هەیە.

ئازاریاندام و وتیان: دانیشە. دانیشتم.

دەڵێت: وتەکانی بەنداریان بۆ موغەیرە وەردەگێڕایەوە، دەیوت: عەرەبەکان لەهەموو خۆشییەکانی ژیان بەدوور و لەهەمووان بەدبەختتر و ناپاکتر و سەرزەمینەکەیان دوورە. ئەگەر بۆ خۆپاراستن لەگڵاوی جەستەی ئێوە نەدەبوو، فەرمانم بەتیرهاوێژەکان دەدا جەستەی ئێوە بدوورنەوە چوونکە گڵاون، ئەگەر بڕۆن کارمان پێتان نابێت و ئەگەر پێداگری بکەن، کوشتارگەتان نیشان دەدەین.

موغەیرە دەڵێت: سوپاسی خوام کرد و ناوی ئەوم هێنایە سەرزمان، وتم: سوێند بەخوا بەباشترین شێوە وەسفی ئێمەت کرد، دیارمان دوور و لەهەمووان برسیتر و بەدبەختتر بووین و لەچاکەکاری بەدوور تا ئەوەی خواوەند پێغەمبەرێکی لەناومان هەڵبژارد کەبەڵێنی سەرکەوتنی دنیا و بەهەشتی پێداین. سوێند بەخوا لەو کاتەوەی پێغەمبەر لەناوماندا دەرکەوتووە، لەهەموو جەنگەکاندا براوە و سەرکەوتوو بووین و ئێستا ڕووبەڕووی ئێوە بووینەتەوە، سوێند بەخوا جارێکی دیکە نامانەوێت ڕۆژگارمان ڕەش بێت تا ئەو کاتەی دەست بەسەر سنووری وڵات و سامانی ئێوەدا دەگرین یا لەسەرزەمینەکەی ئێوە دەکوژرێین.

وتی: سوێند بەخوا ئەم یەك چاوە قسەكانی دڵی بەراشكاوی هێنایە سەرزمان.

دەڵێت: هەستام و تا ئەو جێگەی دەمتوانی فارسەكانم ترساند.

دەڵێت: بەندار كەسی نارد و پەیامیدا: یا بۆ لای ئێمە وەرنە نەهاوەند، یا ئێمە دێینە لای ئێوە.

نەعمان وتی: وەرن.

ئەبی دەیوت: سوێند بەخوا رۆژێكی هاوشێوەی ئەو رۆژەم نەبینیبوو، فارسەكان لەكێوی ئاسن دەچوون، بڕیاریاندا بوو بەهیچ شێوەیەك گۆڕەپانی جەنگ بەجێنەهێڵن. خۆیان بەستبوویەوە و هەر حەوت كەس بەبەندێكی ئاسنینەوە بوون. دڕكە ئاسنینەكانیان لەپشت سەری خۆیان بڵاو كردبوویەوە و دەیانوت: هەر كەس لەئێمە هەڵێت، دڕكەكان شەلی دەكات.

دەڵێت: كاتێك موغەیرە ژمارەی زۆری ئەوانی بینی، وتی: هاوشێوەی ناكامی ئەمڕۆم نەبینیوە كەرێگە بەدوژمنان دەدەن خۆیان ئامادە بكەن و هێرشیان ناكەنە سەر، سوێند بەخوا ئەگەر فەرماندە دەبووم، دەمێك بوو هێرشم بردبوو.

نەعمان كوڕی موقرین پیاوێكی نەرم و نیان بوو، وتی: خوا بكات لەم شوێنانە ئامادە بیت و لەكردەوەكانی خۆت خەمبار و ناوت نەزڕێت، هۆكاری من بۆ دەسپێكردنی جەنگ، كردەوەی پێغەمبەرە، چوونكە دەمبینی كاتێك پێغەمبەر(د.خ) بۆ جەنگ دەڕۆشت، سەرەتای رۆژ نەدەجەنگا، پەلەی نەدەكرد تا نوێژی دەخوێند و با هەڵیدەكرد، لەبەر ئەمە جەنگ دەستپێناكەم.

وتی: خواوەندا دەمەوێت ئەمڕۆ چاوی من بەسەركەوتنێكی گەورە روونـاك بكەیتەوە و كافرەكان ریسوا و زەلیل بكەیت، دواتر شەهید بوونم پێ ببەخشە، خوا بتانبەخشێت، بڵێن، ئامین.

دەڵێت: وتمان ئامین و گریایین.

نەعمان وتی: كاتێك ئاڵاكەی خۆم شەكاندەوە، سیلاحەكانی خۆتان ئامادە بكەن، جارێكی دیكە ئاڵاكە تەكان دەدەن و بۆ جەنگی دوژمن حازر بن و بۆ سێیەم جار، هەر دەستەیەك بەپشتیوانی خواوەند هێرش بكاتە سەر دوژمن.

دەڵێت: دڕكی ئاسنینیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو.

دەڵێت: نەعمان تا كاتی نوێژ چاوەڕوانی كرد، با هەڵیكرد و تەكبیری هێنایە سەرزمان وئێمەیش تەكبیرمان وت. وتی: هیوادارم خواوەند دۆعاكانم گیرا بكات و سەركەوتنم پێ ببەخشێت، ئاڵاكەی تەكاندا و خۆمان بۆ جەنگ ئامادە كرد، جارێكی دیكە ئاڵاكەی تەكاندا و كەوتینە جموجۆڵ و ڕووبەڕووی دوژمن بووینەوە. سێیەم جار ئاڵاكەی تەكاندا.

دەڵێت: نەعمان تەكبیری وت و موسوڵمانان بەدوای ئەودا تەكبیریان هێنایە سەرزمان و وتیان: سەركەوتنێكمان دەوێت خواوەند بەهۆیەوە ورە و هێزی موسوڵمانان زیاد بكات.

نەعمان وتی: ئەگەر كوژرام، حوزەیفە كوڕی یەمان سەركردەیە و ئەگەر ئەویش كوژرا، فلان كەس و دوای ئەو، فلانەكەس. تا شەش كەسی ناوبرد و دووایین كەسیان موغەیرە بوو. ئاڵاكەی بۆ جاری سێیەم راوەشاند و هەر دەستەیەك هێرشی كردە سەر دوژمنی بەرابەر بەخۆی.

دەڵێت: لەو ڕۆژەدا هیچ كام لەموسوڵمانان ئارەزووی گەڕانەوەیان نەدەكرد مەگەر ئەوەی بكوژرێت یا سەركەوتن بەدەست بێنێت، پێكەوە هێرشمان برد و فارسەكان خۆڕاگری ئێمەیان بینی و دڵنیابوون لەوەی گۆڕەپانی جەنگ بەجێناهێڵین، شكستیان خوارد. یەكیان دەكەوت و حەوت كەس بەدوایدا دەكەوتن. بەزنجیر خۆیان بەستبوویەوە و هەموویان كوژران. دڕكە ئاسنینەكان كە لەپشت سەری خۆیان بڵاویان كردبوویەوە، شەلی دەكردن.

نەعمان وتی: ئاڵاكە بۆ پێشەوە ببەن. ئاڵاكەمان بۆ پێشەوە برد و فارسەكانمان كوشتار دەكرد و شكستمان پێ دەهێنان. كاتێك نەعمان بینی خواوەند دۆعاكەی گیرا كردووە و سەركەوتنی بەچاوی خۆی بینی، تیرێك بەركەلەكەی كەوت و كوژرا.

دەڵێت: مەعقەلی برای هات و بەپەڕۆیەك داپیۆشی و ئاڵاكەی هەڵگرت و جەنگی دەستپێكرد و وتی: با بیانكوژین و شكستیان پێ بێنین. كاتێك خەڵكان كۆبوونەوە، وتیان: كوا سەركردەكەمان؟

مەعقەل وتی: سەركردەكەی ئێوە سەركەوتنی بەچاوی خۆی بینی و خواوەند شەهید بوونی پێبەخشی.

دەڵێت: خەڵكان لەگەڵ حوزەیفە بەیعەتیان بەست. عومەر لەمەدینەوە داوای

سەرکەوتنی بۆ دەکرد و هاوشێوەی ژنی دووگیان دەینالاّند و لەخوا دەپاڕایەوە.

دەڵێت: هەواڵی سەرکەوتنیان بەیەکێك لەموسوڵمانان بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی و کاتێك نێردراو گەیشتە لای ئەو، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، مژدانە، سەرکەوتنێکمان بەدەست هێنا خواوەند بەهۆیەوە هێز و وورەی موسوڵمانانی زیاد و کافرەکانی ریسوا کرد.

دەڵێت: عومەر سوپاسی خوای کرد و وتی: نەعمان تۆی ڕەوانە کرد؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سەبارەت بەنەعمان خۆڕاگربە.

دەڵێت: عومەر دەستی بەگریان کرد و انا للەی هێنایە سەرزمان. وتی: هاوار لەتۆ، کێی تر؟

وتی: فلاّن و فلاّن. کەسانێکی زۆری ناوبرد. وتی: کەسانی دیکە ئەی سەروەری باوەڕداران کەنایاننناسیت.

عومەر کوڕی خەتاب بەدەم گریانەوە وتی: چ زیانێکیان پێدەبڕێت کەعومەر نایاننناسێت، خوا دەیاننناسێت.

بەلاّم بەپێی گێڕانەوەی سەیف کە لەزمانی سەعید باسی دەکات، هۆکاری جەنگی نەهاوەند ئەمە بوو: کاتێك خەڵکانی بەسرە شکستیان بەهورموزان هێنا و رێگەیان نەدا فارسەکان سوپاکەی عەلا کوڕی حەزرەمی لەناو ببەن و هێرشیان کردە سەر فارس، فارسەکان نامەیان بۆ پاشاکەیان لەمەرو نووسی و هانیاندا. شا بۆ خەڵکی کێوەکان لەنێوان باب و سند و خوراسان و حیلوان نامەی نووسی و کەوتنە جموجۆڵ و نامەیان بۆ یەك دەنووسی و لەدەروی یەك کۆبوونەوە و بڕیاریاندا روو بکەنە نەهاوەند و لەوێ کاروبارەکانی خۆیان رێکبخەن. کاتێك یەکەمین دەستەکان گەیشتنە نەهاوەند، سەعد بەهۆی قوباد، کارگوزاری حیلوان ئاگادار بوویەوە و ئەم هەواڵەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی.

لەم کاتە کەفارسەکان نامەیان بۆ یەك دەنووسی و لەنەهاوەند کۆبوونەوە، کەسانێك دژایەتی سەعدیان کرد و دژی ئەو خەڵکانیان هاندا وئەو بارودۆخەی هاتبووە پێش، نەبووە رێگر بۆ ئەم کارەیان.

یەکێك لەوکەسانەی دژایەتی سەعدی دەکرد، جەراح کوڕی سەنانی ئەسەدی بوو

لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە، سەروەری باوەڕداران پێی وتن: هۆکاری خراپە خوازی ئێوە ئەمەیە لەکاتێکدا دوژمن دژی ئێوە کۆبۆتەوە، بەم کارەوە سەرقاڵن، سوێند بەخوا ئەم بارودۆخە نابێتە لەمپەر لەوەی لێکۆڵینەوە لەکار وکردەوەکانی ئێوە بکەم تەنانەت ئەگەر دوژمن لەبن دیواری شارەکەی ئێوە ئوردووی لێدابێت.

عومەر کوڕی خەتاب محەممەد کوڕی موسلیمەی ڕەوانە کرد. لەم کاتەدا موسوڵمانان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی عەجەمەکان خۆیان ئامادە دەکرد.

لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب، کاری محەممەد کوڕی موسلیمە ئەوە بوو سەبارەت بەوکەسانەی سکاڵایان لێدەکرا، لێکۆڵینەوە بکات. ئەو، ڕۆشتە لای سەعد تا بەناو خەڵکانی کوفەدا بیسوڕێنێت، ئەمە لەکاتێکدا بڕیاردرابوو سوپای موسوڵمانان لەویلایەتەکانەوە بەرەو نەهاوەند بەرێکەوێت. محەممەد کوڕی موسلیمە سەعدی بۆ مزگەوتەکانی کوفە دەبرد. پرسیارەکان سەبارەت بەو نهێنی نەبوو چوونکە لەو رۆژەدا بەشێوەیەکی نهێنی پرسیاری کەسانیان نەدەکرد. لەهەر مزگەوتێك سەبارەت بەسەعد پرسیاری دەکرد و دەیانوت: تەنیا وەك کەسێکی چاکەکار دەیناسین و جگە لەو بەفەرمانڕەوایەتی کەسی دیکە رازی نابین، سەبارەت بەو ناڕەوا ناهێنینە سەرزمان و دژی ئەو هاوکاری کەس ناکەین. جگە لەدەستەکەی جەراح کوڕی سەنانی ئەسەدی و هاوەڵانی کەبێدەنگ بوون، ئەوان خراپەیان نەدەوت بەڵام وەسفیشیان نەدەکرد چوونکە ڕەوا نەبوو.

کاتێك محەممەد کوڕی موسلیمە گەیشتە لای مناڵەکانی عەبەس، وتی: هەرکەس شتێکی راستی دەزانێت، سوێندی دەدەم بەخوا باسی بکات.

ئوسامە کوڕی قتادە وتی: خواوەندا، ئێستا کەبەخوا سوێندت داین، ئەو، سەعد، بەشێوەیەکی یەکسان تاڵانییەکان دابەش ناکات و بەشێوەیەکی دادپەروەرانە لەگەڵ ژێردەست و مسکێنەکان ناجووڵێتەوە.

سەعد وتی: خواوەندا، ئەگەر ئەم قسەی درۆیە، چاوەکانی کوێر بکە و نانخۆرەکانی زۆر بکە و بەهەموو ئەو فیتنانەی خەڵکان گومرا دەکەن، گرفتاری بکە.

دوای ئەوە، ئوسامە چاوی لەدەستدا و دەکچ دەوریان گرت. بەشێوەیەك کاتێك هەواڵی یەکێك لەژنەکانی دەبیست و دەڕۆشتە لای و کاتێك دەیدۆزییەوە، دەیوت: ئەمە نفرینی سەعد، پیاوی پیرۆزە.

سەعد چەندین کەسی دیکەی نفرین کرد و وتی: خواوەند ئەگەر بەناڕەوا درۆیان هێناوەتە سەرزمان، گرفتاری بەڵایەکی دژواریان بکە. ئەوان گرفتاری ئەو بەڵایە بوون. جەڕاح ئەو رۆژەی هێرشی کردە سەر حسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب تا بەشێوەیەکی لەناکاو بیکوژێت، بەشمشێری هاوەڵانی حسەین کوژرا، قەبیسە بەبەرد و ئەربود بەخێرد و نووکی شمشێرەکان.

سەعد وتی: یەکەم کەسم لەرێگەی ئیسلام خوێنی ناباوەڕانم ڕشت. پێغەمبەر(د.خ) دایك و باوکی خۆی کردە قوربانی من و پێش من بۆ کەس ئەوکارەی نەکرد. پێنجەم کەس بووم باوەڕم بەم دینە هێنا و منالەکانی ئەسەد گومان دەکەن نوێژ کردن نازانم وبەڕاو کردنەوە سەرقالم.

محەممەد، سەعد و ئەو کەسانەی بردە لای عومەر کوڕی خەتاب و کاتێك گەیشتنە مەدینە، لەهەواڵ و پێشهاتەکان ئاگاداری کردەوە، عومەر وتی: ئەی سەعد، هاوار لەتۆ، چۆن نوێژ دەخوێنیت؟

وتی: دوو ڕەکعەتی یەکەم درێژ دەکەمەوە و ڕەکعەتەکانی دووایی کورت.

وتی: ئەم شێوەیە بۆ تۆ شیاوە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەگەر لەبەر هەندێ شت نەدەبوو، دەمزانی چی لەوان بکەم. وتی: ئەی سەعد، جێگری تۆ لەکوفە کێیە؟

وتی: عەبدوللە کوڕی عەبدوللە کوڕی عوتەبان.

عومەر عەبدوللەی وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد. بەم پێیە، ئاژاوەی نەهاوەند و دەستپێکی راوێژ کردن سەبارەت بەو جەنگە و ڕەوانە کردنی سوپاکان لەرۆژگاری سەعد بوو. بەڵام جەنگەکە لەسەردەمی عەبدوللە روویدا.

دەڵێت: فارسەکان دوای نامەی یەزدگێردی پاشا کەوتنە جموجۆڵ و رێگەی نەهاوەندیان گرتەبەر. خەڵکان لەنێوان خوراسان تا حیلوان و خەڵکان لەنێوان باب تاحیلوان و خەڵکان لەنێوان سیستان تا حیلوان بەرەو نەهاوەند بەرێکەوتن. لەفارسەکان و جەنگاوەرانی کێوەکان لەنێوان باب تا حیلوان، نزیکەی سی هەزار شەڕکەر کۆبوویەوە و لەنێوان خوراسان تا حیلوان شەست هەزار کەس و لەنێوان سیستان تا حیلوان شەست هەزار کەس و هەموویان لەدەوری فیروزان کۆبوونەوە.

باوكی توعمەی سەقەفی كەبینەری رووداوەكان بوو، دەڵێت: فارسەكان وتیان: محەممەد كەدینی بۆ عەرەبەكان هێنا، مەبەستی جەنگی ئێمەی نەكرد، دوای محەممەد، ئەبوبەكر بووبە پاشای ئەوان ومەبەستی سەرزەمینی فارسەكانی نەكرد مەگەر تالآن كردن و بڕینی كاروانەكان كەكاری هەمیشەیی ئەوان بووە، دوای ئەوان عومەر پاشایەتی گرتەدەست و سنووری دەسەلآتەكەی فراوان و لەئێوە نزیك كەوتەوە و سواد و ئەهوازی لەدەستی ئێوە دەرهێنا، ئەگەر هێرشی نەكەنەسەر، ئەو هێرش دەكاتە سەر ئێوە چوونكە مالّی پاشایەتی وێران و هێرشی كردە سەر شاری پاشاكەتان و دەست هەڵناگرێت تا ئەو كاتەی سوپاكەی لەم ولآتە دەربكەن و ئەم دوو شارەیان لیّ وەربگرنەوەو بۆ دیاری خۆی دوور بخەنەوە. بڕیاریاندا ولەنێوان خۆیان نووسراوێكیان نووسی و هەمووان واژۆیان كرد.

كاتێك سەعد ئاگادار بوویەوە، عەبدولله كوڕی عوتەبانی وەك جێگری خۆی دانا و رووی كردە مەدینەو ئەو هەواڵەی دەیویست بۆی بنێرێت، رووبەروو بۆی باس كرد و وتی: خەڵكانی كوفە مۆڵەتی پێشڕەوییان دەوێت و دەیانەوێت بۆ جەنگ و توندوتیژی دژی فارسەكان دەسپێشخەری بكەن.

دەڵێت: عومەر كوڕی خەتاب رێگەی پێشڕەوی كردن لەسەرزەمینی كێوەكانی لیّ گرتبوون.

عەبدوللەو كەسانی دیكە نامەیان بۆ نووسی كەسەد و پەنجا هەزار پیاوی شەڕكەر لەفارسەكان كۆبوونەتەوە و ئەگەر پێش ئەوان نەكەوین، هێرش دەكەنە سەرمان و هێز و بوێرییان فراوان دەبێت، ئەگەر سەرەتا ئێمە هێرشیان بكەینەسەر، لەبەرژەوەندی ئێمەدایە.

دەڵێت: ئەو كەسەی ئەم هەواڵی برد قەریب كوڕی زەفەری عەبدی بوو. سەعد دوای ئەو بۆ راوێژ كردن لەگەڵ سەروەری باوەڕداران بەرێكەوت.

كاتێك نێردراو گەیشتە لای عومەر كوڕی خەتاب، لێی پرسی: ناوت چییە؟

وتی: قەریب.

وتی: كوڕی كیّ؟

وتی: كوڕی زەفەر.

سەرکەوتن (زەفەر، ظفر) نزیکە (قەریبە، قریب) و بێ هاوکاری خوا هیچ هێزێك بوونی نییە.

خەڵکان بۆ نوێژی جەماعەت کۆبوونەوە و سەعد هات و عومەر بەشێوەیەکی باشە لێکدانەوەی بۆ ناوی سەعد کرد. لەسەر مینبەر دانیشت و ئەم هەواڵەی بەموسوڵمانان راگەیاند و راوێژی لەگەڵ کردن، وتی: ئەم رۆژە، رۆژەکانی بەدواوەیە. مەبەستی ئەنجامدانی کارێکم کردووە، پێتان دەڵێم، ببیستن و لەبۆچوونی خۆتان ئاگادارم بکەنەوە، بەکورتی باسی بکەن بێ ئەوەی گیرۆدەی ئاژاوە ببەن چوونکە ناکام و هێزتان لەناو دەچێت، زۆر مەڵێن و درێژ دادڕی مەکەن با کارەکان و بۆچوونەکان ئاڵۆز نەبێت، ئایا پەسەندی دەکەن من و ئەو کەسانەی لەدەوری من کۆبوونەتەوە و ئەوانەی دەتوانم کۆیان بکەمەوە، بەرێکەوین و لەمەنزڵگەیەك لەنێوان ئەم دوو شارە دابەزین و پێشنیاری بەرێکەوتن بەخەڵکان بکەین و ببینە هێزی پشتیوان تا ئەو کاتەی خواوەند سەرکەوتن بەموسوڵمانان دەبەخشێت و فەرمانەکانی خۆی ئەنجام دەدات. ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین، بۆ دیاری فارسەکان پێشڕەوییان پێبکەم کە لەسەر پاشایەتی خۆیان دەجەنگن؟

عوسمان کوڕی عەفان و تەڵحە کوڕی عوبەیداللە و زوبەیر کوڕی عەوام و عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف و چەند کەسێکی دیکە لەبیرمەندان و ئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ)، هەستان و وتیان: ئەمە پەسەند نییە، دەبێت بۆچوونی تۆ بەسەر بۆچوونی کەساندا زاڵ نەبێت، سوار وسەرکردە و سەرانی عەرەب کەبڵاوەیان بەسوپای فارسەکان کردووە و پاشاکانی ئەوانیان کوشتووە و شەڕی گەورەتر لەمەیان ئەنجامداوە، لەوێن. داوای مۆڵەتیان کردووە، نەپاڕاونەتەوە، مۆڵەتیان بدە و کەسان بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە بکە و تۆ لێرە تەنیا دۆعایان بۆ بکە.

دەڵێت: ئەو کەسەی ڕەخنەی لەبۆچوون و بڕیارەکەی عۆمەر گرت، عەباس بوو.

باوکی توعمە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆچوونی ئەسحابەکان پەسەندە و هەستیان بەناوەرۆکی نووسراوەکە کردووە، سەرکەوتن و بەزین بەزۆری و کەمی ژمارەی سوپاکە نییە، ئەمە دینی خواوەندە بڵاوی کردۆتەوە و سوپای ئەوە و لەلایەن فریشتەکانەوە هاوکاری

دەکرێت و گەشتۆتە ئێرە، بارودۆخی تۆ بۆ موسوڵمانان هاوشێوەی ڕشتەی مۆرەکانە کەئەوان کۆدەکاتەوە و دەیانپارێزێت و ئەگەر ئەو ڕشتەیە لەناو بچێت، بڵاوەی لێدەکەن و هیچ کات بەتەواوی یەك ناگرنەوە. هەنووکە عەرەبەکان هەرچەند کەمن بەڵام بەهۆی ئیسلامەوە بەهێز و فراوانن. بمێنەرەوە وبۆ خەڵکانی کوفە کەگەورە و سەرکردەکانی عەرەبن و بەژمارە زۆرتر و تێکۆشەرتر و چاونەترسن، بنووسە، دوو لەسەر سێی ئەوان رووبکەنە دیاری فارسەکان و یەك لەسەر سێیان بمێنێتەوە و بۆ خەڵکانی بەسرە بنووسە دەستەیەك لەشەڕکەرانی خۆیان بۆ هاوکاری سوپاکەی کوفە ڕەوانە بکەن.

دەڵێت: عومەر لەبۆچوونەکەی ئەوان شادمان و وتەکانی ئەوانی پەسەند کرد. سەعد هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، نیگەران مەبە، ئەوان بۆ وەرگرتنی سزاکانیان کۆبوونەتەوە.

ئەبوبەکری هوزەلی دەڵێت: کاتێك عومەر جەماعەتی لەو هەواڵە ئاگادار و راوێژی لەگەڵ کردن، وتی: بەکورتی قسە بکەن دوور لەدرێژدادڕی تا کاروبارەکان ئاڵۆز نەبێت، بزانن، ئەم ڕۆژانە ڕۆژی لەدوایە.

تەڵحە کوڕی عوبەیدالله یەکێك لەزمان پاراوەکان و هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)، هەستا و شایەتوومانی هێنایە سەرزمان، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەکارەکان بیرمەندیت پاشەکەوت کردووە و تامی زیان و بەڵاکانت چێشتووە و لەئەزموونەکان کەڵکت وەرگرتووە، تۆ خۆت باشتر دەزانیت، ئێمە لەبڕیار وبۆچوونەکانی تۆ سستی لەخۆمان نیشان نادەین، فەرمان بدە تا ئەنجامی بدەین، داوا بکە تا لەدەورت کۆببینەوە، ڕەوانەمان بکە تا بەرێکەوین، بمانکێشە، تا بکێشرێین، تۆ خاوەن و لێپرسراوی ئەم کارەیت... ڕەنجی زۆرت پێبڕاوە، بەئەزموونیت و قەزا و قەدەری خواوەند تا ئێستا چاکەی تۆی بەدواوە بووە.

کاتێك تەڵحە دانیشت، عومەر دووبارە وتی: ئەم ڕۆژانە ڕۆژی بەدواوەیە، لەبۆچوونی خۆتان ئاگادارم بکەنەوە.

عوسمان کوڕی عەفان هەستا و شایەتوومانی هێنایە سەرزمان و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆچوونی من ئەوەیە نامە بۆ خەڵکانی شام بنووسیت بەرێکەون و بۆ خەڵکانی یەمەن بەهەمان شێوە تا لەوڵاتەکەی خۆیانەوە بەرێکەون،

ئەوسا تۆ و خەڵکانی مەدینە و مەککە رووبکەنە دووشاری کوفە و بەسرە و موسوڵمانان رووبەرووی ناباوەڕان بکەیتەوە، چوونکە کاتێك لەگەڵ کەسانی هاوڕێی خۆت پێشڕەوی بکەیت، فراوانی ژمارەی دوژمن لەبەر چاوی تۆ ناگرینگ و هێزی تۆ زیاد دەبێت. ئەی سەروەری باوەڕداران، بەبێ عەرەبەکان تۆ چی دەبیت و لەهێزی دنیا چیت هەیە و پەنا بۆ کێ دەبەیت؟ ئەم رۆژانە رۆژی بەدواوەیە، بەبۆچوونی خۆت و لەگەڵ هاوەڵانی خۆت، لەو جەنگە بەشداربە.

عوسمان دانیشت و دووبارە عومەر وتی: ئەم رۆژانە رۆژی بەدواوەیە، قسە بکەن.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر خەڵکانی شام ببەیت، رۆمییەکان هێرش دەکەنە سەر ژن و منداڵەکانیان و ئەگەر خەڵکانی یەمەن ببەیت، حەبەشییەکان هێرش دەکەنە سەر یەمەن، تۆ ئەگەر لەم سەرزەمینە بڕۆیت، هەموو ئەم دەورووبەرە پەرێشان و دەشێوێت. ئەو خەڵکانە لەسەرزەمینەکانی خۆیان مەجووڵێنە و نامە بۆ خەڵکانی بەسرە بنووسە ببنە سێ دەستە: دەستەیەکیان لای ژن و منداڵەکان بمێنێتەوە و دەستەیەکیان لەگەڵ ئەهلی زەممە بۆ ئەوەی پەیمانەکەیان نەشکێنن و دەستەیەکی دیکە بۆ هاوکاری براکانیان لەکوفە بڕۆن. ئەگەر عەجەمەکان بەیانی تۆ ببینن، دەڵێن ئەمە ئەمیری عەرەبە و ڕەگ وریشەی عەرەب، پێداگرانەتر هێرش دەکەنە سەرتۆ، ئەوەی سەبارەت بەجموجۆڵی فارسەکان باست کرد، خواوەند زیاتر ئەو کارەی بەلاوە ناپەسەند و ناخۆشترە و هێزی ئەو بۆ گۆڕینی ئەوەی پەسەندی ناکات، فراوانترە. سەبارەت بەژمارەی فارسەکان قسەت کرد، ئێمە لەرابردوو بەپشت بەستن بەژمارەی سوپا نەدەجەنگاین، بەڵکو بەپشت بەستن بەسەرکەوتن رووبمان دەکردە گۆڕەپانی جەنگ.

عومەر وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا ئەگەر بڕۆم، کاروبارەکان ئاڵۆز و پەرێشان دەبن و ئەگەر عەجەمەکان من ببینن، پشت ناکەنە گۆڕەپانی جەنگ و ئەوکەسانەی هاوکارییان نەکردوون، بۆ هاوکاری ئەوان دێن و دەڵێن: ئەمە ڕەگ و ریشەی عەرەبە و ئەگەر لەبن دەریبێنن، ڕەگ و ریشەی عەرەبتان لەبن دەرهێناوە، کەسێك بەمن بناسێنن تا کاروباری ئەو سنورە بەو بسپێرم.

وتیان: بۆچوونی تۆ باشترە و توانایيت فراوانتر.

وتی: کەسێك بڵێن عێراقی بێت.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، تۆ خەڵکی عێراق و سوپاکەی باشتر دەناسیت، هاتوونە لای تۆ و قسەت لەگەڵ کردوون.

وتی: سوێند بەخوا کاری ئەوان بەکەسێك دەسپێرم بەیانی کاتێك رووبەرووی رمەکان ببێتەوە، بەرەو روویان بڕوات.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەو کەسە کێیە؟

وتی: نەعمان کوڕی موقرینی موزنی.

وتیان: ئەم کارە کاری خۆیەتی.

لەو کاتەدا نەعمان لەبەسرە و چەند کەسێك لەسەرکردەکانی کوفە لای ئەو بوون کەعومەر لەکاتی پەیمان شکێنی هورموزان ئەوانی بۆ هاوکاری کردنی نەعمان ڕەوانە کردبوو. ئەوان توانیبوویان دەست بەسەر رامهورموز و ئیزەدا بگرن و بۆ گرتنی شوشتەر و جوندیشاپوور و شوش هاوکاری موسوڵمانانیان کرد.

عومەر کوڕی خەتاب، بەزەڕ کوڕی کەلیب و موفتەریب، ئەسوەد کوڕی ڕەبیعە، ئەم هەواڵەی بۆ نەعمان نووسی کە: سەرکردایەتی جەنگی فارسەکانم بەتۆ سپارد، لەشوێنەکەی خۆتەوە بەرەو ماه بڕۆ و نامەم بۆ خەڵکانی کۆفە نووسیوە پەیوەستی تۆ ببن و کاتێك سوپاکەت کۆبوویەوە، هێرش بکە سەر فیروزان و ئەو خەڵکانەی لەدەوری کۆبوونەتەوە. داوای سەرکەوتن لەخوا بکەن و بەردەوام بڵێن: لا حول و لا قوە الا باللە.

باوکی وائیل سەبارەت بەوەی عومەر کوڕی خەتاب نەعمانی ڕەوانەی نەهاوەند کرد، گێڕانەوەیەکی دیکەی هەیە، دەڵێت: نەعمان کوڕی موقرین کارگوزاری کەسکەر نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی: نمونەی من و کەسکەر هاوشێوەی پیاوێکی گەنجە کەلەشفرۆشێکی لایە و تەختی بۆ دەرازێنێتەوە و بۆنی خۆشی لێدەدات، سوێندت دەدەم بەخوا لەکارگوزاری کەسکەر دوورم بخەرەوە و پەیوەستی یەکێك لەسوپای موسوڵمانانم بکە.

دەڵێت: عومەر بۆی نووسی: بڕۆ نەهاوەند و سەرکردایەتی خەڵکان بگرە دەست.

دەڵێت: لەکاتی جەنگەکە، نەعمان یەکەم کەس بوو کوژرا و براکەی سوەید کوڕی موقرین ئالاکەی هەڵگرت و خواوەند سەرکەوتنی بەموسوڵمانان بەخشی و فارسەکان

دوای ئەوەی چیتر کۆنەبوونەوە و خەڵکانی هەر شارێك لەگەڵ دوژمنەکەی خۆیان دەجەنگان.

سەیف دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بەرێبعی کوڕی عامر نامەی بۆ عەبدوللە کوڕی عەبدوللە نووسی تا لەخەڵکانی کوفە بەو ئەندازەیە شەڕکەر بۆ نەعمان ڕەوانە بکات چوونکە فەرمانم پێداوە لەئەهوازەوە روو بکاتە ماه. لەوێ پەیوەستی ببن و لەگەڵ ئەوان رووبکەنە نەهاوەند. سەرکردەی خەڵکان حوزەیفە کوڕی یەمانە تا دەگەنە لای نەعمان کوڕی موقرین. نامەم بۆ نەعمان نووسیوە ئەگەر تۆ کوژراییت، حوزەیفە کوڕی یەمان سەرکردەیە و ئەگەر حوزەیفە کوژرا، نەعیم کوڕی موقرین.

عومەر کوڕی خەتاب قەریب کوڕی زەفەری گەڕاندەوە و سائیب کوڕی ئەقرەعی وەك کەسێکی بڕواپێکراو کردە هاورێی ئەو، وتی: ئەگەر خواوەند سەرکەوتنی پێ بەخشین، تالآنییەکان لەناو ئەواندا دابەش بکە، فرێو لەمن مەکە و هەواڵی ناڕاستم بۆ مەنێرە، ئەگەر خەڵکان شکستیان خوارد، نەبتبینم، نەبمبینە.

ئەوان بەخێرایی لەگەڵ نامەکەی عومەر گەیشتنە کوفە، خەڵکانی دیکە زووتر لەهەمووان بەرێکەوتن چوونکە دەیانویست هەوڵ بدەن و لەتالآنییەکانیان بەرکەوێت. حوزەیفە کوڕی یەمان لەگەڵ خەڵکان بەرێکەوت، نەعیم هاورێیەتی دەکرد. لەتەرز پەیوەستی نەعمان بوون و سوپایەکیان بەسەرکردایەتی نەسیر لەمەرج ئەلقەلعە بەجێهێشت.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بۆ سەلما کوڕی قەیس و حەرەملە کوڕی مەربەتە و زەڕ کوڕی کەلیب و موقتەریب، ئەسوەد کوڕی رەبیعە، و سەرکردەکانی پارسی نەژادی نێوان ئەهواز و فارس نامەی نووسی و فەرمانی پێدان: فارسەکان لەبراکانی خۆتان دوور بخەنەوە و سەرقاڵیان بکەن و بەمشێوەیە پارێزگاری لەسەرزەمینی و سنووری دەسەڵاتی خۆتان بکەن تا فەرمانەکانی من بەدەستتان دەگات.

دەڵێت: عومەر، موجاشیع کوڕی مەسعودی سولەمی بۆ ئەهواز نارد و وتی: بەرەو ماه بڕۆ و کاتێك گەیشتە غەزی شەجەر، نەعمان فەرمانی پێدا لەوێ بمێنێتەوە و مایەوە. سەلما و حەرەملە و زەڕ و موقتەریب کە لەسنوورەکانی ئیسفەهان و فارس بوون، هاتن و ڕێگەیان نەدا فارسەکان هاوکاری سوپاکەی نەهاوەند بکەن.

دەڵێت: کاتێک خەڵکانی کوفە لەتەرز پەیوەستی نەعمان بوون، نامەی عومەر کوڕی خەتابی پێگەیشت کەنووسیبووی: ئەوکەسانەی لەگەڵ تۆدان لەرۆژگاری جاهلییەت سەرکردە و گەورەکانی عەرەب بوون، داوای هاوکارییان لێ بکە چوونکە شارەزای کاروباری جەنگن، پشت بەبۆچوونەکانیان ببەستە، راوێژ لەگەڵ تولەیحە و عەمرۆ بکە بەڵام هیچ کارێکیان پێ مەسپێرە.

دەڵێت: نەعمان تولەیحە و عەمرۆی لەتەرزەوە ڕەوانە کرد تا هەواڵەکانی بۆ بێنن. فەرمانی پێدان زۆر دوور نەکەونەوە.

تولەیحە کوڕی خوەیلد و عەمرۆ کوڕی ئەسلەمی عەنزی و عەمرۆ کوڕی مەعدیکەربی زوبەیدی بەرێکەوتن و کاتێک شەو ڕۆژێک ڕێگەیان بڕی، عەمرۆ کوڕی ئەسلەمی گەڕایەوە، وتیان: بۆ گەڕایتەوە؟

وتی: لەسەرزەمینی عەجەم بووم، سەرزەمینێك نەناسراوەکەی خۆی کوشت و ناسیاوەکە درێژەی بەرێگەدا. تولەیحە و عەمرۆ درێژەیان بەرێگەدا و لەکاتی شەو، عەمرۆ گەڕایەوە.

وتیان: بۆ گەڕایتەوە؟

وتی: ڕۆژ و شەوێك ڕێگەمان بڕی و هیچمان نەبینی، ترسام ڕێگەمان لێ ببەستن.

کەسان وتیان: دووەم کەسیش گەڕایەوە.

بەڵام تولەیحە ڕۆشت و تا نەهاوەند پێشڕەوی کرد. لەنەهاوەند تا تەرز بیست و چەند فەرسەخە. ئەوەی دبوا لەفارسەکان بەدەستی بێنێت، بەدەستی هێنا و لەباروودۆخی ئەوان ئاگادار بوویەوە، گەڕایەوە بۆ ناو خەڵکان و تەکبیریان وت.

وتیان: دەنگ و باس چییە؟

پێیان وت بۆ چارەنووسی ئەو ترساون.

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر تەنیا لەبەر عەرەب بوون نەدەبوو، لەناو کۆڕی عەجەمەکان لەعەرەبەکان دوور نەدەکەوتمەوە.

دواتر ڕۆشتە لای نەعمان و لەدەنگ و باسەکان ئاگاداری کردەوە و وتی: لەنێوان ئەو و نەهاوەند هیچ شتێکی ناخۆش و ناسازگار و هیچ لەمپەرێك بوونی نییە.

لەم کاتەدا نەعمان فەرمانی بەرێکەوتنی دەرکرد و فەرمووی: ڕێزەکانیان ڕێکبخەن. فەرمانی بەموجاشیع کوڕی مەسعوددا، خەڵکان بۆ پێشەوە ببات.

نـەعمان هاوشـێوەی سـوپایەکی ئامـادە رێگـەی بـڕی. نـەعیم کـوڕی مـوقرین فەرمانـدەی پێـشەنگەکان و باڵـەکانی راسـت و چـەپی بەحوزەیفـە کـوڕی یـەمان و سوەید کوڕی موقرین سپاردبوو. سەرکردەی تەکسوارەکان قەعقاع کوڕی عەمرۆ و دواوەی سوپاکەی بەموجاشیع سپاردبوو. هێزەکانی مەدینە کەموغەیرە و عەبدوللە لەناویاندا دەبینرا، هاتن و گەیشتنە ئەسپیزهان. فارسەکان لەوبەر وای خەرد و بۆ جـەنگ ریزیـان بەسـتبوو، سـەرکردەکەیان فـیروزان و باڵـەکانی راسـت و چـەپی بـە زەردەق و بەهمـەن جادوویـە سپاردبوو. بەهمـەنیان لـەجیاتی زوئەلحاجـەب دانـابوو. هـەموو خـەڵکی سـنوورەکان و سنووردارەکان و گـەورەکانی فـارس کـە لەقادسـیە و جەنگـەکانی پێـشوو بەشـدارییان نـەکردبوو، هـاتبوون. سـەرکردەی سـوارەکان ئەنوشـەق بـوو. کاتێك نـەعمان ئـەوانی بیـنی، تـەکبیری وت و موسـوڵمانان تـەکبیریان وت. فارسەکان ترسان. نەعمان سوار لەسەر ئەسپەکەی فەرمانیدا بارەکـان دابگـرن و خێوەتەکان هەڵبدەن.

خێوەتەکان هەڵدرا و نەعمان بەهەمان شێوە وەستابوو. گەورەکانی کوفە هاتن و خێوەتێکیان بۆ هەڵدا و بۆ ئەم کارە لەکەسانی دیکە پێشکەوتن. ئەوان چواردە کەس بوون کەحوزەیفـە کـوڕی یـەمان و عوقبـە کـوڕی عـەمرۆ و موغـەیرە کـوڕی شـوعبە و بەشـیر کـوڕی خەسایسـە و حەنزەلـەی کاتـب کـوڕی رەبیـع و بـاوکی هوبـەر و رێبعـی کوڕی عامر و عامر کوڕی مەتەر و جەریر کوڕی عەبدوڵلەی حـەمیری و ئـەقرەع کـوڕی عەبدوڵلـەی حـەمیری و جـەریر کـوڕی عەبدوڵلـەی بێجلـی و ئەشـعەس کـوڕی قەیـسی کێندی و سەعید کوڕی قەیسی هەمەدانی و وایـل کـوڕی حیجـر لەناویانـدا دەبینـران. لەعێراق کەس هاوشێوەی ئەوان خێوەتی هەڵنەدەدا.

دوای ئـەوەی بارەکانیـان داگـرت، نـەعمان جـەنگی دەسـپێکرد. رۆژەکـانی چوارشـەممە و پێنجشـەممە جـەنگان. تـەنووری جـەنگ گـەرم و ئـەم شـەڕە لەسـاڵی حەوتەمی خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب و ساڵی نۆزدەیەمی کۆچ روویدا.

رۆژی هـەینی فارسـەکان پـەنایان بـۆ خەندەکـەکانی خۆیـان بـرد و موسـوڵمانان گەمارۆیان خستنەسەر. تا ئەو کاتەی خواوەند دەیخواست، مانەوە و ئەمە بەدڵخواز و لەبەرژەوەندی عەجەمەکان بوو، چوونکە بەئارەزووی خۆیان بۆ جەنگ دەهاتنەدەر.

بارودۆخی موسوڵمانان دژوار و ترسان ئەم جەنگە درێژە بکێشێت. لەرۆژێکی هەینی موسوڵمانە بیرمەندەکان کۆبوونەوە و وتیان: ئەم شێوازە لەجەنگ لەبەرژەوەندی ئەوانە. ڕۆشتنە لای نەعمان و ئاگاداریان کردەوە. ئەویش لەم کارە ئەندێشەی کرد و بۆچوونی هاوشێوەی ئەوان بوو. نەعمان وتی: بمێننەوە و لێرە مەڕۆن.

کەسی بەدوای پاڵەوانەکان و بەئەزموونەکان لەجەنگ ڕەوانە کرد. هاتن و نەعمان لەگەڵیان ئاخاوت و وتی: دەبینن ناباوەڕان پەنایان بۆ خەندەك و شارەکەیان بردووە و هەرکات بخوازن بۆجەنگی ئێوە دێن و موسوڵمانان ناتوانن هانیان بدەن و بۆ ناو گۆڕەپانی جەنگ پەلکێشیان بکەن مەگەر ئەوەی خۆیان بخوازن. دەبینن ئەم کارە بارودۆخی بۆ موسوڵمانان دژوار کردووە، چۆن دەتوانین ئەوان بۆ گۆڕەپانی جەنگ پەلکێش بکەین.

عەمرۆ کوڕی سەبی کە لەهەمووان بەتەمەنتر بوو، قسەی کرد. ئەوان بەگوێرەی تەمەن قسەیان دەکرد. وتی: ئەم کارە بۆ ئەوان دژوارترە، با وابێت و پێداگری مەکە، باکاری جەنگ دوابخەن، هەرکەس لەوان ڕووبەڕووی تۆبوویەوە، لەگەڵی بجەنگە.

بەڵام کەس بۆچوونەکەی پەسەند نەکرد و وتیان: ئێمە دڵنیایین پەروەردگار بەڵێنەکەی خۆی دێنێتەدی.

عەمرۆ کوڕی مەعدیکەرب قسەی کرد و وتی: هێرش بکە و دەستەیەك بۆ پێشەوە بنێرە و مەترسە.

بەڵام کەس بۆچوونەکەی ئەوی پەسەند نەکرد و وتیان: دەڵێیت لەگەڵ دیوارەکان بجەنگین چوونکە دیوارەکان دژی ئێمە و هاوکاری ئەوانە.

توڵەیحە قسەی کرد و وتی: بۆچوونی خۆیان باس کرد و پەسەند نەبوو، بۆچوونی من ئەوەیە سوپایەك ڕەوانە بکەیت تا دەوریان بگرت، ئەوسا تیربارانیان بکەن و جەنگ دەستپێبکرێت و بەمشێوەیە هانیان بدەین. کاتێك هاندران و ڕووبەڕووی ئێمە بوونەوە، بگەڕێنەوە و ئەوان بەم شێوەیە شوێن خۆیان بخەن چوونکە لەم ماوەی لەگەڵ ئەوان جەنگاوین، تا ئێستا ڕووینەداوە، شوێنمان کەون و کاتێك ئەم کارە بکەین، دڵ بەشکستی ئێمە خۆش دەکەن و دێنەدەر و شەڕ دەسپێدەکەن، ئەو کاتە ئێمەش ڕووبەڕوویان دەبینەوە تا خواوەند لەنێوان ئێمە

داوەری بکات.

نەعمان بەقەعقاع کەسەرکردەی سوارەکان بوو، فەرمانی دا و ئەو کارەیان کرد. شەڕیان دەسپێکرد وعەجەمەکان خۆیان دوور خستەوە، بەڵام بۆ جەنگ ناچاری کردن و کاتێك هاتنەدەر، پاشەکشێی کرد، پاشەکشێی کرد، عەجەمەکان ئەم هەڵەیان بەدەرفەت زانی و ئەو کارەیان کرد کەتوڵەیحە بیری لێکردبوویەوە. وتیان: ئەوەیە کەدەخوازین. هاتنەدەر و کەس جگە لەپاسەوانانی دەرگاکە نەمایەوە، هەموویان شوێن موسوڵمانان کەوتن تا ئەوەی قەقعاع گەیشتە ئوردووگاکە و پارسەکان لەسەنگەرەکانی خۆیان دوور کەوتنەوە.

نەعمان کوڕی موقرین و موسوڵمانان بۆ جەنگ ئامادە و ئەمە لەڕۆژی هەینی و سەرەتای رۆژ بوو. نەعمان فەرمانی بەشەڕکەراندابوو لەشوێنەکانی خۆیان بمێننەوە و جەنگ نەکەن تا ئەو کاتەی فەرمان دەدات.

ئەو کارەیان کرد و لەپەنای وشترەکانیان خۆیان لەتیرەکان پاراست. فارسەکان هاتنە پێش و موسوڵمانانیان تیرباران دەکرد. کەسانێکی زۆر بریندار و سکاڵای موسوڵمانان بەرز بوویەوە، بەنەعمانیان وت: مەگەر حاڵ و بارودۆخی ئێمە نابینیت، مەگەر نابینیت خەڵکان چییان بەسەر دێت، چاوەڕوانی چیت، فەرمانی جەنگ دەربکە.

نەعمان وتی: هێدی هێدی.

چەند جارێك وتەکانی خۆیان دووبارە کردەوە و نەعمان دەیوت: هێدی هێدی.

موغەیرە وتی: ئەگەر ئەم کارە لەدەستی مندا دەبوو، دەمزانی چی بکەم.

وتی: هێدی، تۆیش فەرمانڕەوایەتی دەگریتە دەست، پێشتریش فەرماندە بوویت وئەرکەکانت بەباشی ئەنجام داوە، خواوەند نەتۆ و نەئێمە ریسوا ناکات، ئێمە ئەو چاوەڕوانییەمان لەهێدی بوون هەیە کە تۆ لەپەلە کردن.

نەعمان بۆ جەنگ چاوەڕوانی کاتێکی دەکرد کە بەلای پێغەمبەرەوە پەسەند بوو و ئەمە کاتی دروست بوونی سێبەر و هەڵکردنی بابوو. کاتێك، کاتی چاوەڕوان کراو نزیك کەوتەوە، نەعمان کەوتە جموجۆڵ، سوار ئێسترێکی لەڕ بوو، بەناو سوپاکەیدا گەڕا و لەبەردەم هەر ئاڵایەك دەوەستا، سوپاسی خوای دەکرد و دەیوت: ئێوە دەزانن

خواوەند هێزی بەم دینە بەخشی و بەڵێنەکانی خۆی هێنایەدی و کۆتایی بەدوای قۆناغی یەکەمدا هێنا. بیری بێننەوە ئەو کاتەی ریسوا بوون و باوەڕتان بەم دینە هێنا و هێزتان زیادی کرد، ئێستا بەراستی، بەندە وهاورێیانی خواوەندن. ئێوە لەبراکانی خۆتان لەکوفە جیابوونەوە و دەزانن سەرکەوتن و رێزی ئێوە و شکست و ریسوا بوونی ئێوە، چ کاریگەریەکی لەسەر ئەوان هەیە. دوژمنانی خۆتان دەبینن و دەزانن ئەوان مەترسین بۆ سەر چی و ئێوە مەترسین بۆ سەر چی، ئەوان مەترسییان بۆ سەر کەمێك کەل و پەل درووست کردووە لەگەڵ سنوورەکانی سواد بەلآم ئێوە مەترسین بۆ سەر دین و مانەوەی ئەوان، کەواتە مەترسی ئێوە و ئەوان چوونیەك نییە، ئاگادار بن ئەوان بۆ دنیاکەی خۆیان زیاتر تامەزرۆ و ئارەزوومەند نەبن چوونکە خواپەرەستی راستەقینە کەسێکە لەگەڵ خواوەند راست بێت و لەرێگەی ئەودا هەوڵ بدات. ئێوە چاوەڕوانی یەکێك لەم دوو چاکەیە دەکەن: یا شەهید بوون یا ژیان و رۆژی، یا گرتنی نزیك و سەرکەوتنی ئاسان. هەرکەس رووبەرووی دوژمنی بەرابەر بەخۆی ببێتەوە و بۆ براکەی بەجێی نەهێڵێت کە لەبەرابەر ئەو و خۆی کۆببنەوە چوونکە دەبێتە هۆی ناوزڕان. سەگ بەرگری لەخاوەنەکەی خۆی دەکات، هەرکەس لەئێوە ئۆدەداری ئەرکەکانی خۆیەتی. کاتێك فەرمانمدا ئامادە بن. سێ جار تەکبیر دەڵێم: لەتەکبیری یەکەم هەر کەس خۆی ئامادە نەکردووە، ئامادە بێت و لەتەکبیری دووەم، سیلاح بەدەستەوە بگرن و بۆ هێرش ئامادە بن، لەتەکبیری سێیەم بەخواسی خوا من هێرش دەبەم، ئێوەیش هێرش بەرن. خواوەندا سەرکەوتن بەدینەکەی خۆت ببەخشە و هاوکاری بەندەکانی خۆت بکە بەشێوەیەك ئەمڕۆ لەرێگەی تۆدا نەعمان یەکەم شەهید بێت.

کاتێك نەعمان کۆتایی بەگفتوگۆ لەگەڵ سوپاکەی هێنا، بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە و تەکبیری یەکەم و دووەم و سێیەمی هێنایە سەرزمان. کەسان گوێرایەڵ و خۆیان بۆ هێرش ئامادە کردبوو.

نەعمان هێرشی برد و سوپاکەیش بەهەمان شێوە. ئالآکەی نەعمان هاوشێوەی هەڵۆ پێشڕەوی دەکرد. نەعمان بەعابا و کڵاوی سپی دەناسرایەوە. دوو سوپا بەشمشێر کەوتنە گیانی یەك، کەس جەنگێکی لەوە دژوارتر و کارەساتبارتری نەبینیوە، لەکاتی دروست بوونی سێبەر تا درەنگانی شەو، بەرادەیەك

لەفارسەکانیان کوشت کەگۆڕەپانەکان بەخوێن سوور بوو. پیاو و چوارپێ لەسەر خوێنەکە هەڵدەخلیسکا و کەسانێك لەموسوڵمانان بەهۆی خلیسکانەوە زیانیان بەرکەوت.

ئەسپەکەی نەعمان لەخوێندا خلیسکا و ئەوی خستەخوار. نەعمان لەکاتی خلیسکانی ئەسپەکەی بریندار و مرد. نەعیم کوڕی موقرین ئاڵاکەی هەڵگرت و بەپارچەیەك نەعمانی داپۆشی. ئاڵاکەی بردە لای حوزەیفە و تەسلیمی کرد.

ئاڵاکە بەحوزەیفە بوو. ئەو، نەعیم کوڕی موقرینی بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕاندەوە و ڕۆشتە شوێنەکەی نەعمان و ئاڵاکەی بەرز کردەوە. موغەیرە وتی: مەرگی سەرکردەکەتان با نهێنی بێت نەکا موسوڵمانان ورەیان بڕوخێت.

دەڵێت: جەنگ بەردەوام بوو تا کاتی شەو. فارسەکان شکستیان خوارد و هەڵاتن. موسوڵمانان پێداگرانە شوێنیان کەوتن و ئەوانەی ڕێگەی خۆیان ونکردبوو، ڕوویان کردە دۆڵێك کە لەنزیك ئەوێ لەئەسپیزهان نیشتەجێ ببوون. ڕژانە ناو دۆڵەکە و هەرکەس دەکەوت، دەیوت: (وایەخرد). تا ئێستا ئەو شوێنە بەوایە خرد ناو دەبەن. سەد هەزار کەس یا زیاتر لەوان کەوتە ناو دۆڵەکە و کوژرا جگە لەوانەی لەگۆڕەپانی جەنگ کوژران. ژمارەیەکی کەم گیانیان ڕزگار کرد.

دەڵێت: فیروزان لەگۆڕەپانی جەنگ ڕزگاری بوو و لەگەڵ ژمارەیەك لەسوارەکانی خۆی بەرەو هەمەدان هەڵات. نەعیم کوڕی موقرین شوێنی کەوت و قەعقاعی لەپێشەوە نارد و لەسەر تەپۆڵکەی هەمەدان ئەوی گرت. تەپۆڵکەکە پڕ بوو لەئێستر و کەر کەباری هەنگوینیان هەڵگرتبوو. چوارپێکان ڕێگەی هەڵاتنی ئەویان بەست و ئەجەلی هاتبوو. قەعقاع دوای کەمێك بەرگری ئەوی لەسەر تەپۆڵکەکە کوشت و موسوڵمانان وتیان: خوا سوپایەکی لەهەنگوین هەیە. هەنگوینەکانیان تاڵان و بردیان بۆ ئوردووگای موسوڵمانان. ئەو تەپۆڵکەیە بەتەپۆڵکەی هەنگوین ناوی دەرکرد.

هەڵاتووان تا شاری هەمەدان ڕۆشتن و سوارەکانی موسوڵمان شوێنیان کەوتن. کاتێك ڕۆشتنە ناو هەمەدان، موسوڵمانان لەوێ دابەزین و دەوری شارەکەیان گرت. کاتێك خوسرەو شەنوم بارودۆخی بینی، داوای ئەمانی کرد و ڕازی بوو بەوەی

هەمەدان و دەستبی تەسلیم بەموسوڵمانان بکات بەو مەرجەی خوێن و کوشتار روونەدات، موسوڵمانان رازی بوون و ئەمانیان پێدان. خەڵکی شارەکەیش ئارام بوون و هەڵاتووان گەڕانەوە.

دوای ئەوەی فارسەکان لەشەڕی نەهاوەند شکستیان خوارد، موسوڵمانان رۆشتنە ناو شاری نەهاوەند و ئەوەی لەشارەکە و دەوروبەری شارەکەدا بوو، دەستیان بەسەردا گرت و کەل و پەل و تالآنییەکانیان لای سائیب کوڕی ئەقرەع لێپرسراوی کۆکردنەوە و تۆمار کردنی تالآنییەکان، کۆکردەوە.

لەو کاتەی لەئودرووگا و چاوەڕوان بوون هەواڵی ئەو کەسانەی روویان کردبووە هەمەدان، بەدەستیان بگات، هەربوز لێپرسراوی ئاتەشکەدەکە هات و داوای ئەمانی کرد.

ئەویان بردە لای حوزەیفە و وتی: ئەمانم پێ ببەخشە تا لەنهێنییەك ئاگادارت بکەمەوە.

وتم: رازیم.

وتیك نەخەیرجان پاشماوەی گەنجەکەی خوسرەوی لای من داناوە و من تەسلیم بەتۆی دەکەم بەو مەرجەی خۆم و ئەو کەسانەی دەخوازم ئەمانیان پێ ببەخشیت.

حوزەیفە رازی بوو. ئەو پاشماوەی گەنجەکەی خوسرەو کەبۆ پێشهاتەکانی رۆژگار ئامادەی کردبوو، هێنای. سەیریان کرد و موسوڵمانان بڕیاریاندا بۆ عومەر کوڕی خەتابی بنێرن. گەنجەکانیان هەڵگرت تا لەدابەش کردنی تالآنییەکان تەواو بوون، دواتر لەگەڵ پێنج یەکی تالآنییەکان بۆ لای عومەر کوڕی خەتابیان نارد.

دەڵێت: حوزەیفە کوڕی یەمان تالآنییەکانی لەناو ئەواندا دابەش کرد، هەر سوارەیەك لەشەڕی نەهاوەند شەش هەزاری پێبڕا و پیادەکان دوو هەزار. حوزەیفە لەپێنج یەکی تالآنییەکان بەشی کەسانی بوێر و تێکۆشەریدا و پاشماوەی پێنج یەکەکەی بەسائیب کوڕی ئەقرەع ڕەوانە کرد. سائیب پێنج یەکی تالآنییەکانی هەڵگرت و لەگەڵ گەنجەکەی خوسرەو بەرەو مەدینە بەرێکەوت. حوزەیفە دوای ئەوەی نامەی سەرکەوتنی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نارد، لەنەهاوەند مایەوە تا فەرمانی سەروەری باوەڕدارانی پێ بگات.

نێردراوی ئەو کەنامەکەی برد، تەریف کوڕی سەهم لەتایەفەی مناڵەکانی ڕەبیعە

کوڕی مالك بوو.

دەڵێت: کاتێك خەڵکانی ماهان ئاگادار بوونەوە هەمەدان دەستی بەسەردا گیراوە و نەعیم کوڕی موقرین و قەعقاع کوڕی عەمرۆ لەوێ دابەزیون، وەك خوسرەو شەنوم کەسیان بۆ لای حوزەیفە نارد و بەمەبەستەکەیان رازی بوو. هەموویان رازی بوون و دەیانویست بڕۆنە لای حوزەیفە بەڵام دینار فریویدان. ئەو بچووکتر لەپاشاکانی دیکە بوو. شا بوو بەڵام پاشاکانی دیکە لەو گەورەتر بوون و گەورەی هەموویان قارن بوو. دینار وتی: بەشکۆ و زێر و زیو مەڕۆنە لای ئەوان، خۆتان بەنەدار و هەژار نیشان بدەن. ئەو کارەیان کرد و دینار بەجل و بەرگی رازاوە و زێر و زیوی فراوان ڕۆشتە لایان. بەمەرجەکانیان رازی و ئەوەی داوایان کرد، بۆی بردن و لەگەڵ ئەو سەبارەت بەیەکێك لەدوو ماە پەیمانی ئاشتییان بەست وکەسانی دیکە پەیوەستی بوون و بوونە شوێنەکەوتەی ئەو. لەبەر ئەمە بەماە دینار ناوی دەرکرد.

دەڵێت: نەعمان لەگەڵ بێهزاذان پەیمانێکی هاوشێوەی بەستبوو و دوو ماە کەی دیکە، بۆ ئەو گەڕایەوە و هەروەها ئەو نەسیر کوڕی سووری وەك فەرمانڕەوای قەلایەك دەستنیشان کرد کەدەستەیەك لەفارسەکان پەنایان بۆ بردبوو. شەڕی لەگەڵ ئەوان کرد و دەستی بەسەر قەلاکەدا گرت.

حوزەیفە ئەوکەسانەی لەمەرج ئەلقەلعە مابوونەوە وئەوانەی لەغەزی شەجەر نیشتەجێ بوون و هەموو خەڵکانی ناو پادگانەکان، لەتالانییەکانی نەهاوەند، بەشی بۆ دانان چوونکە ئەوان پارێزەری دواوەی سوپای موسوڵمانان بوون بۆ ئەوەی هێرشیان نەکرێتەسەر.

دەڵێت: شەوی جەنگەکە، عومەر کوڕی خەتاب، خەوی لێنەدەکەوت و بەردەوام دەڕۆشتەدەر و چاوەڕوانی هەواڵ بوو. یەکێك لەموسوڵمانەکان بۆ کارێکی تایبەت لەماڵەکەی خۆی هاتەدەر، سوارێکی بینی کەبەرەو مەدینە دەڕۆشت و ئەمە لەسێیەم شەوی جەنگی نەهاوەند روویدا. پێی وت: ئەی بەندەی خوا، لەکوێوە دێیت؟

وتی: لەنەهاوەند.

وتی: چ هەواڵێکت پێیە؟

وتی: هەواڵێکی خۆش، خواوەند سەرکەوتنی بەنەعمان بەخشی و خۆی شەهید

بوو و موسوڵمانان تالآنی نەهاوەندیان لەناو خۆیان دابەش کرد و هەر سوارەیەك شەش هەزاری بەرکەوت. سوارە ڕێگەی بڕی و ڕۆشتە ناو مەدینە. ئەو پیاوە ڕۆشت و شەو خەوت و بەیانی ئەم هەواڵەی بەکەسەکانی خۆیدا و هەواڵەکە بڵاو بوویەوە و بەگوێی عومەر کوڕی خەتاب گەیشت کەهێشتا دوودڵ و نیگەران بوو. کەسی نارد و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

عومەر وتی: ئەو ڕاست دەکات و تۆیش ڕاست دەکەیت. ئەوە عەیسەم، پەیکی جنۆکەکان بوو و پەیکی مرۆڤەکانی بینی.

دوای ئەوەی تەریف بەهەواڵی سەرکەوتن هات و عومەر پرسی: دەنگ و باس چییە؟

وتی: جگە لەسەرکەوتن هیچ هەواڵێکم پێ نییە، کاتێك هاتم موسوڵمانان شوێن هەڵاتووان کەوتبوون و هەموویان ئامادە بوون. هیچ شتێکی ناڕاحەتکەری پێنەوت. عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشت و هاوەڵانی لەگەڵ ئەو ڕۆشتن. بەدوای هەواڵدا دەگەڕا کەسوارێك دەرکەوت.

عومەر وتی: پێم بڵێن کێیە؟

عوسمان کوڕی عەفان وتی: سائیبە.

هەموویان وتیان: سائیبە.

کاتێك نزیك کەوتەوە، وتی: دەنگ و باس چییە؟

وتی: مژدە و سەرکەوتن.

وتی: نەعمان چی دەکرد؟

وتی: ئەسپەکەی لەخوێن هەڵخلیسکا و مرد.

عومەر گەڕایەوە و سائیب لەگەڵی دەڕۆشت. عومەر سەبارەت بەژمارەی کوژراوەکان پرسیاری کرد کەژمارەیەکی کەمی هێنایە سەرزمان و زیادی کرد: یەکەم کەس لەموسوڵمانان کەشەهید کرا، نەعمان بوو.

دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب، ڕۆشتە ناو مزگەوتەکە، بارەکانیان داگرت و لەمزگەوتەکە دایاننا. بەچەند کەسێك لەهاوەڵانی خۆی و لەناو ئەوان عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و عەبدوللە کوڕی ئەرقەمی وت، لەمزگەوت بخەون و خۆی گەڕایەوە بۆ ماڵ. سائیب کوڕی ئەقرەع ئەو دوو سنووقەی بەدوای ئەودا برد و چۆنییەتی

بەدەست هێنانی ئەوانی بۆ عومەر باس کرد.

عومەر وتی: ئەی کوڕی مەلیکە، سوێند بەخوا تێنەگەیشتوون و تۆیش تێنەگەیشتووی. خێرا! خێرا! لەو ڕێگەی هاتوویت بگەڕێرەوە تا دەگەیتە لای حوزەیفە و ئەو بەسەر ئەو موسوڵمانانەی لەڕێگەی خوادا شەڕیان کردووە، دابەش بکە.

کوڕی سائیب گەڕایەوە و ڕۆشت تا لەماە پەیوەستی حوزەیفە بوو. سنووقەکانی فرۆشت و چوار هەزار درەمی دەست کەوت.

قەیسی ئەسەدی دەڵێت: لەکاتی مانەوە لەنەهاوەند یەکێك بەناوی جەعفەر کوڕی راشید بەتوڵەیحەی وت: بریسیمانە، لەشتە سەیرەکانی تۆ هیچ شتێك هەیە سوود بەئێمە بگەیێنێت؟

وتی: چاوەڕوان بن با بزانم. عابایەکی هەڵگرت و ماوەیەکی نەزۆر دای بەسەریدا، وتی: بیان، بیان، مەڕی شوانەکان، لەناو بێستان لەئەرونان.

دەڵێت: ڕۆشتنە ئەو بێستانە و چەندین مەڕی قەڵەویان دەستکەوت.

عوروە کوڕی وەلید لەکەسانێك لەخەڵکەکەی خۆی دەگێڕێتەوە: لەو کاتەی گەمارۆمان خستبووە سەر خەڵکانی نەهاوەند، ڕۆژێك ڕووبەرووی ئێمە بوونەوە و شەڕیان دەستپێکرد. زۆری نەخایاند خواوەند شکستی پێ هێنان و سەماك کوڕی عوبەیدی عەبەسی شوێن کەسێکیان کەوت کەهەشت سوارکاری لەگەڵدا بوو، داوای شەڕو ڕووبەروو بوونەوەی لێکردن، هەرکەس ڕووبەرووی بوویەوە کوژرا. هەموویان کوژران.

دواتر هێرشی کردە سەر کەسێك کەدەستەیەکی لەگەڵدا بوو، ئەسیری کرد و سیلاحەکانی لێوەرگرت، پیاوێکی بەناوی عەبد بانگ کرد و ئەسیرەکەی بەوسپارد.

ئەو کەسە وتی: من ببەنە لای سەرکردەکەتان تا سەبارەت بەم سەرزەمینە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ببەستم، تۆ منت ئەسیر کردووە، هەرچی دڵت دەخوازێت، داوای بکە چوونکە چاکەت لەگەڵ کردم و منت نەکوشت، هەنووکە بەندەی تۆم، ئەگەر من ببەیتە لای پاشا و لەنێوان من و ئەو سازگاری دروست بکەیت، بۆ هەمیشە سوپاست دەکەم و برای من دەبیت.

ئەوی ئازاد کرد و ئەمانی پێ بەخشی و وتی: تۆ کێیت؟

وتی: دینارم، ئەو لەبنەماڵەی قارن بوو.

ئەوی بردە لای حوزەیفە و دینار سەبارەت بەبوێری سەماك و ئەو کەسانەی بەدەستی ئەو کوژرا بوون، قسەی کرد و حوزەیفە پەیمانی ئاشتی بەست بەو مەرجەی خەراج بدات و ویلایەتی ماه بۆ ئەو گەڕایەوە و بەردەوام هاوڕێی سەماك بوو و دیاری بۆ دەنارد. هەرکاتێك کاری بەکارگوزاری کوفە بوو، دەڕۆشتە لای.

دەڵێت: دینار لەرۆژگاری خەلافەتی معاویە هاتە کوفە و لەگەڵ خەڵکان قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکانی کوفە، ئێوە یەکەم جار کەلای ئێمە تێپەڕین، خەڵکانێکی چاکەکار بوون و لەرۆژگاری عومەر و عوسمانیش بەمشێوەیە. دواتر گۆڕان و چوار نەریت لەناو ئێوەدا بلاوبوویەوە: رژدی و گێژی و نامەردی و بێ تاقەتی. هیچ یەك لەم عادەتانە لەناو ئێوەدا بوونی نەبوو و کاتێك وردبوومەوە، لەدایکتانەوە ئەم عادەتەتان بۆ ماوەتەوە و زانیم زیانەکەتان لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە: گێژی لەنبتییەکان و رژدی لەفارسەکان، نامەردی لەخەڵکانی خوراسان و کەم تاقەتی لەخەڵکانی ئەهواز.

شەعبی دەڵێت: کاتێك ئەسیرەکانی نەهاوەندیان هێنایە مەدینە، باوکی لۆلۆ، فیروز، کۆیلەی موغەیرە کوڕی شوعبە، هەرکەس لەوانی لەناو بازاردا دەبینی، دەستی بەسەریدا دەهێنا و دەگریا، دەیوت: عومەر جەرگی خواردم.

فیروز، خەڵکی نەهاوەند و لەرۆژگاری فارسەکان بەدەستی رۆمییەکان ئەسیر کرابوو. دوای ئەوە موسوڵمانان ئەسیریان کرد.

شەعبی دەڵێت: لەوکەسانەی کەوتنە ناو دۆڵەکە، هەشتا هەزار کەسیان کوژرا، لەگۆڕەپانی جەنگ، نزیکەی سی هەزار کەسی دیکە کوژرا کەبەیەکەوە بەسترابوون جگە لەوکەسانەی لەکاتی هەڵاتن بەدەستی موسوڵمانان کوژران.

شاری نەهاوەند لەسەرەتای ساڵی نۆزدەیەم لەساڵی حەوتەمی خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب، دەستی بەسەردا گیرا و ساڵی هەژدەیەم کۆتایی هاتبوو.

تەڵحە دەڵێت: لەنووسراوەکەی نەعمان و حوزەیفە بۆ خەڵکی ماهەکان بەمشێوەیە نووسرا بوو:

بەناوی خواوەندی بەخشندە و مێهرەبان

ئەم نووسراوێکە لەنێوان نەعمان کوڕی موقرین کە بۆ خەڵکانی ماه بەبێهزادانی دەدات، گیان و ماڵ و زەوییەکانیان ئەمان دەدات و کەس دینەکەیان ناگۆڕێت و لەئەنجامدانی کارەکانیان ڕێگرییان لێ ناکات تا ئەو کاتەی ساڵانە باج بەکارگوزارەکەی خۆیان بدەن: لەهەر کەسێکی باڵغ بۆ گیان و سامانی بەئەندازەی توانایی خۆی، دەبێت ڕێگا نیشان ڕێنیشاندەرەکان بدەن و ڕێگەکان ئاوەدان بکەنەوە و هەرکەس لەسووپای موسوڵمانان لای ئەوان گوزەری کرد، میوانداری بکەن و شەو وڕۆژێك خزمەتیان بکەن. ڕێز لەپەیمانەکەیان بگرن و چاکەخواز بن، ئەگەر خیانەتیان کرد و گۆڕانکارییان لەپەیمانەکەدا کرد، چیتر لای ئێمە پارێزراو نین:

عەبدوللە کوڕی زی ئەلسەهمەین

و قەعقاع کوڕی عەمرۆ

و جەریر کوڕی عەبدوللە شایەتی ئەم پەیمان نامەن.

لەموحەڕەمی ساڵی نۆزدەیەم نووسرا.

***

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمە پەیمانێکە حوزەیفە کوڕی یەمان بەخەڵکانی ماه دیناری دەدات، ئەمان بەگیان و ماڵ و زەوییەکانیان دبەخشێت و کەس دینەکەیان ناگۆڕێت و ڕێگەی ئەنجامدانی ئەرکە دینییەکانیان لێ ناگرێت تا ئەو کاتەی ساڵانە باج بەکارگوزاری موسوڵمانان دەدەن: لەهەر کەسێکی باڵغ بۆ گیان و ماڵی بەئەندازەی توانایی، دەبێت ڕێگە نیشانی ڕێبوارانی موسوڵمانان بدەن و ڕێگاکان ئاوەدان بکەنەوە و هەر کەس لەسوپای موسوڵمانان لای ئەوان گوزەری کرد، میوانداری بکەن وبۆ ماوەی شەو وڕۆژێك لای ئەوان بمێنێتەوە. ئەگەر خیانەتیان کرد و ڕێزی پەیمانەکەیان نەگرت، لەلایەن موسوڵمانانەوە پارێزگارییان لێ ناکرێت.

قەعقاع کوڕی عەمرۆ

و نەعیم کوڕی موقرین

و سوەید کوڕی موقرین شایەتی ئەم پەیمان نامەن

و لەمانگی موحرەمدا نووسرا.

دەڵێت: عومەر ئەو کەسانەی لەنەهاوەند بەشێوەیەکی ئازایانە تێکۆشابوون، پەیوەستی دوو هەزارییەکان کرد و ئەوانی بۆ پێگەی جەنگاوەرانی قادسیە بەرز کردەوە.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب فەرمانی بەسوپای عێراقدا لەهەر شوێنێك دەتوانن شوێن سوپای فارسەکان بکەون و فەرمانی بەسوپای موسوڵمانان لەبەسرەدا بەرەو سەرزەمینەکانی فارس و کرمان و ئیسفەهان بەرێکەون و دەستەیەك لەوان کە لەکوفە و سەرزەمینەکەی دەوروبەریان بوون، رووبکەنە ئیسفەهان و ئازەربایەجان و رەی.

دەستەیەك وتوویانە عومەر کوڕی خەتاب ئەم فەرمانانەی لەساڵی هەژدەیەم دەرکرد و ئەمە وتەی سەیف کوڕی عومەرە.

## رووداوەکانی ساڵی بیست و یەك

و کاری دوو سوپاکە کەعومەر کوڕی خەتاب فەرمانی پێدان

سەعید دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب بینی یەزدگێرد هەموو ساڵێك جەنگێك دژی ئەو بەرپا دەکات و پێیان وت ئەم جەنگانە بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی لەولاَتەکەی دەرواتەدەر، مۆڵەتی بەموسوڵماناندا لەسەرزەمینی عەجەمەکان پێشرەوی بکەن بۆ ئەوەی دەست بەسەر سنووری پاشایەتی یەزدگێرددا بگرن. عومەر، دوای جەنگی نەهاوەند لەخەڵکانی کوفە و بەسرە، سەرکردەکانی رەوانە کرد.

لەنێوان ماوەی فەرمانڕەوایەتی سەعد و فەرمانڕەوایەتی عەمار کوڕی یاسر، دوو سەرکردەی دیکە، فەرمانڕەوایەتییان کرد، یەکیان عەبدوللە کوڕی عەبدوللە عوتەبان کەجەنگی نەهاوەند لەرۆژگاری ئەو روویدا و ئەوی دیکەیان زیاد کوڕی حەنزەلە موالی مناڵەکانی عەبدقوسەی کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەو فەرمانی پێشرەوی کردن بەموسوڵمانان درا. کاتێك عەبدوللە کوڕی عەبدوللە لەسەر کار لابرا و ئەویان بۆ جێگەیەکی دیکە نارد، زیاد جێگەی گرتەوە. ئەو، یەکێك بوو

لەموهاجیرەکان و ماوەیەك مایەوە و پێداگری کرد تا لەو کارە دووری بخەنەوە و لەسەر کار دوورخرایەوە و عەمار کوڕی یاسر دوای ئەو وەك کارگوزار دیاریکرا.

عومەر، عەبدوڵلە کوڕی عەبدوڵلەی بۆ هاوکاری خەڵکانی بەسرە نارد و باوکی موسای بۆ هاوکاری خەڵکانی کوفە و عەمرۆ کوڕی سوراقەی لەجێگەی ئەو دانا.

لەرۆژگاری زیاد کوڕی حەنزەلە لەلایەن عومەر کوڕی خەتابەوە چەندین ئاڵا بۆ چەند کەسێك لەخەڵکانی کوفە نێردرا. ئاڵایەك بۆ نەعیم کوڕی موقرین و دوای ئەوەی خەڵکانی هەمەدان دوای بەستنی پەیمان ئاشتی دووبارە کافر بوونەوە، فەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەریان و وتی: ئەگەر خواوەند لەسەر دەستی تۆ ئەو شارەی بەموسوڵمانان بەخشی، لەوێوە بەرەو هەمەدان یا خوراسان بەرێکەوە. ئاڵایەکی بۆ عوتبە کوڕی فەرقەد و بوکەیر کوڕی عەبدوڵلە بەست و بەرەو ئازەربایەجان ڕەوانەی کردن، ویلایەتەکەی لەنێوان ئەواندا دابەش کرد: فەرمانی بەیەکیاندا لەحیلوانەوە بەرەو لای ڕاست بڕوات و ئەوی دیکەیان لەموسڵەوە بەرەو لای چەپ. ئەوان بەرێکەوتن.

ئاڵایەکی بۆ عەبدوڵلە کوڕی عەبدوڵلە نارد وفەرمانی پێدا هێرش بکاتە سەر ئیسفەهان. ئەو پیاوێکی بوێر و چاونەترس بوو. لەئەسحابە بڕواپێکراوەکان و لەئەنسارییەکان، موالی مناڵەکانی حەبەلی تیرەیەك لەمناڵەکانی ئەسەد. باوکی موسای لەبەسرەوە بۆ هاوکاری ئەو نارد و عومەر کوڕی سوراقەی وەك کارگوزاری کوفە دیاری کرد.

بەسەرهاتی عەبدوڵلە کوڕی عەبدوڵلە بەمشێوەیە: کاتێك هەواڵی سەرکەوتنی نەهاوەند بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت، بڕیاریدا مۆڵەتی پێشڕەوی بەسوپای موسوڵمانان بدات. نامەی بۆ عەبدوڵلە نووسی تا لەکوفەوە بەرێکەوێت ورووو بکاتە مەداین وپێشنیار بەرێکەوتن بەخەڵکان بکات و کەس هەڵنەبژێرت و ئەنجامی کارەکەی بۆ بنووسێت.

عومەر دەیویست ئەو بۆ ئیسفەهان ڕەوانە بکات و لەو کەسانەی بۆ لای ئەوی نارد، عەبدوڵلە کوڕی وەرقای ریاحی و عەبدوڵلە کوڕی حارس کوڕی وەرقای ئەسەدی بوون. کەسانێك کەنەیانزانیوە گومانیان کردووە یەکیان عەبدوڵلە کوڕی

بودەیل کوڕی وەرقای خوزاعی بووە و کاتێك باسی وەرقا کراوە، گومانیان کردووە ئەویان بۆ باوەگەوریی گەڕاندۆتەوە. بەڵام عەبدوللە کوڕی بودەیل کوڕی وەرقا کاتێك لەسەفین کوژرا، بیست و چوار ساڵ تەمەنی بوو بەم پێیە دەبێت لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب تەنیا منداڵ بووبێت.

کاتێك عومەر لەبەرێکەوتنی عەبدوللە ئاگادار بوویەوە، زیاد کوڕی حەنزەلەی نارد و کاتێك لەپێشڕەوی سوپاییەکان و پێشکەوتنی ئەوان ئاگادار بوویەوە، عەماری وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد و ئەم ئایە لەقورئانی خوێندەوە:

((ونريد ان نمن على الذين استضعفوا فى الارض و نجعلهم ائمة و تجعلهم الوارثين.

واتاکەی: دەمانویست بەوکەسانەی لەسەر زەوی بەکەسانی هەژار و زمان گیراو لەقەڵە دەدران، منەتیان بخەینە سەر و بیانکەینە پێشەوا و میرات هەڵگرەکان.))

لەکاتی فەرمانڕەوایەتی سەعد دوای ئەوەی سەلمان و عەبدولرەحمان کوڕەکانی رەبیعە داوەری کوفەیان لێ وەرگیرایەوە، زیاد بۆ ئەو کارە دەستنیشان کرا تا عەبدوللە کوڕی مەسعود لەحمسەوە بێت.

نەعمان و سوەید کوڕەکانی موقرین کارگوزارانی ئاوخۆرەکانی فورات و دیجلە بوون و ویستیان لەم کارە ببەخشرێن، وتیان: ئێمە لەو کارەی هاوشێوەی رووسپی خۆی بۆیە دەکات و خۆی دەرازێنێتەوە، ببەخشە. عومەر ئەوانی بەخشی و حوزەیفە کوڕی ئەسیدی غەفاری و جابر کوڕی عەمرۆی موزنی لەجێگەی ئەوان دانا. ئەوانیش ویستان لەو کارە ببەخشرێن و ئەوانیشی بەخشی و حوزەیفە کوڕی یەمان و عوسمان کوڕی حەنیفی بۆ ئەو کارە راسپارد. حوزەیفە کارگوزاری ئاوخۆری دیجلە و ئەوبەری دیجلە و عوسمان کارگوزاری فورات لەهەردوولای سواد بوو.

عومەر نامەی بۆ خەڵکانی کوفە نووسی: عەماری یاسر وەك فەرمانڕەوای ئێوە رەوانە دەکەم و عەبدوللە کوڕی مەسعودم وەك مامۆستا و وەزیر هەڵبژاردووە و حوزەیفە کوڕی یەمانم وەك کارگوزاری ئاوخۆری دیجلە و عوسمان کوڕی حەنیفم وەك کارگوزاری ئاوخۆری فورات دەستنیشان کردووە.

## هەواڵەکانی تایبەت بەئیسفەهان

دەڵێت: کاتێك عەمار وەك کارگوزار گەیشتە کوفە و نامەی عومەر کوڕی خەتاب بەدەستی عەبدوللە گەیشت کەفەرمانی پێدەدا بەرەو ئیسفەهان بڕوات و زیادی وەك کارگوزاری کوفە و عەبدوللە کوڕی وەرقای ریاحی سەرکردەی پێشەنگەکان و عەبدوللە کوڕی وەرقای ئەسەدی و عیسمە کوڕی عەبدوللە سەرکردەی باڵەکانی سوپاکەت دیاری بکە. عەبدوللە لەگەڵ کەسانی خۆی بەرێکەوت تا گەیشتە لای حوزەیفە و حوزەیفە بۆ سەر کارەکەی خۆی گەڕایەوە و عەبدوللە لەگەڵ هاوەڵانی خۆی و ئەو کەسانەی لەسوپاکەی نەعمان پەیوەستی ببوون، لەنەهاوەند بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو سوپایەی لەئیسفەهان کۆببوونەوە بەرێکەوت. سەرکردەی خەڵکانی ئیسفەهان ئێستەندار و سەرکردەی پێشەنگەکانی سوپاکەی شەهربەراز جادویە بوو. شەهربەراز پیرێکی بەتەمەن و سوپایەکی زۆری لەبەردەستا بوو.

سوپای موسوڵمانان لەگەڵ پێشەنگی فارسەکان لەیەکێك لەگوندەکانی ئیسفەهان رووبەروو بوونەوە و جەنگێکی دژوار هەڵگیسرا. شەهربەرازی پیر داوای شەڕکەری کرد و عەبدوللە کوڕی وەرقا رووبەرووی بوویەوە و خوێنی ڕشت و خەڵکانی ئیسفەهان شکستیان خوارد و موسوڵمانان ئەو گوندەیان بەگوندی پیر ناو برد و تا ئێستایش بەو ناوە بەناو بانگە.

عەبدوللە کوڕی عەبدوللە، داوای شەڕی دەستەویەخەی لەجێگرەکەی کرد و ئێستەندار، داوای ئاشتی. عەبدوللە پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و ئەمە یەکەمین گوندی ئیسفەهان بوو دەستی بەسەرا گیرا.

عەبدوللە لەگوندی پیرەوە بەرەو جی بەرێکەوت. لەو کاتەدا پاشای ئیسفەهان فادوسفان بوو. عەبدوللە لەجی دابەزی و دوای ماوەیەك بۆ رووبەروو بوونەوەی هاتن و کاتێك رووبەرووی یەکبوونەوە، فادوسفان بە عەبدوللەی وت: هاوەڵانی من مەکوژە، منیش هاوەڵانی تۆ ناکوژم، شەڕی دەستەویەخە لەگەڵ من بکە، ئەگەر تۆم کوشت، سوپاکەت بگەڕێتەوە و ئەگەر منت کوشت، سوپاکەم پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تۆ دەبەستێت، تەنانەت ئەگەر یەك تیریان پێ نەگات.

دەڵێت: عەبدوللە رووبەرووی بوویەوە و وتی: تۆ هێرش دەکەیتە سەر من یامن هێرش بکەمە سەرتۆ.

وتی: من هێرش دەکەمە سەرتۆ.

عەبدوللە رووبەرووی وەستا و فادوسفان هێرشی برد و زەربەیەکی لێدا. بەر زینی ئەسپەکەی کەوت و دڕاندی و بەندی زینی ئەسپەکی عەبدوللە قرتا. عەبدوللە لەسەر ئەسپەکە کەوت بەڵام نەکەوتە سەر زەوی و سوار ئەسپی ڕەسەنی عەرەبی بەرکەبەرەکەی وت: ئامادە بە. بەڵام فادوسفان خۆی کێشایەوە و وتی: جەنگ لەگەڵ تۆ پەسەند ناکەم چوونکە تۆ پیاوێکی تەواویت، لەگەڵ تۆ دێمە ئوردووگاکەت و پەیمانی ئاشتیت لەگەڵ دەبەستم و شارەکەت تەسلیم دەکەم، بەو مەرجەی هەرکەس دەخوازێت بمێنێتەوە و جەزیە بدات و ماڵ و سامانەکەی پارێزراو بێت و ئەو کەسانەی بەزۆر دەستتان بەسەر زەوییەکانیاندا گرتووە، هاوشێوەی ئەوان بن و بگەڕێنەوە و هەرکەس نەخوازێت، هاوشێوەی ئێمە لەئاشتیدا بێت وبۆ هەر شوێنێك دەخوازێت بڕوات و زەویی و ماڵەکەی بۆ ئێوە بێت.

عەبدوللە وتی: رازیم.

باوکی موسا لەناوچەی ئەهوازەوە هاتە لای عەبدوللە کەپەیمانی ئاشتی لەگەڵ فادوسفان بەستبوو. فارسەکان لەجی هاتنەدەر و بەدانی جەزیە رازی بوون جگە لەسی کەس لەخەڵکانی ئیسفەهان کەپێچەوانەی خەڵکەکەی خۆیان جووڵانەوە و کۆبوونەوە و لەگەڵ کەسەکانی خۆیان روویان لەکرمان کرد کەدەستەیەك لەوێ کۆببوونەوە.

عەبدوللە لەگەڵ باوکی موسا ڕۆشتە ناو جی کەقەزای شاری ئیسفەهان بوو. ئەم هەواڵەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی و ئەوانەی مابوونەوە، شادمان و ئەوانەی ڕۆشتبوون، پەشیمان بوونەوە. نامەی عومەر کوڕی خەتاب بەدەستی عەبدوللە گەیشت: بەرێکەوە و پەیوەستی سوهەیل کوڕی عودەی ببە و پێکەوە بۆ شەڕی خەڵکان کرمان ئوردوو لێبدەن. سوپایەك بۆ پاراستی جی بەجێبێڵە و سائیب کوڕی ئەقرەع لەئیسفەهان بکەرە جێگری خۆت.

ئەسید کوڕی موتەشەمس برازای ئەحنەف دەڵێت: لەگەڵ باوکی موسا لەگرتنی ئیسفەهان بەشدار بووم. ئەو وەك هێزی پیشتیوان هاتبوو.

سەعید دەڵێت: پەیمان نامەی ئاشتی ئیسفەهان بەمشێوە بوو:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمە پەیمان نامەی عەبدوللەیە بۆ فادوسفان و خەڵکانی ئیسفەهان و دەوروبەر، ئێوە تا ئەو کاتەی جەزیە دەدەن، پارێزراون. جەزیە بەئەندازەی توانای ئێوە وەردەگیرێت و لەهەرکەسێك کەبالغ بێت. جەزیە تەسلیمی کارگوزاری ویلایەتەکەی خۆتان بکەن و رێگە نیشانی موسوڵمانان بدەن و رێگەکان ئاوەدان بکەنەوە و یەك شەو رۆژ میوانداری موسوڵمانان بکەن و تا یەك مەنزڵی لەگەڵیان بڕۆن و هێرش نەکەنە سەر هیچ موسوڵمانێك. چاکەخوازی موسوڵمانان بن، دەبێت رێز لەبەڵێنەکە بگرن. ئەگەر ئەم خالآنە جێبەجێ بکەن، لەئەماندان و ئەگەر رێزتان لەپەیمانەکە نەگرت یا کەسێکێتان خیانەتی کرد و تەسلیمی نەکەن، ئەمانتان نییە و پارێزراو نین. هەرکەس جوێن بەموسوڵمانێك بدات، سزا دەدرێت و ئەگەر لێی بدات، خوێنی دەرێژین.

عەبدوللە کوڕی قەیس نووسی و بوو بەشایەت

عەبدوللە کوڕی وەرقا و عیسمە کوڕی عەبدوللەیش شایەتی ئەم پەیمان نامەیەن.))

کاتێك نامەی سەروەری باوەڕداران بە عەبدوللە گەیشت کەفەرمانی دابوو لەکرمان پەیوەستی سوهەیل کوڕی عودەی ببێت، لەگەڵ دەستەیەك لەسوارەکانی ڕۆشت و سائیبی کردە جێگری خۆی وپێش ئەوەی سوهەیل بگاتە کرمان، پەیوەستی بوو.

لەمەعقەل کوڕی یەسار دەگێڕنەوە: سەکردەی سوپای موسوڵمانان لەجەنگی ئیسفەهان، نەعمان کوڕی موقرین بوو.

## ئامادەدان بەم گێڕانەوەیە

دەڵێت: عەبدوللە کوڕی خەتاب راوێژی لەگەڵ هورموزان کرد و وتی: بۆچوونی تۆ چییە؟ لەفارسەوە دەستپێبکەم یا ئازەربایەجان یا ئیسفەهان؟

هورموزان وتی: فارس و ئازەربایەجان وەك دوو باڵن و ئیسفەهان سەری گەورەیە، ئەگەر یەکێك لەدوو باڵەکە لەناو ببەیت، باڵەکەی دیکەی لەشوێنی خۆیەتی

بەلاّم ئەگەر سەری گەورە لەناو ببەیت، هەر دوو باڵەکە لەکار دەکەوێت، کەواتە لەسەری گەورەوە دەستپێبکە. عومەر ڕۆشتە مزگەوت و نەعمان کوڕی موقرین نوێژی دەخوێند. عومەر کوڕی خەتاب لای دانیشت تا ئەوەی کۆتایی بەنوێژەکەی هێنا، وتی: دەمەوێت وەك کارگوزار دەستنیشانت بکەم.

وتی: بۆ کۆکردنەوەی خەراج نە، بۆ جەنگ رامسپێرە.

عومەر وتی: بۆ جەنگ راتدەسپێرم. ئەوی بۆ ئیسفەهان نارد و نامەی بۆ خەڵکانی کوفە نووسی هاوکاری بکەن. نەعمان رووی کردە ئیسفەهان. رووبار لەنێوان ئەو و سوپای ئیسفەهان بوو. موغەیرە کوڕی شوعبەی بۆ لای ئەوان نارد و ڕۆشت. بەزوئەلحاجەبی پاشای خۆیان وت: نێردراوی عەرەب لەبەردەرگایە. ئەو، لەگەڵ هاوەڵانی خۆی راوێژی کرد و وتی: بۆچوونی ئێوە چییە، بەرێز و شکۆی پاشایەتییەوە ببینین؟

وتیان: بەڵێ.،

لەسەر تەختەکەی دانیشت و تاجی خستە سەر و شازادەکان بەگوارەی زێر و گەردەبەندی زێر و جل و بەرگی رازاوە و جوان لەدەوری ئەو ریزیان بەست. مۆڵەتی هاتنی بەموغەیرەدا، ڕم و قەڵغانێکی پێبوو. بەڕمەکەی لەفەرشەکەی دەدا. دوو کەس قۆلی ئەویان گرتبوو. بردیانە بەردەم پاشا، قسەی کرد و وتی: ئێوەی عەرەب، گرفتاری برسییەتییەکی دژوار بوون و هاتوونەدەر، ئەگەر دەخوازن توێشوو و خواردەمەنیتان پێدەدەم و بگەڕێنەوە.

موغەیرە قسەی کرد، ناوی خوای هێنایە سەرزمان، وتی: ئێمەی عەرەب جەنازە و مردارمان دەخوارد، خەڵکان هێرشیان دەکردە سەرئێمە بەلاّم ئێمە توانای هێرش کردنمان نەبوو، خواوەند پێغەمبەرێکی لەناو ئێمەدا هەڵبژارد، رەچەڵەك و نەژادی لەهەمووان بڕواپێکراوتر و لەهەمووان راستگۆتر بوو.

دواتر بەئەندازەی پێویست وەسفی پێغەمبەری کرد و وتی: ئەو چەندین بەڵێنی بەئێمەدا و بەڵێنەکانی هاتنەدی. بەڵێنی سەرکەوتن بەسەر ئێوەی پێداوین و بەسەر خەڵکانی ئەم سەرزەمینە زاڵ دەبین، ئێوە لەناو جل و بەرگ و بارودۆخێك دەبینم کەسوپای موسوڵمانان تا بەدەستی نەهێنن، ناڕۆن.

موغەیرە وتی: بەخۆم وت باشترە لەدەرفەتێکی گونجاو بپەڕمە سەرتەختەکەی و

لای ئەو دانیشم ئەگەری هەیە ئەم کارەی من بەشێوەیەکی خراپ لێکبدەنەوە.

دەڵێت: دەرفەتێکم بەهەل زانی و پەڕیمە سەر تەختەکە و لای ئەو دانیشتم.

بێژەر دەڵێت: ئەویان گرت و شەق بارانیان کرد.

موغەیرە دەڵێت: وتم: بەمشێوەیە لەگەڵ نێردراوەکان دەجووڵێنەوە.؟ ئێمە لەگەڵ نێردراوەکانی ئێوە بەمشێوەیە مامڵە ناکەین.

پاشا وتی: ئەگەر دەخوازن ئێوە بپەڕنەوە و ئەگەر دەخوازن ئێمە دەپەڕینەوە.

وتمان: ئێمە دەپەڕینەوە.

دەڵێت: بۆ رووبەرووی ئەوان لەرووبارەکە پەڕینەوە، هەردەکەس یا سێ کەسیان بەزنجیرەوە بەستبوویەوە. لەبەرابەر ئەوان ریزمان بەست. تیربارانیان کردین وزیانێکی زۆریان لێدانین.

موغەیرە بەنەعمانی وت: خوا بتبەخشێت، خەڵکان دەکوژرێن، هێرش دەستپێبکە.

نەعمان وتی: تۆ بەچاکەکاری ناسراویت، من لەجەنگەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەشداریم کردووە، سەرەتای رۆژی نەدەجەنگی و دوای دەخست تا ئەو کاتەی سێبەر دروست دەبوو و با هەڵیدەکرد و سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا.

دەڵێت: نەعمان وتی: من ئالاکەی خۆم سێ جار ڕادەوەشێنم، یەکەم جار هەمووان کارە پێویستەکانی خۆیان ئەنجام بدەن و دەستنوێژ بگرن، لەجاری دووەم، قەیتانی پێپۆش و سیلاحەکانتان ئامادە بکەن، لەجاری سێیەم، هێرش ببەن و کەس بەکەسەوە سەرقاڵ نەبێت. ئەگەر نەعمان کوژرا، کەس خۆی بەمنەوە سەرقاڵ نەکات چوونکە لەخوا دەپارێمەوە و سوێندتان دەدەم هەمووتان بڵێن ئامین. خواوەندا، ئەمرۆ شەهید بوون بەنەعمان و سەرکەوتن بەموسوڵمانان ببەخشە.

ئالاکەی خۆی بۆ جاری یەکەم تەکاندا، جارێکی دیکە ئەوکارەی کرد و جاری سێیەم، زرێکەی فڕێدا و هێرشی برد. یەکەم کەس بوو لەپێ کەوت.

مەعقەل دەڵێت: ڕۆشتمە لای بەڵام سوێندەکەیم بیرکەوتەوە و نیشانەیەکم لەسەر دانا و ڕۆشتم. کاتێک کەسێکمان دەکوشت، هاوەڵانی لەجەنگی ئێمە پەشیمان دەبوونەوە. زوئەلحاجەب لەئێسترەکەی کەوتەخوار و ورگی هەڵدڕا. خواوەند

ئەو کارگوزارەی دیاریت کردووە، بۆ تۆ خێر و خۆشی بێنێت.

عومەر وتی: کێم کردۆتە کارگوزار.

مەغەیرە وتی: جوبەیر کوڕی موتعیم.

عومەر وتی: نازانم چی بکەم. موغەیرە کوڕی شوعبەی وەك کارگوزاری کوفە نارد و لەسەر کارەکەی مایەوە تا ئەو کاتەی عومەر کوڕی خەتاب کوژرا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عەمرۆ کوڕی عاس، عوقەبە کوڕی نافیعی فیهری نارد کە بەئاشتی دەستی بەسەر زەویلەدا گرت و خەڵکانی نێوان بەرقە و زوەیلە بەئاشتی تەسلیمی موسوڵمانان بوون.

کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لەساڵی بیست و یەکەم معاویە کوڕی ئەبوسوفیان و عومەیر کوڕی سەعدی ئەنساری لەشام بۆ جەنگی دیمەشق و بەسنیە و حوران و حمس و قنسرین و جەزیرە ڕۆشتن. معاویە کوڕی ئەبوسوفیان کارگوزاری بەلقا و ئەردەن و فەلەستین و کەنارەکانی ئەنتاکیە ومەعرەی مسرین و کیلکیە بوو. لەم کاتەدا باوکی هاشم کوڕی عوتبە کوڕی ڕەبیعە، سەبارەت بە کیلکیە و ئەنتاکیە و مەعرەی مسرین پەیمانی ئاشتی بەست.

دەڵێن: لەدایك بوونی حەسەنی بەسری و عامری شەعبی لەم ساڵەدا بوو.

واقدی دەڵێت: لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد و زەید کوڕی سابتی وەك جێگری خۆی لەمەدینە دانا. کارگوزارانی مەککە و تاییف و یەمەن و یەمامە و بەحرەین و شام و میسر و بەسرە هەمان کەسانی ساڵی بیستەم بوون. کارگوزاری کوفە عەمار کوڕی یاسر و کاروباری جەنگیان بەو سپاردبوو. سەرپەرەستی بیت المال عەبدوللە کوڕی مەسعود و کاروباری خەراج لەئەستۆی عوسمان کوڕی حەنیفدا بوو. وەك وتوویانە سەرپەرەستی کاروباری داوەری لەئەستۆی شورەیحدا بوو.

## ساڵی بیست و دوو دەستی پێکرد

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا وەك لەگێڕانەوەی باوکی مەعشەر ئاماژەی پێدراوە، ئازەربایەجان دەستی بەسەردا گیرا.

دەڵێت: گرتنی ئازەربایەجان لەساڵی بیست و دووەم روویدا و سەرکردەکەی موغەیەر کوڕی شوعبە بوو. واقدیش بەو شێوەیە باسی دەکات بەلاّم سەیف کوڕی عومەر دەڵێت: گرتنی ئازەربایەجان لەساڵی هەژدەیەمی کۆچ و دوای گرتنی هەمەدان و رەی و گورگان و دوای ئەوەی سوپاسالاری تەبەرتان پەیمانی ئاشتی لەگەڵ موسوڵمانان بەست. دەڵێت: هەمووی ئەم رووداوانە لەساڵی هەژدەیەم روویدا.

دەڵێت: گرتنی هەمەدان بەپێی گێڕانەوەی سەعید بەمشێوەیە: کاتێك نەعمان بەهۆی کۆبوونەوەی عەجەمەکان لەنەهاوەند، بەرەو ماه ەکان ڕەوانە کرا و خەڵکانی کوفەیان بۆ هاوکاری کردنی ئەو نارد و لەگەڵ حوزەیفە پەیوەستی بوون و کاتێك خەڵکانی کوفە لەحیلوانەوە بەرێکەوتن و گەیشتنە ماه، لەمێرگەلاّن هێرشیان کردە سەر قەلاّیەك. پادگانێکی لێ بوو، دەستیان بەسەردا گرت و سەرەتای سەرکەوتنەکان لێرەوە دەستی پێکرد. دەستەیەك لەسوپای موسوڵمانانیان لەوێ دانا و ئوردووگاکەیان بەمەرج ئەلقەلعە ناو برد. دواتر لەو ناوچەوە بەرەو نەهاوەند بەرێکەوتن و گەیشتنە قەلاّیەك کەدەستەیەك لەوێ کۆببوونەوە. نەسیر کوڕی سور و منالّەکانی عیجل و منالّەکانی حەنیفەیان لەوێ دانا. نەسیر دوای سەرکەوتن لەنەهاوەند دەستی بەسەر قەلاّکەدا گرت و ئەو دەستە لەمنالّەکانی عیجل و حەنیفە کە لەگەڵ ئەو لەناوچە مابوونەوە، بەشداری شەڕی نەهاوەندیان نەکرد. کاتێك تالاّنی قەلاّ و جەنگی نەهاوەندیان کۆکردەوە، بەشێوەیەکی یەکسان لەناو موسوڵمانان دابەش کرا. لەبەر ئەوەی دەستەیەك هێزی بەدەستەیەکی دیکە بەخشیبوو. هەموو ئەو شوێنانەی لەنێوان مەرج ئەلقەلعە و نەهاوەند دەستیان بەسەردا گرتبوو یا لەوێ نیشتەجێ ببوون، بەناوی یەکێك لەتایبەتمەندییەکانەوە ناونران.

لەیەکێك لەتەپۆڵکەکانی ماه، سوارەکان کۆببوونەوە و بە ثنیة الرکاب (تەپۆڵکەی

سوارەکان) ناویان برد. تەپۆڵکەیەکی دیکە کەرێگەکەی بەدەوری بەردێکدا بوو و بە ملویە (ئالۆن) ناویانبرد. ناوە کۆنەکانی لەبیر کرا.

لای کێوێکی بەرز تێپەڕیان کرد کەبەرزتر لەکێوەکانی دیکە بوو. یەك لەوان وتی: ئەمە ددانی سەمیرەیە. سەمیر ژنێکی موهاجیر لەتیرەی منداڵەکانی معاویە کوڕی زەب کەددانێکی بەرزتر و گەورەتر لەددانەکانی دیکەی بوو و کێوەکە بەسن (ددان) سەمیرە ناوی دەرکرد.

دەڵێت: حوزەیفە، نەعیم کوڕی موقرین و قەعقاع کوڕی عەمرۆی بۆ شوێنکەوتنی سوپاکەی نەهاوەند ڕەوانە کرد و تا هەمەدان ڕۆشتن. خوسرەو شەنوم پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن و گەڕانەوە. خوسرەو شەنوم دووبارە پەشمیان بوویەوە. کاتێك فەرمانەکەی نەعیم هاوشێوەی فەرمانەکانی دیکە لەلایەن سەروەری باوەڕداران گەیشت، ماڵئاوایی لەحوزەیفە کرد. حوزەیفەیش ماڵئاوایی لێکرد. نەعیم دەیویست بەرەو هەمەدان بڕوات و حوزەیفە دەگەڕایەوە بۆ کوفە. عومەر کوڕی بیلال کوڕی حارسی کردە جێگری خۆی لەماه ەکان.

نامەکەی عومەر کوڕی خەتاب بۆ موقرین بەمشێوەیە بوو: بەرەو هەمەدان بڕۆ و سوەید کوڕی موقرین لەگەڵ پێشەنگەکانی سوپاکەی خۆت ڕەوانە بکە. ڕێبعی کوڕی عامر و موهەلهیل کوڕی زەید، ئەوەیان تایی و ئەمیان تیمی وەك فەرماندەی دوو باڵی سوپاکەت دەستنیشان بکە.

نەعیم سوپای ڕازاندەوە و لەنزیك تەپۆڵکەی هەنگوین دابەزی. تەپۆڵکەکە بەهۆی ئەو هەنگوینەی موسوڵمانان لەوێ تالآنیان کرد بەو ناوە ناودەبرا و ئەمە لەکاتێکدا بوو سوپای موسوڵمانان شوێن هەلآتووانی فارس لەنەهاوەند کەوتبوون. فیروزان گەیشتە تەپۆڵکەکە کەبەو چوارپێیانەی هەنگوین و شتی دیکەیان هەڵگرتبوو، داپۆشرابوو و ڕێگەیان نەدا فیروزان بەرە کێوەکە سەرکەوێت. ئەو ئەسپەکەی خۆی بەرەلا کرد و ڕووی لەکێوەکە کرد بەلآم دەستگیر کرا و کوژرا.

کاتێك نەعیم و سوپاکەی لەکونکور مەنزڵیان گرت، دزێك چوارپێیەکی موسوڵمانانی دزی و ئەو ناوچەیان بەکۆشکی دزەکان ناو برد. نەعیم لەتەپۆڵکەکەوە بەرێکەوت و لەبەرابەر هەمەدان ئوردووی لێدا.

خەڵکی هەمەدان لەناو شارەکەیان سەنگەریان گرتبوو. نەعیم گەمارۆی خستە سەر شارەکە و لەنێوان هەمەدان و جورمیزان جێگیر بوو. موسوڵمانان بەسەر هەموو ویلایەتەکانی هەمەدان زاڵبوون. کاتێك خەڵکانی شار ئەمەیان بینی،پێشنیاری ئاشتییان بەرز کردەوە بەو مەرجەی لەگەڵ ئەو کەسانەی پێشتر بەپەیمانی ئاشتی رازی ببوون، وەك یەکبن. نەعیم رازی بوو بەوەی جەزیە بدەن.

چەند کەسێك لەخەڵکانی کوفە، عیسمە کوڕی عەبدوللەی زەببی و موهەلهیل کوڕی زەیدی تایی و سەماك کوڕی عوبەیدی عەبەسی و سەماك کوڕی مەخریمەی ئەسەدی و سەماك کوڕی خەرەشەی ئەنساری لەدەستبی دانا و ئەوان یەکەم کەسان بوون بۆ راپەڕاندنی کاروبارەکانی پادگانی دەستبی راسپێردران و لەگەڵ دەیلمییەکان جەنگان.

بەڵام بەوتەی واقدی، گرتنی هەمەدان لەساڵی بیست و سێیەم روویدا. دەڵێت: بەوتەیەك فەرماندەی سوپای موسوڵمانان بۆ گرتنی رەی، قورەزە کوڕی کەعبی ئەنساری بوو.

دەڵێت: رەبیعە کوڕی عوسمان پێی وتم گرتنی هەمەدان لەجومادی الاول، شەش مانگ دوای کوژرانی عومەر کوڕی خەتاب و سەرکردەکەی موغەیرە کوڕی شوعبە بوو.

دەڵێت: بەوتەیەك گرتنی رەی دوو ساڵ دوای کوژرانی عومەر کوڕی خەتاب روویدا و بەوتەیەك کاتێك عومەر کوڕی خەتاب کوژرا، سوپاکەی لەبەرابەر رەی ئوردووی لێدابوو.

سەیف دەڵێت: لەو کاتەی نەعیم لەگەڵ دوانزە هەزار شەڕکەری موسوڵمان لەناو شاری هەمەدان و سەرقاڵی رێکخستنی کاروبارەکان بوو، دەیلەمییەکان و خەڵکانی رەی و ئازەربایەجان نامەیان بۆ یەك نووسی و موتا لەگەڵ دەیلەمییەکان بەرێکەوت و لەواج روود دابەزی. زەینەبی، باوکی فەرخان، لەگەڵ خەڵکان هات و پەیوەستی بوو. ئیسفەندیار برای رۆستەم لەگەڵ خەڵکانی ئازەربایەجان پەیوەستی بوو. سەرکردەی پادگانەکانی زەببی سەنگەریان گرت و هەواڵەکەیان بۆ نەعیم نارد. نەعیم یەزید کوڕی قەیس وەك جێگری خۆی دانا و لەگەڵ سوپاکەی بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو خەڵکانە بەرێکەوت و لەواج روود لەبەرابەر ئەوان دابەزی. شەڕێکی

قورسیان کرد کە لەسۆنگەی گەورەیی و دژواری هاوشێوەی جەنگی نەهاوەند بوو. ژمارەیەکی زۆر لەفارسەکان کوژران.

کۆبوونەوەی ئەو خەڵکەیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسیبوو، سەروەری باوەڕداران ترسا و نیگەرانی چارەنووسی جەنگەکە و بەردەوام چاوەڕوانی هەواڵی موسوڵمانانی دەکرد و لەناکاو مژدەهێنەر لەگەڵ هەواڵی سەرکەوتن هات. عومەر وتی: بەشیری؟

وتی: نە، عورووە.

کاتێك دووبارە پرسی، بەشیر؟ تێگەیشت و وتی: بەڵێ، بەشیرم.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: نێردراوی نەعیم.

وتی: نێردراوی نەعیم.

وتی: چ هەواڵێکت پێیە؟

ئەوی لەسەرکەوتنی موسوڵمانان ئاگادار کردەوە.

عومەر سوپاسی خوای کرد و فەرمانیدا نامەکە بۆ خەڵکان بخوێنێتەوە و سوپاسی خوایان کرد.

دوای ئەوە سەماك کوڕی مەخریمە و سەماك کوڕی عوبەید و سەماك کوڕی خەرەشە لەگەڵ نێردراوانی خەڵکانی کوفە و پێنج یەکی تالانییەکان گەیشتنە مەدینە. عومەر لەڕەچەڵەکی ئەوانی پرسی و هەر سێ سەماکەکە ڕەچەڵەکی خۆیان باس کرد.

سەروەری باوەڕداران وتی: خوا پیرۆزتان بکات. خواوەندا، بەهۆی ئەمانەوە گەورەیی و شکۆ بەئیسلام ببەخشە.

دەڵێت: جەستبی لەهەمەدان و پادگانەکانی پەیوەستی هەمەدان بوو تا نێردراو وەڵامی عومەر کوڕی خەتابی بۆ نەعیم کوڕی موقرین هێنا. وەڵامەکە بەمشێوە بوو: بەڵام دواتر، کەسێك لەهەمەدان وەك جێگری خۆت دەستنیشان و سەماك کوڕی خەرەشە بۆ هاوکاری بوکەیر کوڕی عەبدوللە ڕەوانە بکە و خۆت لەگەڵی بڕۆ و ڕووبەڕووی سوپای فارسەکان ببنەوە و لەوێ بمێنەرەوە چوونکە لەهەموو ویلایەتەکان گرنگتر و بۆ مەبەستەکەی تۆ گونجاوترە.

نـەعیم، یەزیـد کـوڕی قـەیس هەمـەدانی لەهەمـەدان دانـا و لـەواج روود لەگـەڵ سوپاکەی مەبەستی گرتنی ڕەی کرد.

دەڵێـت: سـەماك کـوڕی مەخریمـە دامەزرێنـەری مزگـەوتی سـەماك بـوو. نـەعیم نووسراوی ئاشـتی هەمـەدانی تـازە کـردەوە و یەزیـد کوڕی قەیـسی هەمـەدانی لـەوێ دانـا و لەگـەڵ سـوپاکەی بەرێکـەوت تـا گـەیشتە ڕەی. یەکـەم کـەس لەعەرەبـەکان بـوو رووی کردە دەیلەمییەکان.

## گرتنی ڕەی

دەڵێت: نەعیم لەگەڵ سوپاکەی لەواج روودەوە بەرێکەوت و لەوێوە تا دەستبی، سنووری فەرمانڕەوایەتی ئەو بوو. مەبەستی ڕەی کرد کەلەوێ سوپایەك بۆ دژایـەتی کردنـی موسـوڵمانان کۆببوویـەوە. زەینـەبی، بـاوکی فـەرخان، هاتـەدەر و لەشـوێنێك بەناوی قەها رووبەرووی بوویەوە. ئەم رووبـەروو بوونەوەیـە بەئاشتی و دژی پاشـای ڕەی بوو. تامی جەنگی موسوڵمانانی چێشتبوو و رژدی بەسیاوەخش و بنەماڵەکەی دەبرد. لەگەڵ نەعیم هات. لەم کاتەدا پاشای ڕەی، سیاوەخش، کوڕی مێهـران کـوڕی بەهرامی چوبین بوو، داوای هاوکاری لەخەڵکانی دۆنباوەند و تەبەرستـان و قـومس و گورگـان کـرد و وتـی: ئاگـادارن ئـەوان لـەرەی نزیـك بوونەتـەوە، کـاتی جموجـۆڵ و چالاکییە.

بۆ هاوکاری کردنـی ئـەو کۆبوونـەوە و سـیاوەخش رووبـەرووی نـەعیم بوویـەوە و لەداوێنی کێوی ڕەی جەنگ دەستپێکرد.

دەڵێـت: زەینـەبی بەنـەعیمی وتبـوو، ژمارەیـان فراوانـە و سـوپاکەی تـۆ کـەم، دەستەیەك سوار لەگـەڵ من بنێـرە تـا لەرێگـەیـەك کەهەسـتمان پـێ نەکـەن بڕۆینـە نـاو شارەکە و تۆ هێرش بکە سەریان و کاتێك ئەو دەستەیە رووبەرووی رکەبەرەکانی تۆ ببنەوە، ناتوانن لەبەرابەر تۆ خۆڕاگری بکەن.

نـەعیم شـەوانە دەسـتەیەك سـواری لەگـەڵ نـارد کەسـەرکردەکەیان مـونزەر کـوڕی عەمرۆ، بـرازای خـۆی بـوو. زەینـەبی ئـەوانی لەرێگەیـەك کـەدوژمن هەسـتی پێنـەکرد، بردە ناو شارەکە و نەعیم شەوانە هێرشی کـردە سـەریان و لـەناو شـارەکە ناکـاوگیری

کردن. جەنگان و خۆڕاگرییان کردە پیشە تا ئەو کاتەی لەپشتەوە دەنگی تەکبیریان بیست و شکستیان خوارد. ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا. کوژراوەکانی خۆیان بەقامیش بژارد (ئەندازە گرت؟) ئەو تالآنییەی لەم شارە دەستیان کەوت هاوشێوەی تالآنییەکەی مەداین بوو.

زەینەبی بەنوێنەرایەتی خەڵکانی رەی پەیمانی ئاشتی لەگەڵ نەعیم بەست. نەعیم ئەوی وەك سنووری رەی دەستنیشان و پێگە و رێزی رەی بۆ بنەماڵەی زەینەبی گوێزرایەوە کەشەهرام و فەرخان لەناویاندا بوون. تا ئێستایش بەمشێوەیە و بنەماڵەی بەهرامی چوبین چیتر ناو و نیشانی نەما. نەعیم ئەوشارەی وێران کرد کەبە شاری کۆن ناوبراوە. فەرمانی بەزەینەبیدا بناغەی شاری رەی تازە دابرێژێت.

نەعیم هەواڵی سەرکەوتنی خۆی بەموزاریب کوڕی عیجلی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نارد و پێنج یەکی بەعوتەیبە کوڕی نەهاس و باوکی مەفزەر و دەستەیەك لەسەرکردەکانی کوفەی ڕەوانە کرد و کاتێك رەی دەستی بەسەردا گیرا، سەماك کوڕی خەرەشەی ئەنساری بۆ هاوکاری بوکەیر کوڕی عەبدوللە نارد و سەماك بۆ هاوکاری کردنی بوکەیر مەبەستی ئازەربایەجانی کرد.

نەعیم نووسراوێکی بۆ خەڵکانی رەی نووسی کەبەم شێوە بوو:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمە پەیمانێکە نەعیم کوڕی موقرین بەزەینەبی کوڕی قولەی دەدات. ئەمان بەخەڵکانی رەی و هەموو کەسانی هاوشێوەی ئەوان دەدات بەو مەرجەی جەزیە، بەئەندازەی توانای خۆیان، هەر باڵغێك دەبێت بیدات، و ئەوان چاکەخواز بن و رێنومایی موسوڵمانان و خیانەت نەکەن و پەیوەندی بەدوژمنانەوە نەکەن و هەروەها بۆ شەو و رۆژێك میوانداری موسوڵمانان بکەن و رێزیان بگرن و هەرکەس جوێن بەموسوڵمانێك بدات یا ئیهانەی بکات، سزا دەدرێت و هەرکەس لەموسوڵمانێك بدات، دەکوژرێت و هەرکەس گێرەشێوێنی بکات و تەسلیمی نەکەن، پەیمانەکەی شکاندووە.

نووسرا و شایەتەکان واژۆیان کرد.

مەسغان کەسی نارد و داوای پەیمانی ئاشتی کرد بۆ ئەوەی فدیە بدات بێ

ئـەوەی داواری هاوکـاری وپارێزگـاری کـردن بکـات. نـەعیم رازی و نووسـراوێکی لەنێوان خۆیاندا نووسی بێ باس کردنی هاوکاری کردن دژی کەسێك و ئەمە لەنێوان ئەواندا مایەوە:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمـە پـەیمانی نـەعیم کـوڕی موقرینـە بـۆ مەردانـشای مەسـغانی دۆنباوەنـد و خـەڵکانی دۆنباوەنـد و خـوار و لارز و شـەرز: تـۆ و هەرکـەس هاوشـێوەی تـۆ بێـت، لەئەماندایە و ڕێگەت پێدەدرێت پارێزگاری لەخەڵکی سەرزەمینەکەی خۆت بکەیت و ساڵانە دووسەد هەزار درەم، لەکێشی حەوت، بدەیت و پارێزراو بیت. تا ئەو کاتەی ڕێز لەم پەیمانە بگریت، کسە هێرش ناکاتە سەرتۆ و کەس بێ مۆڵەتی تۆ نایێتە ناو شـارەکەت مەگـەر ئـەوەی پەیمانەکـەت بـشکێنیت و هەرکـەس پـەیمان بـشکێنێت، ئەمانی نییە و هەرکەس خۆی بەدەستەوە نەدات، بەهەمان شێوە.

نووسرا و شایەت وەرگیرا.

دەڵێت: کاتێك نەعیم هەواڵی سەرکەوتنی بەموزاربی عیجلیدا نارد و پێنج یەکی ڕەوانەی مەدینە کرد، عومەر بۆی نووسی: سوەید کوڕی موقرین بۆ قومس بنێرە و سـەماك کـوڕی مەخریمـە وەك فەرمانـدەی پێشەنگی سوپاکەی و دوو بـاڵی سـوپاکە بەعوتەیبە کوڕی نەهاس و هیند کوڕی عەمرۆ جەمەلی بسپێرە.

سـوەید کـوڕی مـوقرین دوای رازاندنـەوەی سـوپاکەی لـەرەی بـەرەو قـومس بەرێکەوت وکـەس رووبـەرووی نەبوویـەوە و بەئاشـتی دەسـتی بەسـەر قوسمدا گرت. لەوێ ئۆردووی لێدا و کاتێك لەرووبارەکەی ئەوان بەناوی مەلاز ئاویـان خواردەوە، نەخۆشـی لـەناو ئەوانـدا سـەریهەڵدا و بـڵاو بوویـەوە. سـوەید پێـی وتـن: ئاوەکـەتان بگۆڕن تا ببنە هاوشێوەی خەڵکانی ئێرە. ئەو کارەیان کرد و ئاوەکە بۆیان سازگار بوو.

ئەوکەسانەی لەخەڵکانی فارس پەنایان بۆ تەبەرستان بردبوو یا ڕێگەی بیابانیان گرتبووەبەر، نامەیان بۆ نەعیم نووسی. نەعیم پێشنیاری ئاشتی و جەزیـەی پێکردن و بۆی نووسین:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمـە پـەیمان نامەیێکـە سـوەید کـوڕی مـوقرین بەخـەڵکانی قـومس و دەوروبـەری

دەدات، بۆ ماڵ و گیان و سامانیان بەو مەرجەی جەزیە بدەن، لەهەر کەسێکی باڵغ بەئەندازەی توانای خۆی، دەبێت چاکەخوازی موسوڵمانان بن و ڕێگەیان نیشان بدەن. هەر موسوڵمانێك دەڕواتە لایان، دەبێت شەو و ڕۆژێك میوانداری بکەن. ئەگەر ڕێزی پەیمانەکەیان نەگرت یا پەیمانەکەیان شکاند، چیتر پارێزراو نین.

نووسرا و شایەتیان بۆ وەرگیرا.

## گرتنی گورگان

دەڵێت: سوەید کوڕی موقرین لەبەستام ئۆردووی لێدا و بۆ پاشای گورگان ڕەزبان سول نامەی نووسی، دواتر مەبەستی ڕۆشتن بۆ ڕەی کرد، ڕەزبان سول نامەی بۆ نووسی و خوازیاری ئاشتی بوو. بەڵێنیدا جەزیە بدات و جەنگی گورگان لەئەستۆ بگرێت و ئەگەر شکستی خوارد، هاوکاری بکەن. بەمەرجەکەی ڕازی بوون و ڕزەبان سول پێش ئەوەی سوەید بڕواتە ناو گورگان، بۆ پێشوازی کردنی لەشارەکە هاتەدەر. سوەید لەگەڵ ڕەزبان ڕۆشتە ناو شارەکە و لەوێ ئۆردووی لێدا تا خەراجی بۆ کۆبکەنەوە و سنوورەکانیان پێوت. ئەو، سنوورەکانی بەتورکەکان بەهێز و لەوکەسانەی بۆ پارێزگاری کردنی ئەو ناوچانە ڕایسپاردن، جەزیەی وەرنەگرت. لەنێوان خۆی وئەوان پەیمانێکی نووسی بەم ناوەڕۆکە:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەم پەیمانێکە لەنێوان سوەید کوڕی موقرین بۆ ڕەزبان سوول کوڕی ڕەزبان و خەڵکی گوندەکان و خەڵکانی دیکەی گورگان. ئێوە لەپەنای ئێمەدان، پاراستنی ئێوە لەئەستۆی ئێمەدایە و جەزیە لەئەستۆی ئێوەدا، هەر ساڵە و بەئەندازەی تواناییتان و لەهەر کەسێکی باڵغ جەزیە وەردەگیرێت. هاوکاری لەهەر کەسێکی ئێوە وەربگرین، جەزیەی لەسەر هەڵدەگیرێت. دین و ئەرکە دینییەکانی خۆتان وەك خۆی دەمێنێتەوە و تا ئەو کاتەی جەزیە بدەن و ڕێگە نیشانی موسوڵمانان بدەن و چاکەخوازی ئەوان بن و میوانداارییان بکەن و پەیوەندی بەدوژمنی موسوڵمانانەوە نەکەن و خیانەت نەکەنە پیشە، پەیمانەکە گۆڕانی بەسەردا نایێت. هەرکەس بمێنێتەوە، هاوشێوەی کەسانی دیکەیە و هەرکەس دەخوازێت بڕوات، پارێزراوە تا

ئەو کاتەی دەگاتە شوێنی مەبەستی خۆی. هەرکەس جوێن بەموسوڵمانێك بدات، سزا دەدرێت و هەرکەس لەموسوڵمانێك بدات، خوێنی حەڵاڵە.

سواد کوڕی قوتەبە و هیند کوڕی عەمرۆ و سەماك کوڕی مەخریمە و عوتەیبە کوڕی نەهاس شایەتی ئەم پەیمانەن و لەساڵی هەژدەیەم نووسرا.

بەڵام بەوتەی مەدائینی گورگان لەرۆژگاری عوسمان و لەساڵی سی دەستی بەسەردا گیرا.

## گرتنی تەبەرستان

دەڵێت: ئیسپەهبوز سەبارەت بەئاشتی بۆ سوەیدی نووسی، ئاشتی لەنێوان ئەوان سەقامگیر و بۆ ماوەیەك بەردەوام بێت و باسی هاوکاری کردن دژی هیچ کەسێك لەئارادا نەبێت. سوەید بەمە رازی و پەیمان نامەیەکی نووسی بەم ناوەرۆکە:

((بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمە پەیمان نامەی سوەید کوڕی موقرینە بۆ فەرخان سوسپاسالاری خوراسان لەتەبەرستان و کێوەکانی گیلان و دوژمنەکان.

تۆ، بەئەمانی خواوەند، پارێزراویت بەو مەرجەی رێگە لەدز و خەڵکی سەرزەمینەکەی خۆت بگریت و پەنای یاخییەکان نەدەیت و لەکارگوزاری سنوورەکەی خۆت پارێزراو دەبیت بەدانی پێنسەد هەزار درەم لەهەر جۆرە درەمێکی سەرزەمینەکەت، کاتێك ئەو برە پارە بدەیت کەس لەئێمە ماف نییە هێرش بکاتە سەر تۆ و بێ مۆڵەتی تۆ بێتە ناو سنووری فەرمانڕەوایەتیت، رێگەی ئێمە بۆ لای ئێوە، (بەمۆڵەتەوە) دەبێت ئەمن بێت و رێگەی ئێوەیش بەهەمان شێوە. پەنا بەهەڵاتووەکانی ئێمە مەدەن، پەیوەندی بەدوژمنانی ئێمەوە مەکەن و خیانەت نەکەنە پیشە، ئەگەر خیانەت بکەن، لەنێوان ئێمە و ئێوە هیچ پەیمانێك نییە.

سواد کوڕی قوتەبەی تەمیمی و هیند کوڕی عەمرۆ موڕادی و سەماك کوڕی مەخریمەی ئەسەدی و سەماك کوڕی عوبەیدی ئەسەدی و عوتەیبە کوڕی نەهاسی بەکری شایەتی ئەم پەیمان نامەن. لەساڵی هەژدەیەم نووسرا.

## گرتنی ئازەربایەجان

دەڵێت: کاتێک نەعیم بۆ جاری دووەم دەستی بەسەر ئازەربایەجاندا گرت و لەرووباری ئەرواجەوە رووی کردە رەی، عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ نووسی کە سەماك کوڕی خەرەشەی ئەنساری بۆ هاوکاری بوکەیر کوڕی عەبدوللە بۆ ئازەربایەجان ڕەوانە بکە و ئەو، ئەم کارەی دواخست تا رەی دەستی بەسەردا گیرا. دواتر ئەوی ڕەوانە کرد و سەماك بەمەبەستی پەیوەست بوون بەبوکەیر رێگەی ئازەربایەجانی گرتەبەر.

سەماك کوڕی خەرەشە و عوتبە کوڕی فەرقەد لەدەوڵەمەندەکانی عەرەب بوون و هاوشێوەی کەسێکی بەتوانا هاتبوونە ناو کوفە.

کاتێك بوکەیری ڕەوانە کرد، بەرێکەوت تا گەیشتە بەرابەر جەرمیزان و ئیسفەندیار کوڕی فەروخزاد کە لەرووباری ئەرواج شکستی خواردبوو، رووبەرووی بوویەوە. ئەمە یەکەم جەنگی ئازەربایەجان بوو. کاتێك جەنگ دەستی پێکرد، خواوەند شکستی بەسوپای فارسەکان هێنا و بوکەیر ئەوی ئەسیر کرد. ئیسفەندیار وتی: زیاتر حەز بەئاشتی دەکەیت یا جەنگ؟

بوکەیر وتی: ئاشتی.

وتی: کەواتە من لای خۆت رابگرە چوونکە خەڵکانی ئازەربایەجان، ئەگەر من بەنوێنەرایەتی ئەوان پەیمانی ئاشتی نەبەستم لەشوێنی خۆیان نامێننەوە و روو دەکەنەکوێستانەکانی دەوروبەر هاوشێوەی کوێستانی قەبەج و کوێستانی رۆم و هەرکەس خۆی حەشار بدات و سەنگەر بگرێت، بۆ ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە.

بوکەیر ئیسفەندیاری لای خۆی هێشتەوە. ئەو هاوشێوە ئەسیر مایەوە تا ئەو کاتەی ویلایەتەکەی تەسلیم کرد جگە لەقەڵاکان.

لەم کاتەدا سەماك کوڕی خەرەشە وەك هێزی پشتیوان گەیشت، ئیسفەندیار، هێشتا ئەسیر بوو، سەماك، دەستی بەسەر هەموو ناوچەکانی دەوروبەری خۆیدا گرتبوو. عوتەب کوڕی فەرقەدیش دەستی بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری خۆیدا گرت.

کاتێك سەماك گەیشتە لای بوکەیر، بەگاڵتەوە پێی وت: لەگەڵ تۆ و عوتبەی دەوڵەمەند چی بکەم؟ ئەگەر بەدڵخوازی خۆم بجووڵێمەوە، پێشڕەوی دەکەم و ئێوە لێرە بەجێدێڵم، ئەگەر دەخوازی لای من بمێنەرەوە و ئەگەر دەخوازیت بڕۆ بۆ لای عوتبە چوونکە مۆڵەت بەهەر دووکتان دەدەم و روو دەکەمە سەرزەمینێك، لێرە دژوارتر و سەختتر بێت.

دوای ئەوە داوای لەعومەر کوڕی خەتاب کرد لەکار دووری بخاتەوە. عومەر نامەی نووسی و مۆڵەتی پێدا بەرەو باب پێشڕەوی بکات و کەسێك وەك جێگری خۆی دابنێت. ئەو عوتبەی وەك جێگری خۆی دانا و پێشڕەوی کرد. ئیسفەندیاری تەسلیمی عوتبە کرد. سەماك کوڕی خەرەشەی (ئەمە ئەبو دووجانە نییە)، وەك فەرمانڕەوای ئەو ناوچانەی بوکەیر دەستی بەسەردا گرتبوو، دیاری کرد. عومەر کوڕی خەتاب فەرمانڕەوایەتی هەموو ئازەربایەجانی بەعوتبە کوڕی فەرقەد سپارد.

دەڵێت: بەهرام کوڕی فەروخزاد ڕێگەی عوتبە کوڕی فەرقەدی گرت و لەگەڵ سوپاکەی خۆی بۆ زیان گەیاندن بەموسوڵمانان مایەوە تا عوتبە نزیك کەوتەوە و جەنگان. عوتبە شکستی پێهێنان و بەهرام هەڵات.

کاتێك هەواڵی شکستی بەهرام و مێهرەبە بەئیسفەندیاز گەیشت کەلای بوکەیر ئەسیر بوو، وتی: ئێستا پەیمانی ئاشتی دەبەسترێت و جەنگ کۆتایی پێدێت. لەگەڵ بوکەیر پەیمانی ئاشتی بەست و هەمووان رازی بوون و ئازەربایەجان ئارام بوویەوە و بوکەیر و عوتبە نامەیان بۆ عومەر نووسی و پێنج یەکی تاڵانییەکانیان ڕەوانەی مەدینە کرد.

بوکەیر خێراتر لەعوتبە دەستی بەسەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی گرتبوو و دوای ئەوەی عوتبە شکستی بەبەهرام هێنا و پەیمانی ئاشتی مۆر کرا، عوتبە لەنێوان خۆی و خەڵکانی ئازەربایەجان پەیمان نامەیەکی نووسی بەم ناوەرۆکە:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمە پەیمان نامەی ئەمانێکە عوتبە کوڕی فەرقەد، کارگوزاری عومەر کوڕی خەتاب، سەروەری باوەڕداران، بەخەڵکانی ئازەربایەجانی دەدات. لەدەشت و کێو و دەوروبەر و دۆڵەکان و شوێنکەوتەی دینەکان کەگیان و ماڵ و دین و ئەرکە دینییەکانیان پارێزراوە بەو مەرجەی جەزیە بدەن بەئەندازەی توانای خۆیان. منداڵ و

ژنی نەخۆش کەهیچی لەسامانی دنیا پێنەبڕاوە، خۆپارێزی گۆشەگیر کەهیچی نییە، جەزیەیان لەسەر نییە. ئەمانیان هەیە و هەرکەس بمێنێتەوە. دەبێت شەو و ڕۆژێك میوانداری موسوڵمانی سوپای موسوڵمانان بکەن و ڕێنیشاندەریان بن. هەرکەس لەوان لەماوەی یەك ساڵ پەیوەستی سوپای موسوڵمانان بێت، جەزیەی لەسەر هەڵدەگیرێت و هەرکەس نەیکات، هاوشێوەی کەسانی دیکە دەبێت و هەرکەس دەخوازێت دەتوانێت بڕوات و تا شوێنی مەبەستی خۆی، پارێزراو دەبێت.

جوندەب نووسی

بوکەیر کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی و سەماك کوڕی خەرەشەی ئەنساری، شایەتی پەیمان نامەکەن.

لەساڵی هەژدەیەم نووسرا.

دەڵێت: لەم ساڵەدا عوتەیبە، حەلوایەکی بردە لای عومەر کوڕی خەتاب. عومەر فەرمانیدا بوو کارگوزارەکانی هەموو ساڵێك لەکاتی حەج، سەردانی بکەن بەمشێوەیە ڕێگەی ستەمکاری لێدەگرتن.

## بەوتەی سەیف گرتنی باب لەم ساڵەدا بوو

دەڵێت: بەپێی وتەی مێژوو نووسان عومەر کوڕی خەتاب باوکی موسای بۆ بەسرە گەڕاندەوە و سوراقە کوڕی عەمرۆ کەنازناوەکەی زوئەلنور بوو، بەرەو باب ڕەوانە کرد. عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە کەهەمان نازناوی بوو، وەك فەرمانەدەی پێشەنگی سوپاکەی دەستنیشان و حوزەیفە کوڕی ئەسیدی غەفاری وەك سەرکردەی یەکێك لەباڵەکانی سوپاکەی دانا. بوکەیر کوڕی عەبدوڵڵەی لەیسی پێش گەیشتنی سوراقە کوڕی عەمرۆ لەبەرابەر باب ئوردووی لێدا بوو. بۆ فەرمانەدەیی باڵەکەی دیکە کەسێکی راسپارد و فەرمانی پێدا پەیوەستی سوراقە ببێت. کاری دابەش کردنی تالانییەکانی بەسەلمان کوڕی رەبیعە سپارد.

سوراقە، عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعەی بۆ پێشەوە نارد و خۆی بەدوای ئەو ملی ڕێگەی گرتەبەر تا ئەوەی لەسنووری ئازەربایەجان دەرچوون و کەوتنە سەر ڕێگەی باب. لەنزیك باب، پەیوەستی بوکەیر بوو. ئەوی وەك فەرمانەدەی باڵێکی سوپاکەی

دەستنیشان و بەئامادە کردنی سوپاکەی بۆ جەنگ، ڕۆشتنە ناو سەرزەمینی باب.

سەروەری باوەڕداران، حەبیب کوڕی موسلیمەی بۆ هاوکاری ئەو نارد. ئەوی لەجەزیرەوە ڕەوانە کرد و زیاد کوڕی حەنزەلەی لەجیاتی ئەو، وەك فەرمانڕەوا دەستنیشان کرد.

کاتێك عەبدولرەحمان کوڕی ڕەبیعە لەسەرزەمینی باب لەپاشا نزیك کەوتەوە (لەو کاتەدا پاشای باب، شەهربەراز لەخەڵکانی فارس و سنوورداری ئەو سنوورە بوو، ڕەچەڵەکی ئەو دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی شەهربەراز پاشا کەمناڵەکانی ئیسرائیلی لەناو برد و ئەوانی لەشام دەرپەڕاند.) شەهربەراز نامەی نووسی و داوای ئەمانی کرد تا بڕواتە لای عەبدولرەحمان. ئەمانی پێبەخشی، هات و وتی: من لەبەرابەر دوژمنێکی تێکۆشەرم و چەندین نەتەوەی جیاواز کەرێز و پێگەی ئەوتۆیان نییە. شیاو نییە کەسێکی ناودار و خاوەن پێگە، خۆی بەوان بشوبهێنێت و دژی کەسانی خاوەن پێگە، داوای هاوکاری لەوان بکات، چوونکە پیاوی بەرێز و خاوەن پێگە، لەهەر شوێنێك بێت، خزمی کەسانی خاوەن پێگە و مەزنە.

من لەگەڵ خەڵکانی قەبەج و ئەرمەن هیچ پەیوەندییەکەی خزمایەتیم نییە. ئێوە بەسەر سەرزەمین و دیاری ئێمە زاڵبوون، هەمێستاکە کەسێکم لەئێوە، دەستی من لەناو دەستی ئێوەدایە و دڵم لەگەڵ ئێوە، خواوەند ئێوە و ئێمە پیرۆز بکات، جەزیەی ئێمە بۆ ئێوەیە و سەرکەوتن تایبەتە بەئێوە، چیتان پێخۆشە ئەنجامی بدەن، بەوەرگرتنی جەزیە ریسوامان مەکەن چوونکە لەبەرابەر دوژمنانمان ریسوا دەبین.

عەبدولرەحمان وتی: لەمن گەورەتر کەسێکە و نزیك بۆتەوە، بۆ لای ئەو بڕۆ. ئەوی بۆ لای سوراقە نارد و پاشا، وتەکانی خۆی دووبارە کردەوە.

سوراقە وتی: ئەمە سەبارەت بەو کەسانەی لەگەڵ تۆن، ئەگەر بەو شێوەیە کەباسی دەکەیت، پێی رازی دەبم، هەرکەس بمێنێت و نەجەنگێت بەناچاری دەبێت جەزیە بدات.

شەهربەراز رازی و ئەمە دەربارەی ئەو ناباوەڕانەی دەجەنگان، بوویە نەریت و ئەوانەی نەیاندەتوانی جەزیە بدەن، دەبوا بەشداری جەنگەکان بکەن تا جەزیەی ئەو ساڵەیان لەسەر هەڵگیرێت.

سوراقە، عومەر کوڕی خەتابی لەم کارە ئاگادار کردەوە و ئەو، کارەکەی پەسەند

و پشتڕاستی کردەوە. لەهەموو ئەو ناوچە کوێستانییانە، هیچ شوێنێك نییە، ئەرمەنییەکان تیایدا نیشتەجێ نەبن. شەڕ و هێرشی موسوڵمانان، خەڵکانی ئەو ناوچەی لەناوبرد وئەوانەی خەڵکی کوێستانەکان بوون، روویان کردە کێوەکان و لەمانەوە لەسەرزەمینەکەی خۆیان، بێ بەش کران. چیتر لەو ناوچانە جگە لەو سوپاییەکان و ئەو کەسانەی هاوکاری ئەوانیان دەکرد، کەس نەدەبینرا.

لەسوراقە کوڕی عەمرۆ پەیمان نامەیەکیان وەرگرت بەم ناوەڕۆکە:

ئەمە پەیمان نامەیەکە سوراقە کوڕی عەمرۆ، کارگوزاری سەروەری باوەڕداران، عومەر کوڕی خەتاب، بەشەهربەراز و دانیشتووانی ئەرمەنییە و ئەرمەنییەکانی دەدات، ئەمان بەگیان و ماڵ و دینەکەیان دەبەخەشێت و بلاوەیان پێناکات، خەڵکانی ئەرمەنییە و ئەبواب، لەنیشتەجێکان و ئەوانەی کۆچیان کردووە و هەرکەس پەیوەستی ئەوان بێت، دەبێت هەر کاتێك هێرشێك روویدا، بەرێکەون و فەرمانی فەرمانڕەوا، هێرش بێت یا نەبێت، ئەنجام بدەن، هەرکەس بەمە رازی بێت، جەزیەی لەسەر هەڵدەگیرێت مەگەر ئەوانەی پەیوەستی سوپای موسوڵمانان بوون و ئەم کارەیان لەجیاتی جەزیەیە، موسوڵمانان پێویستیان بەهەر کەس نەبێت و بمێنێتەوە، هاوشێوەی خەڵکانی دیکەی ئازەربایەجان دەبێت جەزیە بدات. ئەگەر پەیوەستی سوپا بن، رێنیشاندان و میوانداری کردنی موسوڵمانان لەسەر شانیان هەڵدەگیرێت و ئەگەر جیاواز لەمە بێت، دەبێت جەزیە بدەن.

عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە و سەلمان کوڕی رەبیعە و بوکەیر کوڕی عەبدوللە، شایەتی ئەم پەیمان نامەن.

مەرەزی کوڕی موقرین پەیمان نامەکەی نووسی و یەکێکە لەشایەتەکان.

سوراقە، بوکەیر کوڕی عەبدوللە و حەبیب کوڕی موسلیمە و حوزەیفە کوڕی ئەسید و سەمان کوڕی رەبیعەی بۆ لای خەڵکی کوێستانەکانی دەوروبەری ئەرمەنییە نارد: بوکەیر بۆ موقان، حەبیبی بۆ تفلیس، حوزەیفە کوڕی ئەسیدی بۆ کێونشینەکانی ئالان و سەلمان کوڕی رەبیعەی بۆ ناوچەیەکی دیکە نارد.

سوراقە هەواڵی سەرکەوتن و ڕەوانە کردنی ئەم کەسانەی بۆ سەروەری باوەڕداران نووسی. عومەر گومانی کرد، ئەم کارە بەو شێوەیە دەرئەنجامێکی

ئەوتۆی نییە چوونکە خەڵکانی بێ کەرەستەی پێویست ناردبوو. ئەو ناوچەیە سنوورێکی گەورە و سوپایەکی گەورەی لێبوو. فارسەکان چاوەڕوانی کردەوەکانی ئەوانیان دەکرد بۆ ئەوەی دوای ئەوە یا دەستبەرداری جەنگ بن، یا جەنگ دەستپێبکەن و کاتێك دڵنیابوونەوە و دادپەروەری ئیسلامیان بینی، پەسەندیان کرد. سوراقە مرد و عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعەی وەك جێگری خۆی دانا.

ئەو سەرکردانەی سوراقە ڕەوانەی کردن، بەرێکەوتن. کەسیان نەیتوانی دەست بەسەر ئەو ناوچەی بۆ گرتنی راسپێردرابوو، بگرێت جگە لەبوکەیر کەخەڵکی موقانی تێکشکاند و بەدانی جەزیە ناچاری کردن. پەیمان نامەیەکی بۆ نووسین بەم ناوەڕۆکە:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمە پەیمان نامەی بوکەیر کوڕی عەبدوللەیە بۆ خەڵکانی موقانی کوێستانی قەبەج کەماڵ و سامان و دین و داب و نەریتیان پارێزراوە لەبەرابەر وەرگرتنی جەزیە لەهەر کەسێکی باڵغ یەك دینار، یا بەهاکەی، دەبێت چاکەخواز و رێنیشاندەری موسوڵمانان بن و بۆ ماوەی یەك شەو رۆژ میوانداریيان بکەن. ئەگەر ئەم کارانە ئەنجام بدەن، پارێزراون و ئەمە لەئەستۆی ئێمەدایە و داوای هاوکاری لەخواوەند دەکەین و ئەگەر نەیانکرد و بەندەکانی پەیمانی ئاشتییان خستە ژێرپێ، چیتر ئەمانیان نییە، مەگەر ئەوەی خیانەتکاران تەسلیم بکەن.

شەماخ کوڕی زەرار و رەساس کوڕی جونادیب و حەملە کوڕی جەوییە، شایەتی پەیمان نامەکە و لەساڵی بیست و یەکەم نووسرا.

دەڵێت: کاتێك هەواڵی مەرگی سوراقە و جێگری عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە بەعومەر کوڕی خەتاب گەیشت، عەبدولرەحمانی وەك سنووردارى باب دیاری کرد و فەرمانی پێدا لەگەڵ تورکەکان بجەنگێت.

عەبدولرەحمان لەگەڵ سوپاکەی بەرێکەوت و لەباب گوزەری کرد. شەهربەراز پێی دەوت: دەتەوێت چی بکەیت؟

وتی: دەمەوێت هێرش بکەمە سەر خەڵکانی بەلەنجەر.

وتی: ئێمە بەوە رازین ئەوان لەوبەر باب نەبنە ئەرك بۆمان.

عەبدولرەحمان وتی: بەڵام ئێمە بەمە رازی نین و دەمانەوێت لەسەرزەمینی خۆیان

هێرشیان بکەینە سەر، سوێند بەخوا کەسانێك لەگەڵ ئێمەدان، ئەگەر ئەمیرەکەمان مۆڵەتمان پێبدات لەگەڵ ئەوان دەگەمە لای خەڵکانی رەدم.

وتی: خەڵکانێك هەن لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) ئاخاوتن و باوەڕیان بەم دینە هێنا، دەستەیەك کە لەجاهلییەت خاوەن پێگە و کەسێکی رێزدار بوون، رێز و پێگەی ئەوان زیادی کردووە و ئەمە بەردەوام لەناو ئەواندا دەمێنێتەوە و سەرکەوتن بەردەوام هاورێیانە تا ئەوەی کەسانێك بەسەریاندا زاڵبن و بیانگۆڕن و بەهۆی ئەوکەسانەوە، بارودۆخیان دەگۆڕێت.

عەبدولرەحمان لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب، لەگەڵ خەڵکانی بەلەنجەر جارێك جەنگی کرد کەنەهیچ ژنێك بێوە کرا و نەهیچ منداڵێك هەتیو بوو. سوپاکەی ئەو بۆ جەنگی بەیزا تا دوسەد فەرسەخی بەلەنجەر پێشڕەوی کرد، جارێکی دیکە بۆ جەنگ بەرێکەوت و تەندروست مایەوە. لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان، چەندین جاری دیکە جەنگی کرد.

عەبدولرەحمان لەرۆژگاری خەلافەتی عوسمان کوڕی عەفان کوژرا و ئەمە لەکاتێکدا بوو خەڵکانی کوفە دژی عوسمان راپەڕیبوون چوونکە دەستەیەك لەهەڵگەڕاوەکانی بۆ کاروبارەکان راسپاردبوو بۆ ئەوەی بۆ کەسانێکی چاکەکار بیانگۆڕێت بەڵام نەگۆڕان و دنیاپەرەستەکان بەسەر خەڵکانی کوفەدا زاڵ بوون. ئەمە گەندەڵکارییەکانی ئەوانی زیاتر کرد و خەڵکانی کوفە دژی عوسمان راپەڕین. ئەو بۆ نموونە هۆنراوەیەکی دەخوێندەوە کەناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

((من و عومەر هاوشێوەی کەسێکین

سەگەکەی قەڵەو کرد

بەڵام گاز و نینۆکی سەگەکەی ئەوی بریندار کرد.))

سەلمان کوڕی رەبیعە دەڵێت: کاتێك عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە هێرشی کردە سەر تورکەکان، خواوەند رێگەی نەدا تورکەکان دژی ئەو بکەونە جموجۆڵ و وتیان: ئەم پیاوە کەبەمشێوەیە بوێرە، بەدڵنیاییەوە فریشتەکانی لەگەڵدایە، سەنگەریان گرت و هەڵاتن. عەبدولرەحمان سەرکەوتوو و لەگەڵ تاڵانییەکان گەڕایەوە. ئەم جەنگە لەرۆژگاری خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب روویدا.

دەڵێت: عەبدولرەحمان لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان چەندین جار لەگەڵ تورکەکان جەنگی کرد تا ئەوەی خەڵکانی کوفە گۆڕانیان بەسەرداهات چوونکە خەلیفەی سێیەم کەسێکی هەڵگەڕاوەی وەك فەرمانڕەوای ئەوان دەستنیشان کرد. عەبدولرەحمان جارێکی دیکە بۆ جەنگی تورکەکان بەرێکەوت. ئەوان، سەرکۆنەی یەکیان کرد و وتیان: ئەوانە نامرن.

وتی: تاقی بکەنەوە. ئەو کارەیان کرد و لەناو دارستانەکان بۆسەیان نایەوە و یەکێك لەوان بەشێوەیەکی لەناکاو تیری بۆ یەکێك لەموسوڵمانان هاویشت و ئەوی کوشت و هاوەڵانی رایانکرد. تورکەکان دژی عەبدولرەحمان راپەڕین و شەڕێکی قورسیان دەستپێکرد. کەسێك لەئاسمانەوە هاواری کرد: ئەی بنەماڵەی عەبدولرەحمان، خۆڕاگر بکەن چوونکە بەهەشت جێگەی ئێوەیە.

عەبدولرەحمان جەنگا و کوژرا و موسوڵمانان پاشەکشێیان کرد. سەلمان کوڕی رەبیعە ئالاکەی هەڵگرت و جەنگی. کەسێك لەئاسمانەوە هاواری کرد: بنەماڵەی سەلمان کوڕی رەبیعە خۆڕاگر بن.

سەلمان وتی: مەگەر بەترسەنۆکمان دەزانیت. لەگەڵ خەڵکان بەرێکەوت.

سەلمان و باوکی هورەیرەی دووسی روویان کردە گیلان و لەوێوە گەیشتنە گورگان. دوای ئەم رووداوە، بوێری تورکەکان زیادی کرد بەڵام تا ئێستا جەستەی عەبدولرەحمانیان لای خۆیان هێشتۆتەوە و داوای بارانی لێدەکەن.

مەتەر کوڕی سەلجی تەمیمی دەڵێت: لەباب، ڕۆشتمە لای عەبدولرەحمان کوڕی رەبیعە، شەهربەراز لای دانیشتبوو، پیاوێکی ڕەنگ پەڕاو هاتە لای عەبدولرەحمان و لای شەهربەراز دانیشت، گفتوگۆیان کرد و شەهربەراز وتی: ئەی ئەمیر، دەزانی ئەم پیاوە لەکوێوە هاتووە، چەندین ساڵ پێش ئێستا ئەومان بۆ سەد نارد تا بارودۆخی ئەوێ هەڵسەنگێنێت و بزانیت چ کەسانێك لێوەی نزیکن؟ سامانێکی فراوانم کردە توێشووی رێگەی و نامەم بۆ پاشای دراوسێی خۆم نووسی و دیاریم بۆنارد و داوام لێکرد نامە بۆ پاشای دراوسێی خۆی بنووسێت و بۆهەموو پاشاکان تا سەد دیاری و پێشکەشیم نارد تا گەیشتە پاشای سەرزەمینی سەد. بۆ ئەو نامەی بۆکارگوزاری ویلایەتی نووسی و ڕۆشتە لای، کارگوزاری شا بازیاری خۆی گەڕاندەوە کەهەلۆکەی خۆی پێوو و حەریرێکی پێبەخشی. سوپاسی کرد و کاتێك گەیشتنە سەد، دوو

کێـو بـوو کەسـەدێکی (بەنـداو) گـەورەیان لـەنێوان دوو کێوەکـە دروسـت کردبـوو. لەبەردەم بەنداوەکە خەندەکێکی تاریك هاوشێوەی شەو دەبینرێت، لەبەر ئەوەی زیاد لەئەندازە قووڵە.

دەڵێـت: سـەیرم کـرد و لێـی وردبوومـەوە، مەبەسـتی گەڕانـەوەم کـرد، بازیـار پێـی وتم: چـاوەڕوان بـە پاداشـتت پێببەخـشم، هەرپاشـایەك کـەدوای پاشـایەکی دیکـە بێتەسەر کار، بۆ خۆ نزیك کردنەوە لەخواوەند باشترین شتی خۆی دەخاتە ناو ئەم دۆڵـە. لەتەگۆشتێکی خسته ناو چاڵەکە، هەڵۆکە بۆ گـرتنی هـەڵفڕی. وتـی: ئەگـەر پێش گۆشتەکە بگاتە قولاّی، دەیگرێتـەوە و هـیچ و ئەگـەر پێـی نـەگات تا گۆشـتەکە دەکەوێتە قولاّیی، شتێك بەدەست دێت.

هەڵۆکـە گەڕایـەوە و لەتـە گۆشـتەکەی پێبـوو. یاقوتێـك بەچـنگی هەڵۆکـەوە بـوو، بەخـشی بـەمن، ئەمـە ئـەو یاقووتەیـە، تەسـلیمی شـەهربەرازی کـرد. عەبـدولرەحمان وەریگرت و لێی وردبوویەوە و گەڕاندییەوە بۆ شەهربەراز. شەهربەراز وتی: ئەمە لەم ویلایەتە، یانی باب، باشترە. سوێند بەخوا چاکەکارانی ئێوەم زیاتر لەخوسرەوەکان خۆش دەوێت، ئەگەر ژێر دەستەی ئـەوان دەبـووم و لـەم یاقووتـە ئاگـادار دەبوونـەوە، لێیان دەسەندم، سوێند بەخوا لەبەر ئەوەی رێز لەپەیمانەکەتان دەگرن و گـەورەکاتان راستگۆیە، هیچ شتێك و هیچ کەسێك ناتوانێت لەبەرابەر ئێوە خۆڕاگری بکات.

عەبـدولرەحمان بەنێردراوەکـەی وت: بـارودۆخی ئـەو چـاڵە چـۆنە و هاوشـێوەی چییە؟

وتی: هاوشێوەی جلەکانی بەر ئەو پیاوەیە.

دەڵێت: سەیری جلەکانی منی کرد، مەتەر کوڕی سەلج بە عەبـدولرەحمانی کـوڕی رەبیعـەی وت: سـوێند بـەخوا ئـەم پیـاوە ڕاسـت دەکـات چـوونکە بینیویـەتی و لێـی وردبۆتەوە.

وتی: بەڵێ وەسفی ئاسن و رووی دەکات کەخواوەند دەفەرمێت:

((آتونی زبر الحدید اذا ساوی بین الصدفین قال انفخوا حتی اذا جعله نـارا، قـال آتـونی افرغ علیه قطرا.

واتاکەی: پارچەی ئاسن بۆ من بێنن، تا کاتێك نێوان دوو دیوارەکە پـڕ بوویـەوە.

وتی: بیدەن، تا سووری کردەوە، وتی: بیهێنن تا تواوەی برێژمەسەر.))

عەبدولرەحمان بەشەهربەرازی وت: بەهای دیارییەکەی تۆ چەندە؟

وتی: لەم ویلایەتە یەکسەد هەزار و لەویلایەتەکانی دوور سێ هەزار هەزار.

بەگومانی واقدی لەم ساڵەدا معاویە بۆ جەنگی هاوینە بەرێکەوت و لەگەڵ دە هەزار کەس لەموسوڵمانان ڕۆشتە ناو سەرزەمینی ڕۆم.

دەستەیەك وتوویانە: خالید کوڕی وەلید لەم ساڵەدا مرد.

لەم ساڵەدا یەزید کوڕی معاویە و عەبدولمەلیك کوڕی مەروان لەدایك بوون.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب حەجی لەگەڵ خەڵکان کرد، کارگوزاری ئەو لەمەککە عەتاب کوڕی ئەسید، لەیەمەن یەعلی کوڕی ئومەییە و لەشارەکانی دیکە، کارگوزارەکانی هەمان کەسانی ساڵی پێشتر بوون.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب لەدابەش کردنی ناوچە دەست بەسەردا گیراوەکان لەنێوان خەڵکانی بەسرە و کوفە گۆڕانکاری دروست کرد.

## گۆڕانکاری

سەعید دەڵێت: لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب، عەماری یاسر یەك ساڵ و بەشێك لەساڵێکی دیکە، کارگوزاری کوفە بوو. عەمرۆ کوڕی سوراقە لەو کاتەدا کارگوزاری بەسرە و نامەی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی: خەڵکانی بەسرە فراوانن و ئەو خەراجەی بەدەستمان دەگات، کەمە. داوای لێکرد یەکێك لەدوو ماه یا ماسەبزانیان پێبدات. کاتێك خەڵکانی کوفە لەمە ئاگادار بوونەوە، بەعەماریان وت: بەنوێنەرایەتی ئێمە نامە بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسە کەمێهرموز و ئیزە تایبەت بوو بەئێمە و خەڵکانی بەسرە، بۆ گرتنی ئەو ناوچانە هاوکاریی ئێمەیان نەکردووە، کاتێك ئەو ناوچانەمان گرت، ئەوسا پەیوەستی ئێمە بوون.

عەمار وتی: من چ کارێکم بەوێ هەیە؟

عەتارد پێی وت: ئەی بەندەی گوێ قرتاو، کەواتە کێ دەبێت لەگەڵ ئەوکەسانەی داوای بەشە تاڵانی ئێمە دەکەن، ڕووبەڕوو ببێتەوە؟

وتی: جوێنت بەگوێچکەی مندا کە لەگوێچکەکەی دیکەم، زیاترم خۆش دەوێت.

لەمبارەوە هیچی نەنووسی و ئەویان بەدوژمنی خۆیان لەقەڵەمدا. کاتێك خەڵکانی کوفە بۆ دژایەتی کردنی خەڵکانی بەسرە لەسەر ئەو دوو ویلایەتە پێداگرییان کرد، کەسانێك لەبەرژەوەندی باوکی موسا شایەتییاندا کەئەو، پەنای بەخەڵکانی مێهرموز و ئیزە دابوو. خەڵکی کوفە و نەعمان کاتێك کەسیان بۆ لای ئەوان نارد کەئەمانیان پێ بەخشرابوو. عومەر بەپێی شایەتی شایەتەکان، ئەو دوو ویلایەتەی بەخەڵکانی بەسرە سپارد.

دەڵێت: خەڵکانی بەسرە داوای چەند گوندێکی ئیسفەهانیان لەنزیك جی کرد و باوکی موسا کاتێك بەفەرمانی عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ خەڵکانی بەسرە بۆ هاوکاری عەبدوللە کوڕی عوتەبان، ڕۆشتبووە ئەو سەرزەمینە، دەستی بەسەر ئەو گوندانەدا گرتبوو.

خەڵکانی کوفە وتیان: ئێوە بۆ هاوکاری کردنی ئێمە هاتبوون، ئێمە دەستمان بەسەر ویلایەتەکەدا گرت و لەتالانییەکان بەشدارمان کردن، بەلام جەزیەی خەڵکان بۆ ئێمەیە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ڕاست دەکەن.

جەنگاوەرانی خەڵکی بەسرەی بەشدار لەقادسیە و دوای قادسیە، بابەتێکی دیکەیان هێنایە کایەوە و وتیان: بەشی ئێمە لەسواد و سەرزەمینەکانی دەوروبەر کەبەشداریمان لەگرتنی ئەو ناوچانە کردووە، بدەن.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئایا بەماە، ڕازی دەبن.

هەروەها بەخەڵکانی کوفەی وت: ڕازی دەبن یەکێك لەدوو ماە بەوان بسپێرین؟

وتیان: ئەوەی بەباشی دەزانی ئەنجامی بدە.

عومەر ماە دینار و مێهرەگانی قەزەقی بەسوادی بەسرە بەخشی و ئەمە تایبەتە بەجەنگاوەرانی بەسرە بەشدار لەجەنگی قادسیە و دوای قادسیە.

بەمشێوەیە بوو تا لەرۆژگاری معاویە کوڕی ئەبوسوفیان کەشیعەکانی عەلی لەعێراقەوە بۆ قنسرین برد. پێش ئەو قێنسرین یەکێك لەگوندەکانی حمس بوو. معاویە کردی بەویلایەت و موهاجیرەکانی کوفە و بەسرەی لەوێ نیشتەجێ کرد و لەداگیرکارییەکانی عێراق، ئازەربایەجان و موسڵ و بابی بۆ ئەوان وەرگرت و

پەیوەستی ناوچەکانی دیکەی کرد.

سوپای نیشتەجێی جەزیرە و موسڵ لەشوێنەکانی دیکە بوون و هەرکەس لەخەڵکانی کوفە و بەسرە کەئەو ناوچەیان بەجێهێشتبوو، روویان کردبووە جەزیرە و موسڵ. باب و ئازەربایەجان و موسڵ و جەزیرە بەدەستی خەڵکانی کوفە گیرا و بەو کەسانەی لەرۆژگاری عەلی بۆ شام رۆشتبوون، سپێردرا.

لەرۆژگاری معاویە خەڵکانی ئەرمەنییە کافر بوون و ئەو سەرکردایەتی بابی بەحەبیب کوڕی موسلیمە سپارد، حەبیب لەو کاتەدا لەجەرزان و لەگەڵ خەڵکانی تفلیس و کوێستان، نامەیان ئاڵوگۆڕ کرد. دواتر بۆجەنگی ئەوان بەرێکەوت و ناچاری کردن ملکەچی خۆیان نیشان بدەن و لەحەبیب پەیمانیان وەرگرت. ئەو دوای چەندین نامە، پەیمان نامەیەکی بۆ نووسین بەم ناوەرۆکە:

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

لەحەبیب کوڕی موسلیمە بۆ خەڵکانی تفلیسی جەرزان، سەرزەمینی هورموزان، ئاشتی لەنێوان ئێمەدا سەقامگیرە و سوپاسی خوا دەکەم کەخوایەك جگە لەو بوونی نییە و نێردراوی ئێوە، تیفلی هاتە لای ئێمە و پەیامیدا و کارەکەی خۆی بەسەر برد. تیفلی بەنوێنەرایەتی ئێوە وتی بەگومانی ئێوە ئێمە خەڵکانێك نەبووین. راستە تا ئەو کاتەی خواوەند بەهۆی پێغەمبەرەوە رێنوێنی کردین و دوای ریسوایی و جاهلییەت، بەئیسلام رێزی پێبەخشین. تیفلی وتی ئێوە دەتانەوێت پەیمانی ئاشتی ببەستن. من و موسوڵمانانی هاورێم ئاشتی بەناپەسەند نازانین.

عەبدولرەحمان کوڕی جەؤ ی سەلەمی بۆ لای ئێوە دەنێرم کە لەهەموومان زاناترە و شارەزای کاروباری دین و یەکێکە لەقورئان خوێنەکان، نامەی ئەمانی ئێوە بەودا دەنێرم، ئەگەر رازی بوون، پێتانی بدات و ئەگەر رازی نەبوون، بۆ جەنگی دادپەروەرانە ئاگادارتان بکاتەوە چوونکە خواوەند خیانەتکارانی خۆش ناوێت.

***

بەناوی خواوەندی بەخشندەی مێهرەبان

ئەمە پەیمان نامەی حەبیب کوڕی موسلیمەیە بۆ دانیشتووانی تفلیسی جەرزان،سەرزەمینی هورموز کەگیان و ماڵ و کەنیسە و نوێژەکانی ئێوە پارێزراو

دەبێت لەبەرابەر دانی جەزیە، لەهەر گیانداریك یەك دینار، دەبێت چاكەخواز بن و ئێمە دژی دوژمنانمان هاوكاری بكەن و موسوڵمانان بۆ شەو و رۆژێك میوانداری و رێگەیان نیشان بدەن بەجۆرێك نەبێتە هۆی زیانی بۆ هیچ كام.

ئەگەر باوەڕتان هێنا و نوێژتان خوێند و زەكاتتاندا، برای دینی و موالی ئێمەن و ئەگەر پشت بكەنە ئاینی ئیسلام، بەشێوەیەكی دادپەروەرانە لەگەڵتان دەجەنگین چوونكە خواوەند خیانەتكارانی خۆش ناوێت.

عەبدولرەحمان كوڕی خالید و حەجاج و عەیاز شایەتی ئەم پەیمان نامەن. رەباح نووسی و خواوەند و فرشتەكان و باوەڕدارانی بەشایەت وەرگرت و تەنیا شایەتی خواوەند بەسە.

لەم ساڵەدا عومەر كوڕی خەتاب، عەماری لەكارگوزاری كوفە دوور خستەوە و بەوتەیەك باوكی موسای بۆ ئەو كارە راسپارد. پێشتر ئاماژەمان بەگێڕانەوەی واقدی دا.

## لابردنی عەمار

پێشتر چەند هۆكارێكی لابردنی ئەومان باس كرد. هەنووكە درێژەی داستانەكە.

سەیف دەڵێت: خەڵكانی كوفە، عەتارد و كەسانی دیكە، سەبارەت بەعەمار نامەیان بۆ عومەر كوڕی خەتاب نووسی كەئەو ئەمیر نییە و شیاو نییە بۆ فەرمانڕەوایی. خەڵكانی كوفە سكاڵایان دژی ئەو بەرز كردەوە. عومەر نامەی بۆ عەمار نووسی و ئەو لەگڵ دەستەیەك لەخەڵكانی كوفە بەرێكەوت. كەسانێكی لەگەڵ خۆی برد كەگومانی دەكرد چاكەخوازی ئەون بەڵام بۆ دژایەتی كردنی لەهەموان سەرسەختتر لەوانە بوون كەنەهاتبوون. پێیان وت:

ئەی باوكی یەقزان، بۆ دەناڵێنیت؟

وتی: سوێند بەخوا فەرمانڕەوایەتی پەسەند ناكەم و پێی گرفتار بووم.

سەعد كوڕی مەسعودی سەقەفی مامی موختار و جەریر كوڕی عەبدوللە هاورێی عەمار بوون و سەبارەت بەو خراپەیان هێنایە سەرزمان و باسی هەندێ شتیان كرد كە سەروەری باوەڕداران پەسەندی نەكرد و ئەوی لەسەر كار لابرد و چیتر هیچ كات

بۆ هیچ کارێك راینەسپارد.

باوکی توفەیل دەڵێت: بەعەماریان وت: لەوەی لەسەر کار لابرایت، خەمبار بوویت؟

وتی: سوێند بەخوا کاتێك بۆ ئەو کارە راسپێردرام، شادمان نەبووم، بەڵام کاتێك لەسەر کار لابرام، خەمباری کردم.

شەعبی دەڵێت: عومەر بەخەڵکانی کوفەی وت: کام یەك لەو دوو مەنزڵگەیە پەسەند دەکەن؟ مەبەستی کوفە و مەداین بوو.

وتی: لەئێوە دەپرسم بەڵام دەتوانم لەروخساری ئێوە وەڵامەکەی خۆم دەستکەوێت.

جەریر وتی: ئەم مەنزڵگەیە لەهەموو شوێنێکی سواد لەدەشتەوە نزیکترە و ئەو مەنزڵگەی دیکە لێوانلێوە لەنەخۆشی و سەختی و مێشو و مێشوولە.

عەمار وتی: درۆ دەکەیت.

عومەر پێی وت: تۆ لەو درۆزنتریت.

وتی: چی دەربارەی ئەمیرەکەتان دەزانن؟

جەریر وتی: سوێند بەخوا کەسێکی شیاو نییە و ئاگاداری کاروباری سیاسی نییە.

سەعد کوڕی مەسعود وتی: سوێند بەخوا نازانێت ئەوت کردۆتە فەرمانڕەوای کوێ.

عومەر پرسی: ئەی عەمار، فەرمانڕەوایی کام ناوچەیەم بەتۆ سپاردووە؟

وتی: حیرە و سەرزەمینەکەی.

وتی: بیستوومە بازرگانەکان هاتوچۆی حیرە دەکەن.

وتی: کام ناوچەی دیکە؟

وتی: بابل و سەرزەمینەکەی.

وتی: کوێی تر؟

وتی: مەداین و دەورووبەری.

وتی: مەداینی کەسرا.

وتی: بەڵێ.

وتی: کوێی تر؟

وتی: مێهرەگانی قەزەق و سەرزەمینەکەی.

وتیان: پێمان وتی نازانێت.

عومەر کوڕی خەتاب ئەوی لەسەر کار لابرد، دواتر بانگی کرد و وتی: ئایا کاتێك تۆم لەسەر کار لابرد، خەمبار بوویت؟

وتی: سوێند بەخوا کاتێك ڕەوانەت کردم، شادمان نەبووم، بەڵام کاتێك منت لەسەر کار لابرد، خەمبار بووم.

وتی: دەمزانی ئەمە کاری تۆ نییە، بەڵام پشتم بەم ئایە بەست کەدەفەرمێت:

((ونريد ان نمن على الذين استضعفوا فى الارض و نجعلهم الوارثين.

واتاکەی: دمانویست منەت بخەینە سەر ئەو کەسانەی لەسەر زەوی زمان گیراو و هەژار بوون و بیانکەین بەمیرات هەڵگران.))

خولەید کوڕی زوفرەی نەمری لەباوکی گێڕانەوەیەکی هاوشێوە دەگێڕێتەوە بەم زیادە کەدەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب پێی وت: ئەی عەمار، لەو کاتەوەی هاتوویت، سەبارەت بەناسینی ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەوان هەڵس و کەوت دەکەیت، شانازی بەخۆتەوە دەکەیت؟ سوێند بەخوا کردەوەکانت گرفتاری ئەزمون و بەڵایەکی دژوارت دەکات. سوێند بەخوا ئەگر تەمەنت درێژ بێت، سەرخۆش دەبێت و ئەگەر سەرخۆش بیت، گرفتاری رەنج، داوای مەرگ لەخوا بکە.

دواتر رووی کرد خەڵکانی کوفە و وتی: ئەی خەڵکانی کوفە کێتان دەوێت؟

وتیان: باوکی موسا.

باوکی موسای دوای عەمار کردە سەرکردەی ئەوان. بۆ ماوەی یەکی ساڵ لەوێ بوو و کۆیلەکەی ئالفی دەفرۆشت. وەلید کوڕی عەبدشەمس بیستبووی کەدەیوت: سوێند بەخوا هاودەمی هەر خەڵکێك بووم، ریزم لێگرتن، سوێند بەخوا ئەو رۆژە بۆیە شایەتی شایەتەکانی بەسرەم بەدرۆ نەخستەوە، چوونکە هاودەمی خەڵکانی بەسرە بووم، ئەگەر هاودەمی ئێوەیش بم، چاکەتان لەگەڵ دەکەم.

وەلید وتی: تۆ زەوییەکانی ئێمەت لەناو برد و نابێت کارگوزاری ئێمە بیت.

دواتر لەگەڵ چەند کەسێك بەرێکەوت و ڕۆشتنە لای عومەر کوڕی خەتاب، وتیان:

ئێمە باوکی موسامان ناوێت.

وتی: بۆ؟

وتی: کۆیلەیەکی هەیە لەگەڵ خەڵکەکەی ئێمە مامڵە و بازرگانی دەکات.

عومەر ئەوی لابرد و کارگوزاری بەسرەی پێسپارد و عەمرۆ کوڕی سوراقەی وەك کارگوزاری جەزیرە دانا.

عومەر بەوکەسانەی بۆ لابردنی باوکی موسا هاتبوونە مەدینە، وتی: ئایا کەسێکی سەختگیرتان دەوێت یا باوەڕدارێکی لاواز؟

و لەبەر ئەوەی وەڵامێکی دڵخۆشکەریان نەدایەوە، لێیان دوور کەوتەوە و لەسوچێکی مزگەوتەکەدا خەوت.

موغەیرە کوڕی شوعبە هات و دانیشت تا لەخەو هەستا، پێی وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، پێشهاتێك روویداوە، ئایا پێشهاتێکی خراپ بووە؟

وتی: چ پێشهاتێك خراپتر لەوەی سەد هەزار کەس لەسەرکردەیەك رازی نین و سەرکردەیەك لەوان رازی نییە. لەمبارەوە زۆری قسە کرد. بۆیە وشەی سەد هەزاری دەهێنایە سەرزمان چوونکە کاتێك نەخشەی شاری کوفەیان دەکێشا، بۆ نیشتەجێ بوونی سەد هەزار جەنگاوەر، پلانیان داڕشتبوو.

هاوەڵانی عومەر هاتن و وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، گرفتاری تۆ چییە.

وتی: گرفتاری! خەڵکانی کوفە گرفتاریم بۆ دروست دەکەن.

دواتر راوێژ کردن لەگەڵ خەڵکانی کوفەی بۆ باس کردن، موغەیرە وەڵامی دایەوە: باوەڕداری لاواز، لاوازی ئەو دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بەتۆ و موسوڵمانان و باوەڕداری تایبەت دەبێت بەخۆی، بەڵام بەهێزی سەختگیر، هێزی ئەو لەبەرژەوەندی تۆ و موسوڵماناندایە و سەختگیرییەکەی لەزیان و قازانجی خۆیەتی.

عومەر کوڕی خەتاب ئەوی وەك کارگوزاری کوفە دەستنیشان کرد.

سەعید کوڕی عەمرۆ دەڵێت: عومەر پێش ئەوەی موغەیرە بکاتە کارگوزاری کوفە، وتی: سەبارەت بەسپاردنی ئەم کارە بەپیاوێکی باوەڕداری لاواز یا بەهێزێکی سەختگیر، بۆچوونی ئێوە چییە؟

موغەیرە وتی: باوەڕداری لاواز، باوەڕەکەی تایبەتە بەخۆی و لاوازییەکەی لەزیانی تۆدایە، بەڵام بەهێزی سەختگیر، سەختگیرییەکەی تایبەتە بەخۆی و

هێزەکەی لەبەرژەوەندی تۆ و موسوڵماناندایە.

عومەر وتی: ئەی موغەیرە تۆ دەنێرم.

موغەیرە کارگوزاری کوفە بوو تا عومەر کوڕی خەتاب کوژرا. ئەم ماوەیە دوو ساڵ و کەمێك زیاتر بوو. کاتێك موغەیرە بۆ ڕۆشتن بۆ کوفە ماڵئاوایی لەعومەر کوڕی خەتاب کرد، پێی وت: ئەی موغەیرە، دەبێت چاکەکاران لەتۆ لەئەماندابن و خراپەکاران هەمیشە بترسن.

عومەر کوڕی خەتاب دەیویست، سەعد بۆ ئەو کارە ڕاسپێرێت بەڵام پێش ئەوەی ڕەوانەی بکات، کوژرا و پێشنیاری ئەوی کرد.

شێوازی عومەر بەو شێوە بوو کارگوزارانی خۆی ناچار دەکرد بەشداری لە ڕێ و ڕەسمەکانی حەجدا بکەن تا لەژێردەستەکان دوور بکەونەوە و ئەو کەسانەی سکالآیان هەبوو دەرفەتی ئەوەیان دەست بکەوێت، سکالآکانی خۆیان بەدەستی سەروەری باوەڕداران بگەیێنن.

لەم ساڵەدا بەوتەی دەستەیەك ئەحنەف کوڕی قەیس بۆ جەنگی خوراسان ڕۆشت و لەگەڵ یەزدگێرد شەڕی کرد، بەڵام بەپێی گێڕانەوەی سەیف ڕۆشتنی ئەحنەف بۆ خوراسان لەساڵی هەژدەیەمی کۆچ بوو.

## ڕۆشتنی یەزدگێرد بۆ خوراسان و هۆکارەکەی

مێژوو نووسان لەمبارەوە بۆچوونیان جیاوازە. گێڕانەوەی سەیف بەمشێوەیە: کاتێك خەڵکانی جەلەولا شکستیان خوارد، یەزدگێرد کوڕی شەهریار کوڕی خوسرەو کە لەو کاتەدا پاشای فارسەکان بوو، بەرەو ڕەی بەڕێکەوت. تەختێکیان لەسەر وشترێك بۆ دانابوو کەتیایدا دەخەوت، لەگەڵ خەڵکان نەدەخەوت. لەکاتی ڕۆشتن گەیشتنە ڕێڕەوێك، ئەو لەناو تەختەکەی خەوتبوو. بێداریان کردەوە بۆ ئەوەی لەکاتی ڕۆشتنی وشترەکە لەرێڕەوەکە هەڵنەستێت و نەترسێت.

بەڵام بەشێوەیەکی توندوتیژ قسەی لەگەڵ کردن و وتی: کارێکی خراپەتان کرد، سوێند بەخوا ئەگەر دەتانهێشت، کاتی مانەوەی ئەم خەڵکەم دەزانی، خەوم بینی من و محەممەد لای خواوەند قسەمان دەکرد خواوەند پێی فەرموو: بۆ ماوەی یەکسەد

ساڵ پاشایەتییان پێ دەبەخشم.

وتی: زیادیکە؟

فەرمووی: سەد و دە ساڵ.

وتی: زیادی کە.

فەرمووی: سەد و بیست ساڵ.

وتی: زیادیکە.

فەرمووی: هەرچەند تۆ بخوازیت.

لەم کاتەدا لەخەو هەڵتانساندم، ئەگەر دەتانهێشت، دەمزانی ماوەی مانەوەی ئەم خەڵکە چەندەیە.

دەڵێت: کاتێك گەیشتە رەی، ئەبان جازویە سەرکردەی ئەو ناوچەیە هێرشی کردە سەر یەزدگێرد و ئەوی گرت.

یەزدگێرد وتی: ئەبان جازویە، خیانەت لەمن دەکەیت؟

وتی: نە، بەڵام تۆ پاشایەتی خۆت بەجێهێشت و کەوتە دەست کەسێکی دیکە، دەمەوێت سەبارەت بەوەی لەدەستی مندایە و مەبەستەکانی دیکە، پەیمان وەربگرم.

ئەنگوستیلەکەی یەزدگێردی وەرگرت و چەرمەکانی هێنا و سەبارەت بەهەرچی دەیخواست، تۆماری نووسی و بەئەنگوستیلەکە واژۆی کرد و تەسلیمی یەزدگێردی کردەوە.

دواتر کاتێك سەعد هات، ئەوەی لەناوتۆمارەکاندا نووسیبووی، بەخۆی بەخشی.

کاتێك ئەبان جازویە بەو شێوەیە لەگەڵ یەزدگێرد جووڵایەوە، یەزدگێرد لەرەی بەرەو ئیسفەهان بەرێکەوت چوونکە ئەوی خۆش نەدەویست و لەدەستی ئەو هەڵات. دواتر بەرەو کرمان بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە ئەو شارە، ئاگری پێبوو، ویستی لەکرمان بەجێبیهێڵێت، دواتر مەبەستی خوراسانی کرد و گەیشتە مەرو و لەوێ دابەزی. ئاگرەکەی لەگەڵ خۆی بردبوو، لەدوو فەرسەخی مەرو خانوویەکی بۆ دروست کرد و بینایەکی بەرز کردەوە. لەدووو فەرسەخی مەرو دەژیا و ترسی گرتن و کوشتنی نەمابوو.

دەڵێت: دواتر لەمەروەوە بۆ ناوچەکانی دیکە کەهێشتا دەستی موسوڵمانانی پێنەگەیشتبوو، نامەی نووسی، هەمووان ملکەچی خۆیان نیشاندا و خەڵکانی

هەمەدان و فارسی هاندا کەپەیمانیان شکاند، خەڵکانی کوێستانەکان و فیروزانی هاندا و ئەوانیش پەیمانیان شکاند و ئەمە بووە هۆی ئەوەی سەروەری باوەڕداران مۆڵەتی پێشڕەوی بەموسوڵمانان بدات و خەڵکانی کوفە و بەسرە بەرێکەوتن و خوێنیان ڕشت.

ئەحنەف رووی کردە خوراسان و دەستی بەسەر مێهرەگانی قەزەقدا گرت. دواتر رووی کردە ئیسفەهان و خەڵکانی کوفە گەمارۆیان خستبووە سەرجی، دواتر لەرێگەی دوو تیبسەوە ڕۆشتە ناو سەرزەمینی خوراسان و بەجەنگ دەستی بەسەر هەراتدا گرت و سەحار کوڕی فلانی عەبدی لەوێ دانا. دواتر رووی کردە مەروی شاهجەهان و موتەریف کوڕی عەبدوللەی شەخەیری بۆ نەیشابوور نارد و لەوێ، جەنگ روویدا. هەروەها حارس کوڕی حەسانی بۆ سەرخس نارد.

دەڵێت: کاتێك ئەحنەف لەمەروی شاهجەهان نزیك بوویەوە، یەزدگێرد بەرەو مەروروود بەرێکەوت و لەوێ دابەزی. ئەحنەف لەمەروی شاهجەهان جێگیر بوو.

یەزدگێرد لەمەروروودەوە نامەی بۆ خاقان نووسی و داوای هاوکاری کرد. هەروەها نامەی بۆ شای سەغد نووسی و داوای هاوکاری کرد. نێردراوەکانی ئەو روویان کردە سەرزەمینی خاقان و شای سەغد، نامەیەکی هاوشێوەی بۆ پاشای چین نووسی و داوای هاوکاری کرد.

هێزی پشتیوانی خەڵکانی کوفە بەسەرکردایەتی چوار کەس گەیشتنە لای ئەحنەف: عەلقەمە کوڕی نەزری نەزەری و ڕێبعی کوڕی عامری تەمیمی و عەبدوللە کوڕی عەقیلی سەقەفی و کوڕی دایکی غەزالی هەمەدانی. کاتێك هێزی پشتیوان گەیشت، ئەحنەف لەمەروی شاهجەهان بەمەبەستی مەروروود ملی ڕێگەی گرتەبەر. حارسە کوڕی نەعمانی باهلی لەو مەروی شاهجەهان دانا.

خەڵکانی کوفە روویان کردە بەلخ و ئەحنەف بەدوایاندا بەرێکەوت. لەبەلخ لەنێوان خەڵکانی کوفە و یەزدگێرد جەنگ روویدا و خواوەند سوپاکەی یەزدگێردی شکستدا و لەگەڵ فارسە هەڵاتووەکان روویان کردە رووبارە و پەڕینەوە.

کاتێك ئەحنەف پەیوەستی خەڵکانی کوفە بوو کەخوا سەرکەوتنی پێبەخشیبوون. لەبەر ئەمە بەلخ لەو شارانەیە بەدەستی خەڵکانی کوفە گیرا. دواتر

ئەو خەڵکانەی لەخوراسان بەجێ مابوون یا خۆیان حەشاردابوو، لەنەیشابوورەوە تا خوراسان کەلەناو سنووری دەسەڵاتی کەسرادابوو، بەردەوام بۆ بەستنی پەیمانی ئاشتی دەهاتن.

ئەحنەف بۆ مەرو روود گەڕایەوە و لەوێ دابەزی. ڕێبعی کوڕی عامر کەدایکی لەگەورەکانی عەرەب بوو، لەتەخارستان بەجێهێشت.

ئەحنەف هەواڵی سەرکەوتنەکانی خوراسانی بۆ عومەر نووسی کەوتی: چەندە خۆش دەبوو ئەگەر لەنێوان ئێمە و ئەوان دەریایەك لەئاگر دەبوو.

عەلی هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆ؟

وتی: بۆ ئەوەی خەڵکەکەی سێ جار لەوێ بڵاوەی لێبکەن و جاری سێیەم لەناو بچن. حەز دەکەم ئەم بەڵایە بەسەر ئەواندا بێت، نەك موسوڵمانان.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەڵێت: کاتێك هەواڵی سەرکەوتنی موسوڵمانان لەخوراسان بە سەروەری باوەڕداران گەیشت، وتی: حەز دەکەم لەنێوان ئێمە و ئەوان دەریایەك لەئاگر دەبوو.

وتم: بۆ لەسەرکەوتنی ئەوان خەمباریت چوونکە ئێستا کاتی شادمانییە؟

وتی: بەڵێ، بەڵام، ئاماژەی بەدرێژەی گێڕانەوەکەی دیکەدا.

یەکێك لەمناڵەکانی بەکر کوڕی وائیل بەناوی وازع دەڵێت: کاتێك عومەر لەزاڵبوونی ئەحنەف بەسەر مەروی شاهجەهان و مەرو روود ئاگادار بوویەوە، وتی: بەڵێ، ئەو ئەحنەفە و سەرورەی خەڵکانی رۆژهەڵات و بەههەڵە ناویان ناوە ئەحنەف (ئەحنەف بەمانای کەسێکی نەرم و نیانە.)

سەروەری باوەڕداران نامەی بۆ ئەحنەف نووسی: لەرووبارە تێمەپەڕە و بەم لا بەسەندە بکە، دەزانن چ شتێك بووە هۆی ئەوەی بەسەر خوراساندا زاڵ بن؟ پشتی تێمەکەن تا سەرکەوتنەکانتان بەردەوام بێت، لەرووبار نەپەڕنەوە چوونکە بڵاو دەبنەوە.

دەڵێت: کاتێك نێردراوەکانی یەزدگێرد گەشتنە لای خاقان و غوزەك، هۆکارەکانی هاوکاری ئامادە نەکرا تا ئەوەی هەڵاتوو لەرووبار تێپەڕی و ڕۆشتە لای ئەوان. خاقان هاوکاری کرد چوونکە پاشاکان هاوکاری کردنی پاشاکان بەئەرکی سەرشانی خۆیان دەزانن. خاقان لەگەڵ سوپای تورکەکان بەرێکەوت و خەڵکانی فەرغانە و

سەعدی کۆکردەوە و لەگەڵ ئەوان هات. یەزدگێردیش بەرێکەوت و مەبەستی گەڕانەوە بۆ خوراسانی کرد. بەرەو لای بەلّخ بەرێکەوت و خاقان هاورێیەتی دەکرد. خەڵکانی کوفە لەمەرو روود ڕۆشتنە لای ئەحنەف و ناباوەڕان لەبەلّخەوە بەرێکەوتن و لەمەرو روود لەبەرابەر ئەحنەف ئوردوویان لێدا.

کاتێك ئەحنەف ئاگادار بوویەوە کەخاقان و خەڵکانی سەغد بەمەبەستی جەنگان لەگەڵ ئەو لەشاری بەلّخ گوزەریان کردووە، شەوانە لەناو ئوردووگاکەی خۆی دەسوڕایەوە بۆ ئەوەی هەواڵێکی دەستکەوێت تا سوودی لێ وەربگرێت. لای دوو پیاو تێپەڕی کەباوەشێك گیایان بژار دەکرد، کا و جۆیان لەیەك جیا دەکردەوە، یەکیان بەوەی دیکەی وت: ئەگەر ئەمیر، ئێمە بباتە بن ئەم کێوە کەرووبار لەنێوان ئێمە و دوژمن هاوشێوەی خەندەك بێت و کێوەکە لەپشت سەرمان وکەس نەتوانێت لەپشتەوە هێرشمان بکاتەسەر، لەیەك قۆڵەوە دەجەنگین و هیوادارم خواوەند سەرکەوتنمان پێ ببەخشێت.

ئەحنەف گەڕایەوە، بۆچوونێکی پەسەند بوو. شەوێکی تاریك بوو کاتێك بەیانی داهات، سوپاکەی کۆکردەوە و وتی: ئێوە ژمارەتان کەمە و دوژمنان فراوان، مەترسن چوونکە زۆر جار دەستەیەکی کەم بەفەرمانی خواوەند بەسەر ژمارەیەکی زۆردا سەرکەوتوون. خواوەند پشتیوانی خۆڕاگرانە. لێرە بڕۆن و پشت بەو کێوە ببەستن با کێوەکە لەپشت سەرتان بێت و رووبار لەنێوان ئێوە و دوژمن جیایی دروست بکات. بەمشێوەیە لەیەك قۆڵەوە لەگەڵیان دەجەنگن.

ئەو کارەیان کرد و کەرەستەکانی ڕۆشتن ئامادە کرا. ئەحنەف دوانزە هەزار کەس لەخەڵکانی بەسرەی لەگەڵدا بوو، بەم ژمارەیە لەخەڵکانی کوفەیش هاورێیەتیان دەکرد.

ناباوەڕان و هاورێکانیان هاتن و لەبەرابەر موسوڵمانان ئوردوویان لێدا. ماوەیەك بەیانییان و ئێوارن هێرشیان دەهێنا و شەوانە دەگەڕانەوە. ئەحنەف مەبەستی ئەوەی کرد شوێنەکەی ئەوان بزانێت و دوای ناسینی شوێنەکە، شەوێك لەجیاتی پێشەنگی سوپاکەی خۆی تا نزیك ئوردووگاکەی خاقان پێشڕەوی کرد و لەوێ مایەوە، کاتێ بەیانی داهات، سوارەیەك لەسوپای خاقان هات و تەپڵی لێدا. دواتر

لەشوێنێکی بەرز وەستا، ئەحنەف پەلاماریدا و ئەو پیاوەی کوشت.

ئەحنەف لەشوێنی تورکەکە وەستا، تەوقەکەی ئەوی هەڵگرت. دوای ئەوە یەکێکی دیکە لەتورکەکان هات و هاوشێوەی تورکی یەکەم تەپڵی لێدا و لای ئەحنەف وەستا. ئەحنەف هێرشی کردە سەر و ئەویشی کوشت.

ئەحنەف لەشوێنی تورکی دووەم وەستا و تەوقەکەی ئەوی هەڵگرت. تورکی سێیەم هات و هاوشێوەی دوو تورکەکەی دیکەی کرد. دوورتر لەشوێنی تورکی دووەم وەستا. ئەحنەف هێرشی کردەسەر و ئەویشی کوشت.

دواتر گەڕایەوە بۆ ناو سوپای موسوڵمانان و کەس ئاگادار نەبوویەوە. ئەحنەف خۆی بۆجەنگ ئامادە کرد.

نەریتی تورکەکان بەوشێوە بوو هێرشیان نەدەبرد تا ئەو کاتەی سێ لەسوارەکانی تورك بێنە ناو گۆڕەپانی جەنگ و تەپڵ لێبدەن، دوای ئەوەی سێیەم کەس دەهات، هێرشیان دەبرد.

لەو شەودا تورکەکان دوای هاتنی سوارەی سێیەم هێرشیان برد و سوارە کوژراوەکانی خۆیانیان بینی. خاقان بەشێوەیەکی خراپ لێکدانەوەی بۆ کوژرانی ئەوان کرد و وتی: ماوەیەکی زۆر لێر ماینەوە و ئەم کەسانە لەشوێنێك کوژران کەکەسی تیا نەکوژراوە، ئێمە لەشەڕی ئەم خەڵکە هیچمان دەست ناکەوێت، دەبێت بگەڕێینەوە. خەڵکانی تورك گەڕانەوە. کاتێك رۆژ بوویەوە، موسوڵمانان بینیان ئوردووگای تورکەکان چۆڵە و ئاگادار بوونەوە خاقان رووی لەبەڵخ کردووە.

یەزدگێرد کوڕی شەهریار کوڕی خوسرەو، خاقانی لەمەرو رووود بەجێهێشت و رووی کردە مەروی شاهجەهان و حارسە کوڕی نەعمان لەگەڵ هاوەڵانی خۆیان سەنگەریان گرت و یەزدگێرد گەمارۆی خستنەسەر و گەنجینەکانی خۆی هێنایەدەر. لەم کاتەدا خاقان لەبەڵخ بوو.

موسوڵمانان بەئەحنەفیان وتی: بۆچوونت چییە سەبارەت بەوەی شوێن تورکەکان بکەوین؟

وتی: لەشوێنی خۆتان بمێننەوە وکارتان پێیان نەبێت.

کاتێك یەزدگێرد ئەوەی لەمەرو شاردبوویەوە، دەریهێنا، بەخێرایی بەرێکەوت چوونکە دەویست لەگەڵ خۆی بیبات کەبەشێکی گرنگ لەگەنجینەی پارسەکان بوو.

دەیویست پەیوەستی خاقان بێت.

فارسەکان پێیان وت: چی دەکەیت؟

وتی: دەمەوێت پەیوەستی خاقان بم و لەگەڵی بمێنمەوە تا دەڕۆمە چین.

وتیان: ئارام بە، ئەم کارە قێزەونە بڕۆیتە وڵاتێکی دیکە و خەڵکەکەی خۆت بەجێبێڵیت، ئێمە بۆ لای عەرەبەکان ببە تا پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ ببەستین چوونکە خەڵکانێکی دیندار و ئەمەکدار بۆ پەیمانن و بەسەر وڵاتەکەی ئێمەدا زاڵبوون، دوژمنێك کە لەوڵاتەکەمان بەسەرماندا زاڵبووە باشترە لەو دوژمنەی لەوڵاتەکەی خۆی بەسەر ئێمەدا زاڵ ببێت چوونکە دینی نییە و لەپەیمانەکەی دڵنیا نین.

بەڵام یەزدگێرد رازی نەبوو و ئەوانەی نارازی بوون، وتیان: گەنجینەکان دابنێ چوونکە دەگەڕێنینەوە بۆ دیاری خۆمان تا ئەو کەسانەی بەسەر ئێمەدا زاڵن، لەدیاری ئێمە بۆ دیاری بێگانەی نەبەن.

بەڵام یەزدگێرد رازی نەبوو.

وتیان: رێگەت پێنادەین، بیبەیت.

ئەوان خۆیان لێ بەدوور گرت و شەڕی یەکیان کرد. یەزدگێرد شکستی خوارد و دەستیان بەسەر گەنجینەکاندا گرت و پاشایان بەجێهێشت. ئەم هەواڵەیان بۆ ئەحنەف نووسی کەموسوڵمانان و ناباوەڕان لەمەرو رێگەیان لێگرتووە و لەگەڵی جەنگاون و گەشتوونەتە پاشماوەی هەڵاتووان و دەستیان بەسەر بارەکانی پاشادا گرتووە. پاشا بۆ رزگاری کردنی خۆی لەڕووبار پەڕیوەتەوە و رووی کردۆتە دیاری فەرغانە و تورکەکان. هەمووی ئەم پێشهاتانە لەرۆژگاری عومەر کوڕی خەتاب روویدا و لەگەڵ دەستەیەك لەفارسەکان نامەیان دەگۆڕییەوە.

لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان خەڵکانی خوراسان ناباوەڕ بوون و فارسەکان ڕۆشتنە لای ئەحنەف و پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ بەست و گەنجینەکان و سامانی یەزدگێردیان بەو سپارد و گەڕانەوە بۆ ماڵ و سەرزەمینی خۆیان. باشتر لەوەی لەرۆژگاری خوسرەوەکاندا بوون وەك بڵێی لەبنەڕەتەوە سنووری پاشایەتی ئەوان بووە بەم جیاوازییە کە موسوڵمانان بۆ پەیمانەکانیان ئەمەکدار و دادپەروەرتر بوون

و ئەمە دەبووە هۆی ڕەزامەندی ئەوان.

لەجەنگەکانی خوراسان، سوار هاوشێوەی جەنگی قادسیە، بەشی وەرگرت.

لەرۆژگاری عوسمان کەخەڵکانی خوراسان ئالای شۆڕشیان بەرز کردەوە، یەزدگێرد هاتە مەرو و کاتێك لەنێوان خۆی و هاوەڵانی لەگەڵ خوراسان کێشە دروست بوو، پەنای بۆ ئاشێك برد و کاتێك لەسووچێکی ئاشە سەرقاڵی خواردن بوو، هێرشیان کردەسەر و خوێنیان ڕۆشت و پەیکەرەکەیان فرێدایە ناو ڕووبار.

کاتێك یەزدگێرد لەئاشەکەی مەرو کوژرا کەلەوێ خۆی شاردبوویەوە و دەیویست بەرەو کرمان بڕوات، موسوڵمانان و ناباوەڕان سامانەکەی ئەویان تالان کرد و کاتێك ئەحنەف ئاگادار بوویەوە، بێ وەستان لەگەڵ موسوڵمانان و ناباوەڕانی فارس بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خاقان و شوێنکەوتنی هەڵاتووان و کەسانی نزیکی یەزدگێرد ڕێگەی بەڵخی گرتەبەر چوونکە خاقان لەگەڵ تورکەکان لەبەڵخ بوو و کاتێك لەکوژرانی یەزدگێرد ئاگادار بوویەوە، زانی موسوڵمانان و ئەحنەف لەمەڕووڕوودەوە مەبەستی هێرش کردنە سەر بەڵخیان کردووە، بەڵخی بەجێهێشت و لەڕووبار پەڕییەوە.

ئەحنەف تا بەڵخ پێشڕەوی کرد و خەڵکای کوفە لەچوار ویلایەتی بەڵخ نیشتەجێ بوون. دوای ئەوە ئەحنەف بۆ مەرو ڕوود گەڕایەوە و لەوێ جێگیر بوو. هەواڵی سەرکەوتن بەسەر خاقان و یەزدگێردی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و پێنج یەکی بۆ ڕەوانە کرد.

دەڵێت: کاتێك خاقان لەڕووبار پەڕییەوە، کەسانی نزیکی خوسرەو کە لەبەڵخ کۆببوونەوە، لەگەڵ ئەو بەرێکەوتن و چاویان بەنێردراوەکەی یەزدگێرد بۆ چین کەوت کەوەڵامی پاشای چینی بەنامەیەك بۆ یەزدگێرد هێنابوویەوە. لێیان پرسی: دەنگ و باس چییە.؟

وتی: کاتێك دیاری و نامەکەم بردە لای، ئەم شتانەی دەیبینن بەئێمەدا. دیارییەکانی پاشای چینی نیشاندان. وتی: ئەم نامەی لەوەڵامی یەزدگێرد نووسی و بەمنی وت: دەزانم دەبێت پاشاکان، دژی دوژمنان هاوکاری پاشاکان بکەن. تایبەمەندییەکانی ئەو خەڵکەی ئێوەیان لەوڵاتەکەتان دەرپەڕاندووە، باس بکە چوونکە بیستم باسی کەمی ژمارەی ئەوان و فراوانی هێزی خۆتان دەکەیت.

زاڵبوونی ئەم دەستە کەمە بەسەر سوپا گەورەکەی ئێوە بەهۆی تایبەتمەندییە چاکەکانی ئەوان و تایبەتمەندییە خراپەکانی ئێوەیە.

وتم: هەرچی دەخوازی بپرسە؟

وتی: ئایا ڕێز لەپەیمانەکەیان دەگرن.

وتم: بەڵێ.

وتی: پێش ئەوەی جەنگ دەسپێبکەن، چیتان پێ دەڵێن؟

وتم: پێشنیاری یەکێك لەم سێ کارەمان پێدەکەن، یا بەدینەکەیان رازی ببین کەدەبینە کەسێك لەخۆیان، یا جەزیە بدەین و پارێزگاریمان لێدەکەن یا جەنگ.؟

وتی: گوێڕایەڵی ئەوان بۆ سەرکردەکەیان چۆنە؟

وتم: لەهەموو خەڵکان بۆ سەرکردەکەی خۆیان ملکەچترن.

وتی: چ شتێك بەحەلاڵ و چ شتێك بەحەرام دەزانن؟

بۆم باس کرد.

پرسی: ئایا ئەو شتەی بۆ ئەوان حەلاڵ کراوە، حەرامی دەکەن، یا ئەوەی بۆ ئەوان حەرام کراوە، حەلاڵی دەکەن؟

وتم: نە.؟

وتی: ئەم نەتەوە لەناو ناچن تا ئەو کاتەی حەلاڵەکانیان حەرام و حەرامەکانیان حەلاڵ بکەن.

دواتر وتی: جل و بەرگیان چۆنە؟

بۆم باس کرد.

سەبارەت بەچوارپێکانیان پرسیاری کرد.

وتم: ئەسپی عەرەبی و تایبەتمەندییەکانیم باس کرد.

وتی: پشتوانێکی بەهێزە.

دواتر تایبەتمەندییەکانی وشترم بۆ باس کرد.

وتی: ئەمە تایبەتمەندی چوارپێ گەردن درێژەکانە.

دواتر نامەی بۆ یەزدگێرد نووسی: ئەگەر سوپایەك بۆ تۆ نانێرم کەسەرەتاکەی لەمەرو روود و کۆتاییەکەی لەچین بێت لەبەر ئەوە نییە لەئەرەکەکەی خۆم بێ ئاگام،

بەلأم ئەو خەڵکەی نێردراوەکەی تۆ تایبەتمەندییەکانی ئەوانی بۆ باس کردم، تا ئەو کاتەی بەمشێوە بن، ئەگەر مەبەستی لەناو بردنی کێو بکەن، لەناوی دەبەن و ئەگەر کۆببنـەوە دەتـوانن شکـستیش بـەمن بێـنن، پـەیمانی ئاشـتییان لەگـەڵ ببەسـتە و شادمان بە لەوەی پێکەوە لەیەك سەرزەمیندا بژین و تا ئەو کاتەی بۆجەنگ ناچاریان نەکردوویت، ناچاریان مەکە.

کاتێك یەزدگێرد و بنەماڵەی خوسرەو، لەفەرغانە نیشتەجێ بوون، لەگەڵ خاقان پەیمانیان بوو.

کاتێـك هـەواڵی سـەرکەوتن و نێردراوەکـان و تالأنییـەکان لەلایـەن ئەحنەفـەوە گەیشتە مەدینە، سەروەری باوەڕداران خەڵکانی کۆکردەوە و قسەی لەگەڵ کردن و فەرمانیدا نامەی سەرکەوتنیان بۆ بخوێننەوە. لەناو وتەکانی خۆی وتی:

خواوەنـد بـەڵێنی بەپێغەمبەرەکـەی دا کەشـوێنکەوتەی ئـەو پاداشـتی نزیـك و دووری دەستدەکەوێت کەچاکی دنیا و ئەو دنیایە و فـەرمووی: هو الـذی ارسـل رسـوله بالهدی و دین الحق لیظهره علة الدین کله و لوکره المشرکون.

واتاکـەی: ئـەوە کەپێغەمبەرەکـەی خـۆی بـەدینێکی راسـت و رێنیشاندراو ڕەوانـە کـردووە تـا بەسـەر هـەموو دینـەکانی دیکـە سـەرکەوتنی پێببەخـشێت هەرچـەندە ناباوەڕان بێزاری خۆیان دەرببڕن))

سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەڵێنەکانی خۆی هێنایەدی و هاوکاری سوپاکەی خۆی کـرد. بـزانن خـوا پاشـایەتی زەردەشـتییەکانی لـەناو بـرد و بـڵاوەی بەدەسـتە و کۆبوونەوەکانیان کرد و لەسەرزەمینی خۆیـان تەنانـەت یـەك وەجەبیان لـەژێر دەسـتا نییە کەببێتە هۆی زیان گەیاندن بە موسوڵمانان. بزانن خواوەند سەرزەمین و ماڵ و منداڵەکانی ئـەوانی بەئێوەدا تـا بزانێـت چـۆن کردەوەکانتـان ئـەنجام دەدەن، لـەدیاری خۆیـان دوور کەوتوونەتـەوە و کوفـە و بەسـرە بەرادەیـەك لەپادگانەکانیانـەوە دوورن کەپێشتر ئێوە لەکوفە و بەسرە دوور بوون، خواوەند بەڵێنەکانی خۆی دەهێنێتەدی و کۆتایی کار هاوشێوەی سـەرەتای کارەکە دەبێت، بـۆ کـاری خواوەنـد و فەرمانـەکانی ئامادە بن تا بەڵێنەکانی خۆی بباتەسەر، گۆڕانکاری لەدینی خواوەند دروست مەکەن تا خواوەند جێگەی ئێوە بەکەسانی دیکە پڕنەکاتەوە چوونکە دەترسم ئەگەر زیانێك

بەم ئۆمەتە بگات، لەلایەن ئێوەوە بێت.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: دوای ئەوە خەڵکانی دوور و نزیکی خوراسان لەرۆژگاری عوسمان کوڕی عەفان و دوو ساڵ دوای خەلافەتی ئەو، ناباوەڕ بوون. هەواڵی پەیمان شکێنی ئەوان بەتەواوی لەگەڵ چۆنیەتی کوژرانی یەزدگێرد لەجێگەی خۆیدا باس دەکەین، بەخواستی خوا.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ خەڵکان حەجی کرد.

کارگوزارانی ویلایەتەکان هەمان کەسانی ساڵی پێشوو بوون جگە لەکوفە و بەسرە کەکارگوزاری کوفە و سەرکردەی جەنگ، موغەیرە کوڕی شوعبە و کارگوزاری بەسرە باوکی موسای ئەشعەری بوو.

سالی بیست و سێ دەستی پێکرد.

بەوتەی باوکی مەعشەر لەم ساڵەدا ئیستەخر دەستی بەسەردا گیرا. لەگێڕانەوەی ئیسحاق کوڕی عیسا ئاماژەی پێدراوە کەباوکی مەعشەر دەڵێت: یەکەم گرتنی ئیستەخر و هەمەدان لەساڵی بیست و سێیەم روویدا، واقدیش بەمشێوەیە دەڵێت بەلاّم سەیف دەڵێت گرتنی ئیستەخر دوای دووایین گرتنی توج بوو.

## گرتنی توج

عەمرۆ دەڵێت: ئەوکەسانەی لەبەسرەوە بۆ فارس ڕەوانە کران، بوونە ئەمیرەکانی فارس، ساریە کوڕی زەنیم و کەسانی دیکە لێپرسراوی پشتەوەی فارس بوون، لەگەڵ ئەوان بەرێکەوتن.

دەڵێت: خەڵکانی فارس لەتوج کۆببوونەوە. بەلاّم عەرەبەکان رووبەرووی دەستەکانی ئەوان نەبوونەوە و هەرکام لەئەمیرەکان مەبەستی هێرش کردنە سەر ویلایەتێکی کرد و رووی کردە ئەو ویلایەتەی بۆ گرتنی راسپێردرا بوو.

کاتێك فارسەکان ئاگادار بوونەوە عەرەبەکان بلاّو بوونەتەوە و روویان کردۆتە ویلایەتەکانی خۆیان تا بەرگری لەو ناوچانە بکەن و هۆکاری شکست و بەربلاّوی کارەکانیان و بلاّو بوونەوەی دەستەکەیان ئەمە بوو. فارسەکان بەشێوەیەکی خراپ لێکدانەوەیان بۆ ئەمە کرد، وەك بڵێی چارەنووسی خۆیان دەبینی. یەکێك لەوان موجاشیع کوڕی مەسعودی سولەمی لەگەڵ موسوڵمانانی هاوڕێی خۆی بەمەبەستی گرتنی شاپوور و ئەردەشێر خەرە بەرێکەوتن و لەتوج رووبەرووی فارسەکان بوونەوە و تا ئەو کاتەی خواوەند دەیخواست، جەنگان. خواوەند شکستی بەخەڵکانی توج هێنا و موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و بەدڵخوازی خۆیان لەفارسەکانیان دەکوشت و تالاّنییەکان کۆکردەوە و دەستیان بەسەر ئوردووگاکەیاندا گرت. ئەمە دووەم جەنگی توج و دوای ئەو فارسەکان لەو ناوچەیە هیچکات سەریان بەرز نەکردەوە. یەکەم گرتنی توج لەرۆژگاری تاووس و دوای جەنگێکی دژوار و لەو کاتەدا سوپاکەی عەلا کوڕی حەزرەمی لەفەوتان رزگاری بوو. دەرئەنجامەکانی جەنگی یەکەم و دووەم هاوشێوەی یەك بوو.

کاتێک توج دەستی بەسەردا گیرا، پێشنیاری دانی جەزیەیان بەخەڵکەکەیدا و پێی رازی بوون. موجاشیع تالاَنییەکان دابەش و پێنج یەکی بۆ مەدینە نارد.
مژدەبەران و نێردراوان خەلاَتییان وەردەگرت و پێداویستییەکانیان دابین دەکرا. ئەم نەریتە لەپێغەمبەرەوە بۆ موسوڵمانان مابوویەوە.
عاسم کوڕی کەلیب، لەباوکی دەگێڕێتەوە: لەگەڵ موجاشیع کوڕی مەسعود بۆ جەنگی توج ڕۆشتین و گەمارۆمان خستە سەر خەڵکەکەی و تا ئەو کاتەی خواوەند مەبەستی کرد، جەنگایین. کاتێک دەستمان بەسەر ئەو ناوچەدا گرت و تالاَنی زۆرمان دەستکەوت و خەڵکانێکی زۆرمان کوشت، کراسەکەی من درا. دەرزی و دەزووم هەڵگرت و کراسەکەم دوورییەوە. کراسی یەکێک لەکوژراوەکانم بینی، لەبەری دامکەندو بردم شۆردم، دواتر دەمکێشا بەبەردێکا تا پیسی و ناپاکی پێوە نەماو لەبەرم کرد. کاتێک تالاَنییەکانیان کۆکردەوە، موجاشیع قسەی کرد، سەرەتا سوپاسی خوای کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، خیانەت مەکەن، چوونکە هەر کەس خیانەت بکات، لەرۆژی قیامەت، سزا دەدرێت، کەواتە تالاَنییەکان بگەڕێننەوە تەنانەت ئەگەر دەرزی و دەزووە.
کاتێک ئەمەم بیست، کراسەکەم داکەند و خستمە ناو تالاَنییەکان.

## گرتنی ئیستەخر

دەڵێت: عوسمان کوڕی عاس مەبەستی ڕۆشتن بۆ ئیستەخری کرد و ژمارەیەکی زۆریان کوشت و تالاَنییەکی زۆریان کۆکردەوە و خەڵکان لەسەر جەنگ کردن بەردەوام بوون. عوسمان پێشنیاری جەزیەدانی بەخەڵکان کرد و ئەوان، کەسیان ڕەوانە و عوسمانیش کەسی نارد و هەربوز و هەموو هەلاَتووان و گۆشەگیران بەڵێنی دانی جەزیەیاندا.
کاتێک فارسەکان شکستیان خوارد، عوسمان هەموو تالاَنییەکانی موسوڵمانانی کۆکردەوە و پێنج یەکی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نارد و چوار یەکی لەناو موسوڵماناندا دابەش کرد. عوسمان موسوڵمانانی کۆکردەوە و وتی: ئەم دینە تا ئەو کاتەی خەڵکەکەی خیانەت نەکەن، بەردەوام بەرەو سەرکەوتن دەڕوات و خەڵکان

لەشتە ناسازگارەکان بەدوور دەبن و کاتێك خیانەت بکەنە پیشە، رووبەرووی ناسازگارییەکان دەبنەوە و ئەوکات، زۆر بەئەندازەی کەمێکی ئەم رۆژگارە دەبێت.

حەسەن دەڵێت: لەرۆژی جەنگی ئیستەخر، عوسمان کوڕی ئەبی عاس وتی: خواوەند کاتێك چاکەی خەڵکێکی بوێت، خۆڕاگرییان پێدەبەخشێت و دەیانکاتە کەسانێکی ئەمانەتدار تا پارێزگاری لەئەمانەتەکەیان بکەن. یەکەم شت کە لەدینەکەتان لەدەست دەچێت، ئەمانەتە و کاتێك لەدەستتاندا، هەر رۆژەو شتێکی تازە لەدەست دەدەن.

لەکۆتاییەکانی خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب و سەرەتای خەلافەتی عوسمان کوڕی عەففان، شەهرەك ئالای شۆڕشی بەرز کردەوە و خەڵکانی فارسی هاندا و داوای پەیمان شکێنی لێکردن. جارێکی دیکە عوسمان کوڕی ئەبی عاس لەگەڵ سوپایەك بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەو رەوانە کرا و دواتر سوپایەك بۆ پشتیوانی کردنی بەرێکەوت کەعوبەیدالله کوڕی مەعمەر و شیل کوڕی مەعبەدی بێجلی سەرکردەیان بوون و رووبەرووی فارسەکان بوونەوە.

شەهرەك گوندێکی بوو بەناوی شەهرەك و تا گۆڕەپانی جەنگ سێ فەرسەخ دوور بوو. دووری گۆڕەپانەکە تا شوێنی ئۆردوو لێدانی ئەو دوانزە فەرسەخ بوو. لەگۆڕەپانی جەنگ بەکوڕەکەی خۆی وت: نانی نیمەڕۆ لەکوێ دەبێت، لێرە یا لەشەهرەك؟

وتی: باوە گیان، ئەگەر وازمان لێ بێنن، نە لێرە دەبێت نە لەشەهرەك، بەڵکو لە ماڵی خۆمان دەبێت، بەڵام سوێند بەخوا دەستبەردارمان نابن.

هێشتا کۆتاییەکان بەگفتوگۆکەیان نەهێنابوو موسوڵمانان جەنگیان دەستپێکرد و شەڕێکی قورسیان خستەگەر. لەو جەنگە شەهرەك و کوڕەکەی کوژران و خواوەند ژمارەیەکی زۆر لەفارسەکانی لەسەر دەستی موسوڵمانان کوشت. ئەوکەسەی شەهرەکی کوشت، حەکەم کوڕی عاس کوڕی دەهمان برای عوسمان بوو.

بەڵام بەوتەی باوکی مەعشەر جەنگی یەکەمی فارس و جەنگی کۆتایی ئیستەخر، لەساڵی بیست و هەشتەم بوو.

دەڵێت جەنگی کۆتایی فارس و گور لەساڵی بیست و نۆیەم بوو. ئەم وتەی باوکی مەعشەر لەگێڕانەوەی ئیسحاق کوڕی عیسا ئاماژەی پێدراوە.

عەبدوللە کوڕی سلێمان دەڵێت: عوسمان کوڕی ئەبی عاسیان بۆ بەحرەین نارد و براکەی خۆی حەکەم کوڕی ئەبی عاسی لەگەڵ دوو هەزار کەس بۆ تـوج نـارد. خوسرەو لەمەداین هەڵاتبوو و رووی کردبووە گوری فارس.

حەکەم کوڕی عاس دەڵێت: شەهرەك مەبەستی لەناو بردنی سوپاکەی منی کرد.

عوبەید دەڵێت: کەسرا ئەوی ناردبوو.

حەکەم دەڵێت: بەسوپاکەی رووبەرووی من بوویەوە. لەگەردەنەیەك هاتنەخوار و هەموویان زرێپۆش بوون. ترسام چاوی موسوڵمانان زەق ببێت. بەکەسێکم وت لەناو سوپاکەدا جاڕبدات، هەرکەس جامانەی پێیە، لەدەوری چاوی بئاڵێنێت و هەرکەس نییەتی، چاوی ببەستێت. هەروەها فەرمانم بەسوپاکەمدا لەئەسپەکانیان بێنەخوار.

دەڵێت: کاتێك شەهرەك ئەمەی بینی، دابەزی. فەرمانی سەرکەوتنم بەسوپاکەمدا و لەبەرابەر ئەوان ریزمان بەست. ئەوانیش سوار بوون. جارود کوڕی عەبدیم وەك سەرکردەی باڵی راست و باوکی سەفرە یانی باوکی موهەلیبم وەك سەرکردەی باڵی چەپ دانا، دوژمنان هێرشیان کردە سەر موسوڵمانان بەڵام شکستیان خوارد بەشێوەیەك نوزەیان لێ نەدەبیسترا.

جارود وتی: ئەی ئەمیر، سوپاکە ڕۆشت.

وتم: دەبینین.

دەڵێت: زۆری نەخایاند سوپای فارسەکان گەڕایەوە بەڵام سوار نەبوون. موسوڵمانان شوێنیان کەوتبوون و لێیان دەکوشتن و سەرەکان لەبەرابەر مندا بلاو دەبوونەوە. یەکێك لەشاکانی فارس بەناوی موکەعبەر کەلەخوسرەو دابڕا و پەیوەستی من ببوو، لەوێ بوو، سەرێکی گەورەیان هێنایە لای من، موکەعبەر وتی: ئەمە ئەژدیهاك یانی شەهرەکە.

فارسەکان لەشاری شاپور گەمارۆیان خرایەسەر و حەکەم پەیمانی ئاشتی لەگەڵ بەستن. شای شاپوور، ئەزەربیان بوو کەحەکەم لەئەزەربیان بۆ گەمارۆ خستنە سەر خەڵکانی ئیستەخر کەڵکی وەرگرت. لەم کاتەدا عومەر کوڕی خەتاب کوژرا و عوسمان کوڕی عەفان، عوبەیدالله کوڕی مەعمەری لەجیاتی حەکەم ڕەوانە کرد.

عوبەیداللە ئاگادار بوویەوە کەئەزەبیان دەیەوێت خیانەت بکات و پێی وت:

دەمەوێت خواردنێك بۆ هاوەڵانی من دروست بكەیت و مانگایەك بكوژیت و ئێسقانەكانی لەسەر سینییەك لەبەرابەر من دابنێیت چوونكە حەز بەلێسانەوەی ئێسقانەكان دەكەم.

ئەزەربیان ئەو كارەی كرد و عوبەیدالله ئێسقانێك كەتەنیا بەتەور دەشكا، هەڵیگرت و بەدەستی خۆی شكاندی و مۆخەكەی دەرهێنا. عوبەیدالله كەسێكی بەهێز بوو. پاشا هەستا و قاچی گرت و وتی: پەنا بۆ تۆ دەهێنم. عوبەیدالله پەیمانی لەگەڵ بەست.

بەردێك لەبەردهاوێژێك بەر عوبەیدالله كەوت و وەسیەتی لای هاوەڵانی خۆی كرد و وتی: بەخواستی خوا دەست بەسەر ئەم شارەدا دەگرن و بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی من بۆ ماوەی یەك كاژێر خەڵكانی ئەو شارە كوشتار بكەن.

ئەو كارەیان كرد و ژمارەیەكی زۆر لەخەڵكی شارەكەیان كوشت.

دەڵێت: كاتێك حەكەم كوڕی عاس شكستی بەشەهرەك هێنا، عوسمان كوڕی عاس پەیوەستی بوو و نامەی بۆ عومەر كوڕی خەتاب نووسی كە لەنێوان من و كوفە كەلێنێك هەیە و دەترسم دوژمن لەو كەلێنەوە هێرش بكاتە سەرمان. كارگوزاری كوفەیش نوسیبووی لەنێوان من و فلآنە شوێن كەلێنێك هەیە. دوو نامەكە پێكەوە بەدەستی عومەر كوڕی خەتاب گەیشت و باوكی موسای لەگەڵ حەوتسەد كەس ڕەوانە كرد و لەبەسرە نێشتەجێی كرد.

## گرتنی فەسا و دارابگەرد

عەمرۆ دەڵێت: ساریە كوڕی زەنیم مەبەستی گرتنی فەسا و دارابەگەردی كرد و كاتێك لەئوردووگای دوژمن نزیك كەوتەوە، دابەزی وبۆ ماوەیەكی زۆر گەمارۆی خستنەسەر. دواتر دوژمنان كۆبوونەوە و كوردەكان هاوكارییان دەكردن. بارودۆخی موسوڵمانان دژوار و دەستەیەكی گەورە دژی ئەوان كۆببوونەوە. عومەر ئەو شەوە لەخەودا بینی كەموسوڵمانان و دوژمنان لەكاتێكی ڕۆژ، سەرقاڵی جەنگ بوون، ڕۆژی دواتر خەڵكانیان بۆ نوێژی جەماعەت كۆكردەوە. لەخەودا بینیبووی موسوڵمانان لەسارایەك بوون كەئەگەر دەمانەوە گەمارۆیان دەخرایەسەر و ئەگەر

پەنایان بۆ کێوەکەی پشت سەریان دەبرد، تەنیا لەیەك قۆڵەوە هێرشیان دەکرایە سەر. وتارێکی خوێندەوە و وتی: ئەی خەڵکینە، من ئەو دوو سوپایەم لەخەودا بینی. بارودۆخی ئەوانی باس کرد.

وتی: ساریە بەرەو کێوەکە! بەرەو کێوەکە! بەرەو کێوەکە! رووی کردە خەڵکان و وتی: خواوەند چەندین سوپای بەهێزی هەیە، ئەگەری هەیە یەکیان بۆ هاوکاری ئەوان ڕەوانە بکات. لەرۆژی دەستپێکردنی جەنگەکە ساریە و موسوڵمانان بڕیاریاندا پشت بەکێوەکە ببەستن و ئەو کارەیان کرد و تەنیا لەیەك قۆڵەوە لەگەڵ دوژمنان جەنگان. خواوەند شکستی بەدوژمنان هێنا و ئەم هەواڵەیان بۆ سەرورەری باوەڕداران نووسی و لەگرتنی شارەکە ئاگاداریان کردەوە پێشنیاری دانی جەزیەیان بەخەڵکی شارەکە کردووە.

یەکێك لەمناڵەکانی مازن دەڵێت: عومەرە کوڕی خەتاب، ساریە کوڕی زەنیمی دوئەلی بۆ فەسا و دارابگەرد نارد کەگەمارۆی خستە سەر ئەو سەرزەمینە. دواتر فارسەکان کۆبوونەوە و روویان لەسارا کرد. ژمارەیان فراوان و لەهەر چوارلاوە هێرشیان کردە سەر ساریە. عومەر لەرۆژی هەینی لەکاتی خوێندنەوەی وتار، وتی: ئەی ساریە کوڕی زەنیم بەرەو کێوەکە، بەرەو کێوەکە. کاتێك رۆژی دیاریکراو گەیشت، موسوڵمانان کێوێکیان لەتەنیشتەوە بوو کەئەگەر پەنایان بۆ دەبرد، دوژمن تەنیا لەیەك قۆڵەوە دەیتوانی هێرش بکاتە سەریان، پەنایان بۆ کێوەکە برد و جەنگان و دوژمن شکستی خوارد. ساریە تالانییەکانی کۆکردەوە کەسنوقێکی جەواهیر لەناویدا دەبینرا و وتی موسوڵمانان ببەخشن بەعومەر کوڕی خەتاب و بەخشییان و لەگەڵ هەواڵی سەرکەوتن و پێنج یەکی تالانییەکان ڕەوانەی مەدینەیان کرد.

دەڵێت: مژدەدەر و نێردراوەکان خەڵات و دیارییان وەردەگرت و پێداویستییەکانیان دابین دەکرا. ساریە بەنێردراوی وت: لەبری خەڵاتەکەت، خەرجی رێگە بەو شتەی بۆ کەسانی خۆتی دادەنێی، بەقەرز وەربگرە.

ئەو پیاوە رۆشتە بەسرە و ئەو کارەی کرد و بەرێکەوت تا گەیشتە مەدینە. کاتێك گەیشتە لای سەرورەری باوەڕداران، کەخواردنی بەخەڵکان دەدا و داردەستێکی

پێبوو.

لەبەرابەری وەستا. عومەر وتی: دانیشە. ئەو دانیشت و کاتێك نانی خوارد، عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشت، ئەویش هەستا و شوێنی کەوت.

عومەر گومانی کرد پیاوێکە کەهێشتا برسییەتی و کاتێك گەیشتە بەردەم ماڵەکەی خۆی، وتی: وەرە ژوور. بەنانەواکەی وت دەستەیەك نان بباتە چێشتخانەی موسوڵمانان. کاتێك لەماڵەکەی دانیشت، خواردنەکەیان بۆ هێنا کە لەنان و کەمێك ڕۆن و زەیتوون و خوێی درشت، پێکدەهات. کاتێك خواردنەکەیان لەبەردەم دانا، بەهاوسەرەکەی وت: مەگەر نایێت نان بخۆیت؟

وتی: پێم وابێت پیاوێکی لێیە؟

عومەر وتی: بەڵێ.

وتی: ئەگەر دەتویست پیاوەکان بمبینن، جل وبەرگێکی جیاواز لەمەت بۆ دەکریم.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: دڵخۆش نیت بەوەی بڵێن دایکی کولسوم، کچی عەلی و ژنی عومەر؟

وتی: ئەمە چ سوودێك بەمن دەگەیێنێت؟

بەپیاوەکەی وت: وەرە بخۆ، ئەگەر دڵخۆش دەبوو، خواردنەکە لەمە باشتر دەبوو.

خواردیان و کاتێك دەستیان کێشایەوە، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، نێردراوی ساریە کوڕی زەنیمم.

وتی: بەخێر بێیت.

نێردراوی بەرادەیەك لەخۆی نزیك کردەوە کەڕانیان بەریەك کەوت و سەبارەت بەکاری موسوڵمانان پرسیاری کرد. دواتر لەبارودۆخی ساریە کوڕی زەنیمی پرسی و ئەو بەسەرهاتی سنووقەکەی بۆ باس کرد. عومەر سەیری سنووقەکەی کرد و وتی: بەخێر نەیێیت تا دەگەڕێیتەوە بۆ ناو سوپاکە و ئەمە لەناویاندا دابەش دەکەیت. ئەمەی وت و ئەوی لەخۆی دوور خستەوە.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، وشترەکەم هیلاك کردووەو بەگومانی وەرگرتنی خەڵاتی، قەرزم کردووە، شتێکم پێ ببەخشە تا بیکەمە توێشووی ڕێگە.

پێداگری کرد تا وشترەکەی لەگەڵ یەکێك لەوشترەکانی زەکات گۆڕییەوە.

نێردراو، بێ بەش و داماو، گەڕایەوە تا گەیشتە بەسرە و فەرمانەکانی عومەری جێبەجێ کرد.

لەمەدینە، سەبارەت بەساریە و سەرکەوتنە پرسیاریان لێکرد بوو ئایا لەرۆژی جەنگەکە هیچیتان بیست؟

وتی: بەڵێ، بیستمان کە: ئەی ساریە، بەرەو کێوەکە، لەمردن نزیك ببووینەوە، دواتر پەنامان بۆ کێوەکە برد و خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین.

## گرتنی کرمان

عەمرۆ دەڵێت: سوهەیل کوڕی عودەی مەبەستی هێرش کردنە سەر کرمانی کرد و عەبدوللە کوڕی عەبدوللە کوڕی عوتەبان پەیوەستی بوو. پێشەنگی سوهەیل کوڕی عودەی بەنەسیر کوڕی عەمرۆ عێجلی سپێردرابوو. خەڵکانی کرمان دژی سوهەیل کۆبوونەوە و لە (قەفەس) داوای هاریکارییان کرد و دەستیان بەسەر کەنارەکانی ویلایەتەکەیدا گرت. خواوەند بڵاوەی پێکردن و موسوڵمانان ڕێگەیان بەستن و نەسیر، سنووردارى کرمانی کوشت و سوهەیل لەو ڕێگەوەی هەنووکە ڕێگە گوندەکانە و عەبدوللە کوڕی عەبدوللە لەڕێگەی بیابانی شیر، ڕۆشتنە ناو جیرۆفت و هەرچییان لەمەڕ و وشتر دەویست، هەڵیانگرت. بەهای مەڕ و وشترەکانیان خەملاند. وشترەکانی بەختی لەوشترەکانی عەرەب گەورەتر بوون بەلأم نەیانویست بەهاکەی بەرز بکەنەوە. نامەیان بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی کەوشتری عەرەبی بەپێی گۆشتەکەی بەهای بۆ دادەنرێت. ئەمەیش نموونەی ئەوەیە ئەگەر بۆ سەر بڕین دەبوو، بەهای زیاتریان لەسەر دادەنا.

حەنبەل کوڕی باوکی جورەیدە، دادوەری قەهێستان، لەسنوورداری قەهێستان دەگێڕێتەوە: گرتنی کرمان لەرۆژگاری خەلافەتی عومەر کوڕی خەتاب و بەدەستی عەبدوللە کوڕی بودەیل کوڕی وەرقای خوزاعی ئەنجامدرا. دوای ئەوە عەبدوللە لەکرمانەوە ڕووی کردە دووتەبەس. دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، دەستم بەسەر دووتەبەسدا گرت، بیانبەخشە بەمن. عومەر دەیویست بەداواکەی ڕازی بێت بەلأم پێیان وت دوو گوندی گەورەیە. بەلأم

سەرئەنجام پێی بەخشی کەدوو سنووری خوراسانە .

## گرتنی سیستان

دەڵێت: عاسم کوڕی عەمرۆ مەبەستی سیستانی کرد و عەبدوللە کوڕی عومەر پەیوەستی بوو. خەڵکانی سیستان پێشڕەوییان کرد و لەنێوان موسوڵمانان لەناوچەی نزیك سنووری ئەو ویلایەتە جەنگ روویدا و فارسەکان شکستیان خوارد و موسوڵمانان شوێنیان کەوتن و لەزرەنك گەمارۆیان خستنەسەر و تا ئەو جێگەی دەیانخواست لەسەرزەمینی سیستان پێشڕەوییان کرد. دواتر خەڵکانی سیستان دەربارەی زرەنك و ناوچە دەست بەسەرداگیر کراوەکانی دیکە، خوازیاری ئاشتی بوون و پەیمانی ئاشتی مۆر کرا.

لەپەیمانی ئاشتیدا هاتبوو دەشتەکانی سیستان قەرقە (شوێنێکی تایبەتە و کەس بۆی نییە بچێتە ناوی) و کاتێك موسوڵمانان دەڕۆشتنەدەر، چاودێرییان دەکرد بۆ ئەوەی هیچی لێ هەڵنەگرن و پەیمانەکە بشکێت. خەڵکانی سیستان باجیاندا و موسوڵمانان لەوێ نیشتەجێ بوون.

سیستان گەورەتر لەخوراسان و سنوورەکانی فراوانتر بوو. چەندین جار لەگەڵ قەندهار و تورك و نەتەوەکانی دیکە جەنگان، ناوچەی نێوان سند تا رووباری بەلخ لەبەرابەر ئەواندا بوو. بەردەوام لەخوراسان گەورەتر و سنوورەکەی دژوارتر و ژمارەی خەڵکەکەی فراوانتر بوو.

لەرۆژگاری معاویە پاشا لەبەرابەر براکەی خۆی هەڵات – ناوی برای پاشا رۆتبیل بوو– رووی کردە یەکێك لەشارەکانی ئەوێ بەناوی ئەسڵ و خەڵکەکەی ملکەچی سەلم کوڕی زیاد بوون کەلەو کاتەدا کارگوزاری سیستان بوو. سەلەم رازی و پەیمانی لەگەڵ بەستن و لەو ویلایەتە نیشتەجێی کردن. ئەم هەواڵەی بۆ معاویە نووسی و گومانی کرد سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

معاویە وتی: برازاکەم، لەشتێك شادمانە کەمن خەمبار دەکات و دەبێت ئەویش خەمبار بێت.

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، بۆ؟

وتی: لەبەر ئەوەی ڕێگەی زرەنك تا ئامول دژوار و سەختە و ئەوان خەڵكانێكی توند و تیژ و خیانەت پیشەن و بەم زووانە بارودۆخی ئەو ناوچەیە پەرێشان دەبێت. کەمترین کار کە ئەگەری هەیە ئەوان ئەنجامی بدەن ئەوەیە بەسەر هەموو ویلایەتی ئامولدا زاڵ بین.

پەیمانەکەی کوڕی زیاد بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی لەرۆژگاری معاویە ئاژاوە لەکوفە سەریهەڵدا و پاشا کافر بوو و دەستی بەسەر ئامولدا گرت و ڕۆتبیل لەپاشا ترسا و پەنای بۆ شوێنی ئێستای برد. بەمەیش بەسەندەی نەکرد و کاتێك خەڵكان سەبارەت بەکارەکانی دیکە نامەیان بۆ نووسی، چاوی تەماحی بڕییە زرەنك و بۆ جەنگ هات و گەمارۆی خستە سەر خەڵكی ئەو شارە تا ئەو کاتەی هێزی پشتیوان لەبەسرەوە هات و ڕۆتبیل و هاوەڵانی لەو ویلایەتە تا کاتی مەرگی معاویە ملکەچ و نیشتەجێ کران و تا ئێستایش لێیان وەرنەگیراوەتەوە.

## گرتنی مەکران

دەڵێت: حەکەم کوڕی عەمرۆ تەغلەبی مەبەستی گرتنی مەکران و شەهاب کوڕی موخاریق کوڕی شەهاب، پەیوەستی بوو. سوهەیل کوڕی عودەی و عەبدوللە کوڕی عەبدوللە کوڕی عوتەبان بۆ هاوکاری ئەو بەرێکەوتن و لەنزیك شارەکە پێی گەیشتنەوە. خەڵكانی مەکران ئوردوویان لێدا بوو. کاتێك موسوڵمانەکان گەیشتن، پاشاکەیان بەناوی راسل، پاشای دیاری سند، هات و پەیوەستیان بوو و لەچەند مەنزڵی ڕووبار کەپێشتر دەستەکانی خەڵكی مەکران لەوێ ئوردوویان لێدابوو و چاوەڕوانی گەیشتنی دەستەکانی دیکەیان دەکرد، جەنگ ڕوویدا. خواوەند راسلی شکستدا و ئوردووگاکەی لەلایەن موسوڵمانانەوە دەستی بەسەردا گیرا. ژمارەیەکی زۆریان لەفارسەکان لەناو گۆڕەپانی جەنگ کوشت، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك شوێنیان کەوتن و بەردەوام کوشتاریان دەکردن تا گەیشتنە ڕووبارەکە و لەمەکران نیشتەجێ بوون.

حەکەم، هەواڵی سەرکەوتنی بۆ عومەر کوڕی خەتاب نووسی و لەگەڵ پێنج یەکی تالانییەکان بەسەحاری عەبدی ڕەوانەی کرد و سەبارەت بەفیلەکان داوای بۆچوونی

سەروەری باوەڕدارانی کرد. کاتێك سەحار هەواڵی سەرکەوتن و تالآنییەکانی بردە لای عومەر کوڕی خەتاب، سەبارەت بەمەکران پرسیاری لێکرد. عومەر کوڕی خەتاب، هەر کەس دەڕۆشتە لای، سەبارەت بەو ناوچەی لێوەی هاتبوو، پرسیاری دەکرد.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، سەرزەمینێکە دەشتەکەی کێوە و ئاوەکەی کەم و میوەکەی دەغەڵ (خورمای خراپ) و دوژمنەکەی بەتەڵە (بوێر)، خێری کەمە و شەڕی فراوان، ئەوێ کەمە و کەم لەبەردەم مەترسی لەناوچوون و پشتەوەی لەمە خراپترە.

عومەر وتی: شێعر دەخوێنیتەوە یا وەسفی ئەو ناوچەم بۆ دەکەیت؟

وتی: وەسفی ناوچەکەت بۆ دەکەم و نێردراوم.

وتی: سوێند بەخوا تا ئەو کاتەی شوێنکەوتەی فەرمانەکانی من بن، سوپاکەی من لەوێ ناجەنگێت.

نامەی بۆ حەکەم کوڕی عەمرۆ و سوهەیل نووسی: هیچ کەس لەسوپاکەی ئێوە لەمەکران تێنەپەڕێت و تەنیا بەم لای رووبار بەسەندە بکەن. فەرمانیدا فیلەکان لەسەرزەمینی ئیسلام بفرۆشێت و بەهاکەی لەنێوان موسوڵمانان دابەش بکات.

## بیروز و ئەهواز

دەڵێت: کاتێك سوپاکان بۆ ولایەتەکانی دیکە بەرێکەوتن، دەستەیەکی فراوان لەکوردەکان و کەسانی دیکە لەبیروز کۆبوونەوە. کاتێك سوپاکان بۆ ویلایەتەکان دەڕۆشتن، عومەر کوڕی خەتاب نامەی بۆ باوکی موسا نووسی و فەرمانی پێدابوو چاودێری سنووری بەسرە بکات تا کەس لەپشتەوە هێرشیان نەکاتە سەر چوونکە مەترسی ئەوەی لێدەکرا دەستەیەك لەسوپاییەکان لەجەنگێك گرفتار ببن یا دەستەیەك لەشەڕکەران لەو سەرزەمینە دوور بکەونەوە، کۆبوونەوەی بیروز ئەوە بوو سەروەری باوەڕداران لێی دەترسا و باوکی موسا سستی و لاوازی لەخۆی نیشاندا. لەمانگی رەمەزان بەرێکەوت تا رووبەرووی سوپاکەی بیروز ببێتەوە. لەنێوان رووباری تیری و مونازیر شەڕ روویدا. بوێرەکانی فارس و کورد هاتبوونە ئەو سەرزەمینە تا تۆڵەی خۆیان لەعەرەبەکان بکەنەوە یا دەرەفەتێکیان دەستکەوێت و

گومانیان نەبوو لەوەی سەرکەوتن بەدەست دێنن.

موهاجیر کوڕی زیاد کەبۆنی خۆشی لەخۆیدا بوو و بۆگیان بەخشین ئامادە بوو، بەباوکی موسای وت: ئەوانەی بەرۆژوون سوێندیان بدە بگەڕێنەوە و رۆژووەکەیان بشکێنن. براکەی یەکێك بوو لەو کەسانەی لەبەر سوێندەکە گەڕایەوە. مەبەستی موهاجیر ئەوە بوو براکەی دوور بخاتەوە تا نەبێتە رێگر لەبەردەم گیان بەخشینی ئەو. دواتر ڕۆشتە پێش و جەنگا تا کوژرا. خواوەند شکستی لەناو سوپای فارس و کوردەکان بڵاو کردەوە و سەنگەریان گرت.

کاتێك رەبیع برای موهاجیر هات، بۆ سەرکۆنە کردنی خۆی وتی: ئەی دنیا پەرەست، بۆ مەرگی براکەی ناڵاندی و باوکی موسا کەخەم و ناڵەی ئەوی بۆ براکەی بینی، ئەوی لەگەڵ دەستەیەك لەموسوڵمانەکان بۆ گەمارۆ خستنە سەر سوپای فارسەکان بەرێکرد و بەرێکەوت و رووی کردە ئیسفەهان و لەوێ رووبەرووی سوپاکەی کوفە بوویەوە کەگەمارۆیان خستبوویە سەر جی و دوای سەرکەوتن، سوپاکە بەرەو بەسرە گەڕایەوە.

لەرووباری تیری، خواوەند رەبیعی بەسەر سوپاکەی بیروز زاڵ کرد و ژمارەیەکی زۆریان لێ ئەسیر کردن. باوکی موسا چەند کەسێك لەوان کەبەهای ئازادییەکەیان زۆر بوو، ڕاگرت چوونکە وەرگرتنی بەهای ئازادی لەفرۆشتنی ئەسیرەکان سوودمەنتر بوو. دواتر چەند کەسێکی لەگەڵ پێنج یەکی تالآنییەکان رەوانە کرد. یەکێك لەخەڵکانی عەنەزە داوای لەباوکی موسا کرد لەگەڵ نێردراوەکان بڕوات بەڵام رازی نەبوو. پیاوی عەنەزی ڕۆشت و خراپەی ئەوی هێنایە سەرزمان. عومەر کوڕی خەتاب باوکی موسای بانگ کرد و ئەوانەی رووبەرووی یەك کردەوە، وتەکەی باوکی موسا شیاو بوو بۆ رازی بوون مەگەر سەبارەت بەکاری کۆیلەکەی کەسەرکۆنەی کرد و ئەوی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە. ئەو کەسەی دیکەی بەدرۆزن ناو برد و پێی وت چیتر ئەو کارە دووبارە نەکاتەوە.

عەمرۆ دەڵێت: کاتێك سوپاکان گەیشتنە ویلایەتەکان و رەبیع شکستی بەسوپاکەی بیروز هێنا و ئەسیر و تالآنی زۆری دەسکەوت، باوکی موسا لەئیسفەهان گەڕایەوە و شەست منداڵی کەم تەمەن لەمنداڵی وەرزێرەکانی هەڵبژارد و جیای

کردنەوە. هەواڵی سەرکەوتنی نووسی و نێردراوانی بۆلای عومەر کوڕی خەتاب ڕەوانە کرد. یەکێك لەخەڵکانی عەنزە هات و وتی: منیش لەگەڵ نێردراوەکان ڕەوانە بکە.

باوکی موسا وتی: کەسانێك ڕەوانە دەکەین کە لەتۆ شیاوترن. ئەو تووڕە و خەمبار ڕۆشت.

باوکی موسا نامەی بۆ عومەر نووسی کەیەکێك لەخەڵکانی عەنەزە بەناوی زەببە کوڕی موحسین ئەو داوایەی لێکردم و ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی. کاتێك نامە و نێردراوەکان گەیشتنە لای عومەر کوڕی خەتاب، پیاوی عەنەزی ڕۆشتە لای عومەر و سلاوی کرد.

عومەر پرسی: کێیت؟

عەنەزی ناوی خۆی وت.

سەروەری باوەڕداران وتی: بەخێر نەیێیت و نەشیاو هاتیت.

وتی: بەخێرهێنان لەخواوەندە و شیاوی لەنەشیاوی.

سێ جار پیاوی عەنەزی ڕۆشتە لای عومەر و وتەکانی دووبارە کردەوە و هەمان وەلامی دەستکەوت.

بۆ ڕۆژی چوارەم، عومەر پرسی: چ سکالایەکت لەئەمیرەکەت هەیە؟

وتی: شەست منالی لەمنالی وەرزێرەکان بۆ خۆی هەڵبژاردووە و کەنیزێکی هەیە بەناوی عەقیلە کەنیمەڕۆ سینییەك دەخوات و ئێواریێ بەهەمان ئەندازە و کەس لەئێمە توانای ئەو کارەی نییە، دوو جەریب زەوی هەیە و دوو ئاوکێش، کاروباری بەسرەی بەزیاد کوڕی ئەبی سوفیان سپاردووە — کارەکانی بەسرە لەئەستۆی زیاد بوو— و یەك هەزاری بەحەتیئە بەخشیوە.

عومەر کوڕی خەتاب هەموو وتەکانی ئەوی نووسی و بۆ باوکی موسای نارد و کاتێك هات، بۆ چەند ڕۆژێك مۆڵەتی پێنەدا بیبینێت. دواتر ئەوی بانگ کرد و زەببە کوڕی موحسینیش ئامادە بوو. نووسراوەکەی پێدا و وتی: ئەوی نووسیومە، بیخوێنەرەوە. ئەو ناوی شەست کوڕەکەی خوێندییەوە.

باوکی موسا وتی: ئەوانیان نیشانی مندا چوونکە بەهای ئازادی ئەوان گرانە، بەهای ئازادی ئەوانم وەرگرت و لەنێوان موسوڵمانان دابەشم کرد.

زەببە وتی: سوێند بەخوا درۆ ناکات و منیش درۆم نەوت.

وتی: دوو جەریب زەوی هەیە.

باوکی موسا وتی: جەریبێکی تایبەتە بەکەسەکانی من کەبژێوی ئەوان لەوێوە دابین دەکەم و جەریبێکی تایبەتە بەموسوڵمانان و لەدەستی ئەواندایە و رۆژی خۆیان لەوێوە دابین دەکەن.

زەببە وتی: سوێند بەخوا درۆ ناکات و منیش درۆ ناکەم

کاتێك باسی عەقیلەی کرد، باوکی موسا بێدەنگ و هیچ پاساوێکی نەبوو.

عومەر کوڕی خەتاب هەستی بەراستی زەببە کرد.

وتی: کاروباری بەسرە لەدەستی زیاد کوڕی ئەبی سوفیانە و ئەو ناوچەیە ناناسێت.

باوکی موسا وتی: ئەوم بەکەسێکی بڕواپێکرا و خاوەن پێگە و بیرمەند زانی و کارەکانی خۆم بەو سپارد.

وتی: یەك هەزاری بەحەتیئە بەخشیوە.

باوکی موسا وتی: بەسامانی خۆم دەمم بەست تا قسەی ناشیرین نەهێنێتە سەرزمان.

وتی: بەهەرحاڵ ئەو کارەت کردووە.

عومەر باوکی موسای گەڕاندەوە و وتی: کاتێك گەشتیتە بەسرە، زیاد و عەقیلە بۆ لای من بنێرە.

باوکی موسا ئەو کارەی کرد و عەقیلە پێش زیاد گەیشتە مەدینە. زیاد هات و لەبەر دەرگا وەستا. کاتێك عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتەدەر، لەبەردەرگا وەستابوو، جل و بەرگێکی کەتانی سپی پۆشیبوو.

وتی: ئەم جل و بەرگە چییە؟

زیاد وەڵامی دایەوە.

وتی: بەهاکەی چەندە.

زیاد بەهاکەی وت و راستی وت.

وتی: مانگانەی تۆ چەندە.؟

وتی: دوو هەزار.

وتی: یەکەم مانگانەی خۆت چۆن خەرج کرد؟

وتی: دایکم کڕییەوە و ئازادم کرد و بەمانگانەی دووەم، عوبەید کوڕی ژنەکەم کڕییەوە و ئازادم کرد.

عومەر وتی: کارێکی چاکت کرد.

ئەوسا سەبارەت بەئەرکی موسوڵمانان و سونەتەکان و قورئان پرسیاری کرد و ئەوی بەکەسێکی شارەزا بینی و گەڕاندییەوە و فەرمانی بەسەرکردەکانی بەسرەدا پشت بەبۆچوونەکانی ببەستن و عەقیلەی لەمەدینە هێشتەوە.

عومەر وتی: بزانن زەببەی عەنەزی لەکارە راستەکەی باوکی موسا توڕە بووە و بەنارەزایی لەو جیابوویەوە لەبەر ئەوەی بۆ بەشێك لەکاروبارەکانی دنیایی لەدەست داوە و دژی ئەو راستی هێنایە سەر زمان و درۆ، کەدرۆکەی راستییەکانی بەفیرۆدا. لەدرۆ خۆتان بەدوور بگرن چوونکە کەسان دەخاتە ناو جەهەننەم.

حەتیئە لەجەنگی بیروز چاوی بەباوکی موسا کەوت و بەخششی پێدابوو. باوکی موسا گەمارۆ خستنە سەر سوپای فارسەکان و جەنگی بیروزی دەستی پێکرد و ئەوانی سست و لاواز کرد. دواتر ئەو ناوچەی بەجێهێشت و کاروباری جەنگی بەرەبیع سپارد و دوای سەرکەوتنی موسوڵمانان گەڕایەوە و دابەش کردنی تالانییەکانی گرتەئەستۆ.

ئەسید کوڕی موتەشمەس برازای ئەحنەف کوڕی قەیس دەڵێت: لەگەڵ باوکی موسا لەجەنگی ئیسفەهان بینەری گرتنی گوندەکان بووم کەبەدەستی عەبدوللە کوڕی وەرقای ریاحی و عەبدوللە کوڕی وەرقای ئەسەدی ئەنجام دەدران. دوای ئەوە باوکی موسا بۆ کوفە ڕەوانە کرا و عەمرۆ کوڕی سوراقەی مەخزومی بەدری وەك کارگوزاری بەسرە دەستنیشان کرا. دواتر باوکی موسایان بۆ بەسرە گەڕاندەوە.

کاتێك عومەر کوڕی خەتاب مرد، باوکی موسا لەبەسرە و ئۆدەداری بەخششەکانی ئەو شارە بوو. کاروبارەکانی بەسرە بەچەندین کەس سپێردرابوو و لەیەك شوێندا نەبوو. هەندێ کات عومەر کوڕی خەتاب کەسی بۆ لای ئەو دەنارد تا هاوکاری سوپاییەکان بکات و هاوکاری دەکردن.

## کارەکانی سەلمە کوڕی قەیسی ئەشجەعی و کوردەکان

سەلمان کوڕی بوریدە دەڵێت: کاتێك سوپایەك لە موسوڵمانان لەلای سەرۆمری باوەڕداران کۆدەبوویەوە، یەکێك لەشارەزایانی زانست و فیقهی ئیسلامی دەکردە سەرکردەیان، دەستەیەك لای ئەو کۆبوونەوە و سەلمە کوڕی قەیسی ئەشجەعی کردە سەرکردەی ئەوان و وتی: بەناوی خواوەند بەرێکەوە و لەرێگەی خواوەند لەگەڵ ناباوەڕان بەخوا بجەنگە و کاتێك رووبەرووی دوژمنەکانی خۆتان بوونەوە، پێشنیاری سێ کاریان پێبکەن، پێشنیاری ئیسلامیان پێبکەن و ئەگەر باوەڕیان هێنا، لەشوێنی خۆیان بمێننەوە و دەبێت زەکات بدەن، لەتالانی موسوڵمانان هیچیان بەرناکەوێت و ئەگەر بیانەوێت پەیوەستی ئێوەبن، هاوشێوەی ئێوەن، ئەگەر باوەڕیان نەهێنا، پێشنیاری دانی جەزیەیان پێبکە، ئەگەر رازی بوون، لەگەڵ دوژمنەکانیان بجەنگن و بەوەرگرتنی خەراج بەجێیان بێڵن بێ ئەوەی زیاد لەتوانای خۆیان بەسەردا بسەپێنن، ئەگەر بەدانی جەزیە رازی نەبوون لەگەڵیان بجەنگن چوونکە خواوەند سەرکەوتنتان پێدەبەخشێت، ئەگەر لەقەلایەك خۆیان حەشاردا و ویستیان بەفەرمانی خواوەند و پێغەمبەر خۆیان بەدەستەوە بدەن، بەتەسلیم بوون بەفەرمانی خواوەند رازی مەبن چوونکە نازانن فەرمانی خواوەند لەبارەی ئەوانەوە چییە؟ ئەگەر ویستیان پەیوەستی ئەهلی زەممە ببن، پێشنیاری زەممەی خوا و پێغەمبەریان پێمەکەن و زەممەی خۆتان پێشنیار بکەن، ئەگەر لەگەڵ ئێوە جەنگان، نامەردی مەکەن و خیانەت مەکەنە پیشە و ئەندامی کوژراوەکان مەبڕن و منداڵەکان مەکوژن.

سەلمە دەڵێت: بەرێکەوتین تا رووبەرووی دوژمنان بووینەوە. پێشنیاری ئەو سێ کارەمان پێکردن، بەموسوڵمان بوون رازی نەبوون، پێشنیاری خەراجمان پێکردن و رازی نەبوون، شەڕمان لەگەڵ کردن و خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین. جەنگاوەرانمان کوشت و ژن و منداڵەکانمان ئەسیر کرد و تالانییەکانمان لەگەڵ خۆمان هێنا.

بێژەر دەڵێت: سەلمە کوڕی قەیس زیوەرێکی بینی و وتی: ئەمە هیچ سوودێك

بەئێوە ناگەیێنێت، رازی بن تا بۆ سەروەری باوەڕدارانی بنێرم چوونکە ئەو نێردراو و خەرجی هەیە.

وتیان: رازین.

دەڵێت: زیوەرەکەی خستە ناو سنووقێك و یەکێك لەکەسانی خەڵکەکەی خۆی نارد و وتی: لەگەڵ ئەمە بڕۆ و کاتێك گەیشتیتە بەسرە، بەبیر کردنەوە لەخەلاتی سەروەری باوەڕداران، دوو بار هەڵگر بۆخۆت و کۆیلەکەت بکرە و توێشوو بارکە و بەرەو مەدینە بەرێکەوە.

نێردراو دەڵێت: ئەو کارەم کرد و گەیشتمە لای سەروەری باوەڕداران، خواردنی بەخەڵکان دەدا و هاوشێوەی شوانێك پشتی بەداردەستەکەی خۆی بەستبوو. لای کاسەکان تێدەپەڕی و دەیوت: یەرفا! گۆشتیان بۆ بێنە، نانیان بۆ بێنە، ئاوگۆشتیان بۆ بێنە.

دەڵێت: ڕۆشتمە لای، وتی: دانیشە، لەگەڵ کەسان دانیشتم، خورادنێکی سادە بوو، خورادنەکەی خۆم باشتر بوو. کاتێك خەڵکان دەستیان لەخواردن هەڵگرت، وتی: یەرفا، کاسەکان کۆبکەرەوە. ڕۆشت و منیش بەدوایدا ڕۆشتم تا ڕۆشتە ناوماڵێك، ڕۆشتە ژوورێك و منیش داوای مۆڵەتم کرد و سلاوم کرد. مۆڵەتی پێدام و ڕۆشتمە ژوور. لەسەر ڕاخەرێکی سادە دانیشتبوو، پشتی بەدوو پشتی چەرمینی پڕ لەگەڵای دارخورما، دابوویەوە، یەکیانی بۆ من هاویشت ودانیشتم.

حەوشێکی بەرز و ژورێك کەپەردەی پێوە بوو. عومەر کوڕی خەتاب وتی: دایکی کولسوم! خواردنی ئێمە بێنە. نان و زەیتوونیان هێنا، کەمێك خوێی نەکوتراوی لەگەڵدا بوو.

عومەر وتی: دایکی کولسوم نایێت لەگەڵ ئێمە نان بخۆیت؟

وتی: پێم وابێت پیاوێك لای تۆ دانیشتووە؟

وتی: بەڵێ و پێم وابێت خەڵکی ئەم سەرزەمینە نییە.

لەم کاتەدا زانیم منی نەناسیوەتەوە.

ژن وتی: ئەگەر دەتویست بێمە ناو پیاوان، دەبوا لەو جل و بەرگانەم لەبەر بکەیت کەکوڕی جەعفەر دەیکاتە بەر ژنەکەی خۆی.

وتی: ئەوەت بەس نییە دەڵێن کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و هاوسەری

سەروەری باوەڕداران، عومەر کوڕی خەتاب.

بەمنی وت: بخۆ، ئەگەر دڵخۆش دەبوو، خۆرادنێکی باشتر لەمەی دەرخواردی تۆ دەدا.

دەڵێت: کەمێکم خوارد، خواردنەکەی خۆم باشتر بوو، عومەر کوڕی خەتاب نانی خوارد. کەسم نەبینیوە باشتر لەو نان بخوات. دەست و دەمی خۆی بەخواردنەکە پیس نەدەکرد.

وتی: خواردنەوەیان هێنا.

پیاڵەیەك ئاوی تێکەڵ بەئاردی جۆیان هێنا.

وتی: بیدە بەو پیاوە.

دەڵێت: کەمێکم خواردەوە، خورادنەوەکەی خۆم زۆر باشتر بوو. عومەر کوڕی خەتابیش خواردییەوە تا ئەوەی پیاڵەکە بەرناوچاوی کەوت، وتی: سوپاس بۆ خوا کەخواردنی پێداین و تێری کردین، خواردنەوەی پێداین و تێراوی کردین.

وتم: سەروەری باوەڕداران خواردی و تێر و خواردییەوە و تێراو بوو. ئێستا ئەی سەروەری باوەڕداران، سەرەی پێویستییەکانی منە.

وتی: پێویستی تۆ چییە؟

وتم: نێردراوی سەلمە کوڕی قەیسم.

وتی: سلاو لەسەلمە کوڕی قەیس و نێردراوەکەی، باسی موهاجیرەکان بکە، بارودۆخیان چۆنە؟

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، بەوشێوەن تۆ دەخوازیت، تەندروست و سەرکەوتوو بەسەر دوژمنان.

وتی: بەهاکانیان چۆنە؟

وتم: زۆر هەرزان.؟

وتی: گۆشت چۆنە کەداری عەرەبەکانە و عەرەبەکان تەنیا بەدارەکەی خۆیان جوان و چاکن.

وتم: بەهای گا ئەوەندەیە و بەهای بزن ئەوەندە. ئەی سەروەری باوەڕداران، ڕۆشتین و ڕووبەڕووی دوژمنانی خۆمان بووینەوە و بەهەمان شێوەی فەرمانت

پێدابووین، پێشنیاری باوەڕهێنانمان پێکردن و رازی نەبوون، پێشنیاری خەراجمان کرد و رازی نەبووین. لەگەڵیان جەنگاین و خواوەند سەرکەوتنی پێبەخشین، جەنگاوەرانمان کوشت و ژن و منداڵەکانمان ئەسیر و تالآنییەکانمان کۆکردەوە، سەلما لەناو تالآنییەکان زیوەرێکی بینی و بەموسوڵمانانی وت: ئەمە هیچ سوودێکی بۆ ئێمە نابێت، ئەگەر رازی بن، دەینێرین بۆ سەروەری باوەڕداران؟

وتیان: رازین. سنووقەکەم دەرهێنا و کاتێك نگینە زەرد و سەوز و سوورەکانی بینی، هەستایە سەرپێ، دەستی خستە کەلەکەی خۆی و وتی: خواوەند سکی عومەر تێر نەکات.

دەڵێت: ژنەکانی گومانیان کرد دەمەوێت عومەر کوڕی خەتاب بکوژم و بۆلای پەردەکە رایان کرد. عومەر وتی: ئەوەی هێناوتە هەڵیگرە، یەرفا! لەگەردنی بدە.

دەڵێت: سنووقەکەم رێك و پێك دەکرد و یەرفا لەگەردنی دەدام، وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، چوارپێکەم لەپێ کەوتووە، چوارپێم پێبدە.

وتی: یەرفا، دوو وشتری زەکاتی پێ بدە، کاتێك کەسێکت بینی کەلەتۆ زیاتر پێویستی بەوشترەکان بوو، بیدە بەو.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، چی بکەم.

وتی: سوێند بەخوا ئەگەر موسوڵمانان پێش ئەوەی ئەمە لەناویاندا دابەش بکرێت، رووبکەنە قشلاق، بەلآیەك بەسەر تۆ و هاورێکەت دەهێنم، هاوشێوەی نەبێت.

دەڵێت: ڕۆشتم تا گەیشتمە لای سەلمە و وتم: چەندە ناپیرۆز بوو ئەو کارەی بەمنت وت. پێش ئەوەی بەلآ یەخەی من وتۆ بگرێت، ئەمە لەناو موسوڵمانان دابەش بکە.

سەلما لەناو موسوڵمانان دابەشی کرد، نگینی وا بوو بەپێنج درەم یا شەش درەم دەفرۆشرا و بەهاکەی زیاتر لەبیست هەزار درەم بوو.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب، هاوسەرەکانی بۆ حەج برد و ئەمە دووایین جار بوو حەجی لەگەڵ خەڵکان کرد. ئەم حەدیسەیان لەواقدی گێڕاوەتەوە.

لەم ساڵەدا عومەر کوڕی خەتاب مرد.

## کوژرانی عومەر کوڕی خەتاب

مەسعود کوڕی مەخریمە کەدایکی عاتیکە کچی عەوفە، دەڵێت: ڕۆژێك عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتە بازار و ئەبو لۆلۆ کۆیلەی موغەیرە کوڕی شوعبە ئەوی بینی.

ئەبو لۆلۆ مەسیحی بوو، بەعومەری وت: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەکاری موغەیرە کوڕی شوعبە چاکەم لەگەڵ بکە چوونکە خەراجی قورسم لەسەر شانە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: خەراجەکەی تۆ چەندە؟

وتی: ڕۆژانە دوو درەم.

وتی: چ پیشەیەك دەزانیت؟

وتی: دارتاشم و وێنەکێش و ئاسنگەر.

وتی: بەبۆچوونی من بەو هەموو کارەی ئەنجامی دەدەیت، خەراجەکەی تۆ زۆر نییە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: بیستوومە وتووتە ئەگەر بمەوێت ئاشێك دروست دەکەم کە بەبا کار بکات.

وتی: ئەگەر تەندروست مامەوە، ئاشێکت بۆ دروست دەکەم کەخەڵکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا باسی بکەن.

ئەبو لۆلۆ ڕۆشت و عومەر وتی: ئەم کۆیلەیە ئێستا هەڕەشەی لەمن کرد.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب ڕووی کردەماڵەکەی خۆی و ڕۆژی دواتر کعب الاخبار هاتە لای و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، وەسیەت بکە، چوونکە سێ ڕۆژی دیکە دەمریت.

وتی: لەکوێوە دەزانیت؟

وتی: ئەمە لەکتێبی خوا، تەورات، دەبینم..

وتی: تۆ ناوی عومەر کوڕی خەتاب لەتەوراتدا دەبینی.

وتی: نا، بەڵام تایبەتمەندییەکانی تۆ دەبینیم و ماوەی ژیانی تۆ کۆتایی هاتووە.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب، هەستی بەهیچ دەرد و ئازارێك نەدەکرد و بۆ ڕۆژی دواتر، کەعب هات و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ڕۆژێك بەسەر چوو، تەنیا دوو

ڕۆژ ماوەتەوە.

بۆ بەیانی دووبارە ڕۆشتە لای عومەر و وتی: دوو ڕۆژ بەسەر چووە و تەنیا شەو و ڕۆژێك ماوەتەوە چوونكە تا بەیانی زیندوو دەبیت.

دەڵێت: كاتێك بەیانی داهات، عومەر كوڕی خەتاب، بۆ نوێژ هاتەدەر. ئەو، چەندین كەسی بۆ ڕێك كردنی ریزەكان دادەنا و كاتێك خەڵكان ریزیان دەبەست، دەهات و تەكبیری دەوت.

دەڵێت: ئەبولۆلۆ لەناو خەڵكان هات، خەنجێرێكی دوو سەری بەدەستەوە بوو، شەش جار لەعومەر كوڕی خەتابیدا و یەكیان ژێر كەلەكەی گرت و بووە هۆی كوشتنی. كەلیب كوڕی ئەبی كەسیری لەیسی كە لەپشت سەری سەروەری باوەڕدارانەوە بوو، كوژرا. كاتێك عومەر كوڕی خەتاب هەستی بەسووتانەوەی سیلاحەكە كرد و لەپێ كەوت، وتی: عەبدولرەحمان كوڕی عەوف لەناو خەڵكاندایە؟.

وتیان: بەڵێ ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەمە ئەوە.

وتی: وەرە پێش و پێشنوێژی بۆ خەڵكان بكە.

دەڵێت: عەبدولرەحمان كوڕی عەوف پێشنوێژی بۆ خەڵكان كرد، عومەر كەوتبوو. دواتر ئەویان هەڵگرت و بردیانەوە بۆ ماڵ. عەبدولرەحمان كوڕی عەوفی بانگ كرد و وتی: دەمەوێت لای تۆ وەسیەت بكەم.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، بەڵێ، ئەگەر بەمن بڵێی، ڕازی دەبم.

وتی: مەبەستت چییە؟

وتی: دەتەوێت من وەك خەلیفە دەستنیشان بكەیت؟

وتی: نە، سوێند بەخوا نە.

وتی: سوێند بەخوا هەرگیز بەشداری تیا ناكەم.

وتی: بێدەنگ بە تا سەبارەت بەو كەسانەی پێغەمبەر(د.خ) لەكاتی مردن لێیان ڕازی بوو، قسە بكەم. عەلی و عوسمان و زوبەیر و سەعد بێنەرە لای من.

دواتر وتی: سێ ڕۆژ چاوەڕوانی تەڵحە بن و ئەگەر نەهات، كۆتایی بەكارەكەی خۆتان بێنن، ئەی عەلی سوێندت دەدەم بەخوا ئەگەر جڵەوی كاروبارەكانت گرتەدەست، منداڵەكانی هاشم نەكەیتە هەمەكارەی خەڵكان. ئەی عوسمان، سوێندت دەدەم ئەگەر جڵەوی كاروبارەكانت گرتەدەست، كوڕەكانی باوكی موعیت نەكەیتە

هەمــەکارەی خــەڵکان، ئــەی ســەعد، ســوێندت دەدەم بــەخوا ئەگــەر تــۆ جڵــەوی کاروبارەکانـت گرتەدەسـت، خزمەکانی خـۆت بـۆ کارەکـان رانەسـپێریت. هەسـتن و راوێژ بکەن و کۆتایی بەم کێشەیە بێنن، سوهەیب لەگەڵ خەڵکان نوێژ بخوێنێت.

باوکی تەڵحەی ئەنساری بانگ کرد و وتی: لەبەردەرگا بێستە و رێگە مەدە کەس بڕواتە لایان.

دواتر وتی: پێشنیاری ئەنسارییەکان بەخەلیفەی دوای خۆم دەکەم تا چاکەیان لەگەڵ بکات و لەخراپەکانیان بوگزەرێت، پێشنیاری بەدرییـەکان بەخەلیفەی دوای خۆم دەکەم چوونکە کۆڵەکەی ئیسلامن، زەکات لەوان وەربگرێت و لەناو هەژاراندا دابەشـی بکـات، پێـشنیاری جەزیــەدەران بەخەلیفــەی دوای خــۆم دەکــەم تــا رێــز لەپەیمانەکانیان بگرێت. ئەی خوایا، ئایا کارەکانی خۆم بەئەنجام گەیاند؟ رێگەی خەلیفەی دوای خۆمم تەخت و خۆش کرد.

وتی: ئەی عەبدوڵڵە، بڕۆ بزانە کێ منی کوشت.؟

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەبولۆلۆ کۆیلەی موغەیرە کوڕی شوعبە.

وتـی: سـوپاس بۆخـوا کەمــەرگی مـن لەسـەر دەسـتی کەسـێکە کەیـەکجاریش سـوجدەی بۆ خواوەنـد نەبردووە. ئـەی عەبدوڵڵـە کـوڕی عومـەر! بـڕۆ لای عایـشە و داوای لێ بکە مۆڵەت بدات من لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر بەخاك بسپێرن. ئەی عەبدوڵڵە کوڕی عومەر، ئەگەر جیاوازی لەناو خەڵکان دروست بوو، لەگەڵ زۆرینە بە، ئەگـەر سـێ سـێ بـوون، لەگـەڵ ئـەو دەسـتە بـە کـە عەبـدولرەحمان کـوڕی عـەوفیان لەگەڵدایە. ئەی عەبدوڵڵە، خەڵکان کۆبکەرەوە.

دەڵێت: موهاجیر و ئەنسار لەدەوری کۆبوونەوە و سڵاویان بۆ نارد.

عومەر وتی: ئایا ئەمە بەرەزامەندی ئێوە بوو؟

وتیان: خوا نەکات؟

وتی: کەعبیش لەگەڵ خـەڵکان بێت و کاتێك عومـەر سـەیری کـرد، هۆنراوەیـەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

((کەعب سێ رۆژی بۆ دیاری کردم

گومانی تیا نییە قسەکەی راست بوو

من لەمەرگ ناترسم چوونکە دەمرم

من لەگوناح دەترسم کەدوای گوناح دێت))

دەڵێن: وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، چی دەبێت ئەگەر داوای پزیشك بکەیت. پزیشکێك لەمناڵەکانی حارسیان بانگ کرد و گیراوەیەکیان درخواردداۥ گیراوەکەی هێنیا و کەس ڕەنگەگەی نەدەزانی.

پزیشك وتی: شیری دەرخوارد بدەن.

دەڵێت: شیرەکەی بەسپییەتی هێنایەوە. پێیان وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، وەسیەت بکە.

وتی: کردوومە.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب شەوی چوارشەممە سێ ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججەی ساڵی بیست و سێیەم کۆچی دوایی کرد.

دەڵێت: بەرەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە ئەویان برد و لەماڵی عایشە لای پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر بەخاکیان سپارد.

دەڵێت: سوهەیب هات و نوێژی لەسەر خوێند. پێش ئەو، دووان لەئەسحابەکانی پێغەمبەر(د.خ) ، عەلی و عوسمان، هاتبوونە پێش، یەکیان لەلای سەری و ئەوی دیکەیان لەلای قاچییەوە، عەبدولرەحمان وتی: لا الە الا اللە، چەندە بۆ پێشەوایی تەماحکارن، سەروەری باوەڕداران وتوویەتی، سوهەیب پێشنوێژە.

سوهەیب هات و نوێژی لەسەر خوێند.

دەڵێت: ئەو پێنج کەسە ڕۆشتنە ناو گۆڕەکەی.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەیەك کۆچی دوایی عومەر کوڕی خەتاب لەموحەڕەمی ساڵی بیست و چوارەم ڕوویدا.

ئەبوبەکر کوڕی ئیسماعیل دەڵێت: عومەر لەڕۆژی چوارشەممە چوار ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججە بریندار کرا و لەڕۆژی یەکشەممە بەرەبەیانی یەکی موحەڕەمی ساڵی بیست و چوار بەخاك سپێردرا و ماوەی خەلافەتی ئەو دە ساڵ و پێنج مانگ و بیست و یەك ڕۆژ بوو لەو کاتەوەی ئەبوبەکر ماڵئاوایی لەجیهان کرد.

کاتی مردن، بیست و دوو ساڵ و نۆمانگ و سیانزە ڕۆژ لەکۆچی پێغەمبەر(د.خ) تێپەڕی کرد بوو. ڕۆژی دووشەممە سێ ڕۆژی یەکەمی موحەڕەم لەگەڵ عوسمان

کوڕی عەفان بەیعەتیان بەست.

بێژەر دەڵێت: ئەمەم بۆ عوسمانی ئەخنەسی گێڕایەوە و وتی: بەهەڵەدا چوویت، عومەر کوڕی خەتاب چوار ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججە کۆچی دوایی کرد و یەك ڕۆژ بۆ کۆتایی مانگی زیحەججە لەگەڵ عوسمان بەیعەتیان بەست و خەلافەتی ئەو لەموحەڕەمی ساڵی بیست و چوار دەستی پێکرد.

باوکی مەعشەر دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب ڕۆژی چوارشەممە چوار ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججەی ساڵی بیست و سێیەم کوژرا. ماوەی خەلافەتی ئەو دە ساڵ و شەش مانگ و چوار ڕۆژی خایاند. دوای ئەو، لەگەڵ عوسمان کوڕی عەفان بەیعەتیان بەست.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: بەوتەی مەداینی عومەر کوڕی خەتاب ڕۆژی چوارشەممە حەوت ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججە و بەوتەیەك شەش ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججە بریندار کرا.

خولەید کوڕی زەفرە دەڵێت: عوسمان دوای تێپەڕینی سێ ڕۆژ لەموحەڕەمی ساڵی بیست و چوار خەلافەتی گرتەدەست و لەگەڵ خەڵکان نوێژی عەسری خوێند و نێردراوانی ڕەوانە کرد و ئەمە بوو بەنەریت.

شەعبی دەڵێت: سێ ڕۆژ لەموحەڕەم تێپەڕیبوو کەشەش کەسەکە بۆ خەلافەتی عوسمان ڕێککەوتن. کاتی عەسر بوو، بانگدەرەکەی سوهەیب بانگی فەرموو و خەڵکان بۆ نوێژ کۆببوونەوە کەعوسمان کوڕی عەفان هات و لەگەڵ خەڵکان نوێژی خوێند و سەد درەمی بەمانگانەکان زیاد کرد و کەسانی بۆ ویلایەتەکان نارد. یەکەم کەس بوو ئەو کارەی کرد.

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب سێ ڕۆژ بۆ کۆتایی زیحەججەی ساڵی بیست و سێیەم کۆچی دوایی کرد و ماوەی خەلافەتی ئەو دەساڵ و شەش مانگ و چوار ڕۆژ بوو.

## ڕەچەڵەکی عومەر کوڕی خەتاب

بەوتەی محەممەد کوڕی ئیسحاق و هوشام کوڕی محەممەد و عەلی کوڕی محەممەد، ڕەچەڵەکی عومەر کوڕی خەتاب بەمشێوەیە:

عومەر کوڕی خەتاب کوڕی نوفەیل کوڕی عەبدولعوزا کوڕی ڕەباح کوڕی عەبدوللە کوڕی قەرت کوڕی ڕەزاح کوڕی عودەی کوڕی کەعب کوڕی لوئەی. نازناوەکەی باوکی حەفس بوو. دایکی حەنتەمە کچی هاشم کوڕی موغەیرە کوڕی عەبدوللە کوڕی عومەر کوڕی مەخزومە.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: ئەویان بەفاروق ناو دەبرد. لەنێوان پێشینیان جیاوازی هەیە لەوەی کێ ئەم ناوەی پێبەخشی. دەستەیەك دەڵێن: پێغەمبەر(د.خ) ئەم نازناوەی پێبەخشی.

باوکی عەمرۆ زەکوان دەڵێت: لەعایشەم پرسی: کێ عومەری بەفاروق ناوبرد؟

وتی: پێغەمبەر(د.خ).

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: یەکەم کەسان کەعومەریان بەم ناوە ناوبرد، ئەهلی کتێب بوون، وتیان: موسوڵمانان ئەمەیان لەزمانی ئەوانەوە گێڕاوەتەوە و نەمانبیستووە پێغەمبەر(د.خ) بەو ناوە بانگی کردبێت.

## تایبەتمەندییەکانی عومەر کوڕی خەتاب

زەڕ کوڕی حەبیش دەڵێت: عومەر لەڕۆژی جەژن هاتەدەر، یا لەرێ ورەسمی بەخاك سپاردنی زێنەب بوو، بینیم ڕەش ڕەنگ و باڵابەرز و تاس و چەپ دەست و بەدەستی ڕاستیش کاری دەکرد. کاتێك بەرێگەدا دەڕۆشت، وەك بڵێی سوار لەسەر ئەسپ بوو.

حەدیسێکی دیکە لەزەڕ هەیە کەدەڵێت: عومەر کوڕی خەتابم لەڕۆژی جەژن بینی کەپیادە و پێ پەتی بەرێگەدا دەڕۆشت، چەپلەر و بەدەستی ڕاستیش کاری دەکرد، لەهەموو کەسان باڵابەرزتر و دەتوت سوار لەسەر ئەسپە و بەخەڵکانی دەوت: ئەی خەڵکینە، کۆچ بکەن و کۆچکەر ئاسا مەبن.

عەبدوللە کوڕی عامر کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب پیاوێکی سپی

ڕۆشن و کەمێك سورباو بوو، باڵابەرز و تاس.

خالید کوڕی ئەبی بەکر دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب ڕیشی خۆی زەرد دەکرد و حەنای لەسەری دەبەست.

## ڕۆژی لەدایك بوون و تەمەنی عومەر کوڕی خەتاب

ئوسامە کوڕی زەید کوڕی ئەسلەم لەباوەگەورێی دەگێڕێتەوە: بیستم عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: چوار ساڵ پێش دوایین فەجاری گەورە چاوم بەدنیا هەڵهێنا.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: رابردووان سەبارەت بەتەمەنی عومەر کوڕی خەتاب جیاوازییان هەیە. دەستەیەك وتوویانە لەکاتی مەرگ، پەنجا و پێنج ساڵ بوو.

کوڕی عومەر دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب پەنجاوپێنج ساڵە بوو کوژرا.

کوڕی شەهابیش دەڵێت: لەکاتی مردن، تەمەنی پەنجا و سێ ساڵ و چەند مانگ بوو. ئەمەیان لەهوشام کوڕی محەممەدی کەلبی گێڕاوەتەوە.

دەستەیەکی دیکەوتوویانە: لەکاتی مەرگ تەمەنی شەست وسێ ساڵ و ئەم حەدیسەیان لەعامر گێڕاوەتەوە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: لەکاتی مەرگ شەست و یەك ساڵی بوو. ئەم حەدیسەیان لەقتادە گێڕاوەتەوە.

دەستەیەکی دیکە وتوویانە: شەست ساڵ و ئەم حەدیسەیان لەزەید کوڕی ئەسلەم گێڕاوەتەوە. محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: لای ئێمە ئەم حەدیسە لەحەدیسەکانی دیکە بڕواپێکراوترە.

لەمەداینی دەگێڕنەوە: عومەر کوڕی خەاب لەکاتی مەرگ، پەنجا و حەوت ساڵە بوو.

## ناوی منداڵەکان و هاوسەرەکانی عومەر کوڕی خەتاب

هوشام کوڕی محەممەد دەڵێت: عومەر لەڕۆژگاری جاهلییەت زێنەب کچی مەزعونی کردە هاوسەری خۆی و عەبدولڕەحمانی گەورە و عەبدوڵڵە و حەفسە چاویان بەدنیا هەڵهێنا.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: لەڕۆژگاری جاهلییەت، مەلیکە کچی جەرولی خوزاعی کردە هاوسەر و عەبدوڵڵە کوڕی عومەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا و لەکاتی ئاشتی لێی جیابوویەوە و دوای عومەر کوڕی خەتاب، باوکی جەهم کوڕی حوزەیفە ئەوی وەك هاوسەر هەڵبژارد.

محەممەد کوڕی عومەر دەڵێت: دایکی زەیدی بچوك و عوبەیداللە کە لەجەنگی سەفین هاوڕێیەتی معاویەی دەکرد و کوژرا، دایکی کولسوم کچی جەرول کوڕی مالیك و ئیسلام لەنێوان ئەو و عومەر کوڕی خەتاب جیابوونەوەی دروست کرد.

عەلی کوڕی محەممەد دەڵێت: قورەیبە کچی باوکی ئومەییەی مەخزومی لەڕۆژگاری جاهلییەت وەك هاوسەر هەڵبژارد و لەکاتی ئاشتی لێی جیابوویەوە، دوای عومەر، عەبدولڕەحمان کوڕی ئەبوبەکری ڕاستگۆ ئەوی کردە هاوسەر.

دەڵێن: دایکی حەکیم کچی حارس کوڕی هوشامی مەخزومی لەئیسلامدا وەك هاوسەر هەڵبژارد و عاسم چاوی بەدنیا هەڵهێنا. دواتر تەڵاقیدا.

هەروەها عومەر کوڕی خەتاب دایکی کولسوم کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیبی کردە هاوسەر کەدایکی فاتیمە کچی پێغەمبەرە. وەك وتوویانە چل هەزار مارەیی ئەو بوو و زەید و ڕوقیە چاویان بەدنیا هەڵهێنا.

یەکێك لەژنانی خەڵکی یەمەن بەناوی ئەهیەی کردە هاوسەر و عەبدولڕەحمان چاوی بەدنیا هەڵهێنا.

مەداینی دەڵێت: ئەهیە عەبدولڕەحمانی بچوکی.هێنایە دنیا و بەوتەیەك ئەو، کەنیز بوو. بەوتەی واقدیش ئەهیە کەنیز و عەبدولڕەحمانی نێوەنجی بۆ عومەر هێنایە دنیا، دایکی عەبدولڕەحمانی بچوکیش کەنیز بوو.

فوکەیهەیش هاوسەری عومەر بوو، ئەویش کەنیز و زێنەبی هێنایە دنیا و بەوتەی واقدی بچووکترین منداڵی عومەر کوڕی خەتاب بوو.

عاتیکە کچی زەید کوڕی عەمرۆ کوڕی نوفەیلی کردە هاوسەر کەپێشتر هاوسەری عەبدوللە کوڕی ئەبوبەکر و کاتێک عومەر کوڕی خەتاب مرد، زوبەیر کوڕی عەوام ئەوی کردە هاوسەری خۆی.

مەداینی دەڵێت: خوازبێنی دایکی کولسوم کچی ئەبوبەکری کرد کەمناڵ بوو.سەبارەت بەو کەسی بۆ لای عایشە نارد کەبەدایکی کولسومی وت: ئەمە بەدڵخوازی خۆتە.

وتی: من کارم بەو نییە.

وتی: سەروەری باوەڕدارانت ناوێت؟

وتی: نە، بژێوی کەمە و لەگەڵ ژنان سەختگیرە.

عایشە کەسی بەدوای عەمرۆ کوڕی عاس نارد و ئەم بەسەرهاتەی بۆ باس کرد.

وتی: چاکی دەکەم.

ڕۆشتە لای عومەر و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هەواڵێکم بیستووە، خوا نەکات راست بێت.

عومەر پرسی: چییە؟

وتی: خوازبێنی دایکی کولسوم کچی ئەبوبەکرت کردووە؟

وتی: بەڵێ، من بۆ ئەو پەسەند ناکەیت یا ئەو بۆ من؟

وتی: هیچ کام، بەڵام ئەو منالە و لەسێبەری ئەبوبەکری خەلیفە بە نەرم و نیانی پەروەردە کراوە و تۆ کەسێکی توندوتیژیت و دەترسین و ناتوانین هیچ کام لەعادەتەکانی تۆ بگۆڕین، کاتێک ئەو سەبارەت بەشتێک دژایەتی تۆ بکات، توندوتیژی لەگەڵ دەکەیت و بەمشێوەیە توند وتیژی لەگەڵ منالی ئەبوبەکر دەکەیت کەبەهیچ جۆرێك ماف ئەو کارەت نییە.

وتی: ئەی عایشە، قسەم لەگەڵ کردووە.

وتی: خۆم قسە لەگەڵ عایشە دەکەم و باشتر لەو بۆ تۆ داوا دەکەم: دایکی کولسوم کچی عەلی کوڕی ئەبی تالیب تا بەهۆی ئەم پەیوەندییەوە ببیتە خزمی پێغەمبەر(د.خ).

مەداینی دەڵێت: خوازبێنی دایکی ئەمان کچی عوتبە کوڕی رەبیعەی کرد بەڵام

پەسەندی نەکرد و وتی: دەرگاکەی دادەخات و خێری بۆ کەس نییە و رووگرژ دێت و رووگرژ دەڕوات.

## کاتی باوەڕهێنانی عومەر کوڕی خەتاب

ئەبوجەعفەر دەڵێت: وتوویانە ئەو دوای چل و پێنج پیاو و بیست و یەك ژن باوەڕی بەئیسلام هێنا.

محەممەد کوڕی عەبدولله دەڵێت: لەگەڵ باوکم سەبارەت بەعومەر کوڕی خەتاب قسەمان دەکرد و وتی: عەبدولله کوڕی سەعلەبە پێی وتم: عومەر کوڕی خەتاب دوای چل و پێنج پیاو و بیست و یەك ژن باوەڕی هێنا.

## بەشێك لەکردوەکانی عومەر کوڕی خەتاب

حوسێن کوڕی موزنی دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: نموونەی عەرەب، نموونەی وشتری سەرکێشە و بەدوای سوارەکەی خۆیدا دەڕوات، دەبێت ئەو کەسەی وشترەکە دەبات، بزانێت بۆ کوێی دەبات. سوێند بەخوای کەعبە ئەوان بۆ رێگەی راست دەبەم.

حەسەن دەڵێت: عومەر دەیوت: ئەگەر لەپێگەیەکدا بم کەمن گیرۆدەی بگرە و بێنە و خەڵکان لەزەحمەتدا بن، سوێند بەخوا نابێت بەپێگە ناوی ببەن تا ببمە نموونەی کەسان.

باوکی یەزیدی مەداینی یەکێك لەموالییەکانی عوسمان دەڵێت: لەریزی عوسماندا سوار ببووم، رۆژێکی گەرم و ژەهراوی بوو، عوسمان رووی کردە ئاخوڕی وشترەکانی زەکات، کەسێکم بینی عابایەکی پۆشیبوو و سەری خۆی پێچابوویەوە و لەوشترەکانی دەدا و بۆ ئاخوڕی وشترەکانی دەبردن.

عوسمان وتی: گومان دەکەیت، ئەوە کێیە؟

کاتێك نزیك بوومەوە بینیم عومەر کوڕی خەتابە. عوسمان وتی: سوێند بەخوا بەهێز و ئەمینە.

ئەبوبەکری عەبەسی دەڵێت: لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب و عەلی کوڕی ئەبی

تالیب بۆ بژاردنی زەکاتییەکان ڕۆشتین.

دەڵێت: عوسمان لەسێبەردا دانیشت و دەستی بەنووسین کرد، عەلی لەسەر سەری وەستابوو و وتەکانی عومەر کوڕی خەتابی بۆ دەخوێندەوە، عومەر لەهەتاوەکەدا وەستابوو، ڕۆژێکی گەرم و عومەر جل وبەرگێکی ڕەشی لەبەردابووو، یەکێك لەعاباکانی لەکەمەری ئاڵاندبوو و ئەوی دیکەیانی لەسەری پێچابوو. وشترەکانی زەکاتی دەبژارد و ڕەنگ و ددانەکانی ئەوانی دەنووسی. عەلی لەگەڵ عوسمان قسەی کرد و بیستم کەوتی: کچی شۆعەیب لەکتێبی خوا وەسفی هێناوە و دەڵێت: ئەی باوکە، ئەو بەکریێ بگرە چوونکە بەهێزە و ئەمین. عەلی بەدەستی خۆی ئاماژەی بۆ عومەر کرد و وتی: بەهێزی ئەمین، ئەمەیە.

حەسەن دەڵێت: عومەر دەیوت: بەخواستی خوا ئەگەر زیندوو بم بۆ ماوەی یەك ساڵ لەناو ژێردەستەکاندا دەگەڕێم، دەزانم خەڵکان پێداویستییان هەیە و بەمن ناگات، کارگوزارەکانم ئاگادارم ناکەنەوە، خۆیشیان دەستیان بەمن ناگات، دەڕۆمە شام و یەك مانگ لەوێ دەمێنمەوە، دواتر ڕوودەکەمە جەزیرە و دوو مانگ دەمێنمەوە، دەڕۆمە میسر و دوومانگ دەمێنمەوە، دەڕۆمە بەحرەین و دوومانگ دەمێنمەوە، دواتر دەڕۆمە کوفە و دوومانگ دەمێنمەوە، دواتر ڕوو دەکەمە بەسرە و دوومانگ دەمێنمەوە و سوێند بەخوا ئەمە ڕەزامەندی خوای بەدواوە دێت.

کەعب الاخبار وتی: ڕۆشتمە لای پیاوێك بەناوی مالك کەدراوسێی عومەر کوڕی خەتاب بوو، مەنزڵم کرد و وتم: چۆن دەتوانم بڕۆمە لای سەروەری باوەڕداران؟

وتی: دەرگا و پەردەی نییە، نوێژ دەکات و دادەنیشێت و هەرکەس بیەوێت، قسەی لەگەڵ دەکات.

ئەسلەم دەڵێت: عومەر منی لەگەڵ دەستەیەك لەوشترەکانی زەکات نارد، کەرەستەکانی خۆم خستە سەر پشتی وشترێك و کاتێك ویستم وشترەکە ببەم، وتی: وشترەکان ببژێرە. ئەوە کارەم کرد و کەرەستەکانی منی لەسەر یەکێك لەوشترە جوانەکان بینی و وتی: ئەی بێ دایك، وشترێکت هەڵگرتووە کەدەتوانێت بژێوی بنەماڵەیەکی موسوڵمان دابین بکات، بۆ وشترێکی لەڕ یا وشترێکی کەم شیرت هەڵنەگرت.

ئەبی دێهقانە دەڵێت: بەعومەر کوڕی خەتابیان وت: لێرەپیاوێك لەخەڵکانی ئەنبار دەژیت کە شارەزای کاروباری دیوانە، چی دەبێت ئەگەر وەك دەبیری خۆت دیاری بکەیت.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: بەو شێوەیە کەسێکی ناباوەڕم کردۆتە رازداری موسوڵمانان.

عەبدولرەحمان کوڕی زەید لەباوەرگەورێی دەگێڕێتەوە: عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ خەڵکان قسەی کرد و وتی: سوێند بەو خوایەی محەممەدی بەراستی نارد، ئەگەر وشترێك لەناوچەی رووباری فورات بەناڕەوا لەناو بچێت، دەترسم خواوەند لێکۆڵینەوە لەبنەماڵەی خەتاب بکات.

باوکی زەید دەڵێت: لەبنەماڵەی خەتاب مەبەستی خۆی بوو نەکەسی دیکە.

باوکی عیمرانی جوەنی دەڵێت: عومەر نامەی بۆ باوکی موسا نووسی: خەڵکان بەردەوام سەرکردەیان هەیە کەپێویستییەکانی ئەوان بەرز دەکاتەوە، رێز لەسەرکردەکانی خەڵکان بگرە، بۆ موسوڵمانە لاوازەکان ئەم رادەیە لەدادپەروەری بەسە کە لەداوەری کردن و دابەش کردنی تالآنییەکان، دادپەروەرییان لەگەڵ بکەیت.

شەعبی دەڵێت: عەرەبێکی سارانشین هاتە لای و وتی: وشترەکەی من دومەڵی هەیە و بریندارە، چوارپێیەکم پێبدە.

عومەر وتی: وشترەکەت نەدومەڵی هەیە، نە بڕین.

دەڵێت: پیاوەکە ڕۆشت و هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە خوێندەوە:

((باوکی حەفس، عومەر کوڕی خەتاب، سوێندی خوارد

کەوشترەکەم نەدومەڵی هەیە نەبرین

خواوەندا ئەگەر هەڵەی کردووە، بیبەخشە.))

عومەر کوڕی خەتاب وتی: خواوەندا، بمبەخشە و پیاوەکەی بانگ کرد و وشترێکی پێدا.

محەممەد دەڵێت: بیستم یەکێك لەخزمەکانی عومەر کوڕی خەتاب داوای شتێکی لێکرد. عومەر لێی تورە بوو و لەماڵەکەی دەریکرد.

وتی: لەماڵی خوای دەویست، ئەگەر وەك پاشایەکی خیانەتکار بڕۆمە پێشگای خواوەند، پاساوم نابێت، بۆ لەماڵی خۆمی نەویست.

دەڵێت: دواتر دەهەزاری بۆ نارد.

عومەر کوڕی خەتاب کارگوزارێکی ڕەوانە دەکرد و وەك لەگێڕانەوەی تارق کوڕی هوشام ئاماژەی پێدراوە، دەیوت: سوێند بەخوا ئەوان نانێرم دەست بەسەر سامانی خەڵکان بگرن یا لێیان بدەن، هەرکەس ئەمیرەکەی ستەمی لێ بکات، جگە لەمن ئەمیری نییە.

مەعدان کوڕی ئەبی تەڵحە دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب، لەرۆژی هەینی قسەی بۆ خەڵکان کرد و وتی: خواوەندا، تۆ دەکەمە شایەتی ئەمیری ویلایەتەکان، ئەوانم ڕەوانە کرد تا دین و سونەتی پێغەمبەر(د.خ) فێری خەڵکان بکەن و تالانییەکان لەنێوان ئەواندا دابەش بکەن ودادپەروەری بکەنە پیشە و ئەگەر ڕووبەڕووی کێشەیەك بوونەوە، منی لێ ئاگادار بکەنەوە.

باوکی حوسێن دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب کاتێك کەسێکی وەك کارگوزار دەنارد، بەڕێی دەکردن و دەیوت: ئێوەم نەکردۆتە فەرمانڕەوای جەستەی ئۆمەتی محەممەد، ئێوەم ڕاسپاردووە نوێژیان لەگەڵ بخوێنن و دادپەروەرانە لەنێوان ئەوان داوەری بکەن، ئێوەم بەسەر جەستەی ئەواندا زاڵ نەکردووە، قامچی لەعەرەبەکان مەدەن چوونکە زەلیل دەبن و زۆر لەوڵاتی خۆیان دووریان مەخەنەوە چوونکە گرفتاری فیتنە و ئاژاوە دەبن، لەوان بێ ئاگا مەبن و بێ بەشیان مەکەن. قورئان بەپاکی لەناویاندا بڵاو بکەنەوە و هیچ حەدیسێك لە محەممەد مەگێڕنەوە. منیش کاری ئێوە دەکەم.

دەڵێت: کاتێك کەسێك سکاڵای لەیەکێك لەکارگوزارەکانی دەکرد، هەردوو کەسەکەی ڕووبەڕوو دەکردەوە، ئەگەر شتێك یا هۆکارێك بۆ سەرکۆنە کردنی دەبینی، سەرکۆنەی دەکرد.

باوکی فوراس دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بەخوا کارگوزاران بۆ لای ئێوە نانێرم لێتان بدەن یا دەست بەسەر سامانی ئێوەدا بگرن، دەیاننێرم تا دین و سوونەتی پێغەمبەرتان فێر بکەن وهەرکەس جگە لەمەی ئەنجامدا، بیهێننە لای من، سوێند بەو کەسەی گیانی عومەر لەدەستی ئەودایە، تۆڵەی لێدەستێنمەوە.

لەم کاتەدا عەمرۆ کوڕی عاس هەستا و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر یەکێك لەئەمیرەکان، سزای یەکێك لەژێردەستەکانی خۆی بدات، سزای دەدەیتەوە؟

وتی: بەڵێ، سوێند بەوخوایەی گیانی عومەر لەدەستی ئەودایە، تۆڵەی لێدەستێنم، چۆن ئەو کارە نەکەم لەکاتێکدا پێغەمبەرم بینی، ئەو کارەی لەگەڵ خۆی دەکرد. لەموسوڵمانان مەدەن چوونکە زەلیل دەبن و لەوڵاتی خۆیان زۆر دووریان مەخەنەوە تا گرفتاری ئاژاوە و فیتنە نەبن و مافەکانیان پێبدەن تا کافر نەبن و لەزۆنکاوەکان نیشتەجێیان مەکەن بۆ ئەوەی لەناو بچن.

عومەر کوڕی خەتاب خۆی کێشکی دەگرت و لای ماڵی موسوڵمانان گوزەری دەکرد و لەبارودۆخی ئەوان ئاگادار دەبوویەوە.

بەکر کوڕی عەبدوللەی موزنی دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتە بەردەرگای عەبدولرەحمان کوڕی عەوف و لەدەرگایدا، ژنێك هات و دەرگاکەی کردەوە و وتی: مەیێرە ژوور تا بڕۆم و بگەمە شوێنەکەی خۆم. عومەر نەڕۆشتە ژوور، تا ژنەکە گەڕایەوە شوێنی خۆی و وتی: وەرە ژوور.

عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتە ژوور و وتی: هیچیتان بۆ خواردن هەیە.

ژنەکە خواردنی هێنا و خواردی. عەبدولرەحمان نوێژی دەخوێند، عومەر پێی وت: ئەی پیاو، نوێژەکەت کورت کەرەوە.

عەبدولرەحمان سلاوی نوێژەکەی دایەوە و رووی کردە عومەر کوڕی خەتاب و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەم کاتەدا بەچ مەبەستێك هاتوویت؟

وتی: دەستەیەك لەبازاری مەدینە دابەزیون و دەترسم دزەکانی مەدینە هێرشیان بکەنەسەر. با بڕۆین و پاسەوانی ئەوان بکەین.

دەڵێت: ڕۆشتن و لەبازار لەسەر بەرزاییەك دانیشتن و بەگفتوگۆ کردنەوە سەرقاڵ بوون. لەو کاتەدا چرایەکیان بینی، عومەر وتی: مەگەر فەرمانم نەدابوو، دوای خەو، کەس چرا هەڵنەکات؟

ڕۆشتن و دەستەیەکیان بینی، سەرقاڵی شەراب خورادنەوە بوون. عومەر کوڕی خەتاب وتی: بڕۆین، ناسیمەوە.

دەڵێت: بەرەبەیان کەسی بەدوای ئەو پیاوەدا نارد و وتی: فلاَن کەس، دوێ شەو خۆت و هاوەلاَنت سەرقاڵی شەراب خواردنەوە بوون.

وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، لەکوێوە زانیت؟

وتی: خۆم بینیم.

وتی: مەگەر خواوەند ڕێگەی ئەو کارەی لێنەگرتوویت (بەدزییەوە لەبارودۆخی ژیانی خەڵکان بکۆڵیتەوە)

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب، لێی خۆش بوو.

بەکر کوڕی عەبدوڵڵەی موزنی دەڵێت: عومەر فەرمانیدا لەکاتی خەوتن هەموو چراکان بکوژێننەوە لەبەر ئەوەی مشك پلیتەی چراکەی رادەکێشا و دەیبردە سەر سەقفی ماڵەکە و ماڵەکە گڕی دەگرت. لەو ڕۆژگارەدا سەقی ماڵەکانیان بەگەڵای دارخورما دروست دەکرد.

زەید کوڕی ئەسلەم لەباوکی دەگێڕێتەوە: لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب ڕوومان کردە حوڕە و ئەقەم، کاتێك گەیشتینە زەرار، ئاگرێکی داگیرساومان بینی.

عومەر وتی: ئەسلەم، کاروانێکە لەم شەوە ساردەدا ماوەتەوە، با بڕۆینە لایان.

دەڵێت: بەخێرایی بەرێکەوتین و کاتێك لێیان نزیك بووینەوە، ژنێك و منداڵەکانیمان بینی، قازانێك لەسەر ئاگر بوو و منداڵەکان دەیانناڵاند.

عومەر وتی: سڵاو لەئێوە ئەی خاوەنانی ڕووناکی. نەیویست بڵێت ئەی خاوەنانی ئاگر.

ژن وتی: سڵاو لەتۆیش بێت.

عومەر وتی: بێمە پێش.

وتی: وەك کەسێکی چاکەکار وەرە پێش وەگەرنە بڕۆ.

عومەر نزیك کەوتەوە و وتی: کێشەی ئێوە چییە؟

وتی: لەم شەوە ساردەدا ماوینەتەوە.

وتی: ئەو منداڵانە بۆ دەناڵێنن.

وتی: لەبرسانا.

عومەر وتی: ئەو قازانە چی تیایە؟

وتی: ئاوە و منداڵەکان بەهۆیەوە بێدەنگ دەکەم تا خەویان لێدەکەوێت، خواوەند لەنێوان ئێمە و عومەر کوڕی خەتاب داوەری بکات.

دەڵێت: خوا لێت خۆش بێت عومەر کوڕی خەتاب لەبارودۆخی ئێوە ئاگادارە؟

ژن وتی: کاروباری ئێمە لەدەستی ئەودایە و لەئێمە بێ ئاگایە!

عومەر رووی کردە من و وتی: بڕۆین.

دەڵێت: بەڕاکردن گەڕاینەوە تا گەیشتینە دار ئەلدەقیق، چەوری و ئاردی هەڵگرت و وتی: بیخە سەر شانی من.

وتم: من هەڵیدەگرم.

وتی: بیخە سەر شانی من. دوو سێ جار وتەکەی دووبارە کردەوە و دەموت: من هەڵیدەگرم.

سەرئەنجام پێی وتم: ئەی بێ دایک، لەرۆژی هەستانەوە، تۆ گوناحەکانی من لەئەستۆ دەگریت؟

بارەکەم خستە سەر شانی و بەرێکەوت. منیش لەگەڵی ڕۆشتم و بەڕاکردن ڕێگەمان دەبڕی تا گەیشتینە لای ژنەکە. بارەکەی داگرت وکەمێك ئاردی دەرهێنا و وتی: تۆ بیرێژە و من دەیشێلم. دواتر مەبەستی ئەوەی کرد فوو لەئاگرەکە بکات، ریشی درێژ بوو، دووکەڵم لەنێوان تاڵەکانی ریشی دەبینی. فووی لەئاگرە کرد تا قازانەکە کوڵا. ژنەکە دایگرت و عومەر وتی: شتێك بێنە. ژن سینییەکی هێنا و قازانەکەی رۆ کرد.

عومەر وتی: دەرخواردیان بدە، من پانی دەکەمەوە.

دەڵێت: ئەو کارەیان کرد تا تێر بوون و پاشماوەکەی لای ژنەکە بەجێهێشت و هەستا. منیش هەستام.

ژن وتی: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە، تۆ بۆ خەلافەت لەعومەر کوڕی خەتاب شیاوتریت.

عومەر وتی: وتاری باش بێنەرە سەرزمان، ئەگەر بڕۆیتە لای سەروەری باوەڕداران، بەخواستی خوا، من لەوێ دەبینیت.

لەژنەکە دوور کەوتەوە و دواتر وەك ئاژەڵێکی دڕندە بۆسەی دانا، پێم وت: ئەمە کاری تۆ نییە، بەڵام وەڵامی نەدەدامەوە تا ئەو کاتەی منداڵەکانی بینی کەسەرقاڵی پێکەنین و گەمە کردنن و دوای گەمە کردنن ئارامیان گرت و خەویان لێ کەوت.

عومەر هەستا و سوپاسی خوای کرد و وتی: ئەسلەم، لەتاو برسیەتی خەویان لێ

زڕا بوو و دەگریان، نەمویست بڕۆم تا ئاسوودەیی لەروخساری ئەواندا ببینم.

عومەر کوڕی خەتاب کاتێك بۆ چاکسازی لەکاروباری موسوڵمانان فەرمانی شتێکی پێدەدان یا رێگری کارێکی لێ دەکردن، لەبنەماڵەکەی خۆیەوە دەستی پێدەکرد و ئامۆژگاری دەکردن. هەڕشەی لێدەکردن بۆ ئەوەی پێچەونەای فەرمانەکانی ئەو نەجوولێنەوە.

سالم دەڵێت: کاتێك عومەر دەڕۆشتە سەر مینبەر و رێگەی ئەنجام دانی کارێکی لەخەڵکان دەگرت، کەسانی خۆی کۆدەکردەوە و دەیوت: رێگەی ئەنجامدانی فلآنە کار و فیسارە کارم لەخەڵکان گرتووە، خەڵکان بەشێوەیەك سەیری ئێوە دەکەن کەباڵندەکان لەگۆشت، سوێند بەخوا هەرکەس لەئێوە ئەو کارە ئەنجام بدات، دوو بەرابەر سزای دەدەم.

ئەبوجەعفەر دەڵێت: عومەر سەبارەت بەهەموو شتێك سەختگیر بوو و بۆ وەرگرتنی حەق و راستی پێداگری دەکرد. سەبارەت بەئەرکەکانی خۆی نەرم و نیان و بەرابەر بەلاواز و هەژارەکان بەخشەندە و میهرەبان.

زەید کوڕی ئەسلەم دەڵێت: چەند کەسێك لەموسوڵمانان لەگەڵ عەبدولرەحمان کوڕی عەوف قسەیان کرد و وتیان: لەگەڵ سەروەری باوەڕداران قسە بکە چوونکە ئێمە لێی دەترسین، بەرادەیەك سوێند بەخوا ناتوانین چاو ببڕینە ناوچاوی.

دەڵێت: عەبدولرەحمان عومەر کوڕی خەتابی لەمە ئاگادار کردەوە.

عومەر وتی: بەراستی وایان وت. بەرادەیەك نەرمیم لەگەڵ نواندوون کەبە هۆیەوە لەخواوەند دەترسم، سوێند بەخوا ترسی من لەوان زیاترە لەترسی ئەوان لەمن.

عاسم دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب کەسێکی کردە کارگوزاری میسر، رۆژێك کە لەسەر یەکێك لەرێگەکانی مەدینە گوزەری دەکرد، بیستی کەسێك دەڵێت: ئەی هاوار لەتۆ عومەر، کەسێکت کردۆتە کارگوزار کەخیانەت دەکات، دەڵێی پەیوەندی بەمنەوە نییە و کارگوزارەکەی تۆ ئەو کارە دەکات.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب کارگوزارەکەی بانگ کرد و کاتێك هات، داردەست و عابا و چەندین سەر مەڕی پێدا و وتی: ئەم مەڕانە بلەوەڕێنە چوونکە باوکیشت شوان بووە.

دەڵێت: ناوی ئەو عەیاز کوڕی غەنەم بوو، دواتر ئەوی بانگ کرد و وتەیەکی هێنایە سەرزمان وتی: ئەگەر دووبارە بتگەڕێنمەوە.

ئەوی بۆ سەر کارەکەی گەڕاندەوە و پێی وت: دەبێت بەڵێن بدەیت جل و بەرگی ناسك نەپۆشیت و سوار ئەسپی تورکی نەبیت.

کوڕی خەزیمە کوڕی سابتی ئەنساری دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب کەسێکی دەکردە کارگوزار، فەرمانێکی بۆ دەنووسی و دەستەیەك لەئەنسار و موهاجیرەکانی دەکردە شایەت و بەڵێنی لێوەردەگرتن سوار ئەسپی تورکی نەبن و خواردنی باش نەخوات و جل و بەرگی ناسك نەپۆشێت و دەرگای لەسەر نیازمەندان دانەخات.

عیمران دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب نیازمەند دەبوو، دەڕۆشتە لای لێپرسراوی بیت المال و شتێکی بەقەرز وەردەگرت، زۆر جار عومەر هەژار و نیازمەند بوو و لێپرسراوی بیت المال دەهات و داوای قەرزەکەی دەکردەوە و شوێنی دەکەوت وعومەر کوڕی خەتاب بۆ رزگار بوون لەدەستی ئەو فێڵی دەکرد و کاتێك مانگانەی خۆی وەردەگرت، قەرزەکەی دەدایەوە.

ئەبو بەرۆ کوڕی مەعرور دەڵێت: رۆژێك عومەر کوڕی خەتاب ڕۆشتە سەر مینبەر، نەخۆش بوو، پێیان وتبوو هەنگوین بخوات و دەفرێك هەنگوین لەبیت المال بوو، وتی: ئەگەر رێگەم پێدەدەن، هەڵیدەگرم و گەرنە بۆ من حەرامە.

## هەڵبژاردنی ناوی سەروەری باوەڕداران بۆ عومەر کوڕی خەتاب

ئەبوجەعفەر دەڵێت: یەکەم کەس بە سەروەری باوەڕداران بانگ کرا، عومەر کوڕی خەتاب بوو، دواتر ئەمە بوو بەنەریت و خەلیفەکان تا ئێستا ئەو ناوە بەکار دەبەن.

دایکی عەمرۆ کوڤ کچی حەسان لەباوکی دەگێڕێتەوە: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب خەلافەتی گرتەدەست، وتیان: ئەی خەلیفەی خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ).

عومەر وتی: کاتێك دوای من خەلیفەیەکی دیکە بێتەسەر کار، ئەم ناوە درێژ دەبێت و دەڵێن: ئەی خەلیفەی خەلیفەی خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ)، ئێوە باوەڕدارن و منیش ئەمیری ئێوەم. ئەویان بەئەمیری مۆمنان (سەروەری باوەڕداران) ناو برد.

ئەحمەد کوڕی عەبدسەمەد دەڵێت: لەدایکی عەمرۆم پرسی تەمەنت چەند ساڵە؟

وتی: سەد و سی و سێ ساڵ.

جابر دەڵێت: کەسێك بەعومەر کوڕی خەتابی وت: ئەی خەلیفەی خوا.

وتی: خواوەند، دەمی تۆ دابخات.

وتی: خواوەند بمکاتە قوربانی تۆ.

وتی: کەواتە خواوەند ریسوات دەکات.

## دانانی مێژوو لەلایەن عومەر کوڕی خەتاب

ئەبوجەعفەر دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب یەکەم کەس بوو بناغەی مێژووی ئیسلامی دانا ومێژووی نووسییەوە. ئەم بابەتە وەك لەگێڕانەوەی محەممەد کوڕی عومەر ئاماژەی پێدراوە لەساڵی شانزەیەمی کۆچ و مانگی رەبیع الاوەلدا بوو. پێشتر چۆنیەتی نووسینەوەی مێژوومان باس کرد.

عومەر کوڕی خەتاب یەکەم کەس بوو بەرواری لەنامەکاندا و بەگڵ مۆری کرد و یەکەم کەس بوو بیت المالی بوو و یەکەم کەس بوو شەوانە کێشکی دەگرت و یەکەم کەس بوو بەهۆی هۆنراوەوە سزایدا و یەکەم کەس بوو فرۆشتنی ئەو کەنیزانەی منالیان هێنابوویە دنیا، یاساغی کرد و یەکەم کەس بوو چوار جار لەنوێژی مردوو، تەکبیری هێنایە سەرزمان کەپێشتر چوار و پێنج و شەش جار تەکبیریان دەوت و یەکەم کەس بوو قامچی لەکەساندا ویەکەم کەس بوو لەمانگی رەمەزان نوێژی شەوانی بەجەماعەت خوێند و نامەی بۆ ویلایەتەکان و موسوڵمانان نووسی ئەو کارە بکەن و ئەم بابەتە وەك لەگێڕانەوەی محەممەد کوڕی عومەر ئاماژەی پێدراوە، لەساڵی چواردەیەم روویدا. دوو قورئان خوێنی بۆ خەڵکان دەستنیشان کرد، قورئان خوێنێك کەنوێژی لەگەڵ پیاوان دەخوێند و قورئان خوێنێك کەنوێژی لەگەڵ ژنان دەخوێند.

## عومەر کوڕی خەتاب قامچی بەدەستەوە گرتودیوانی ڕێکخست

عومەر کوڕی خەتاب یەکەم کەس بوو قامچی بەدەستەوە و گرت و لەخەڵکانیدا و یەکەم کەس بوو کاروباری دیوانی ڕێکخست و ناوی کەسانی بەپێی هۆزەکانیان نووسی و مانگانەی بۆ بڕینەوە.

جوبەیر کوڕی حوەیرس دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب لەگەڵ موسوڵمانان بۆ ڕێکخستنی دیوان ڕاوێژی کرد، عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ساڵانە ئەو سامانەی لای تۆ کۆدەبێتەوە، دابەش بکە و هیچی لای خۆت مەهێڵەرەوە.

عوسمان کوڕی عەفان وتی: سامان فراوانە و بەهەموو خەڵکان دەگات، ئەگەر نەژمێردرێن، تا ئەوەی وەریگرتووە لەوەی وەرینەگرتووە، جیا بکرێتەوە، ئەم کارە دەشێوێت.

وەلید کوڕی هوشام کوڕی موغەیرە وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، ڕۆشتوومەتە شام و پاشاکانی ئەو سەرزەمینەم بینیوە کەدیوانیان ڕێکخستووە و سوپایەکیان ئامادە کردووە، تۆیش دیوان و سوپایەك ڕێکبخە.

عومەر وتەکەی بەکار برد، عەقیل کوڕی ئەبی تالیب و مەخریمە کوڕی نەوفل و جوبەیر کوڕی موتعیم کە لەڕەچەڵەك ناسانی قورەیش بوون، بانگ کرد و وتی: ناوی کەسەکان بەپێی پێگە و جێگەیان تۆمار بکەن.

ئەوان نووسیان و لەمناڵەکانی هاشمەوە دەستیان پێکرد. ئەبوبەکر و بنەماڵەکەی ئەویان دوای مناڵەکانی هاشم نووسی و عومەر و خەڵکەکەی ئەویان بەهۆی ئەوەی خەلیفەی موسوڵمانان بوو، دوای ئەوان تۆمار کرد.

کاتێك عومەر سەیری کرد، وتی: حەزم دەکرد بەمشێوە بێت، بەڵام سەرەتا خزمەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەپێی نزیکی ئەوان لە پێغەمبەر(د.خ) بنووسن و عومەر کوڕی خەتاب لەشوێنێکدا بنووسن کەخواوەند بۆی دیاریکردووە.

ئوسامە کوڕی زەید کوڕی ئەسلەم لەباوەگەورێی دەگێڕێتەوە: عومەر کوڕی خەتابم بینی کاتێك تۆمارەکەیان نیشاندا، مناڵەکانی تیم بەدوای مناڵەکانی هاشم نووسرابوون و مناڵەکانی عودەی دوای مناڵەکانی تیم، بیستم دەیوت: عومەر کوڕی خەتاب لەشوێنی خۆیدا بنووسن و لەخزمەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەپێی نزیکی ئەوان

لە پێغەمبەر(د.خ) دەستپێبکەن.

دەڵێت: منداڵەکانی عودەی ڕۆشتنە لای عومەر کوڕی خەتاب و وتیان: تۆ خەلیفەی پێغەمبەری خواییت.

وتی: یا خەلیفەی ئەبوبەکرم چوونکە ئەو، خەلیفەی پێغەمبەر(د.خ) بوو.

وتیان: با وابێت، چی دەبێت ئەگەر خۆت لەو جێگەیە دابنێیت کەئەم خەڵکە دایاننناوە.

وتی: دەسخۆش، منداڵەکانی عودەی! دەتانەوێت قورسایی بارەکەی خۆتان بخەنە سەر شانی من و کارە چاکەکانی من بەهۆی ئێوەوە لەناو بچێت! نا، سوێند بەخوا. خۆڕاگر بن تا بانگتان دەکەن ئەگەر تەنانەت دەفتەرکان بەسەر ئێوەدا ببەستن و ئەگەر تەنانەت لەکۆتایی هەمووان ناوی ئێوە بنووسن. دوو هاوڕێم بوو کەگەڕاونەتەوە بۆ شوێنی خۆیان، ئەگەر دژایەتی ئەوان بکەم، خراپەکارم، سوێند بەخوا بەرەکەتی دنیا و هیوای پاداشتی ئەو دنیامان بەهۆی بوونی پێغەمبەرەوە هەیە کەهۆکاری شەرەف و ڕێزی ئێمە و ئەو، گەورەی عەرەبەکانە و هەرکەس لەو نزیکتر بێت، شەریفترە. عەرەبەکان شەرەفیان لەپێغەمبەر بۆ ماوەتەوە، ئەگەری هەیە ڕەچەڵەکی ئەوان دوای چەندین پشت بەپێغەمبەر بگاتەوە، بەڵام ڕەچەڵەکی ئێمە دوایی چەندین پشتی کەم بەو دەگاتەوە، لەوێوە تا ئادەم پەیوەستی یەکین، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا سوێند بەخوا ئەگەر لەڕۆژی هەستانەوە عەجەمەکان بەکردەوە چاکەکانی خۆیان ئامادە بن و ئێمە هیچمان پێ نەبێت، سوێند بەخوا ئەوان لە محەممەد نزیکترن. هیچ کەس بیر لەخزمایەتی نەکاتەوە و تەنیا بۆ بەدەست هێنانی پاداشتی خوایی کردەوەکانی ئەنجام بدات، هەرکەس لەکردەوەکانی خۆی بێ ئاگا بێت، ڕەچەڵەکی فریای ناکەوێت.

حوزام کوڕی هوشامی کەعبی لەباوکی دەگێڕێتەوە: عومەر کوڕی خەتابم بینی مانگانەی خەڵکانی خوزاعەی برد و لەقەدی دابەزی. خەڵکانی خوزاعە لەقەدید لەدەوری کۆبوونەوە و هیچ ژنێک، بێوە ژنێک یا کچێک بەجێ نەمابوو. مانگانەی ئەوانی تەسلیمی خۆیان دەکرد، دواتر دەڕۆشت و ڕووی دەکردە عەسفان و هەمان کاری دووبارە دەکردەوە. بەمشێوە بوو تا ئەو کاتەی مرد.

سایب کوڕی یەزید دەڵێت: بیستم عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: سوێند بەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە—سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە—هەر کەسێك بەشی بەم ماڵەوە هەیە، پێی بدەن یا نەیدەن، هیچ کەس زیاتر لەوەی دیکە بەشی نییە مەگەر بەندەی ڕێزدار. منیش یەکێکم لەوان، بەڵام هەر کەسێك پێگەیەکی هەیە بەپێی کتێبی خواوەند و ئەو بەشانەی لە پێغەمبەر(د.خ) بەرمان کەوتووە و ئەو هەوڵانەی لەڕێگەی ئیسلام داومانە و ئەو پێویستییانەی پیاو بەخوا هەیەتی، بەشی شوانی کوێستانی سەنعا لەماڵەکەی پێی دەگات.

ئیسماعیل کوڕی محەممەد دەڵێت: ئەم وتانەم بۆ باوکم باس کرد و ئەو، حەدیسەکەی ناسییەوە.

سایب کوڕی یەزید دەڵێت: لای عومەر کوڕی خەتاب چەندین ئەسپم بینی، لەسەر سمتیان داغی پێوە بوو و بۆ ڕێگەی خوا و کارەکانی تایبەت بەموسوڵمانان رایانگرتبوون.

لەگێڕانەوەی سەلمان هاتووە، عومەر پێی وت: من پاشام یا خەلیفە؟

سەلمان وتی: ئەگەر یەك درەم یا کەمتر یا زیاتر لەخەراجی سەرزەمینی موسوڵمانان بەناڕەوا خەرج بکەیت، پاشایت و خەلیفە نیت.

باوکی هورەیرە دەڵێت: خوا لەکوڕی حەنتەمە خۆش بێت، لەساڵی ڕەمادەت بینیم دوو باری بەسەر پشت و دەفرێك ڕۆنی بەدەستەوە بوو. لەگەڵ ئەسلەم دەست بەدەستیان دەکرد، کاتێك منی بینی، وتی: باوکی هورەیرە لەکوێوە دێیت؟

وتم: لەم نزیکانە. منیش هاوکاریم کرد و شتەکانمان برد تا گەیشتینە سەرار، نزیکەی بیست بنەماڵە لەتایەفەی موحاریب لەوێ بوون.

عومەر وتی: بۆ هاتوون؟

وتیان: لەهەژاریدا.

پێستی مردارییان دەبرژاند و دەیانخوارد و ئێسقانە نەرم کراوەکانیان دەکرۆشت و نیشانی ئێمەیاندا. عومەرم بینی عاباکەی خۆی فڕێدا و بەردەوام خواردنی بۆ ئەوان ئامادە دەکرد تا تێریان خوارد. دواتر ئەسلەمی بۆ مەدینە نارد و چەند وشترێکیان هێنا، ئەوانی سوار کرد و بردنی بۆ سارا و لەوێ نیشتەجێی کردن و جل و بەرگی پێبەخشین. بەردەوام دەڕۆشتە لای ئەوان و کەسانی دیکە تا خواوەند

زیانەکەی لەسەر موسوڵمانان هەڵگرت.

هوشام کوڕی خالید دەڵێت: لەعومەر کوڕی خەتابم بیست دەیوت: ئارد مەرێژن تا ئاوەکە گەرم دەبێت، دواتر کەم کەم تێکی بدەن و بیشێوێنن چوونکە نانی زیاتری لێ دەکرێت.

راشید کوڕی سەعد دەڵێت: سامانێکیان بردە لای عومەر کوڕی خەتاب و لەناو موسوڵمانان دابەشی کرد و خەڵکان لەدەوری کۆببوونەوە. سەعد کوڕی وەقاس هات و خەڵکانی دوور خستەوە تا عومەر کوڕی خەتاب هات. عومەر بەقامچی لێیدا و وتی: هاتیت و لەدەسەلاتی خوا لەسەر زەوی نەترسایت، ویستم پێت بڵێم، دەسەلاتی خوا لەسەر زەوی لەتۆ ناترسێت.

شەفا کچی عەبدوللە دەڵێت: چەندین گەنجم بینی بەهێواشی رێگەیان دەبڕی و لەسەر خۆ قسەیان دەکرد.

وتم: ئەمە چییە؟

وتیان: ئەوانە خواپەرستەکانن.

وتم: سوێند بەخوا عومەر بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد و بەخێرایی رێگەی دەبڕی و بەتوندی لەخەڵکانی دەدا، بەلام سوێند بەخوا خواپەرەستی راستەقینە بوو.

عەبدوللە کوڕی عامر دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب هاوکاری کەسێکی بۆ هەڵگرتنی شتێك کرد، وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، هیوادارنم منداڵەکانت سوودت پێ بگەیێنن.

وتی: نا، هیوادارم خواوەند من لەوان بێ نیاز بکات.

عومەر کوڕی موجاشیع دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: هێزی کردار ئەوەیە کاری ئەمڕۆ نەخرێتە سبەی و ئەمانەت ئەوەیە لەنهێنی و ئاشکرا یەکێك بێت. لەخواوەند بترسن چوونکە خۆپارێزی هۆکارێکە بۆ ئاگادار بوون و هەر کەس لەخوا بترسێت، بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی ئەو ئاگادار دەبێت.

موسا کوڕی عوقبە دەڵێت: دەستەیەك پۆشتنە لای عومەر کوڕی خەتاب و وتیان: نانخۆریان زۆرە و ژیانیان دژوار، داوایان کرد مانگانەکەیان زیاد بکات.

وتی: خۆتان کردووتانە، بەردەوام ژنتان بردۆتەماڵەوە و کەڵکتان لەسامانی

خواوەند وەرگرتووە. سوێند بەخوا حەزم دەکرد من و ئێوە لەناو دوو کەشتیدا بین لەناو دڵی دەریا بۆ ئەوەی ئێوەی بەرەو ڕۆژهەڵات و منی بەرەو ڕۆژئاوا ببردایە. دواتر خەڵکان دەیانتوانی کەسێك لەخۆیان بکەنە خەلیفە کەئەگەر دادپەروەری دەکردە پیشە، شوێنی دەکەوتن و ئەگەر ستەمی دەکرد، دەیانکوشت.

تەڵحە وتی: باشتر بوو بڵێی ئەگەر هەڵەی بکردایە، لەسەر کار لایان دەبرد.

وتی: نا، کوشتن دەبێتە هۆکاری ترسی دواتر، لەگەنج و گەورەزادەکانی قورەیش بترسن چوونکە تا ڕازی نەبن ئارام ناگرن و لەکاتی تورەیی پێدەکەنن و دەست بۆ سەر و ژێر درێژ دەکەن.

زەید کوڕی ئەسلەم دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: ئێمە ئەو کەسەی قەرزی پێدەداین بەبەخیلمان دەزانی، بەڵام مەبەستی هاوکاری بوو.

کوڕی عەباس دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بەدەستەیەك لەقورەیشییەکانی وت: بیستوومە کۆڕ دەگرن و کاتێك دوو کەس پێکەوە کۆدەبنەوەوە دەڵێن، لەهاوەڵانی فلأن کەسن یا لەهاونشینەکانی فلأنەکەس، تا ئەو جێگەی ئەمە لەناو کۆڕ و کۆبوونەوەکان بۆتە نەریت، سوێند بەخوا ئەمە زیان بەدینەکەتان دەگەیێنێت، زیان لەپێگەتان دەدات و بۆ کۆبوونەوەکانتان ناپەسەندە، دەڵێی لەئێستاوە دەبینم کەسێك دوای ئێوە دێت و دەڵێت: ئەمە بۆچوونی فلأنەکەسە کە ئیسلامیان دابەش کرد. پێکەوە کۆبوونەوەکانتان ساز بدەن و پێکەوە دانیشن تا زیاتر عادەت بەیەك بگرن و کەسانی باشتر چاو لەئێوە بکەن.،

وتی: خواوەندا، ئەوان لەمن بێزار بوون، منیش لەوان بێزار بووم، لەخۆم تێر بووم و ئەوانیش لەمن تێر بوون. نازانم بەلا بەسەر کاممانـدا دەبارێت، دەزانم دەستەیەکیان هەیە، من بۆ لای خۆت بگەڕێنەرەوە.

ئیبراهیم کوڕی محەممەد لەباوکی دەگێڕێتەوە: عەبدوللە کوڕی ئەبی ڕەبیعە چەندین ئەسپی لەمەدینە ڕاگرت و عومەر کوڕی خەتاب ڕێگەی ئەو کارەی لێگرت. قسەیان لەگەڵ کرد تا مۆڵەت بەعەبدوللە بدات، وتی: مۆڵەتی پێ نادەم مەگەر ئەوەی ئاڵفی ئەسپەکان لەدەرەوەی مەدینە بهێنێت. ئەو چەند ئەسپەکەی بەستەوە و ئاڵفەکەی لەژێر زەمینێك لەیەمەنەوە بۆ دەهێنان.

موجالید دەڵێت: دەستەیەك لای عومەر کوڕی خەتاب باسی پیاوێکیان کرد و

وتیان: ئەی سەروەری باوەڕداران، ڕێزدارێکە و ئاگای لەشەڕ نییە.

وتی: کەواتە ئاسانتر گیرۆدەی شەڕ دەبێت.

## گێڕانەوەی بەشێك لەوتەکانی عومەر کوڕی خەتاب

عوروە کوڕی زوبەیر دەڵێت:

عومەر کوڕی خەتاب قسەی کرد، سوپاسی خوای کرد، بەئەندازەی پێویست و شیاو خواوەندو ڕۆژی هەستانەوەی بیری خەڵکان هێنایەوە و وتی: ئەی خەڵکینە، منیان بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی ئێوە ڕاسپاردووە، ئەگەر هیوادار نەدەبووم کەباشتر و بەهێزتۆ لەئێوەبم و بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان بەتواناتر، ئەم کارەم لەئەستۆ نەدەگرت. ئەمە کارە بۆ عومەر بەسە کەبەردەوام ئەندێشەی کارەکانی ئێوەی لەسەردایە بۆ ئەوەی بزانێت مافەکانتان چۆن وەربگرێت و چۆن لەناو ئێوەدا دابەش و چۆن هەڵسوکەوتتان لەگەڵ بکات. داوا لەخوا دەکەم ئەگەر بەهێز و بەخشش و پشتڕاست کردنەوەی فریای عومەر نەکەوێت، ناتوانێت پشت بەکەسی بەهێزتر لەخۆی ببەستێت.))

جارێکی دیکە قسەی کرد و وتی:

((خواوەند کاروباری ئێوەی بەمن سپاردووە و دەزانم چ شتێك زیاتر سوودتان پێدەگەیێنێت و لەخوام دەوێت بۆ ئەم کارە هاوکاریم بکات و لەم بابەتەیش وەك کارەکانی دیکە، ئاگای لەمن بێت و بۆ دابەش کردنی لەنێوان ئێوە و ئەو دادپەروەرییەی فەرمانی پێداوە، هاریکارم بێت چوونکە پیاوێکی موسوڵمانم و بەندەیەکی لاواز، مەگەر خواوەند خۆی هاوکارم بێت. بەخواستی خوا، ئەم خەلافەتەی ئێوە، خوو وعادەتەکانی من ناگۆڕێت چوونکە گەورەیی و ڕێز تایبەتە بەخواو هیچی تایبەت نییە بەبەندەکان. کەس نەڵێت عومەر لەو کاتەوەی خەلافەتی گرتۆتە دەست، گۆڕاوە. خۆم باش دەناسم وکارەکانی خۆم بۆ ئێوە ڕوون دەکەمەوە: هەرکەس نیازی هەبێت، یا ستەمی لێکرابێت، یا بەشێك لەکردەوەکانی من پەسەند نەکات، پێم بڵێت چوونکە کەسێکم لەئێوە.

بەئاشکرا و نهێنی لەکارە نهێنی و ئاشکراکان لەخواوەند بترسن، پابەندی ڕاستی

و دەستدرێژی مەکەنە سەریەك چوونکە کاتێك داوەری بگاتە لای من، ئاسانکاری بۆ کەس ناکەم. چاکەی ئێوەم دەوێت و حەز بەسەرکۆنە کردن و سزادانی ئێوە ناکەم. زۆربەی ئێوە لەدیارێك نیشتەجێن نەزەوی کشت و کاڵی هەیە و نەئاژەڵی شیردەری فراوان مەگەر ئەوەی خواوەند پێتان ببەخشێت. خواوەند بەفراوانی بەئێوەی بەخشیوە و من، لێپرسراوی ئەم بارودۆخەم. بەخواستی خوا ئەوەی لەبەردەستی مندایە، چاودێری دەکەم و دەیپارێزم و بەکەسی دیکەی ناسپێرم و ئەوەی دوورە لەدەستی من، تەنیا بەهۆی کەسانی بڕواپێکرا و چاکەکار دەتوانم بیپارێزم و بەخواستی خواوەند، ئەم ئەمانەتە تەنیا بەوان دەسپێرم.))

جارێکی دیکە وتارێکی پێشکەش و سوپاسی خواوەندی هێنایە سەرزمان و سلاّواتی بۆ پێغەمبەر(د.خ) نارد و وتی:

((ئەی خەڵکینە، بەشێك لەتەماحکارییەکان هەژارییە و بەشێك لەبێ هیواییەکان، دەوڵەمەندی. ئێوە ئەو شتانە کۆ دەکەنەوە، نایانخۆن و ئەو شتانەی ئارەزووی دەکەن، پێی ناگەن. تاماوەیەکی دیاریکراو لەرۆژگاری پێغەمبەر(د.خ)، خەڵکان رووبەرووی وەحی خواوەند بوون، هەرکەس شتێکی دەشاردەوە، ئاشکرایان دەکرد و لێیان دەسەند و ئەوەی ئاشکرای دەکرد، بەئاشکرا لێیان وەردەگرت، کردەوە چاکەکانی خۆتان نیشانی ئێمە بدەن چوونکە خواوەند باشتر ئاگای لەنهێنییەکانە، هەرکەس شتێك نیشانی ئێمەبدات و گومان بکات، لەناخەوە چاکەکارە، پشت راستی دەکەینەوە و هەرکەس رووکەشێکی جوانمان نیشان بدات، گومانی چاکەکاری لێ دەکەین. بزانن بەخیلی لقێکە لەدوو روویی. چاکە بۆ خۆتان کۆبکەنەوە و هەرکەس لەبەخیلی خۆی بپارێزێت، رزگاری بووە. ئەی خەڵکینە، پێگەی خۆتان بپارێزن و کاروبارەکانی خۆتان رێکبخەن و لەخواوەند بترسن. جل و بەرگی نارەوا بەژنەکانی خۆتان مەپۆشن چوونکە ئەگەر گەنجی نەکات، بەمشێوەیە وەسفی دەکەن. ئەی خەڵکینە! حەز دەکەم، بێ سوود و زیان ماڵئاوایی لەجیهان بکەم، هیوادارم تا ئەو کاتەی لەناو ئێوەدا بم، دادپەروەری بکەمە پیشە، بەخواستی خوا، هەر موسوڵمانێك تەنانەت ئەگەر لەماڵەکەی خۆیدا بێت، ئەو مافەی لەماڵی موسوڵمانان، هەیەتی، بەدەستی دەگات و بۆ وەرگرتنی گیرۆدەی رەنج و دژواری نابێت. ئەوەی کردوویەتی بەرۆژێتان، سامانی بدەن. کەم لەگەڵ سازان باشترە لەزۆر لەگەڵ

توندوتیژی. کوشتن جۆرێکە لەمەرگ و بەچاك و خراپ دەگات. شەهید ئەو کەسەیە لەرێگا خوادا گیان ببەخشێت، ئەگەر کەسێك لەئێوە خوازیاری وشتر بێت، وشترێکی گەورەی دەست دەکەوێت و بەداردەستەکەی خۆی پەروەردەی دەکات و ئەگەر سەرسەخت بێت، دەیفرۆشێت.))

جارێکی دیکە وتاری خوێندەوە و وتی:

(( بۆ بەرەکەتی ئەم دنیا و ئەو دنیا کەبیٚ ویست و داواکاریی بەئێوەی بەخشی، پێویستە شوکر گوزاری خواوەند بین. خواوەند ئێوەی لەنەبوونەوە بۆ پەرەستینی خۆی ئافراند، دەیتوانی ئێوە بکاتە کەم بەهاترین بوونەوەری خۆی، ئێوە کردە گەورەترین و بەهێزترین ئافرێنراوی خۆی و نەیکردنە شوێنکەوتەی هیچ شتێك جگە لەخۆی. ئەوەی لەئاسمان و زەویدایە، خستیە ژێر دەسەلاتی ئێوە و نیعمەتە ئاشکرا و نهێنییەکانی خۆی بەئێوە بەخشی و لەدەشت و دەریا جێگەی کردنەوە بۆ ئەوەی بیپەرەستن و سوپاسی بکەن. چاو و گوێچکەی بەئێوە بەخشی، بەشێك لەنیعمەتەکانی خواوەند تایبەتە بەمناڵەکانی ئادەم و بەشێکی تایبەت کرد بەدینداران. بەلاٚم هەموو نیعمەتە گشتی و تایبەتەکانی لەدەوران و زەمانی ئێوە جێگر کردووە. هەرکام لەم نیعمەتانە ئەگەر تایبەتی کردووە بەکەسێك، ئەگەر لەناو کەساندا دابەشی بکەن، ناتوانن سوپاسگوزاری بن و بەشێوەی پێویست وەلاٚمی چاکی و بەخششەکانی خواوەند بدەنەوە مەگەر بەهۆی باوەڕ بەخواوەند و شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی.

ئەم زەوییەیان بەئێوە سپاردووە و بەسەر خەڵکەکەیدا زاڵ بوون، خواوەند سەرکەوتنی بەدینەکەتان بەخشی و لەدەرەوەی دینەکەی ئێوە تەنیا دوو ئۆمەتی نەیار ماوەتەوە کەیەکیان لەخزمەتی ئیسلام و موسوڵمانانداییە و کارتان بۆ دەکەن و موسوڵمانان کەرەستەکانی ژیان و دەستڕەنج و ئارەقەی ناوچاوی ئەوان وەردەگرن: ئەوان ڕەنجەکەی دەبەن و ئێوە سوودەکەی. و نەتەوەکەی دیکە شەو ورۆژ چاوەڕوانی بەلاٚ و گرفتارییەکانی خواوەندە ودڵیان لێپاولیپە لەترس. پەناگەیەکیان نییە رووی تێبکەن و هیچ شوێنێك پەنای بۆ ببەن، سوپای خواوەند هێرشی کردۆتە سەریان و لە گۆڕەپانی ئەوان دابەزیوە بەبژێوی و سامانی فراوان و نێردراوە یەك

لەدوای یەکەکان و پاراستنی سنوورەکان بەفەرمانی خواوەند کەئەم ئۆمەتە لەسەرەتای ئیسلامەوە باشتر لەئێستای نەبووە. سوپاس بۆ خوا کە بەسەرکەوتنە گەورەکان لەهەر سەرزەمینێك و بەم هەموو نیعمەتە فراوانەی بەئێوەی بەخشی کەهیچ کات ناتوانن ماف خۆی بەتەواوی بۆ بگێڕنەوە. شوکری شوکرگوزاران و زیکری زاکیران و تێکۆشانی تێکۆشەران بەهیچ جێگەیەك ناگات مەگەر بەهۆی ڕەحمەت و بەزەیی خواوەند. لەو خوایەی جگە لەو خوایەك نییە و بەم کارەی گرفتاری ئەزموونی کردووین، دەخوازین بەفراوان کردنی بەخششەکان و سەرکەوتنەکان، ڕەزامەندی خۆی لەئێمە نیشان بدات.

بەندەکانی خوا، ئەزمونە خواییەکانتان لەبیر بێت و لەکۆبوونەوەکانتان تەنیا و دووبەدوو داوا لەخوا بکەن، نیعمەتەکانی بەفراوانی بەئێوە ببەخشێت. خواوەند بەموسای فەرموو: هاتنەدەر لەتاریکی و ڕۆژەکانی خواوەند بیری خەڵکەکەت بێنەرەوە. هەروەها بە محەممەدی فەرموو: بیرتان بێت لەم سەرزەوییە، کەم و لاواز بوون.؟

ئەگەر ئەو کاتەی لاواز بوون و لەبەرەکەتەکانی دنیا بیٚ بەش، بەرێگەی ڕاستا دەپۆشتن و دڵتان پێی خۆش دەکرد، خواتان دەناسی و پێی باوەڕدار دەبوون و بەهۆیەوە چاوەڕوانی پاداشتەکانی دوای مەرگتان دەکرد، شتێکە بەلاّم بەوشێوە بوون کەبەدەست هێنانی بژێویتان لەهەمووان دژوارتر و نەزانیتان بەرابەر بەخواوەند لەهەمووان ئاشکراتر. ئەگەر ئەم دینەی کەخواوەند کردیە بەشی ئێوە، تەنیا ئەم سوودەی بۆ ئەم دنیاتان دەبوو کەدەبێتە هۆکاری دڵنیایی ئەو دنیای هەمووان ڕووی تێدەکەن، و بەهەمان شێوە دابین کردنی بژێوی گرفتار دەبوون، ڕەوایە شوێنکەوتەی ئەم دینە و خوازیاری ئەم دینە بن و پێش هەموو دینەکانی دیکەی بکەون چ بگات بەوەی بەرەکەتی ئەم دنیا و ڕێزی ئەو دنیای پێکەوە پیٚ بەخشیون. دەبێت دڵتان بەهێز و بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی خواوەند بەبڕشت و لەهەمان کات کە لەخۆشییەکانی دنیا کەڵك وەردەگرن، لەبیری خواوەند و ئەو دنیادا بن، ئەگەری هەیە لەدەستتان بڕوات و هیچ شتێك هاوشێوەی کوفران نابێتە هۆی فیڕۆیی نیعمەتەکان. شوکرگوزاری دەبێتە هۆی خۆپاراستن لەگۆڕانکاری و فراوان بوونی نیعمەتەکان. لەبەر خوا، فەرمان بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپە، لەسەر من پێویستە.

## ئەو پرسەنامانەی بۆ عومەر کوڕی خەتابیان هۆنییەوە

هوشام کوڕی عوروە دەڵێت: ژنێك بۆ عومەر کوڕی خەتاب دەگریاو دەیوت: چ خەمێکم بۆ لەدەستدانی عومەر کوڕی خەتاب هەیە، خەمێك کەبڵاو بوویەوە و هەموو مرۆڤەکانی گرتەوە. موغەیرە کوڕی شوعبە دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب مرد، کچی باوکی حەنتەمە بۆی گریا و وتی: هاوار لەعومەر، ڕەنجەکانی لەناو برد و کارەکانی ڕێکخست، فیتنەکانی سڕییەوە و سونەتەکانی زیندوو کردەوە، داوێن پاك ڕۆشت بێ ئەوەی ڕەخنەی لەسەر بێت.

هەروەها موغەیرە کوڕی شوعبە دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتابیان بەخاك سپارد، ڕۆشتمە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب، دەمویست سەبارەت بەعومەر کوڕی خەتاب شتێکی لێ ببیستم. هاتەدەر و لەسەر و ڕیشی ئاو دەچۆڕا، دەستنوێژی گرتبوو، جل و بەرگێکی پۆشیبوو، دڵنیا بوو خەلافەت بەو دەگات، وتی: خواوەند لەکوڕی خەتاب خۆش بێت، کچی باوکی حەنتەمە راستی وت کەلەخێری خەلافەت کەڵکی برد و لەشەڕەکەی ڕزگاری بوو. سوێند بەخوا ئەو نەیوت، هێنایانە سەرزمانی.

سەعید کوڕی موسەییب دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب بەرەو حەج بەرێکەوت و کاتێك گەیشتە زەجنان، وتی: هیچ خوایەك جگە لەخوای گەورە بوونی نییە، هەرچی بوێت، بەوەی بیەوێت، دەیبەخێشت. من وشترەکانی خەتابم لەم دۆڵە دەلەوەڕاند، جل و بەرگێکی پەشمینم لەبەردا بوو، خەتاب توندوتیژ و کاتێك کارم دەکرد، هیلاکی دەکردم و ئەگەر کەمتەرخەمیم لەخۆم نیشان دەدا، لێی دەدام. ئێستا ئەو کەسەم کە لەنێوان من و خواوەند هیچ کەسێك بوونی نییە.

وەلیدی مەککی دەڵێت: ڕۆژێك عومەر کوڕی خەتاب دانیشتبوو، پیاوێکی شەل دەرکەوت و وشترێکی شەلی بەدوای خۆیدا رادەکێشا، کاتێك گەیشتە لای سەروەری باوەڕداران، هۆنراوەیەکی خوێندەوە و عومەر کوڕی خەتاب وتی: لا حول و لا قوە الا باللە. پیاوی شەل لەشەلی وشترەکەی سکاڵای دەکرد، عومەر وشترەکەی ئەوی وەرگرت و وشترێکی سوور و توێشووی ڕێگەی پێدا و بەرێکەوت.

عومــەر کــوڕی خــەتاب رووی کــردە حــەج و لەرێگــەدا ســوارەیەکی بــینی کەهۆنراوەیەکی دەخوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((کەس وەك تۆ ئەی کوڕی خەتاب، ئێمەی بۆ رێگەی راست نەبرد

و دوای پێغەمبەری خاوەن کتێب کەس وەك تۆ

ئەی کوڕی خەتاب،

لەگەڵ نزیك و دوور چاکەی نەکرد.))

عومەر قامچی لێدا و وتی: ئەی ئەبوبەکر؟

عەبدولعەزیز کوڕی نەوفل دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب عوتبە کوڕی ئەبی سوفیانی کردە کارگوزاری کەنانە، کاتێك گەڕایەوە بۆ لای، سامانی لەگەڵ خۆی هێنا، پێی وت: ئەی عوتبە ئەمە چییە؟

وتی: سامانی خۆم لەگەڵ خۆم برد و بازرگانیم پێوە کرد.

وتی: چۆن لەم سەفەرەدا سامانی خۆتت لەگەڵ خۆت برد؟

سامانەکەی لێ سەند و تەسلیم بەبیت المالی کرد.

کاتێك عوسمان کوڕی عەفان خەلافەتی گرتەدەست، بەئەبوسوفیانی وت: ئەگەر ئەوەی عومەر کوڕی خەتاب لەعوتبەی وەرگرت، داوای بکەیت، پێتی دەدەم.

ئەبوسوفیان پێی وت: ئەگەر دژایەتی هاورێکەی پێش خۆت بکەیت، بۆچوونی خەڵکان سەبارەت بەتۆ دەگۆڕێت، دژایەتی ئەو مەکە تا کەسی دوای تۆ دژایەتی تۆ نەکات.

زەید کوڕی ئەسلەم لەباوکی دەگێڕێتەوە: هیند کچی عوتبە ڕۆشتەلای عومەر کوڕی خەتاب و چوار هەزاری لەبیت المالْ وەك قەرز داوا کرد تا بازرگانی پێوە بکات و دەستەبەری بێت. عومەر کوڕی خەتاب پێیدا. هیند رووی کردە دیاری کەلب و دەستی بەکڕین و فرۆش کرد. دواتر ئاگادار بوویەوە ئەبوسوفیان و عەمرۆ کوڕی ئەبوسوفیان ڕۆشتوونەتە لای معاویە. لەدیاری کەلبەوە بەرێکەوت. ئەبوسوفیان ئەوی تەلاقدا بوو.

معاویە پێی وت: ئەی دایکە، بۆچی هاتوویت؟

وتی: هاتووم تۆ ببینم، کوڕم. عومەر کوڕی خەتاب دەناسی، لەرێگەی خواوەند کارەکانی ئەنجام دەدات، باوکت هاتە لای تۆ، دەترسم شتێکی پێ بدەیت کەشیاوە

بۆی بەڵام خەڵکان نەزانن لەکوێوەوە پێت بەخشیوە و سەرکۆنەی تۆ بکەن و بەمشێوەیە عومەر کوڕی خەتابیش سەرکۆنەت دەکات و هیچ کات ناتبەخشێت.

معاویە سەد دیناری بۆ باوك و براکەی نارد و جل و بەرگ و چوارپێی پێدان.

عومەر کوڕی خەتاب ئەمەی بەزۆر زانی. ئەبوسوفیان وتی: ئەمە بەزۆر مەگرە چوونکە هیند بۆ ئەم بەخششە راوێژی پێکراوە.

هەموویان گەڕانەوە، ئەبوسوفیان بەهیندی وت: قازانجت دەستکەوت؟

وتی: خوا دەزانێت، کاڵایەك بۆ مەدینە دەبەم.

کاتێك گەیشتە مەدینە و فرۆشتی، لەزیانەکەی سکاڵای کرد.

عومەر پێی وت: ئەگەر ماڵی خۆم دەبوو، پێم دەبەخشی بەڵام سامانی موسوڵمانانە. ئەمە راوێژێکە ئەبوسوفیان بەشداری تیا کردووە، کەسی نارد و ئەوی گرت تا سامانەکەی گەڕاندەوە.

عومەر کوڕی خەتاب بەئەبوسوفیانی وت: معاویە چەندەی پێداییت؟

وتی: سەد دینار.

ئەحنەف دەڵێت: کاتێك عومەر کوڕی خەتاب مانگانەی بۆ کەسەکان دیاری دەکرد، عەبدوللە کوڕی عومەیر کەباوکی لەجەنگ کوژرابوو، هاتەلای و وتی: ئەی سەروەری باوەڕداران، مانگانە بۆ من دیاری بکە.

بەڵام عومەر گوێی پێنەدا، عەبدوللە دەستی لێدا، وتی: تێگەیشتم. دواتر رووی تێکرد و وتی: تۆ کێیت؟

وتی: عەبدوللە کوڕی عومەیر.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: یەرفا، شەشسەد درەم و حیلەیەکی پێبدە.

یەرفا پێنسەدی پێدا بەڵام وەرینەگرت و وتی: سەروەری باوەڕداران وتی شەشسەد بەمن بدەیت، گەڕایەوە بۆ لای عومەر کوڕی خەتاب و ئاگاداری کردەوە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: شەشسەد درەم و حیلەیەکی پێبدە. یەرفا پێی دا.

عەبدوللە حیلەکەی عومەر کوڕی خەتابی پۆشی و جلەکانی خۆی فرێدا.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: کوڕی خۆم! جلەکانت هەڵگرە و بۆکاروبارەکانت کەڵکی لێوەربگرە و ئەمە بۆ کاتی خۆڕازاندنەوە.

کوڕی عەباس دەڵێت: لەیەکێك لەسەفەرەکان هاوڕێی عومەر کوڕی خەتاب بووم، شەوێك کەرێگەمان دەبڕی، لێی نزیك بوومەوە و بینیم قامچی لەقاچی خۆی دەدا و هۆنراوەیەکی بەم ناوەرۆکە دەخوێندەوە:

(( سوێند بەخوا درۆ دەکەن کە محەممەد دەکوژرێت

و ئێمە بۆ بەرگری کردن لەو شمشێر نەوەشێنین و نەجەنگین.

هیچ کات تەسلیمی ناکەین تا لەدەوری ئەو،

بکوژرێین

و لەمناڵ و ژنەکانی خۆمان بێ ئاگا دەمێنینەوە.))

دواتر استغفرالله ی هێنایە سەرزمان و هۆنراوەیەکی خوێندەوە بەم ناوەرۆکە:

((هیچ وشترێك لەسەر کۆپانەکەی خۆی کەسێکی

جوانتر و راست پەیمانتر لە محەممەدی هەڵنەگرتووە))

جارێکی دیکە وتی: استغفر الله ەئی کوڕی عەباس، بۆ عەلی لەگەڵ ئێمە نەهات؟

وتم: نازانم.

وتی: بەڵام دەزانم، خەلاًفەت، باوکی تۆ مامی پێغەمبەر(د.خ) بوو و تۆ کوڕە مامی پێغەمبەریت، چ شتێك بووە هۆی ئەوەی خەڵکەکەتان ئێوە بەتەنیا جێبێڵن.

وتم: نازانم.

وتی: بەڵام من دەزانم، حەزیان بەخەلافەتی ئێوە نەدەکرد.

وتم: بۆ؟

وتی: خوایە ببەخشە، حەزیان نەدەکرد هەم پێغەمبەر(د.خ) لەئێوە بێت و هەم خەلافەت بۆ ئێوە بێت و شانازی پێوە بکەن. ئەگەری هەیە بڵێن ئەبوبەکر بەناڕەوا دەستی بەسەر خەلافەتدا گرت. سوێند بەخوا نە، ئەبوبەکر ماڵ نەندێش بوو، ئەگەر خەلافەتی بەئێوە دەسپارد بەبوونی خزمەکانتان هیچ سوودێکی بەئێوە نەدەگەیاند. قەسیدەی شاعیری شاعیرەکان زوهەیر بۆ من بخوێنەرەوە کەناوەرۆکەکەی بەمشێوەیە:

((اذا ابتدرت قیس بن عیلان غایة

من المجد من یسبق الیها یسود.))

قەسیدەکەم بۆ خوێندەوە تا بەیانی داهات.

دواتر وتی سووری واقعە بخوێنەرەوە و من خوێندم. لەئەسپەکەی هاتەخوار و نوێژی خوێند و سوری واقعەی لەنوێژەکەیدا خوێند.

هەروەها کوڕی عەباس دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب و دەستەیەك لەهاوەڵانی ئەو باسی شێعریان دەکرد.

یەکیان وتی: فلأن کەس شاعیرترە. یەکیتر وتی: فلأن کەس شاعیرترە.

دەڵێت: لەم کاتەدا من لێیان نزیك کەوتمەوە. عومەر کوڕی خەتاب وتی: کەسێك هات کەزیاتر لەهەمووان شارەزای ئەم بابەتەیە.

بەمنی وت: ئەی کوڕی عەباس، شاعیری شاعیرەکان کێیە؟

وتم: زوهەیر کوڕی سولەمی.

وتی: کەمێك لەشێعرەکانی ئەو بخوێنە تا ببێتە بەڵگەیەك بۆ وتەکەت.

وتم: بۆ وەسف کردنی خەڵکانێك لەمناڵەکانی عەبدوللە کوڕی غەتەفان دەڵێت:

((ئەگەر خەڵکێت بەهۆی کەرەم

وپێشینان و رێزدارییان

لەسەر سەرەوەی خۆر دادەنیشتن

ئەوان دانیشتبوون

خەڵکێك کەباوکیان سەنانە

و پاکن و زادەکانیان پاکە

لەکاتی ئارامی مرۆڤ و

کاتێك بجووڵێن جنۆکەن

کاتێك کۆدەبنەوە، بەخشندەکان و بوێرەکانن

خواوەند هۆکاری رژدی لەوان نەگرێتەوە.))

عومەر کوڕی خەتاب وتی: راستی وتووە و گومانم نییە هیچ کەس وەك ئەم تایەفەی مناڵەکانی هاشم شیاوی ئەم وتانە بێت. بەهۆی لەپێشی پێغەمبەر(د.خ) و خزمایەتییان لەگەڵ ئەو.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، راستت وت و بەردەوام راستی دەهێنیتە سەرزمان.

وتی: ئەی کوڕی عەباس، دەزانی دوای پێغەمبەر(د.خ) چ شتێك بووە ڕێگر لەوەی خەڵکان بەخەلافەتی منداڵەکانی هاشم رازی بن؟

وتم: ئەگەر نەزانم، سەروەری باوەڕداران بڵێت تا ئاگادار ببمەوە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: حەزیان نەدەکرد پێغەمبەرایەتی و خەلافەت لەناو ئەواندا کۆببێتەوە و شانازی بەسەر خەڵکەکەی خۆیانەوە بکەن. قورەیشی بۆ خۆی هەڵبژاردو کارێکی بەجێ و شیاو بوو.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەگەر مۆڵەتی قسە کردن بدەیت بێ ئەوەی تووڕە ببیت، قسە دەکەم.

وتی: ئەی کوڕی عەباس بڵێ.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەوەی وتت قورەیشی بۆ خۆی هەڵبژارد و کارێکی بەجێ و سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەگەر خواوەند لەهەمان شوێنەوە کەخواوەند بۆ ئەوی هەڵبژاردبوو، بۆ خۆی هەڵدەبژارد، بەجێ و ڕێگە بۆ هیچ ڕەخنەیەك نەدەما. بەڵام ئەوەی دەڵێت حەزیان نەدەکرد ئێمە پێغەمبەرایەتی و خەلافەتمان پێکەوە هەبێت، خواوەند بۆ وەسف کردنی نەتەوەیەك دەفەرمێت: ئەوەی خواوەند ڕەوانەی فەرموو، حەزیان پێی نەدەکرد و خواوەند کردەوەکانی ئەوانی سڕییەوە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: گوێ مەدەرێ، سوێند بەخوا ئەی کوڕی عەباس، شتێکم لەتۆ بیست حەز ناکەم پێی رازی ببم لەبەر ئەوەی نەکا پێگەت لای من دابەزێت.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، چی بووە؟ ئەگەر ڕاستی بێت ڕەوا نییە پێگەی من لای تۆ بێنێتەخوار و ئەگەر ناڕەوا بێت، با چیتر دووبارەی نەکەمەوە.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: بیستوومە دەڵێی خەلافەتیان بەستەم و ڕژدی بردن لەدەستی ئێمە دەرهێناوە.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئەوەی دەڵێی بەستەم، بۆ نەزان و بیرمەند ئاشکرایە و ئەوەی دەڵێت بەڕژدی بردن، ئیبلیس ڕژدی بەئادەم برد و ئێمە منداڵە ڕژدی بەرەکانی ئەوین.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: گوێ مەدەرێ، سوێند بەخوا ئەی منداڵەکانی هاشم،

دڵتان بەرژدی بردن، عادەتی گرتووە و لەناوناچێت.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، ئارام بە و دڵی ئەو کەسانەی خواوەند ناپاکی لەوان سڕیوەتەوە، بەرژدی بردن وەسف مەکە چوونکە دلی پێغەمبەر(د.خ) یەکێکە لەدڵی منداڵەکانی هاشم.

عومەر کوڕی خەتاب وتی: ئەی کوڕی عەباس، لەمن دوورکەوەرەوە.

وتم: ئەو کارە دەکەم.

کاتێك ویستم هەستم، شەرم دایگرت و وتی: ئەی کوڕی عەباس، لەشوێنی خۆت بمێنەرەوە، سوێند بەخوا رێز لەمافی تۆ دەگرم و ئارەزوومەندی دڵخۆشی تۆم.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، من لەسەر تۆ و هەموو موسوڵمانان مافێکم هەیە، هەرکەس رێزی لیّ بگرێت، چاکەی کردووە و هەرکەس رێزی نەگرێت، هەڵە.

دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب هەستا و ڕۆشت.

ئەیاس کوڕی سەلمە لەباوکی دەگێڕێتەوە: عومەر کوڕی خەتاب لەبازار گوزەری کرد، قامچی پێبوو، بەهێواشی لەمنیدا و بەرجلەکانم کەوت، وتی: لەسەر رێگەکە لاچۆ.

دەڵێت: ساڵی دواتر دووبارە منی بینیوە و وتی: سەلمە، دەتەوێت بڕۆیت بۆ حەج؟

وتم: بەڵێ.

دەستی منی گرت و بردمیەوە بۆ ماڵ و شەشسەد درەمی پێدام، وتی: ئەمە بکەرە خەرجی حەجەکەی خۆت و بزانە لەجیاتی ئەو لێدانەی هێواشەی ساڵی پارە.

وتم: ئەی سەروەری باوەڕداران، من لەبیرم کردبوو.

وتی: بەڵام من لەبیرم نەکردبوو.

سەلمە کوڕی کوهەیل دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: ئەی ژێردەستەکان، ئێمە لەسەر گەردنی ئێوە مافێکمان هەیە کە بەئامادە نەبوونی من چاکەخوازی من بن و هاوکاری یەك بکەن، هیچ خۆڕاگرییەك لای خواوەند پەسەندتر لەخۆڕاگری بۆ ڕەنج و نەرمی پێشەوا نییە. ئەی ژێردەستەکان! پێداگرتن لای خواوەند ناپەسەندو کەس دوژمنتر لەکەسی پێداگری پێشەوا نییە. ئەی ژێر دەستەکان! هەرکەس ژێر

دەستەکانی خۆی تەندروست بهێڵێتەوە، خواوەند لەسەرەوە تەندروستی پێدەبەخشێت.

عیمران کوڕی سوادە دەڵێت: لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب نوێژی بەیانیم خوێند، سورەی سبحان و سورەیەکی دیکەی لەگەڵدا خوێند. دواتر ڕۆشت و منیش لەگەڵی ڕۆشتم.

وتی: چ نیازێکت هەیە؟

وتم: نیازێکم هەیە.

وتی: بەدوامدا وەرە.

دەڵێت: بەدوایا ڕۆشتم و کاتێك ڕۆشتە ناو ماڵەکەی، مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی پێدام، بینیم لەسەر تەختێك دانیشتووە کەهیچی لەسەر نییە.

وتم: پەندێکم هەیە.

وتی: سڵاو لەپەند بێژی ئێواریٚ و بەرەبەیانان.

وتم: خەڵکان بۆ چوار شت ڕەخنە لەتۆ دەگرن.

دەڵێت: سەری قامچییەکەی خستە ژێر چەناکەی و بنەکەی خستە سەر ڕانی، وتی: بڵێ.

وتم: دەڵێن: حەجی عەمرەت لەمانگەکانی حەج حەرام کردووە، بەلاّم پێغەمبەر(د.خ) و ئەبوبەکر ئەو کارەیان نەکرد.

وتی: حەلاڵە، بەلاّم ئەگەر لەمانگەکانی حەج عەمرە بکەن، بەحەج لەقەڵەمی دەدەن و ساڵەکان لەدەستیان دەردەچێت و حەجەکەیان تەواو نابێت کەنوورێکە لەنوورەکانی خواوەند. ڕاستت وت.

وتم: دەڵێن: (متعە)ی ژنانت حەرام کردووە لەکاتێکدا خواوەند بەڕەوای زانیوە بەدانی یەك مشت درەم، چێژ لەژنەکان وەربگرین و دوای سێ ڕۆژ لێیان جیا ببینەوە.

وتی: پێغەمبەر(د.خ) لەکاتی پێویست ئەو کارەی حەلاڵ کرد و دواتر بارودۆخی خەڵکان گۆڕا. ئاگادار نیم کەسێك لەموسوڵمانان بۆ ئەو کارە گەڕابێتەوە یا ئەو کارەی ئەنجام دابێت. هەنووکە هەر کەس دەخوازێت دەتوانێت بەدانی یەك مشت درەم، ژنێك مارە بکات و دوا سێ ڕۆژ لێی جیا ببێتەوە. ڕاستت وت.

وتم: و کەنیز ئەگەر منالی بۆ خاوەنەکەی هێنایە دنیا، بێ ئەوەی خاوەنەکەی ئازادی بکات، ئازادت کردووە.

وتی: ڕێزێکم پەیوەستی ڕێزێك کردووە و تەنیا مەبەستی چاکەم هەیە، داوای بەخشین لەخواوەند دەکەم.

وتم: لەتوند و تیژی لەگەڵ ژێردەستەکان سکالاّ دەکەن.

دەڵێت: قامچییەکەی هەڵگرت و دەستی پیا هێنا، وتی: من لەگەڵ محەممەد سوار لەسەر وشتر ڕۆشتمك، لەغەزای قەرقەرە لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) سوار لەسەر یەك وشتر بووم، سوێند بەخوا دەلەوەڕێنم و تێر دەکەم و تێراو دەکەم، لەگەڵ نەزان توندوتیژی دەنوێنم، کەسانی بەئەرك سزا دەدەم، بەرگری لەڕێز و پێگەی خۆم و موسوڵمانان دەکەم، کەسی پێداگر تەمی دەکەم، شوێن دزەکان دەکەوم، بەزۆری خەڵکان سەرکۆنە وکەمتر لێیان دەدەم، داردەست بەرز دەکەمەوە بەلاّم بەدەست دەیانگێڕمەوە، ئەگەر بەمشێوە نەدەبوو، هیچ پاساوێکم نەدەبوو.

دەڵێت: ئەم وتەیە بەگوێی معاویە گەیشت و وتی: ژێردەستەکانی خۆی بەباشی دەناسی.

محەممەد دەڵێت: بیستم عوسمان کوڕی عەفان وتبووی: عومەر کوڕی خەتاب بۆ مەبەستی ڕەزای خواوەند، کەسان و خزمەکانی خۆی بێ بەش کرد و من بەمەبەستی ڕەزای خواوەند، ئەرك و کارەکان بەکەسان و خزمەکانی خۆم دەسپێرم. هاوشێوەی عومەر سێ کەس دەستناکەوێت.

کوڕی سلێمان دەڵێت: ڕۆشتمە مەدینە و چوومە ناو یەکێك لەماڵەکان. عومەر کوڕی خەتابم بینی، ڕووپۆشێکی قەتراناوی لەبەردابوو. قەترانی لەوشترەکانی زەکات دەدا.

باوکی وایل دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: ئەگەر ئەوەی ئێستا دەیزانم، پێشتر دەمزانی، زیادەی سامانی کەسانی بەتوانام دەگرت و بەسەر موهاجیرە هەژارەکان دابەشم دەکرد.

ئەسوەد کوڕی یەزید دەڵێت: کاتێك نێردراوان دەڕۆشتنە لای عومەر کوڕی خەتاب، سەبارەت بەئەمیرەکەیان پرسیاری لێدەکردن و چاکەی ئەوانیان دەهێنایە

سەرزمان.

دەیوت: دەڕواتە سەردانی نەخۆشەکان؟

دەیانوت: بەڵێ.

دەیوت: هەڵسو کەوتی لەگەڵ کەسانی لاواز چۆنە، ئایا کەسانی لاواز لەبەر دەرگای ئەو ماتڵ دەبن؟

ئەگەر سەبارەت بەیەکێك لەتایبەتمەندییەکان وەڵامەکەیان نێگەتیڤ دەبوو، ئەوی لەسەر کار لادەبرد.

عەمرۆ دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: چوار شت هەیە لەکاروبارەکانی ئیسلام گرنگترە کەمن هیچ کات لەخۆمدا لەناوی نابەم و پشتگوێی ناخەم: توانایی بۆ کۆکردنەوەی سامانی خوایی و چۆنیەتی کۆکردنەوە و پاراستنی چوونکە خواوەند فەرمانیداوە و ئێمە بنەماڵەی عومەر بەجیٚ دەمێنین و لەسامانی خوایی هیچ شتێك لای ئێمە نامێنێتەوە.

موهاجیرەکان لەژێر سێبەری شمشێرەکانی خۆیان ژیان بەسەر دەبەن و زۆر لەشوێنێك نامێننەوە و لەتالانییەکان بەوان و نانخۆرەکانیان دەبەخشرێت و من چاودێری نانخۆرەکانیان دەکەم تا ئەو کاتەی دەگەڕێنەوە.

ئەنسار کەخواوەندیان لەسامانی خۆیان کردە شەریك و لەگەڵ خەڵکان بەگشتی جەنگان و دەبێت ڕێز لەچاکەکارەکانیان بگرن و لەخراپەکارانیان خۆش بن و لەکاروباری تایبەت بەخەلافەت راوێژیان پێبکرێت.

بەدەوییەکان کەڕەگ و ڕیشەی عەرەب و کۆڵەکەی ئیسلامن، زەکاتیان بەشێوەیەکی ڕەوا لیٚ وەربگیرێت و دینار و درەمیان لیٚ کۆبکەنەوە و بەسەر هەژار و نەدارەکان دابەشی بکەن.

عەبدوللە کوڕی عومەر دەڵێت: عومەر کوڕی خەتاب دەیوت: دەزانم خەڵکان هیچ کەس لەگەڵ ئەم دوو پیاوە بەرابەر ناکەن چوونکە پێغەمبەر(د.خ) لەنێوان ئەوان و جبرەئیل نهێنییەکانی بۆ باس و لەوانی وەردەگرت و پێی ئیلهام دەکردن.